# مێژووی ئێران

## له سه‌ره‌تاوه هه‌تا هاتنی ئیسلام







نووسه‌ر: ڕۆمه‌ن گیرشمه‌ن
وه‌رگێڕ: سه‌لاحه‌ددین ئاشتی

# مێژووی ئێران

# لە سەرەتاوە هەتا هاتنی ئیسلام

نووسەر: ڕۆمەن گیرشمەن

وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی




٢٠١٣

**سەرپەرستی چاپەمەنییەکانی بنکە: سدیق ساڵح**

زنجیرە: ١٦٦

کتێب: مێژووی ئێران لە سەرەتاوە هەتا هاتنی ئیسلام، نووسینی ڕۆمەن گیرشمەن

وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی

پیتچن: پەروین پیرەبابی

بەرگ: ئاوات حەکیمزادە

ساڵی چاپ: ٢٠١٣

بەرگەژمێر: ١٠٠٠

ژمارەی سپاردن: ١٧٣٧/٢٠١٣

شوێنی چاپ: ئێران، تاران

**سەرچاوەی سەرەکی:** ایران از آغاز تا اسلام، رومن گیرشمن ، ترجمه به فارسی دکتر محمد معین ، چاپ بیستم ١٣٩٠خورشیدی، تهران شرکت انتشارات علمی و فرهنگی

**سەرچاوەی دووهەم:** تاریخ ایران از آغاز تا اسلام، رومن گیرشمن ، ترجمه به فارسی محمود بهفروزی، چاپ سوم ١٣٨٥ خورشیدی، تهران انتشارات جامی

**سەرچاوەی یارمەتیدەر:** دەقی فەرانسە .L'Iran des origines a L'Islam

**تێبینی:** ڕووبەرگی کتێبەکە بریتییە لەو کەشەفە زێوەی کە لە گوندی زێوییەی سەر بە شاری سەقز دۆزراوەتەوە. پیاوەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست سەمبولن بۆ چەکدارانی ماد، هەخامەنشی، ئەشکانی و ساسانی.

پشتبەرگ وێنەی گۆزەبەردینەی "فەقرەقا"یە لە باکووری شاری مەهاباد و بەپێی بۆچوونی نووسەر سەر بە سەردەمی مادەکانە.

## بنکەی ژین

**بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی**

عێراق: هەرێمی کوردستان، سلێمانی، شەقامی پیرەمەگروون، گەڕەکی بەرانان(١٠٧)، تەنیشتی مزگەوتی شێخ فەرید. تەلەفۆن ٢-٣١٩٤٧٣١ ئاسیا ٤٨٤٦٣٣٥٧٧٥ یا ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ کۆرەک ٠٧٥٠١١٢٨٣٠٩سندووقی پۆست:١٤

ماڵپەڕ:WWW.Binkey jin.com ناونیشانی ئەلکترۆنی: Info@binkeyjin.com

# پێرست

## بەشی ٣

### خۆرهەڵات دژی خۆرنشین:



## بەشی ٤

### خۆرنشین دژی خۆرهەڵات:

## بەشی ٥



## بەشی ٦

### گەشە و پەرەی شارستانییەتی ئێرانی:

# سەرەتا

نووسەری ئەم کتێبە دوکتۆر ڕۆمەن گیرشمەن (١٨٩٥-١٩٧٩)، شوێنەوارناس و مێژوونووسێکی پایەبەرزی فەرانسەوییە کە لە زانکۆی سۆربۆن و قوتابخانەی بەرزی لووڤر خوێندوویەتی. ساڵی ١٩٣٠ بۆ یەکەم جار وەک ئەندامی شاندێکی شوێنەوارناسی چۆتە وڵاتی عێراق و ماوەیەک دواتر گەیوەتە ئێران و ئەفغانستان. گیرشمەن لەو گەشت و گەڕان و کەندەوکۆژانەدا پێگەیشتووە و بۆتە سەرۆکی شاندی شوێنەوارناسیی وڵاتەکەی لە دەرەوە و پاش نووسینی چەندین کتێب و وتار سەبارەت بە شوێنەوارە لەمێژینەکانی ئێران، سەرەنجام ساڵی ١٩٥١ ئەم بەرهەمەی لە پاریس بڵاو کردۆتەوە.

هێندەی پێنەچووە کە ئەم کتێبە پڕ نێوەرۆکە کەوتۆتە بەر دڵی زانایانی ئێرانی و خوابەخشیو دوکتۆر محەممەد موعین کردوویەتە فارسی و ساڵی ١٩٥٧ لە تاران بڵاو کراوەتەوە. ئەم وەرگێڕانە وەکوو سەرچاوەیەکی زانستی هەتا ساڵی ٢٠١١، بیست جار چاپ کراوەتەوە. بێجگە لەم وەرگێڕانە، بۆ جارێکی دیکە و پاش ٤٣ ساڵ ڕێزدار مەحموود بێهفرووزی چۆتەوە سۆراغی و دەقە فەرانسەکەی کردۆتەوە فارسی و بۆ یەکەم جار ساڵی ٢٠٠٠ لە چاپی داوە و هەتا ئێستا چەندین نۆرەی دیکەش بڵاو کراوەتەوە. پێم‌وایە خودی ئەم

هەنگاوەی دوایی زیاتر بایەخی بەرهەمەکەی گیرشمەن و ڕوونتربوونەوەی ئاسۆی زمانی فارسی و پەیدابوونی ڕوانگەی تازە لەسەر شێوەی وەرگێڕان دەخەنە بەرچاو. گەشەی زمان و ڕوانگەی نوێ باسێکی سەربەخۆن، جا هەر بۆیە ڕوو دەکەمەوە کاکڵی بەرهەمەکە و خۆ لەو دوو خاڵەی دیکە لا دەدەم.

وەکوو ئاشکرایە نووسەر لە ڕەوتی کارەکەی‌دا هەر تەنیا نەپرژاوەتە سەر چارەنووسی میران و مەزنان و تۆمارکردنی شەڕ و سەرکەوتن و بەزینیان، بەڵکوو باسی دین و وێژە و هونەری وڵات و هەرێمەکانی خستوونە بەرباس و بە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیی خەڵکدا چۆتەوە و تیشکەی هاویشتوونە سەری. ئەگەرچی ماوەیەکی یەکجار دووری بیست‌هەزار ساڵە بەرەودوا کشاوەتەوە، بەڵام هێندە هەست بە کورتیی کارەکەی ناکرێ و چوارهەزار ساڵەی تەمەنی پڕ هەوراز و لێژی نەتەوەکانی بانووی ئێرانی بە لەسەرەخۆیی بڕیوە.

دامەزرانی پادشایەتیی ماد و پێکهاتنی ئیمپراتۆریی هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانی و چارەنووسی هەموویان لێرەدا بە پوخت و پاراوی ڕەنگی داوەتەوە و دەتوانێ بیری خوازیارانی تینووی زانین، بەتایبەت خوێندکارانی مێژوو تێراو بکا و دەرروویەکی ڕوونیان بە ڕوویدا بکاتەوە. جا هەر ئەم خاڵە دیار و درەوشاوانەن کە وایان کردووە هەتا خۆشەویستانم کاک دوکتۆر فەریدوون نووری و کاک کەماڵ عەبباسی، کە هەردووکیان خوێندەوار و مامۆستای بواری مێژوون، هەڵمپێچن تاکوو وەرگێڕاوەکەی دوکتۆر موعین بکەمە کوردی. پاش خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی وەرگێڕانەکەی موعین و بەراورد کردنی لەگەڵ وەرگێڕانەکەی بێهفرووزی، پەخشانی سەردەمییانەی دەقی دواییم پتر بە لاوە پەسند بوو، بەڵام پێداگریی دۆستەکانم و چەند شارەزایەکی دیکە، دەقی

وەرگێڕانەکەی موعینی وەکوو سەرچاوەی سەرەکی و یەکەم خستە بەردەستم و بێهفرووزی بوو بە سەرچاوەی دووهەم.

لەگەڵ دەسپێکردنی کاری وەرگێڕان، دەقەکانم پێکدەگرتن و ئاوا هێندێک جیاوازیی ورد و درشتی نێوانیانم بۆ دەرکەوت. پاش تەواو بوونی کارەکە چوومە تاران بۆ دیداری سەیدا مەحموود بێهفرووزی کە پیاوێکی شارەزایە لە بواری وەرگێڕانی بەرهەمی مێژوویی‌دا. پاش باس و ڕاوێژێکی تەسەل، دیسانیش هێندێک لە پرسیارەکانم بێ‌وەڵام مانەوە و گرێیەکان تەواو نەڕەوینەوە. لەسەر جەختی من و ڕێنوێنیی بەڕێزیان دەقی سەرەکیی فەرانسەم وەگیر هێنا و بە کەیف قنجی گەڕامەوە مەهاباد. نووسەر و هاوڕێی بەڕێزم کاک سەید کەماڵ عەبدوڵڵاهی نەیهێشت بۆ دۆزینەوەی کەسێکی فەرانسەزان دابمێنم و خێرایەکی لەگەڵ کاک ڕەحیم مرادزادە کردمی بە ئاشنا کە دەیان ساڵ لە وڵاتی فەرانسە ژیاوە و لێزانی زمانەکەیە. بەپێی ڕێ‌وشوێنێکی دیاریکراو کەوتینە دۆزینی دەقە فارسییەکان و هەڵسەنگاندنی لەگەڵ دەقی سەرەکیی فەرانسە و سەرلەبەری ئەو گرێ‌کوێرانەمان کردنەوە کە بۆ من جێی پرسیار بوون. پاش بڕانەوەی کارەکە، بۆم دەرکەوت کە شێوازی کاری وەرگێڕەکان و مەودای ڕۆژگاری نێوان دوو وەرگێڕانەکە پتر بوونە گرێ لە لام و بەهەڵکەوت لە زانینی مانای ڕستەیەک‌دا بە هەڵە چوون. لە ڕاستی‌دا دەقەکەی موعین زۆر کەم هەڵەی وەرگێڕانی تێدایە، بەڵام بەداخەوە چەند جێگایەکی کورتی دەرهاویشتووە و چەن برگە و ڕستەیەکی لێ زیاد کردووە. بە باری زانستی‌دا ئەمە کارێکی ناپەسندە، چونکە دەنگی نەکردووە و بۆ ئەوەی قسەی نەیەتەوە سەر دەکرا لە پێشەکی یان لە پەراوێزی ئەو شوێنانەدا باسیان بکا و بیاندرکێنێ. لە ڕووی دەقی بێهفرووزی و دەقی فەرانسەوە هەموویان چوونە سەر دۆخی پێشوویان و لە جێی خۆی‌دا

قامکم لەسەر داناون. بە هەڵە چندرانی ساڵەکان لە دەقی موعیندا بەرچاون، بەڵام دەبێ ئێستا لێرەدا گرێیان نەمابێ. لە دەقی بێهفرووزیدا تەنیا برگەیەک لە قەڵەم کەوتووە و ئەویش دەکرێ بە لە بیر چوون دابندرێ و لێرەدا ڕاست کراوەتەوە.

خاڵێکی بەرچاوی کارەکەی موعین دەگەڕێتەوە سەر پێکگرتنی لەگەڵ ئەو دەقەی کە ساڵی ١٩٥٤ پسپۆڕی شوێنەوارناسیی ڕۆژهەڵاتی نیزیک لە زانکۆی کەمبریج خاتوو مارگارێت مون ڕانکین کردوویەتە ئینگلیسی و دیانا کیرکبراید پێیداچۆتەوە و هەڵە و پەڵەی بۆ هەڵگرتۆتەوە و پرۆفسۆر مالۆوان، مامۆستای شوێنەوارناسیی ڕۆژهەڵاتی نیزیک و ئاسیای خۆرنشین پێشەکییەکی بۆ نووسیوە. موعین دەڵێ گیرشمەن کە دیوناس و ئاشنای خۆم بوو، وەرگێڕانە ئینگلسییەکەی بە دڵ نەبوو، چونکە هەڵپاچین و پێوەنانی تێدا بووە و ڕایئەسپاردووە کە دەقەکەی خۆی بکاتە فارسی؛ ئەویش بە گوێی کردووە و تەنیا زۆربەی وێنەکانی کۆتاییی کتێبەکەی لە دەقە ئینگلیسییەکە وەرگرتووە کە ئێمەش بە باشمان زانی و دەرماننەهاویشتن.

ناوی ئەم کتێبە بەپێی دەقی فەرانسە دەبێتە «ئێران لە سەرەتاوە هەتا هاتنی ئیسلام»، بەڵام وەکوو دیارە مەبەست «مێژووی» ئێرانە و بەبێ هێنانی ئەم وشەیە سەردێڕەکە تەم و مژێکی لێ دەنیشێ، هەر بۆیە چوومە سەر ڕێبازی بێهفرووزی و کردمە «مێژووی ئێران لە سەرەتاوە هەتا هاتنی ئیسلام».

زۆربەی ئەو پەراوێزانەی کە موعین و بێهفرووزی نووسیویانن و بە پێویستم زانیون هەڵمنەقرتاندوون و هێناومن و خۆشم لە جێی خۆیدا کۆبەم لە کتێبەکە ناوە یان وشە و ڕستەیەکم زیاد کردووە و خستوومەتە نێو قولاپەوە. لێرەدا چەند کورتەنیشانەیەک وەبەرچاو دێن کە بریتین لە:

١- پیتی «م»، بۆ «محەممەد موعین».

٢- پیتی «ب»، بۆ «مەحموود بێهفرووزی».

٣- پیتی «و»، بۆ «وەرگێڕ».

٤- پیتی «ق»، بۆ وێنەی« قەڵەمکێش».

٥- پیتی «و»، بۆ «وێنە».

لە کۆتایی‌دا دیسان دەگەڕێمەوە سەر زەحمەتەکانی کاک ڕەحیم مرادزادە کە دەورێکی دیاری لە پتەوتربوونی دەقەکەدا گێڕاوە و خۆم بە ئەمەگداری دەزانم. خاتوو پەروین پیرەبابی، کاک ئاوات حەکیم‌زادە و کاک هەباس چراغ‌مەننان وەک زۆر جاران دەسباریان لـەگـەڵ گـرتـم کـە پـڕ بـە دڵ سپاسیان دەکـەم. ئەرکی کاروبـاری چـاپی کتێبەکـە خرایـە سـەر شـانی کـاک کەیوومـەرس کەرباسـی و ئەویش خێرایەکی ڕاپەڕاند و جێگای پێزانینە.

سەلاحەددین ئاشتی

١٣٩٢/٤/٢٥ی هەتاوی ٢٠١٣/٧/١٦ی زایینی

# پێشەکی

دۆزینەوە کارێکی دڵبزوێنە

بەڵام گەڕان بە شوێن دۆزینەوەدا دڵبزوێنترە

*ئێدوارد هێریۆ*

مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە کە هێنانە بەرباس و ناسینی ڕۆژگارانی کۆن و شارستانییەت و مێژووی ئێرانە، لە نێو تان‌وپۆی جوغرافیایی‌دا زۆر بە دەگمەن سنووری باڵی خۆرنشینی بانووی ئێرانی بەزاندووە. ئەم بانووە لە خۆرهەڵاتەوە دەگاتە بناری چیاکانی دەورووپشتی سێند، بەڵام جێی خۆیەتی بزانین کە ئەم بەشەی خۆرهەڵات، هەمیشە نەکەوتۆتە نێو بازنەی دەسەڵاتی پادشایەتیی ئێرانەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ خوێنەر لەم بەرهەمەدا سەربوردەی مادەکان و بەتایبەت پارسەکانی لێ ڕوون دەبێتەوە کە بوونە بناغەدانەری یەکەمین ئیمپراتۆریی جیهانی و وەکوو گرینگترین لقی تۆرەمەکانی ئاریایی کە ئێرانین خۆیان نواندووە. لە سەردەمی کۆن و کەونارادا شوێنی ژیانی ئەو نەتەوە ڕەسەنانەی ئێرانی کە بەشێک بوون لە جەماوەری گەورەماڵی هیندوئورووپایی یەکجار بەربڵاو بوو. ئێرانی لە ڕووباری فوراتەوە هەتا ئاسیای خۆرهەڵات و ناوەندی و تەنانەت سنوورەکانی چین بنەیان داکوتابوو. هەروەها لە باشووری ڕووسیاوە تا دەگاتە زارکی ڕووباری سێند نیشتەجێ ببوون. پارسەکان و مادەکان، سەگزییەکان و سەرمەتەکان، خارەزمییەکان، سۆغدییەکان و بەلخییەکان،

کووشانییەکان و سکاییەکان، هەفتالییەکان و حەشامەتی نێو شینکایەتی و ئاوەدانییەکانی تورکستانی چین، هەموویان لەو توخم و تۆرەمانەی ئێرانی بوون کە چەندین جار توانیبوویان حکوومەتی خۆیان دامەزرێنن. ئەمانە سەرلەبەریان بوونە خاوەنی شارستانییەت و هونەری خۆیان و کەلاڵەیان بۆ دارشت و پێیان‌گەیاند. ئەم نەتەوانەی ئێرانی کە بەشێکیان بنەگر و بەشێکیان کۆچەر و دەوارنشین بوون، دنیای کۆنیان کردبوو بە سێ کوت و خۆیان لە بەشی نێوەراست داسەکنیبوون و بەم شێوەیە توانیبوویان کە باڵی خۆرنشین، یانی شوێنی شارستانییەکانی سامی و «یۆنانی ـ رۆمی» لەگەڵ خۆرهەڵاتی دوور کە دەبێتە چین و هیند لە یەکتر داببرن. کەوایە هەر لەرێوە دەوری گرینگی نەتەوەکانی ئێرانیمان بۆ دەردەکەوێ کە چۆن بوونە پردی پەیوەندیی نێوان کولتووری خۆرنشین و خۆرهەڵات و لە مەیدانی گەشە و پەرەی شارستانییەتی جیهانیدا شوێن‌پەنجەیان دیارە.

لاپەرەکانی داهاتوو دەبنە ئاوێنەی مێژووی لەمێژینەی ئێران بە واتای تایبەت، یانی مێژووی پارسەکان کە دەورێکی گرینگیان لە ژیانی نەتەوەکانی ئێرانیدا گێراوە. بێ‌گومان کەندەوکۆژەی بەردەوامی شوێنەوارناسی، رۆژایەک هەل بۆ نووسینەوەی دیرۆکی نەتەوەکانی دیکەی ئێرانیش دەرەخسێنێ کە هەموویان دانیشتووی شوێنێک بوون لەو خاکە بەربڵاودا و رۆژهەڵاتناسێکی گەورە بە «ئێرانی دەرەوە»ی ناودێر کردووە.

شووش، رۆمەن گیرشمەن

# دەسپێک

## بارودۆخی سروشتیی ئێران

بانووی ئێران بریتییە لە سێگۆشەیەکی نێوان دوو کەند و قووڵان، کە یەکیان دەبێتە کەنداوی فارس لە باشوور و دەریای خەزەر لە باکوور (ق١).
ئەم بانووە وەکوو پردێکی پەیوەندی وایە لە نێوان ئاسیای ناوەندی و ئاسیای نیزیکدا و کۆمەڵێک هەوراز و لێژی بەدی هێناوە کە ئاسیای نێوخۆ بە بانووی ئاسیای بچووک و ئورووپاوە دەبەستێتەوە. ئەم بارودۆخە سروشتییە، دەکەوێتە گێڕانەوەی سەربوردەی دەوری دیرۆکیی بانووی ئێران کە لە ماوەی هەزاران ساڵی مێژووی مرۆڤایەتی‌دا گێڕاویەتی.

کۆمەڵە شاخێک لە دەوری ئەم سێگۆشەیە هاڵاون و بە گەڕانگەڕی جەرگەی‌دا تێوەسووڕاون کە سەردەمانی پێشوو کۆنەکەند و دەریا بووە و ئەمڕۆکە پێدەشت و بیروونێکی قاقڕ و ڕووتەن و هەڵچڕاوە. چیاکانی باڵی خۆرنشین یان زنجیرە چیای زاگرۆس لە باکووری خۆرنشینەوە بەرەو باشووری خۆرهەڵات ڕاکشاون و پتر لە ١٠٠٠ کیلۆمیتر پەلیان هاویشتووە و ٢٠٠ کیلۆمیترێک پان ڕاکەوتوون. ئەم زنجیرە کێوانە ١٠٠٠ تا ١٧٠٠ گەز




ق١- نەخشەی هەوراز و لێژەکانی بانووی ئێران




ق٢- ڕووبەری بانووی ئێران لە بەغداوە هەتا دەگاتە دەریای خەزەر

پێهەڵاچوون و بە خوارەکەوپێچەکە و شانەوشان و بە کۆمەڵ پاڵیان بە یەکەوە داوە و پڕن لە دۆڵی درێژی ٥٠ تا ١٠٠ کیلۆمیتری و بە باری بەرینایی‌دا ١٠ تا ٢٠ کیلۆمیترێک خۆیان کێشاوەتەوە (ق ٢). مێرگ و لەوەڕگەی بەزرەبناری ئەم شاخە بڵیندانە پاشماوەی لێرەواری چڕیان لێ بەدی دەکرێ و بە داربەڕوو، دارگوێز، بادامی کێوی، پستە و دەوەن شین هەڵگەڕاون. کاتێک زەوی بەرەو دەرە و دەشتی بان هەورازان ڕێ دادەگرێ، ڕەز و هەنار و هەنجیر ڕادەسێن و هەڵدەچن. بڵێسەی گەرمای هاوینان، تین بۆ مەڕداری نێو شیو و دۆڵی نشێوان دێنێ و بەرەو لەوەڕگەی هاوینەهەوارانیان دەبا و لە بڵێندان مێگەلی بزن و مەڕ و ڕەوەی ئەسپیان تێر و دابین دەبێ.

بەم شێوەیە بەشێکی بەرچاوی دانیشتووان سەر وەبەر ژیانی دەوارنشینی دێنن کە سروشت و کەش‌وهەوا بە سەری‌دا سەپاندوون. لە جەرگەی زنجیرە چیای زاگرۆس‌دا، تیرەشانێکی تیژ دادەبڕێ و بەرەو خۆرنشین رادەخوشێ و خۆی بە دەشتی دووچۆمان‌دا دەکا و قۆرت و پێچێک دەخاتە رووباری دیجلەوە و لەو شوێنەدا لە رووباری فوراتی نیزیک دەکاتەوە. ئەم تیفەرە و تیرەشانە دەڵێی کێردێکە و لە سەرانەوە دەشتەکە چاوترسێن دەکا. هەر لێرەوە، واتە لە «لورستان»ی ئەمڕۆوە بوو کە «کاسی»یەکان لە هەزارەی دووەمی پێش‌زایین‌دا، پەلاماری بابلیان دا و بۆ ماوەی زیاتر لە پێنج سەدان دەسەڵاتیان بە سەری‌دا شکایەوە.

باڵی باکووری ئەم سێ‌گۆشەیە بە زنجیرە چیای « ئەلبورز» دیاری کراوە کە لووتکەی هەرە بەرزی دەبێتە کێوی دەماوەند و سەری دەگاتە ٥٦٠٠ گەز. ئەم زنجیرە چیایەی کە دەڵێی ماڵی‌کەوانە، شان‌بەشانی لێواری باکووری دەریای خەزەر سەری پێکەوە ناوە و بۆتە شوورەیەکی بەرز و باریک کە مەڵبەندی پڕ گژوگیا و لێرەواری کەناری دەریا لە مەڵبەندی چۆل و بیابانی ناوەندی دادەبڕێنێ (ق٣). کلکەی باڵی خۆرنشینی زنجیرە چیای ئەلبورز دەگاتە ئازەربایجانی ئێران کە گۆلی سوێری ورمێ [واتە بەحری خوێیە] کەوتۆتە جەرگەی. ئەم مەڵبەندە پڕ جەماوەرترین ناوچەی ئێرانە و لە دەرە و دەشتی بەرێژەوی‌دا گەنم، هەرزن، پەمۆ، برینج، تووتن، گەرچەک، کاڵەک و شووتی رەنێو دێ.




ق٣- ڕووبەری بانووی ئێران لە کەنداوی فارسەوە هەتا دەگاتە دەریای خەزەر(کاسپییەن)

ئازەربایجان کە پێی دەڵێن «بەرزەکی مادی»، بۆ باری هاتوچۆ یەکێکە لە ناوچە بێگرێوگۆڵەکانی وڵات و ڕێوبان لە باڵی باکووری خۆرنشین و باکوور و باکووری خۆرهەڵاتەوە ڕووی تێدەکەن. ئەم هەرێمە کە بە یەکێک لە دوو تلّیشەکانی نێو شاخوداخ و کۆسارانی ئێران دادەندرێ، لە درێژاییی مێژوودا چاوی کەوتووە بە هاتن و نیشتەجێبوونی مادەکان، پارسەکان، کوردەکان، مەغۆلەکان و تورکانی تاتار لە دۆڵ و دەشتی دەوروبەری گۆلی ورمێ. زنجیرەی پادشایانی ماد و پارس لەوێوە بووژەڵە بوون و کەوتوونە سەر پێ. هەروەها لەم ناوچەیە کە وەکوو دەروازەی ئێران وایە زنجیرەی پادشایانی پارس بۆ ماوەی سەدان ساڵ کەوتوونە پاراستنی و بوونە بەرهەڵست و بەرگێرەوەی گەلێک لەو پەلاماردەرانەی کە لە پێدەشتەکانی باشووری ڕووسیاوە دەهاتن و بە خاکی قەفقازدا تێپەڕیبوون. وەکوو دیارە ئێستاش پاشماوە و هەرەسی شوورە و سەنگەر و قایمەلانی ئەو سەردەمە هەر ماون.

تێکەڵبوونی توخم و تۆرەمان و باڵئەنگاوتنی کەش‌وهەوای تەڕ و تووش و کەچی بە گیانخۆشی، وێڕای خاکی بەپیت و ڕێژەو، ڕەگەزێکی زەحمەتکێش و بەهێز و گوڕی پەروەراندووە کە زۆریان یاریدەی گەشە و نەشە و بەختەوەربوونی ئەم هەرێمە کەونارایە داوە.

لە باڵی خۆرهەڵاتەوە، زنجیرە چیای ئەلبورز شاخەکانی خوراسانی لێدەکەوێتەوە کە هێندە بەرز نین و هات‌وچۆیان پێدا بێگرێیە و پڕن لە خڕ و دۆڵی یەکجار بەڕێژەو کە گەنم، جۆ، برینج، پەمۆ، خاشخاش و ترێیان لێهەڵدەگیرێ. ئەم هەمارەی دەغڵودان و بژیوەی ئێران بەپێی هەل و هەڵکەوتی جوغرافیایی بە دووهەمین بازگەی تێپەڕین بۆ بانووی ئێران دادەندرێ. شەپۆلی پەلاماردەرانی پێدەشتەکانی ئاسیای نێوەڕاست کە هەزاران کیلۆمیتری بەرەو قۆڵی باکوور و خۆرنشین و خۆرهەڵاتی دادەگرت، لەم ڕەوگەیەوە گەیشتۆتە بانووی ئێران. خوراسانیش وەکوو ئازەربایجان چوارڕێیانی نەتەوەکانە و هەتا کلکەی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی کەوتۆتە بەر هێرشی تاڵان‌وبڕۆی تورکمانان. دەرەی «ئەترەک» و دەشتی «گورگان» لە نێوان دەریای خەزەر و زنجیرە چیای ئەلبورزدا بوونە ئاوەدانی و نیشمەنگای سروشتیی کۆچەرانی بەرەو ئێران. پادشایانی ساسانی بە ئامانجی بەرەنگاربوونەوەی خەنیمان، لەوێ بە خشتی سوور دیوارێکی چەندین کیلۆمیترییان ڕاکێشاوە و هێشتاش شوێنەواری هەر ماوە. لەم مەڵبەندەی باکووری خۆرهەڵاتی ئێران چەند بنەماڵەیەکی پادشایەتی وەکوو ئەشکانییەکان، سەفەوییەکان و قاجارەکان پێگەیشتوون.[1]

---

١ـ سەبارەت بە ئەشکانییەکان و قاجارەکان قسەی لەسەر نییە. بەڵام وادیارە پێوەری نووسەر بۆ سەفەوییەکان تەنیا زمانی تورکییە. وەکوو دیارە سەفەوییەکان لە باکووری خۆرنشینی ئێرانەوە کوانووی ژیان و [دەسەڵاتیان] داگیرساندووە (گۆڤاری کۆلێژی ئەدەبیات، تاران ١:٣، ل ٧٨، دوکتۆر ئیحسان یارشاتر).م.

زنجیرە چیای دەوراندەوری سێگۆشەی ئێران بە باسک و بەندەنی باڵی باشووری دادەکووژێ و دەبڕێتەوە کە پێی دەڵێن چیای مەکران و دوو ڕەوگەی لێدەبێتەوە کە بریتین لە: ڕێگای «بەندەرعەبباس» کە لە پێشوودا لەنگەرگایەکی ئاوەدانی دەریای عومان بووە و ئەوی دیکەیان دەبێتە ڕێگای بەرەو ڕۆژهەڵات کە دەچێتە بەلووچستان و کووەیتەی پاکستان.

لە جەرگەی بانووی ئێراندا کە دوو زنجیرە چیای پێدا تێدەپەڕێ، بە قووڵداچوون و ڕۆچوونێک بەدی دەکرێ کە ویشکارۆترین ناوچەی دنیایە و دەبێتە بیابانی «کەویری نمەک» لە باکوور و بیابانی «کەویری لووت» لە باشوور. بەشی یەکەم بریتییە لە زنجیرەیەک دەر و دەشتی خۆڵەپۆتینە و لمستانی شۆرەکات کە هیچ شتێکی لێ شین نابێ و هیچ بوونەوەرێکی لێ ناژی. لە چەند شوێنێکی دەگمەنی کەند و قووڵان کە خەستایی شۆرەکات کەمترە، چەماوەری دەوری شینکاوان بنەیان داکوتاوە و کراون بە جێژیان. بەپێچەوانە شۆرەکاتی «لووت» ناوچەیەکی ویشک و قاقڕی ڕووتە و ئەو گەڕیدە و دۆزەرەوانەی وێراویانە بەم چۆلستانە میوانجزێنەدا تێپەڕن دەڵێن بیابانە بەرپانەکانی ئاسیای ناوەندی، بۆ وێنە شوێنێکی وەکوو«گۆبی» لەچاو ئەم خێزەڵانە چۆلەوارە دەڵێی جێگایەکی ئاوەدانی بەرێژەوە.

جا بەپێی ئەم باسەی سەرەوە، ژیان لە بانووی ئێران تەنیا دەتوانێ لە خەمرک و بناری زنجیرە چیا بەرزەکان پەرە بگرێ؛ بەڵام لە دەشتە بەرینەکانی دەر و ژووری ئێرانیشدا ژیان پێشکەوتنێکی زۆری بە خۆیەوە دیتووە. گرینگترینی ئەو پێدەشتانە، دەشتی «خووزستان»ە و کەوتۆتە باشووری خۆرنشین و هەمان «سووزیان»ی کۆنە و بە باری هەل و هەڵکەوتی جوغرافیاییشدا هەر دەبێتە درێژبۆوەی دەشتی دووچۆمان. ئەم دەشتە کە بە

سینەی زنجیرە چیای زاگرۆس‌دا ڕۆچووە، ئەگەر لێی ورد دەبییەوە دەبینی هاودەقە لەگەڵ گۆشەی دیوی دەرەوەی شاخستانەکانی لوڕستان، واتە پشتکۆ. سووزیان [سووزیانا] ناوچەیەکە کە لە کۆنەوە ڕووی کردۆتە شارستانییەت و توانیویەتی شوێن‌پەنجەی بخاتە سەر هۆزانی چیانشینی سەرەتایی و ماڵبەکۆڵ و نیوەکۆچەری دەوروبەری خۆی. ئەو کاتەی کە سنووری سیاسیی ئیمپراتۆریی ئێران لە لای خۆرنشینی زاگرۆسەوە پەل‌وپۆی هاویشتە دووران، هەر لەم دەشتەدا بوو کە بناغەی «شووش»ی پایتەخت و شاری هەرە گەورەی داندرا و بوو بە ناوەندی دام‌ودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و توانی بە سووک و هاسانی ڕایەڵەی پەیوەندی لەگەڵ دووڕچۆمان و ئاسیای بچووک دامەزرێنێ.

کۆمەڵێک دەشتی دیکەش کەوتوونە دەرەوەی زنجیرە چیاکانی ئێران و شان‌بەشانی دەریای خەزەر سینگیان ڕاخستووە. شاخە بەرزەکانی تەنیشتاوتەنیشتی دەریا دەبنە خاوەکەرەوەی ڕەوتی تێپەڕینی گەواڵەهەوران و بارینی بارانێکی زۆر و تێراوبوونی زەوی‌وزاری باریکە و یەکجار بەرپێژەوی ناوچەکە. ئێرە کە مەڵبەندێکی پرئاوی ئێرانە، بە لێرەوار و قامیشەڵان و زۆنگاوان تەندراوە و برینج، لۆکە، توتن، چا، نەیشەکەر، نارنج، لیمۆ، توو، هەنجیر و هەناری لێ بەرهەم دێ و نیزیکەی سێ‌یەکی بژیوی جەماوەری وڵاتی لێ کۆ دەکرێتەوە؛ بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ دیسانیش دەشتەکانی دەرەوەی بانووی ئێران دەورێکی پلە دوویان لە پەرە و گەشەی شارستانییەتی ئەم وڵاتەدا گێڕاوە. جا هەر بۆیە لە دێرزەمانەوە ئەو شارستانییەتە چڕ بۆتەوە لە نێو ئاوەدانییە پرش‌وبڵاوەکانی ئامێزی زنجیرە چیای گەڕانگەری ئێران‌دا کە هەوری ئاوس و بزێ و باراناوی گل دەدەنەوە. لێرەدا دەبێ بیخەینەوە یاد کە جەرگەی ئەم وڵاتە سەرلەبەری ویشکارۆ و بیابانە و تەنیا ئەو شوێنانەی بە کەلکی

کشتوکاڵ دێن کە بە ئاوی کەرێز و چاڵاو و ئاوداشتنی دەسکردی مرۆڤ پاراو دەکرێن و دەکەونە کۆنەبەستێنان و گەلێک بەرێژەون. لەبەر جیاوازبوونی کەشوهەوا، واتە سەرمای سەختی زستان و گەرمای بەتینی هاوین، لە هەر جێگایەکی ئادەمیزاد بتوانێ ئاوی پاراوی ئەم زەوی‌وزارانە دابین بکا، بەرهەمێکی زۆری بۆ ڕەنێو دێ.

هەموو سەردەمێک لە بانووی ئێراندا دابین‌کرانی ئاو بۆتە گرێیەک بۆ درێژەی ژیان. لە ڕۆژگارانی بەرلە دیرۆکەوە لەم وڵاتەدا زەوی‌وزار بە شێوەیەکی دەسکرد پاراو دەکران و لە چاخی هەخامەنشی‌دا ڕایەڵەی کەرێزان پەل‌وپۆیان بێروبەوی‌دا ڕاکێشابوو. تەنانەت ئەمرۆش لە هێندێک ناوچەی بەربناران دەکەونە هەڵێنجانی ئەو ئاوانەی دەیان گەز بە سینەی زەوی‌دا ڕۆچوون و ڕایاندەگوێزن بۆ ٣٠ تا ٤٠ کیلۆمیتر ئەولاتر. وەکوو دیارە هەمووساڵێک هەزاران کرێکار و [جووتیار] دەکەونە دەردان و خاوێن‌کردنەوەی کەرێزان و جۆماڵی جۆگان و لێدانی چاڵاو و کەرێزی تازە. لە پیت و بەرەکەتی ئەم ئاوانە و بارانی بەرەحمەتی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و ئەلبورز، کۆمەڵێک ئاوەدانی و زەوی‌وزاری کشتوکاڵی و شارەدێ وەکوو دەنکە تەسبێحی پساو لێرولەوێ خۆ دەنوێنن. تێکڕای پایتەختەکانی ئێران لە زەمانی گوورانی یەکەم پادشایەتی لە هەرێمی ماد، کەوتوونە لێواری بیابان و سەر ڕەوگەی دوو شارێی نێوخۆ کە بە بناری زنجیرە چیا مەزنەکانی زاگرۆس و ئەلبورزدا تێپەڕیون. شارەکانی هەگمەتانە [هەمەدان = هەگمادانە]، قەزوێن، تاران، ڕەی، سەتدەروازە (دامغان) و هەرات [هیرات] کەوتوونە سەر ئەو ڕێگا سەربازی و بازرگانییەی لە

خۆرنشینەوە ڕووو دەکاتە خۆرهەڵات. هەروەها شارەکانی ئیسفەهان، پاسارگاد[١]، ئیستەخر، تەختیجەمشید[٢] و شیراز لەسەر شارێی باشووری هەڵکەوتوون.

ئەم مەبەستە کە سەبارەت بە چاخ و خولی مێژوویی ئێران ئۆباڵی لەسەر کێشراوە و پشتئەستوورە بە هەڵکەوتی جوغرافیایی ئەم وڵاتە، بۆ سەردەمانی بەرلە مێژووش ڕاستە، چونکە توێژینەوە تازەکانی شوێنەوارناسی دەریخستووە کە مرۆڤی چاخی کوچک هەر ئەو کاتەی لە چیاوە دابەزیوە و بنەی لە پێدەشتان داکوتاوە، لەسەر هەمان ڕەوگە کەوانییەی قەراغ «کەویری نمەک» نیشتەجێ بووە. چەند شارێکی وەکوو کاشان (ناوچەی سیێلکە)[٣]، قوم، ڕەی و دامغان ئەو شوێنانەن کە هەتا ئێستا وەکوو ناوەندی بنەگربوونی مرۆڤ لەم ڕەوگەیەدا ناسراون و پەرستگاکانی وڵاتیش هەر کەوتوونە سەر ئەو ڕێوبان و هێڵە سروشتییانەی یەکتر دەگرنەوە و بە یەکەوە گرێ دراون. ئەوەی ڕاستی بێ تەنانەت ئەمرۆش دوو شاری پیرۆزی ئێران، یانی مەشەد و قوم، یەکیان کەوتۆتە سەر ڕێگای خۆرنشین ـ خۆراوا و ئەوی دیکەیان لەسەر ڕێوبانی باکووری ـ باشووری چەقیوە.

وەکوو دیارە لە ڕاستیدا ئێران وڵاتێکی کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییە و پڕە لە کانگای هەمەڕەنگی دەوڵەمەند. لە هەزارەی سێهەمی پێشزایینەوە بەردی مەرمەڕی سپی و بەردی مەرمەڕی ئاسایی کانگایان لێ داخراوە و پێداویستییەکانی میرانی سۆمێرییان دابین کردوون. هەروەها کاریتە و کۆڵەکە و ئاڵووداری کۆشک و بارگای ئەم میرانە لە لێرەوارەکانی ئێرانەوە دەنێردران کە ئەو کاتی هەر شین دەچوون و کێو و تەلانیان داپۆشیبوو. نابێ لە بیرمان بچێ

---

١ـ ڕەنگە لە ڕاستیدا « پارسەگەد» یان « پارسەگەرد» [یا پارسەگرد.و] بووبێ.م.

٢ـ لە سەردەمی کۆندا ناوی پارسە بووە.م.

٣ـ نووسراوە سیەلک. بەڵام زۆر وێدەچێ سیێلکە یان سیێلەکە بێ. و.

کە ئەم کێوانە ئێستا داڕووتاون و کەچەڵە بوون. کاری دەرهێنانی بەردی یاقیق و پیرۆزە و لاژوەرد هەر لە کۆنەوە لێرە برەوی بووە. ئاسن، مس، قەلایی و قورقوشم سەرنجی ئاشوورییە سەرکەوتووەکانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشابوو. هەردک بناری زاگرۆس کانگای بەردەگەچە و سەرینچاوەی نەوتە کە لە سەردەمی هێرۆدتدا وەکوو بەرهەمێک ناسیبوویان و لەم پەنجا ساڵەی دواییدا کەوتوونە هەڵێنجانی.[1]

ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەرچی ئێران بەڕواڵەت هەژارە، بەڵام خاوەنی کان و پاشەکەوتێکی بێژمارە کە تازە کانگایان لێ داخستوون و خەریکن دەریاندێنن. ئەگەرچی ئەم وڵاتە کەوتۆتە باوەشی شاخوداخەوە، بەڵام لە ڕاستیدا گەڕانگەڕی کراوەیە و دەگاتەوە دەشتەکانی دووچۆمان و ڕووسیا و خاکی هیندووستان و کەنداوی فارس و [دەریای عومان]. ئێران ناوەندی ئەو بازگە و ڕێبازە گەورانەی هاتوچۆیە کە خۆرهەڵات و خۆرنشین پێکەوە دەبەستێتەوە و کۆنترین ڕێگای بازرگانی کە «ڕێگای ئاوریشم»ە بە ویدا تێپەڕیوە، هەر بۆیە بۆتە شوێنی تراتێنی پەلاماردەرانیش. ئێران ئەگەرچی وڵاتێکی شاخاوی و کێوپارەیە و بە لەگێرانەهاتوو خۆی دەنوێنێ و بە باری سروشتیدا چیا و چۆل و هەوراز و نشێوە و شەڕ و بەرەنگاری تێیدا بە شێوەیەکی بەرچاو کەند و کۆسپی وەبەر دێ، بەڵام دیسانیش گەلێک جار گیراوە و بە سەریدا زاڵ بوون. هەر ئەم ڕەوتە بە شێوەیەکی تەکولۆ بۆتە هۆی بەدی هاتنی چەرخ و خولی داڕووخان و شوورەیی یان هەستانەوە و شانازی، چونکە کۆمەڵانی جەماوەری هۆز و نەتەوەکانی ئەگەرچی بە جودا و لێرولەوێ بە کشتوکاڵەوە خافڵاون، بەڵام خاوەنی هێز و بڕشتی پێکهێنانی شارستانییەت بوون. پەرەی

---

١ـ بەپێی ڕێکەوتی نووسرانی دەقی کتێبەکەیە لە ساڵی ١٩٥١دا.و.

**بیروبۆچوون و ڕێوشوێنی ژیان و گەشەی دینی و هونەری کە لە ئێراندا بەدی هاتووە، توانیویەتی شەقڵی شوێنپەنجەی خۆی لەسەر شارستانییەتی وڵاتانی دەرەوە بەجێبهێڵێ.**

***

## بەشی ١

# بەرلە مێژوو

## ئادەمیزادی ئەشکەوتنشین

لێکۆڵینەوە تازەکانی زەوی‌ناسی دەریخستووە کە ئەو زەمانەی بەشی هەرە زۆری ئورووپا کەوتۆتە ژێر بارستی سەهۆڵ، بانووی ئێران بە چاخی باران‌دا تێپەڕیوە و تەنانەت دەر و دەشتە بەرزەکانیشی ئاویان بە سەر کشاوە. جەرگەی بانووی ئێران کە ئەمڕۆکە بیابانێکی بەربڵاوی شۆرەکاتە، لەو سەردەمی‌دا زریبارێکی گەورە بووە کە کۆمەڵێک ڕووبار لە چیا بەرزەکانەوە تێی‌ڕژاون. پاشماوەی گوێ‌ماسیلە و شەیتانۆکە کە نەک تەنیا لە بیابانان بەڵکوو لە دۆڵە بڵێندەکانیش وەبەرچاو دێن، دەبنە ئاوێنەی باڵانوێنی چەند هەزار ساڵەی ئەم وڵاتە لە چاخی بەرلە دایک‌بوونی مەسیح‌دا.

لە ڕۆژگارێک‌دا کە دەگەڕێتەوە بۆ دە تا پازدە هەزار ساڵ بەرلەزایین، وردەوردە کەش‌وهەوا دەستی کردووە بە گۆڕان. چاخی بارانی تێپەڕیوە و وشکەچاخ و باران‌بڕان جێی گرتۆتەوە و هێشتاش درێژەی هەیە. کەم‌بوونەوەی باران لە لایەک و ئاستی بەرزی دەریا و دەریاچەکانی نێوخۆ لە لایەکی دیکەوە،

تیژ تێپەڕینی ئەو ڕووبار و جۆبارانەیان خاو کردەوە کە لووزەویان بۆ بەستبوون. ڕەوتی تێپەڕینی چۆماوان قوڕ و لیتەی لەگەڵ خۆی دەبرد و لە ئاوڕێژگان دەیخستە سەر یەکتر و بەرەبەرە پەڵە زەویی ئاوماڵکان سەریان قوت دەکردەوە و لە ئاو دەکشانەوە و دەبوونە مەودای نێوان دەشت و دۆڵی داهاتوو لەگەڵ کێوەکان.

لەم چاخەدا، ئادەمیزادی بەرلە مێژوو کە زۆربەی لە بانووی ئێراندا دەژیا، پەنای بردە بەر داڵدەی ئەو کون و کەلەبەرانەی کە لە قەدپاڵی لێرەواری چڕ بەدی هاتبوون و بە لک و پۆپی داران داپۆشرابوون. هەروەها زۆر جاران یەکێک لەو ئەشکەوت و پەسیوەبەردە بەربڵاوانەی هەڵدەبژارد کە زۆربەیان بەستێنی کۆنە ڕووباری ژێر زەوی بوون.

ئێمە بەهاری ساڵی ١٩٤٩، لە جەنگەی هەڵکەندن و پشکنینی ئەشکەوتێکدا لە ئێران، بۆ یەکەم جار شوێنەواری ژیانی مرۆڤی ئەو چاخەمان دۆزییەوە. ئەم ئەشکەوتە کەوتۆتە « تەنگەی پابدا»ی چیاکانی ناوچەی بەختیاری لە باکووری خۆرهەڵاتی شووشتەر. لێرە مرۆڤ بۆ دابینی بژیوی خۆی ڕاوی کردووە و بۆ وەدی هێنانی ئامانجی، فێڵوفرتی خستۆتە پێشەوەی دەسەڵات و دەستبزاوتنی. ئەو دەیزانی کار بە چەکوچەبەردینە و تەورەبەردینەیەکیش بکا کە لە دەسکێکی دارینی سەر قەڵەشاوەی ترینجاندبوو. تەواوی ئەمانە کۆمەڵێک ئامرازی سەرەتایین کە هێندیک لێک و لووس کراون (و١). ئامرازی وەکوو درێشە کە لە یەسکی گیانلەبەران ساز دەکران، زۆر لە دەسکاری بەردین کەمتر باو بوون، بەڵام ئادەمیزاد لەو کاتەدا چەشنێک دەفری قوڕینی نالەباری نیوەکاڵی هێنابوویە بەرکار و لە بنەبانی چاخی ئەشکەوتنشینیدا ئەوەندەیان دووکەڵ لێ نیشتبوو کە زۆر چاک ڕەشهەڵگەڕابوون. ئەم جۆرە دەفرانە لەگەڵ کۆنترین شوێنەواری

ژیانی مرۆڤی دەشتەکیش دیتراونەوە و بە دیاردەیەکی گرینگی نێوان ئەم دوو قۆناخانەی نیشتەجێبوون دادەندرێ.

لەم کۆمەڵە کاڵ و نەکوڵیوەدا چەند ئەرکێکی تایبەت خرابوویە ئەستۆی ژنانەوە کە بریتی بوون لە پاراستنی ئاورێک کە ڕەنگە خۆیان دایانهێنابێ و سازکردنی دەفری سواڵینە. ژنی بەرلە مێژوو دەبوو کوتەکێک بە دەستەوە بگرێ و بە چیا و نسارانەدا بخولێتەوە و بنج و پنجی شینکە و ڕووەکی پێبژیو هەڵکەنێ و بەری داری کێویلە بچنێتەوە. ناسینی گژوگیا و خۆڕسکان و جەنگەی شینبوونیان و ئەو دەنک و تۆوانەی کە کۆیان دەکردنەوە، ئاکامی بینینی دوور و درێژ و بێپسانەوە بوون کە بەرەو تاقی کردنەوەی چاندن و کشتوکاڵ هانی دان. یەکەم هەنگاوی تێکۆشەرانەی ژن لە بابەت کشتوکاڵەوە دەگەڕێتەوە بۆ چاندنی تۆو لە نێو زەویوزاری ئاوماڵک و کۆنە بەستێنان. جا لەو دەمەدا کە پیاو تۆزە پێشکەوتنێکی بە خۆیەوە دیتبوو، ژن لە چاخی نوێکوچکیدا کە سەر بە ڕۆژگاری ژیانی نێو ئەشکەوتە، وێڕای دەسپێکردنی کشتوکاڵی بەرایی، کۆمەڵێک داهێنانی هێنایە ئاراوە. هەر بۆیە وادیارە دەبێ چەشنێک بێپارسەنگی لە نێوان کار و ئەرکی ژن و پیاودا بەدی هاتبێ و ڕەنگە هەر ئەم مەبەستە بووبێتە بنەمای پێکهاتە و قەوارەی هێندێک لە کۆمەڵانی سەرەتایی کە ژن بە سەر پیاواندا ڕاشکاون و «مێوەجاخی» ڕەنگی داوەتەوە. لە نێو کۆمەڵانی «مێوەجاخی»دا، بەتایبەت ئەوانەی کە لەسەر ڕەوتی «فرەمێردی» دەڕۆن، ژن کاروباری هۆز بەڕێوە دەبا و دەگاتە پلەی پێشەوایەتیی دینی. زنجیرەی دانەبڕاوی بنەماڵە لەسەر باری جێنشینایەتیی ژنان دەسووڕێ و خوێنی پاک و پالاوتەی هۆز لە ڕێی ژنانەوە ڕادەگوێزرێ. لە درێژەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم ڕەوتەی مێوەجاخی یەکێکە لە بنەماکانی تایبەت بە دانیشتووانی سەرەکیی

بانووی ئێران و زۆر دواتر خزیوەتە نێو کولتووری سەرکەوتووانی ئاریایی و کردوویانەتە باو.

## یەکەمین دانیشتووانی پێدەشتان

ویشــکبوونی پــەرەگری دەرە و دۆڵ و لاپــاڵان کــە ئاکــامی داهاتنـــی ویشکەچاخی و بێئاوی بوو، گۆڕانێکی قووڵی لە هەلومەرجی ژیانی مرۆڤدا بەدی هێنا. زرێباری هەراوی ناوەندی، بچووک بۆوە و قوڕ و لیتەی ئاوبردەی کـەنارەکانی کـە ڕووبـار لەگـەڵ خۆیـان هێنابوویـانن، زەمینـی بـەرپێژەویان لێکەوتـەوە و بوونـە مێـرگ و مێرغـوزاری زەمەنـد و زەنـوێر. ئـەو کێـوی و بوونەوەرانەی کە لە چیاکان دەژیان بەرەو لەوەڕگا تازەکان داگەڕان و مرۆڤ کە بە گۆشتی نێچیران بەرێدەچوو کەوتـە پەیکـەردەیان و لـە پێدەشـتان بنـەی داکوتـا. لـەم چاخـەوە کـە مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ دەوروبـەری سـەدەی پێنجـەمی پێشزایـین، دەکـرێ بێدابـران بکەوینـە پێوشـوێنی ئـەو گەشـە و پێشکەوتەی کە لە ژیـان و کولتـووری شارسـتانییەتی مرۆڤی بـانووی ئێراندا بـەدی هـات. ئـەم شارسـتانییەتە بـەپێی هەلومـەرجی جێژیـان کەوتۆتـە ژێـر بانـدۆری بـارودۆخی سروشـتیی زەویوزار، کـەشوهـەوا، پەیوەنـدی لەگـەڵ دراوسێیان و لێشاوی هێرش و کۆڕەوی تیرە و هۆزان؛ بەڵام لێرەدا ناکرێ ئەم ئاڵوگۆڕانە بخرێنە بەر باس و لێدوان، چونکە بەراستی هێشتاش زۆربەی ئەم ئاڵوگۆڕانە بە لامانەوە ناڕوون و بزرن و تەنانەت هەتا ئەمڕۆش سـەرتاسـەری ئاقاری ئێران بە باری لێکۆڵینەوەی شوێنەوارناسیدا هەر مۆر و دەق نەشکاوە. کۆنترین جێگای ناسراوی نیشتەجێبوونی دەشتان «سیلکە»ی نیزیک کاشانە لە باشووری تاران، کە یەکەم جێپێی بنەگربوونی مرۆڤی پێوە دیارە و لە بەرپاڵی گردێکی دەقنەشکاوی توورەکەڕێژدا خۆی دەنوێنێ.

لەو هەرەتەدا هێشتا مرۆڤ بە شێوەی سازکردنی خانووبەرەی نەزانیوە و لە ژێر باڵی کەپری بە چرپی‌وچاڵاندا حاواوەتەوە و خۆی پاراستووە. پاشان خێرایەکی ئادەمیزاد لەسەر پاشماوەی ئەم شوێنانە چینە قورِی لەسەر یەک هەڵچنیوە و دیواری مۆرەی پێ داناوە و کەوێڵی ساز کردووە. مرۆڤ کە هەروا بێ‌وچان بە شوێن نێچیردا دەگەڕا و ڕاوی دەکرد، کاروباری کشت‌وکاڵیشی پەرە پێدەدا. ئەم دوو کار و سەرقاڵییە یەکی دیکەشیان هاتە سەری و بوونە سێ و ئەویش بریتی بوو لە ئاژەڵداری؛ چونکە یەسک‌وپرووسکی گاوگۆل و مەڕ و مێگەلی دەستەمۆکراو لە نێو کەل‌وپەل و نێوماڵ و کەرەستەکانی مرۆڤی ئەم چاخەدا کە چاخی یەکەمە دۆزراوەتەوە. بێجگە لە کاسە و کەوێڵی سواڵینەی ڕەشی دووکەڵاوی کە لە ئەشکەوتاندا بە دەست و بێ‌چەرخی هەورگەری ساز دەکران، چەشنێک دەفری تازەی سووریش هاتوونە ئاراوە کە لە کوورەی زۆر سەرەتاییدا لە گڵ دەردەچوون و جاروبارە تووشی ڕەش‌هەڵگەڕانیش دەبوون. هەر لەم چاخەدا یەکەم گەشە و پێشکەوت لە کاری هەورگەریدا خۆی نواند و ئەویش نەخشاندنی دەفران بوو. دەفرە نەخشینەکانی ئەم ڕۆژگارە بریتی بوون لە کاسەی نالەبار و قرچۆک و خۆنەگر کە لای بەرەوەیان هێلکەیی هەڵدەخرا و بە گڵەسپی لینجاو دەدرایەوە و خەت و کووزی وەکوو ڕایەڵ و پۆی پێدا دەهات. بە وردبوونەوەی زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم ڕازاندنەوەیە لاساکردنەوەی سەوەچنینە، چونکە هێشتا هێندە لەو زەمانە تێنەپەڕیبوو کە مرۆڤ لەبری دەفر و ئامان چەشنێک سەبەتەی بە قوڕ دادراوی وشک کراوەی بەر هەتاوی داهێنابوو؛ کەوایە ئێستاش بە کێشانەوەی ئەم خەت و کووزانە هەمان شێوازی تێکبەزیوی شووڵی سەبەتەی چندراوی دەخستەوە بەرچاو(ق٤).



ق٤ـ سیلکە: دەفر و ئامانی سواڵینەی نەخشین، سەر بە چینی یەکەم

دۆزرانـەوەی کۆمـەڵێکی بـەرچاوی ئاڵقـەی خـەڕەک کـە لـە قـوڕەسـوورەی سوورەوەکراو یان بـەرد سـاز کراون، دەریدەخا کە مرۆڤی کۆن و لـەمێژین بنەماکانی ڕستن و تەنینی کاڵ و پێنەگەیشتووی پارچەی زانیوە. ئامرازی کار هەموویان بـەردین بـوون، وەکوو دمـی کێردی بەردەچـەخماخ[١] و دمـەداس و تەوری لێک و لووس کراو لەگەڵ ئامرازی تیفتیفەدان. وەکوو دیارە هەر چۆنێک بێ لە بنەبانی ئەم چاخەدا، شتومتی بچووکی مز کە هێشتا هـەر بـە زەبری چەکوش ساز دەکران ڕووی خۆیان نواند. مرۆڤی ئەشکەوتان تازە خەریک بوو ئـەو کانزایـە بناسـێ کـە دەبـوو دەکـاری بێنـێ و دەیزانـی مـز نەرمـە و پـان دەکرێتەوە و دەبێتە پەڕە، بەڵام هێشتا لە ڕێوشوێنی قاڵکردنی ڕانەهاتبوو. ئەم چاخە ڕاست دەبێتە بنەبانی چاخی نوێکوچکی.

ژن و پیـاو بـەبێ جیـاوازی مـەیلیان لـە خـۆ ڕازاندنـەوە بـوو. ملوانکـەی گوێماسیلەیان دەهۆندەوە و ئەنگوستیلە و دەسبەندیان لە سەدەفی گەورە یان

١ـ بەردەبەلکە یان بەردەستی. و.

بەردی نەرم ساز دەکردن. وادیارە کوتانی خاڵ یان لانیکەم سووراوسپیاویش باو بووبێ و پێداویستییەکانی ئەم کارەیان بە دەستاونگی ژیکەڵە کوتابێ (ق٥).



ق٥ـ سیڵکە: هێنانە بەرکاری دەستاونگ بۆ هاڕینەوەی سووراوسپیاو

چێشکەی هونەری لە دیمەنی کەندەکاری کراوی سەر یەسکدا خۆی دەنوێنێ. پێشتر مرۆڤ کێشانەوەی قەڵافەتی ئادەمیزاد و بوونەوەری دەست پێکردبوو. هونەرمەندی چاخی نوێکوچکی شەقڵی داویشتە سەر یەسک و لەسەری هەڵدەکەند و دەسکی ئامرازەکەی خۆی بە دیمەنی سەری ئاسک یان کەروێشک دەڕازاندەوە. بێگومان جوانترین شوێنەواری تا ئێستا دۆزراوەی لەم چەشنە، دەسکە چەقۆیەکە کە مرۆڤی ئەو سەردەمە دەخاتە بەرچاوان کە ئارەقچنێکی لە سەری ناوە و تەنوورەیەکی قوڵەی بە کەمەرەیەک لە نێوقەدی شەتەک داوە.

ئەمە یەکێک لە کۆنترین دیمەنی و قەڵافەتەکانی دۆزراوەی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی نیزیکە(و ٢).

مردوویان بە قوونەوە لە تەرکی ژوورانەدا دەناشت. ئەم نزیکی و دانەبڕانەی مردوو، کەسانی پاشەواری لە ئەرکی دابینی بەشینەوەی نەزرینەی مردووان دەپەڕاندەوە، چونکە ڕووحی کۆچکردوو دەبوو بە شەریکەبەشی بژیوی بنەماڵە. کەوایە بۆمان دەردەکەوێ مرۆڤ هەر لە کۆنەوە پێی وابووە کە پاش نەمانیش لەسەر شێوەی زەمانی مانی دەڕوا و بە یەکجاری نابڕێتەوە. بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستە دەبینین کە لە تەنیشت مردوویەکی نێژراو تەورێکی مشتوماڵ کراو داندراوە و شەویلاکەی دوو مەڕیش کەوتوونە لای سەری (و ٣). لەگەڵ خۆراکی ویشکە زۆر وێدەچێ شلەمەنیش خرابێتە نێو گۆڕی مردۆوە و لەبەروەی ئاسەواری دەفرەکان نەماون، دەکرێ وای لێکبدەینەوە کە دەبێ شتی وەکوو کوولەکەی نێوبەتاڵ یان سەبەتە و زەمبیلەی دەسکرد بووبن، کە زوو دەڕزێن و دەبنەوە خۆڵ. بەپێی داب و نەریتێک مردوویان بە ڕەنگی سوور ڕەنگاندووە و ئەم کارە لە جێگای دیکەش وەبەرچاو کەوتوون. هەڵبەت وێدەچێ کە مرۆڤی زیندوو خۆی بە ڕەنگی سوور ڕەنگاندبێ یان بەرلە نێژرانی مردوو، تۆز و بڕشتی ژەنگارگرتووی ئاسنیان بە مەیتەکەی هەڵپڕژاندبێ.

دەستەمۆ کردنی ئاژەڵان کە ڕەنگە بگەڕێتەوە سەر هانی دەروونیی ئادەمیزاد بۆ دۆزینەوەی قوربانی، دەورێکی گرینگی لە پێشکەوتی فەرهەنگی شارستانییەتی مرۆڤدا گێڕاوە. ئاژەڵ بێئەوەی چاو لە دەستی مرۆڤ بێ بۆ تفاق و لەوەڕی خۆی، خۆراک و پۆشاکی بۆ دابین دەکرد و سەرچاوەیەکی هێز بوو کە دەیتوانی لە کاری گەیاندن و گواستنەوەدا یاریدەی بدا. ئاژەڵداری و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات پێویستی بە پێکهاتنی بنەماڵەی پڕ ژن و منداڵ و تەنانەت کۆیلانیش

هەبوو. بەم شێوەیە لەم دەور و زەمانەدا توخمە سەرەتاییەکانی ئابووریی ئادەمی بەدی هاتبوو کە بریتی بوو لە نێچیروانی و ڕاوەماسی، باغەوانی و کشتوکاڵ و پاشان ڕاهێنانی ئاژەڵ و دەرهێنانی کانگا لە دڵی زەوی. مرۆڤ لەو قۆناخە تێپەڕی کە بۆ دابینی بژیوی ڕۆژانەی دەبوو بچێتە ڕاو و بەم شێوەیە کە خۆی دایە کاری بەرهەمهێنان، پێی نایە سەرەتای دەورانی گەشەپێدانی بازرگانی، چونکە دەیتوانی ئەوەی لە بژیو و پاشەکەوتی خۆی دەمایەوە، لەگەڵ کاڵا و کەلوپەلی دیکە بیگۆڕێتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ بازرگانی کردن لە پێشتردا بەدی هاتبوو. ئەو گوێماسیلکە و سەدەفانەی کە خەڵک خۆیان پێڕازاندوونەوە و لە «سیێلکە» دۆزراونەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، دەریانخستووە ئەو چەشنانە تەنیا لە کەنداوی فارس هەبوون، کە مەودای لەگەڵ سیێلکە نیزیکەی ١٠٠٠ کیلۆمیترە. ڕوون و ئاشکرایە کە ئەم ئاڵوگۆڕانەی شتومەک بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەدەکران، بەڵکوو دەبێ چەرچی ئەو کارانەیان ڕاپەڕاندبێ. تەنانەت لەم چاخەشدا دانیشتووانی گوندێکی بەرلە مێژوو لە چوارچێوەی ژیانێکی تەریک و داخراودا تەمەنیان تێپەڕ نەدەکرد. شانەبەرزەی دەسپێشخەریی کاروباری ئاڵوویێر و بازرگانی تایبەت نادرێ بە دانیشتووانی بانووی ئێران، چونکە هاوچەرخانیان لە ئاڵمان بۆ هێنانی سەدەف ڕوویان دەکردە ئۆقیانووسی هیند و فەرانسەوی و ئینگلسییەکانیش یاقیقیان لە دەریای باڵتیکەوە دەبرد.

ڕەنگە بڕوای کۆنباوی «جوولەکە – مەسیحی» سەبارەت بە دەرکرانی ئادەم و [حەوا] لە بەهەشت، یاد و بیرەوەرییەک بێ سەر بە قۆناخی بڕانەوەی چاخی نوێکوچکی و چوونی بۆ نێو قۆناخی پەیدا بوونی جووتیاری گوندنشین

کە لە ڕاستیدا بە یەکێک لە گەورەترین ئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵی مرۆڤ دادەندرێ و ئاکامەکانی هەتا ئەمڕۆش درێژەیان هەیە.

**شارستانییەتی بەرلە مێژووی ئێران؛ گەڕانەوە بۆ هەزارەی چوارەمی پێشزایین**

قۆناخی تازەی گەشە و پێشکەوتنی شارستانییەتی بەرلە مێژووی ئێران کە بە چاخی دووهەمی ناودێر دەکەین، بریتییە لە دەورانێک کە لەچاو دەورەی ڕابردووی باسکراو، تۆزێک پێشکەوتووترە. گەلێک شوێنەواری سەبارەت بەم چەرخەی ژیانی مرۆڤی نیشتەجێی دەشتان هەر ماوە و پارێزراوە. وێناچێ کە هیچ شەڕوشوور و ئاڵوگۆڕێکی لەگوڕی کۆمەڵایەتی بووبێتە هۆی تێکچوونی بارودۆخی ئەم گوندەی بەرلە مێژوو، چونکە هێز و شەپۆلێکی دەرەکی نەیتوانیوە سەری پێدا بکا و سنووری ببەزێنێ.

ئەوەی ڕاستی بێ لەبەروەی مرۆڤ زۆربەی ژیانی سەرقاڵی دابینی ئامراز و کەرەسەی پێتەویستی خۆی بوو، بە شوێن ڕازاندنەوە و ڕێکوپێکی و خۆش کردنی خانە و لانیدا هەنگاوی دەنا و نەیدەخستە پشت گوێ. خانووبەرە بەرفراوانتر بوونەوە و دەرگایان بۆ دابین کرا و ئێستاش شوێنەواری جێی تێگیران و هەڵاوەسرانیان دیارە. دیواری چینچینی مۆرە لیرە بەولاوە پاشەکشەیان کرد و دیواری خشتی کاڵی نوێباو جێیان گرتەوە؛ بەڵام خشتەی ئەو سەردەمە تەنیا تۆپەڵەقوڕ بوو کە بە دەستی چاک دەشێلدرا و دەکرایە سندە و کڵۆ و بە تیشکی تاو ویشک دەکرایەوە. ئەو شەقڵانەی کە بە قامکە گەورەی دەستان دەخرایە سەریان، لە دانان و هەڵچنینی ڕیزەکاندا، قوڕی ڕاخراویان چاکتر پێوەدەنووسا و باشتر یەکانگیر دەبوون (ق ٦).

وەکوو دیارە خشتە لەچاو چینەقوڕ دیواری ڕێک و لەبارترە و ناهێڵێ بقەڵشێ. بە ڕەنگی سوور دیواری ژوورەکانیان گەسکەسواغ دەدا و



ق ٦- سیلکە: یەکەمین خشتی سوورەوەکراو

دەیانڕنگاند و بۆ ئەم مەبەستەش ژەنگاری ئاسن و شیلەی میوەیان تێکەڵ دەکرد، کە لە بانووی ئێراندا باو بوو. ئەم کارە نیشانەی داخواز و وزە و بڕشتی داهێنانی ئادەمیزادە بۆ بەتاقیکردنەوەی هەنگاوی نوێ.

تەرکی پەستواوی ژوورەکان و ڕۆچوونی ئێروئەوێی نیشانەی نێژرانی مردووانە کە بستێک یان قولانجێک گڵیان وەسەر دەکردن. بەم شێوەیە کەسی مردوو بە قوونەوە دەنێژرا و لە پەنا بنەماڵەی خۆی ئۆقرەی دەگرت.

ئەم وردەکارییەی کە لە ڕێکوپێک بوونی خانووبەراندا دیارە، لە هەوروهاڵی تازەی سوورەوەکراویشدا وەبەرچاو دێ. شانبەشانی کاسە و دیزە و گۆزەی پێشوو، چەشنێک دەسکاری نوێ و ژیکەڵەتر خۆی دەنوێنێ کە بە شێوەیەکی چاکتر و لەبارتر و لە کوورەیەکی پێشکەوتووتردا لە کڵ دەرچوون. ئەم کارە نیشانەی داهێنانی ئامێری هەورگەرییە و بریتی بووە لە تەختەیەکی ساکاری باریکەڵە کە لەسەر عەرز داندراوە و شاگردی بەردەستی وەستا سووڕاندوویەتی. ئەم هەورانە بۆیە زۆر دڵگر و جێگای سەرنج بوون، چونکە

لەسەر ڕووکاری سوورەترشانەیان، بە ڕەنگی ڕەش وێنەی بزنەکێویی ڕەوبردە و بەراز و باڵندەی هەمەچەشنە کێشراوەتەوە (و ٤). بوونەوەرەکان بە چەند خەت و کووزێکی ساکار و لە جەنگەی جووڵانەوەیاندا کێشراونەوە و لە ڕاستەقینەیان لانەداوە و هەورگەر هاوکات ویستوویەتی بابەتی سروشتی بە باری ساکاریدا بکەوێ، بەڵام کەوتۆتە سەر شێوازێکی وا کە زۆر جاران تێگەیشتنی مەبەستەکەی دژوارە (ق ٧). لەم ڕۆژگارەوە بەو لاوە، ئێرانی بەرلە مێژوو، هونەرێکی ئەوەندە ورد و باریک و درەوشاوە لە هەورگەریدا دێنێتە ئاراوە کە وەبیرهێنەوەی کەندەکارییە لەسەر یەسقان لە چاخی ڕابردوودا. لە هیچ شوێنێکی دنیا شارەزایی و وەستایەتیی ئەوتۆ لەم کارەدا وەبەرچاو نایە و ئەمە دەریدەخا کە بانووی ئێران زێدی سەرەکیی دەفر و ئامانی نەخشینە. کاسە و گۆزەی هیچ جێگایەکی دیکەی ئەو سەردەمە کۆنەی جیهان، مۆرک و نیشانەی ئاوا ڕێئالیستییانەی بەهێزی لەسەر نەکێشراوەتە کە هێندە بەخێرایی گەیشتبێتە قۆناخێکی خەیاڵمەندانەی ڕووت. ئەم هەنگاوە بۆ یەکەم جار و دەوروبەری ساڵی ٤٠٠٠ی پێش‌زایین، گۆزەکەری بەرلە مێژووی ئێران هاویشتوویەتی.




ق ٧– سێلکە: نەخشاندنی دەفران بە دیمەنی بوونەوەران

کانزا بەرەبەرە بۆ سازکرانی ئامرازان کەلکی لێوەرگیرا و بەردیش لە بایەخی پێشووی کەم نەبۆوە. هەتا ئێستاش مزیان هەر بە چەکوچ دەکوتایەوە و نەیاندەتواندەوە و دەیانکردە درێشە یان چەشنێک شووژن. واوێدەچێ کە هەرگیز وەکوو بەشێکی جەماوەری میسری بەرلە مێژوو نەخش و نیگاریان لەسەر مز هەڵنەکەندبێ. لە لایەکی دیکەوە کاروباری گەواهێرگەری ڕووی کردە زیادبوون و بە تێوەردانی یاقیق و پیرۆزەی گەش و ترووسکەداری دڵبزوێن هێندەی دیکەی پەرە ئەستاند.

بێجگە لە یەسکوپرووسکی ئاژەڵی دەستەمۆکراوی سەر بە سەردەمی پێشوو، یەسکوپرووسکی تۆرەمەیەک تاژی و ئەسپی «پرزێرێڤالسکی»ش دۆزراوەتەوە. ئەم ئەسپە چوارپەل قایم و قوڵە و ئەستوورە و ئازا و بەیاڵ و پژە. وێدەچێ کەرەکێوی و ئەسپی ئەمڕۆ بە چەند پشتان بچنەوە سەر ئەو توخمەیە (ق ٨). هێنانە بەر باری ئەم یەکسمانە کێشەی هاتوچۆ و گەشت و گەڕان و گەیاندن و گواستنەوەی چارەسەر کرد و لە لایەکی دیکەوە کێڵانی مەزراشی کەوتە سەر شانی.



ق٨ـ شووش: ئەسپی پرزێژێڤالسکی کە لەسەر یەسقان هەڵکەندراوە.

گوند خێرایەکی گەشەی کرد و کاری کشتوکاڵی پەرەی ئەستاند. مرۆڤ کە لە کۆنەوە نیر و ئامووری داهێنابوو، لێبڕا هەتا پتر لە پێشوو بەشداری کاری

هاوبەش و هەرەوەزی بێ و بۆ دانانی خانووبەرە و ئاوداشتن و تەخت کردنی زەوی‌وزار یارمەتی لە دراوسێیانی وەربگرێ. لەم ڕۆژگارەدا ژن خۆی دەداتە کاروباری باغەوانی و دابینی خوردوخۆراک و بێ‌وچانیش دەست لـە دیـزە و گۆزە کردن هەڵناگرێ؛ بەڵام لەم چاخەدا سازکردنی دیزە و گۆزە دەکەوێتە دەست کۆمەڵە وەستاکارێک کە تەختەیەکی پانکەڵەی خولدەر دەخەنە بەرکار. زۆربەی توێژەران لایان وایە کە داهێنانی ئامێری هەورگەری بۆیە تەنەخی و دواکەوتنی تێکەوتووە، چونکە ئەو وەستایەتییە بۆ ماوەیەکی درێژ لە ماڵەوەدا بە چنگ ژنانەوە بووە.

لەم زەمانەدا کاروباری ئاڵوویر و بازرگانی ڕەمێنی پەیدا کرد و برووزی ئەستاند. هەر شتێکی مرۆڤ بەرهەمی دێنا دەیتوانی لەم ڕەوتە تازە دامەزراوەدا وەکوو نرخی کڕین و فرۆشتن کاری پێ بکا. بۆ وێنە کەوڵی ئاژەڵ و تیر و تەورەبەردینە و لـە هـەمووان سـەرتر بژیـوی وەکـوو گـەنم و جـۆ و میـوە گۆڕینەوەیان پێ‌دەکرد و لەمانەش بترازێ سەودای مەڕ و پاتاڵ چاک و بەرچاو بوو، چونکە دەیتوانی زیاد بکا و بنەماڵە بەرەو دەوڵەمەندی بەرێ. ئەم مەبەستە سەلمێندراوە کە ئادەمیزاد لەم سەردەمەدا تازە پێی ناوەتە دەکار کردنی کانزا و کردوویەتە جێگرەوەی هێندێک ئامراز و کەرستەی بچووکی یەسقانی. زۆربەی توێژەران لەسەر ئەم باوەڕەن کە چالاکی و کاری بازرگانیی مرۆڤ لە بواری گۆڕینەوەی گیاوگۆڵ و ڕووەک و نەمامانـدا، هەلی بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵی خەڵک بـەدی هێنـاوە. گـەنم و جـۆ کـە بەرهـەمی خۆمـاڵیی ئێرانن و بـە شێوەیـەکی خۆڕسک و دێمەکار دەڕوێن، وادیارە لە زەوی‌وزاری دەم‌بەستێنان چێندراون و پاشان براون بۆ میسر و ئورووپا. هەرزن کـە بـە ڕەسـەن بەرهـەمی هیندە دەنێردرایە ئیتالیا و بەپێچەوانە پەڕش و خاشخاشکی ئورووپا دەگاتە ئاسیا و

تەنانەت سەر بە دوورترین مەڵبەندەکانی «چین»یش‌دا دەکا. لە سەرەتای هەزارەی چوارەمی پێش‌زایین‌دا ئاسۆی ڕوانین و ڕوانگەی مرۆڤ بە باری پێکهێنانی کۆمەڵی نوێ‌دا بەرین دەبێتەوە کە هاوکاتە لەگەڵ ئەو ڕۆژگارەی وا بە شێوەی بەرچاو بەرەو سەردەمــی برەوی هێنانە بەرکاری بەربڵاوی کانزا هەنگاو دەنێ.

قۆناخی دواتری پەرە و ئاڵوگۆڕی شارستانییەتی بەرلە مێژووی ئێران دەبێ لە چاخی سێهەمی «سیلکە»دا بۆی بگەڕێین و بیخەینە بەرچاو. لەم شوێنە چەند چینێک کەوتوونە سەر یەکتر و ئەوانەی بەرەوە لەچاو ئەوانەی سەرەوە کۆنترن. زۆربەی چینەکانی لای سەرەوە سەبارەتن بە هەزارەی چوارەمی پێش‌زایین. لەم ڕۆژگارەدا نژیاروانی کەرەسەیەکی تازە بە خۆیەوە دەبینێ، یانی خشتەی هێلکەیی پێژانی کوێر دەبێتەوە و خشتەی تەخت و لاکێشەیی جێی دەگرێتەوە کە هەتا ئەمرۆش هەر لەباوە. گەڕەکی گوندان بە کووچە و کۆڵانی باریک و پێچاوپێچ لە یەکتر جوێ دەبنەوە و سنووری ملک و ماڵان دیاری دەکرێن. دیواری دەرەوەی ماڵان بە مەبەستی وەرگرتنی تیشک و سێبەر کەند و قووڵیان تێدەکەوێ و جاری وایە بناغەیان لەسەر وشکەبەرد دادەندرێ. نێودەرانە هەروا تەسک و نەوی بوون و بەرزایی سەردەرانەی زۆربەیان لە هەشتا ـ نەوەد سانتیمیتر تێنەدەپەڕی. پەنجەرەش بیوو بە باو و زۆربەیان بەرەو کۆڵان دەکرانەوە. بۆ ئەوەی خانوو شەدار نەبن، سواڵینەی گەورەیان لە دیواران ڕۆدەبردن. دیوی ژوورەوەیان هەر بە ڕەنگی سوور دەڕەنگاندن، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا ڕەنگی سپیش هاتە کایەوە. هەتا ئێستاش مردوویان هەر لە ژووری ماڵەوە و بە قوونەوە دەناشتن و چەند هێما و نیشانەیەکیان بە گڵەزەردە لەسەر

چواربەندەی پەسقانی دەنەخشاند و کەلوپەل و پێداویستییەکی زۆریان دەخستە پاڵدەستی.

لەم سەردەمەدا پێشکەوتنێکی تازە و بەرچاو کە مرۆڤ هەتا ئەمرۆش کەلکی لێوەردەگرێ، لە هەورگەریدا بەدی هات و ئەویش بریتییە لە داهێنانی دەزگای هەورگەری و کوورەی تایبەتی سوورکرانەوە. گۆزەکەر بەو ئامراز و کەرەسە تازانەی کە کەوتبوونە دەستی، کۆمەڵێک سواڵینەی هەمەچەشن و نەخشینی بەرهەم دێنا کە هێندێکیان بریتی بوون لە پیاڵەی گەورە، کاسەی هەرە چاک، دەفری پایە بڵێندی شەراب و شاکووپەی تایبەتی ئازووخە. ڕەنگی هەموو دەفرێک بەپێی تین و بڵێسەی کوورەی سوورکرانەوە دەگۆڕا و هەورگەر دەیتوانی بە دڵی خۆی ڕەنگیان بکاتە بۆر و کەسک و سوور و ئاڵ. شانبەشانی ئەم کارە نەخش و نیگاری ڕووکاری دەفران پتری گەشە دەکرد و بایەخی باڵاتر دەڕۆیی.

هونەرمەندان لە سەرەتادا زیاتر مەیلیان بە لای شێوازی ڕیئالیستیدا دەشکایەوە و وێنەی مار، پڵنگ، بەرانەکێوی، بزنەکێوی، لەگلەگ و وشترمەلیان دەکێشانەوە و بە شارەزایی بە دوای یەکتردا ڕیزیان دەکردن. ئەم وێنەگەرییە نیشانەی داشکانەوەی مەیلی هونەرمەندانە بە لای سروشتدا، بەڵام لەگەڵ شێوازە باس کراوەکەی پێشوو، جیاوازی زۆر و بەرچاوە. ئیتر قەڵافەتی بوونەوەریان بە چەند خەت و کووزێکی ساکار نەدەکێشایەوە و ئەندازەی قەبارەشیان وەبەرچاو دەگرت و پارسەنگیان نەدەبەزاند(ق ۹).



ق ۹ـ سێلکە: شاکووپە، سەر بە چینی سێهەم

دواتر سەرلەنوێ شێوازی کار دەگۆڕێ و وای لێدێ کە کلکی ئاژەڵ درێژتر دەکێشرێتەوە و شاخەکانی لە قەبارەی خۆیان دەردەچن و پانتر و گەورەتر دەبن. هەر ئەم شێوازە بۆ مەلی پەلدرێژیش ڕەچاو کراوە (ق ١٠).



ق١٠ـ شووش: شەربە، سەر بە شێوازی یەکەم

هێندەی پێناچێ کە شاخی ئاژەڵ وا گەورە دەبێتە و قەف دەخواتەوە کە قەڵافەتی چی وای لێ نامێنێتەوە (ق ١١). هەروەها قەڵافەتی پڵێنگ بە شێوەیەکی ساکار کورت دەکرێتەوە وەک سێگۆشەیەک خۆی دەنوێنێ (ق ١٢). ئەم هونەرە ئەگەرچی بنەماکانی پێشووی ڕەچاو دەکرد، بەڵام ڕەوتێکی دیکەی دەپێوا؛ واتە کەمتر بە دڵخواز و زیاتر بەپێی ڕێسایەکی بیرمەندانە هەنگاوی دەنا. دواتر بەپێی پێویستی ئاڵوگۆڕ، گەڕانەوەیەک بەرەو ڕیئالیسم ڕووی دا، بەڵام ئەویش شێوەیەک بادانەوە بوو بۆ سەر ناتووراليزمی نوێ و پڕ بوو لە ژیان و گەشەوەری.





ق١١ـ تەختیجەمشید: پیاڵەیەکی سواڵینی نەخشین



ق١٢_ تەپەی حەسار: پەرداخی بلووریی نەخشین

دیمەنگای ڕاو نێوەنێوە بە دیمەنی تێکهەڵچوون لەگەڵ بوونەوەرانی کێوی دەنەخشێندرا. لەم ڕەوتەدا جاری وایە ڕاوچییەک ژێ لە کەوان دەکێشێتەوە یان جووتیارێک گایەکی قەمتەرکراو بە دوای خۆیدا دەکێشێ و هەلی واشە پۆلێک سەماکەر، سەرقاڵی سەمایەکی پیرۆزن (ق ١٣).







ق١٣_ سیلکە: کۆمەڵێک دەفری نەخشین (b,a)، شووش (c)

لە ماوەی پتر لەو هەزار ساڵە سێ قۆناخییەی کە ژیانی مرۆڤی بەرلە مێژووی پێدەشتانی پێدا تێپەڕی، هونەرمەند هەرگیز خۆی لە نێو بەند و داوی

شێوازی ڕابردوودا نەدەبەستەوە و بێبڕانەوە ئاڵوگۆڕی دڵخوازی بـە سـەر دێنا و دیمەنی تازەی دادێنا. ئەم هونەرە کە وێنەی لە سەرچاوەی تایبەتی خۆی هەڵدەگرتەوە و نەوەستان و قەتیس‌مانی تێدا نەبوو، نوێ دەکرایەوە و گۆڕانی بە سەردا دەهات و تین و تیشکەی پەڕی هەڵداویشت و دەگەیشتە دوورەدەستان و سنووری سروشتیی بانووی ئێرانی دەپەڕاند.

داخوا ئەم دیمەنانەی کە هونەرمەند لەسەر ڕوخساری دەفران دەیخوڵقاندن، وێنە هەڵگرتنەوەیەکی ڕاست و ڕاشکاوانە بوو کە لە ژینگەی دەوروبەری خۆیدا دەیدی، یان لە دیوی نادیاری ئـەم هێمـا و نیشـانە فرەچەشـن و بەرچاوانـەدا، ویستی درکانـدنی مەبەسـت و بابـەتێک شـاراوەتەوە؟ بەکورتی داخـوا وەکـوو هێندێک لە زانایان لێکیان‌داوەتەوە، ئەم وێنەگەرییانە وەکوو دەقێکی نووسراو وا بوون؟ ئێمە نەکەوتووینە پێوشوێنی دۆزینەوەی وڵامی ئەم پرسیارەی دوایی، بەڵام وەبیرتان دەخەینەوە کە بنەبانی ئەم چاخە پڕشنگدارەی دەفری نەخشینی بانووی ئێران، هاوکاتـە لەگـەڵ ئـەو زەمانـەی کـە مرۆڤـی دانیشـتووی دەشـتی دراوسێی دووچۆمان گەیشتە باڵاترین لووتکەی داهێنانی خۆی و ڕێوشـوێنی نووسینی داهێنا. کەوایە داخوا دەکرێ پێمان وابێ داهێنەرانی خـەت، وێنەیان لە شێوازی کاری هونەرمەندانی خەیاڵمەندی بانووی ئێران هەڵگرتۆتەوە و ئەوان بە کێشانەوەی وێنە و دیمەن و نیشانان، گەڵاڵەیان بۆ داڕشتوون؟ هەر چۆنێک بێ ڕێی تێدەچێ وابێ و پێویستە کـە بزانین ئـەم هونـەرە بـە قۆنـاخی سـەرەتایی دادەندرێ بۆ خەتی وێنەیی.

هەورگەری ئەم ڕۆژگارە فێری سازکردن و داڕشتنی پەیکەرە دەبێ و دەست دەکا بە داڕشتنی پەیکەری هەموو بوونەوەرێک و ڕەنگە بۆ لەیستۆکی منداڵان بووبن یان وێدەچێ وەکوو نەزرینە بۆ خودا و خێوی پارێزەری مەڕ و پاتاڵ لە

قالبدا داڕێژرابن. کۆمەڵێکی بەرچاو پەیکەرەی دایکەخوای تێری و تەسەڵی و پیت و بەرەکەتی بەرهەمی زەوی ساز کراون. سەری زۆربەی ئەم پەیکەرانە پەڕیون و بە دەستی ئانقەست شکێندراون، چونکە ویستوویانە کە دوای نەمانی خاوەنەکانیان کەسی دیکە خێریان لێ نەبینێ.

سەنعاتی کانزاگەریش گەشە دەکا. دەست دەکرێ بە تواندنەوەی مز و قالبڕێژکرانی. ژمارە و فرەچەشنیی دەسکاری وەستاکاران لەچاو سەردەمی پێشوو بەرچاوە؛ بەڵام دەکارکردنی ئامرازی بەردین هەروا لە برەودایە و هەموو لایەک کەلکی لێوەردەگرن و زۆر بە ساوەساو و لەقەلەق تەورێکی لووسی مزی تایبەت بە هۆزی «سێلت»ی هیندوئورووپایی جێی تەورەبەردینە دەگرێتەوە و پێمەرەش پەیدا دەبێ. خانووبەرەکانی سەر بەو سەردەمە کۆمەڵێک کێرد و خەنجەری مزیان تێدا دۆزراوەتەوە. هاوکات وەستاکاران دەست دەکەن بە سازکردنی شتی خۆ ڕازاندنەوە و خۆ جوانکردن. ئاوێنەی تەختی لێوهەڵگەڕاوە لەگەڵ دەرزیلەی سەرخڕ دێنە گۆڕ. خشڵ و گەواهێرات ئەوەندەی دیکە پەرە دەستێنن و کەرەسەی خاوی زیاتریان تێوەدەدرێ. جگە لە سەدەف و یاقیق و پیرۆزە، مرواری و بەردی بلوور لەگەڵ لاژوەردی «پامیر»ی و بەردەکەسکەی ناوچە دوورەدەستەکان، دەکەونە بەردەستی هونەرمەندان.

شانبەشانی پەرەی کاروباری بازرگانی، پێویستیی ئەوەش دەهاتە ئاراوە کە بار و نێوەرۆکی تێر و جەواڵ و کووپان بە مۆری و دەقنەشکاوی بگاتە جێ و چاوەدێری بکرێ و دەستەبەربوونی لەسەر بێ. بۆ ئەم مەبەستە مۆر یان هێمایەکی تایبەت بە خاوەن ماڵەکە لەسەر تۆپەڵەیەک قورەسوورە شەقڵ دەکرا و لە زارکی کووپەکە دەدرا یان بە پەتێک پێیانەوە دەبەست. لەمێژینەترین شکڵ و شێوەی مۆر کە ماوەیەکی زۆر گۆڕانی بە سەردا نەهات بریتی بوو لە

کوتەبەردێکی قووچەکی و هەڵکەندراو کە ئاڵقەیەکی تێخرابوو. لە سەرەتادا ڕووکاری مۆرەکان لەسەر بیچمی ئەندازەیی دەڕۆیشتن (ق ١٤)، بەڵام هێندەی پێنەچوو کە دیمەن و قەڵافەتی مرۆڤ و ڕووەک و بوونەوەر لەگەڵ کۆمەڵێک درۆشم و نیشانە هاتنە ئاراوە. بێگومان تەواوی ئەمانە وێنەیان لە کاسە و دیزە و گۆزەی نەخشین هەڵگیرابۆوە و ڕەنگە ئەم نەخش و نیگارانە واتای نوسینیشیان لێوەرگیرابێ.

لە درێژەی ئەم قۆناخەی شارستانییەتی دەشتەکی‌دا، بناغەی ئابووری ماڵ دادەندرێ و خۆی دەگرێ و گەشە دەکا و ئادەمیزاد لە تەواوی بوارەکان‌دا پێشکەوتنی بەرچاو وەدەست دێنێ. ئەم قۆناخە دەکەوێتە سەرەتای سەردەمێکی نوێ کە تێیدا کۆمەڵانی کاڵی دراوسێ، وێڕای دامەزراندنی کۆمەڵێک ناوەندی گەورە، ئابووریی شارنشینانە بەدی دێنن. ڕەنگە بکرێ بڵێین کە بارودۆخێکی ئاوا باڵی بە سەر دەشتی دەوڵەمەندی دووچۆمان کێشابوو، بەڵام لە ئێران‌دا شتێکی ئەوتۆ بەدی ناکرێ و هێشتا زووە. بارودۆخی سروشتیی بانووی ئێران دڕ و نالەبارە و خاکی ڕەقەن و پڕ هەوراز و لێژە و پرش‌وبڵاویی ئاوەدانی و کۆمەڵانی کەم جەماوەر و پاراستنی کولتووری کۆن لە بواری ئابووریی ماڵەکی‌دا، ئاڵوگۆڕی ئەم بەشەی جیهان بۆ سەدان ساڵ وەدوا دەخا. تەنیا بابەتێکی ناوازە، ناوچەی باشووری خۆرنشینی «سووزیان»ە، کە دەبێتە درێژبۆوەی خۆرسکانەی دووچۆمان و گەشەی هاوشێوەی ئەوێی پێوە دیار بوو. لە سەرەتای هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا لەم ناوچەیە چەشنێک ژیانی بنەگرتووی شارنشینی بەدی دێ و یەکەمین حکوومەتی یاسامەند دادەمەزرێ کە پادشایەتیی عیلامە.



ق١٤- سیێلکە: کۆمەڵێک مۆری نەخشێندراو

ئەم سێ قۆناخەی شارستانییەتی بەرلە مێژووی ئێران کە پێشتر باسی کرا، لە هیچ شوێنێک ئەوەندەی بانووی ئێران کەندەوکۆژەی شوێنەوارناسییانەی لەسەر نەکراوە و جێگاکانی نەناسراوە. هەبوونی دوو شارستانییەتی کۆن تەنیا لە کەنارەکانی شۆرەکاتی ناوەندی، واتە سیێلکە، قوم، ساوە، ڕەی و دامغان کەوتوونە بەر لێکۆڵینەوە. ئەو ناوچانە دەڵێی بەرموورن و لەسەر هێڵێکی کەوانی بە دوای یەکتردا ڕیز بوون و کەوتوونە لێواری خۆرنشین و باکووری دەریای




ق ١٥ـ نەخشەی ئێرانی بەرلە مێژوو

کۆن (ق ١٥). وێدەچێ ئەم ناوچەیە لە ماوەی ویشکەچاخی‌دا بە قوڕ و لیتەی ئاوبردەی بەجێماوی ئەو چۆماو و جۆبارانەی کە دەڕژانە دەریاوە وەڕێژەو هاتبێ و گەلێک زووتر لە دۆڵ و دەرەکانی کەژ و کۆی زاگرۆس، هەڵچۆڕابێ. چەند مەڵبەندێکی وەکوو تەپەی «گیان»ی نیزیک «نەهاوەند»ی باشووری هەمەدان و «تەلی باکون»ی دەوروبەری تەختی‌جەمشید لەگەڵ شووش، هەتا کۆتاییی چاخی دووهەم چۆلەوار بوون؛ بەڵام لە دوای ئەم چاخەوە، کولتووری هەوروهاڵی سواڵینی نەخشینی ڕەنگین لە سەرتاسەری بانووی ئێران‌دا پەرەی ئەستاند و هەموو وردەکاری و ئاڵوگۆڕ و بنەما و ڕێساکانی پەنجەنەخشینی ڕەچاو کرا و بێجگە لە دیزە و گۆزە کردن، کانزاگەریشی گرتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ دەفری گڵێنی نەخشینی سوورەوەکراو لەبەروەی لەسەر ڕێسایەکی نەگۆڕ و یەکهەوا نەڕۆیشتووە، توانیویەتی خۆی نوێ بکاتەوە و سەرنجی خەڵک پتر بۆ ئەم هونەرە سەرەتایی و دەوڵەمەندە ڕابکێشێ. هەر ناوچە و کارگایەک خاوەنی شێواز و مۆرکی تایبەتیی خۆی بووە و کاری فرەچەشن پرشنگی داوەتەوە. هەورگەری شووش شەربەیەکی شووش و باریک و تەنکی داهێنا، کەچی وەستاکاری تەختی‌جەمشید دڵی بە شکڵ و شێوەی قووچەکی دەکرایەوە و لێی ڕاهاتبوو. کاسەکەرانی «سێلکە» و «حەسار» هۆگری کاسە بوون. باشە چ بایەخێکی هەیە کە یەکێک لەو ناوەندانە لەبری ڕازاندنەوە و کارناسکی بە لای قورسی و قایمیی بەرهەمی‌دا دەکەوێ یان جێگایەکی دیکە بۆ گەیشتن بە ڕیئالیسم یان سەمبولیزم، دەکەوێتە خاوەخاو؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هەر ئەم تایبەتمەندی و فرەچەشنییە لە داهێنانی دیمەنەکان‌دا دەبێتە پشتیوان و دەستەبەری پشکووتنی هەستی بەرزی هونەرمەندانەی ئەو نەتەوانەی سەرقاڵی خوڵقاندنی بەرهەمی هونەرین.

ڕوخسار و ڕووکار و قه‌باره‌ی ده‌فران خۆی ده‌گرێ و تیشکی داوێته ده‌وروبه‌ران و ئه‌وه‌نده چاک بوو که به‌ره‌به‌ره مه‌ڵبه‌ندی بڵاوبوونه‌وه‌ی دوورتر ڕۆیی. ئه‌م وه‌ستاکارییه له مه‌ودای ڕێگای باشووری‌دا هه‌تا سیستان ڕۆیی و له‌وێ په‌لی هاویشت بۆ به‌لووچستان و ده‌ره‌ی سێند. له باڵی باکووره‌وه بناغه‌ی کولتوور و شارستانییه‌تێکی له ئاوه‌دانییه‌کانی مه‌ڵبه‌ندی «مه‌رو» دانا و زۆر وێده‌چێ ته‌نه‌وه‌ی کردبێ بۆ به‌لخ (باکته‌ریا) که ئێستا شوێنه کۆن و که‌وناراکانی چاوه‌ڕوانی پاچ و پێمه‌ڕه‌ی کۆژه‌ران ده‌که‌ن. وه‌کوو پاشان بۆمان ده‌رده‌که‌وێ، زۆر دواتر ڕۆژاواش سوودی له داهێنانه‌کانی بانووی ئێران وه‌رگرت.

توێژینه‌وه‌کانی ڕه‌گه‌زناسی له‌سه‌ر کۆنترین یه‌سکوپرووسکی دانیشتووانی ئه‌م ئاوه‌دانییانه، هه‌بوونی ڕه‌گه‌زێکی ڕه‌سه‌ن و یه‌ک توخمه ناسه‌لمێنن. ته‌نانه‌ت ناکرێ بڵێین دوو چه‌شنی جیاوازی مرۆڤی سه‌ر درێژ یان سه‌ر چه‌کوچی که له‌و ناوچانه وه‌به‌رچاو دێن به دوای یه‌کتردا هاتوون یان به‌پێچه‌وانه سه‌ر به تاقمێکی ڕه‌گه‌زین که ناسراوه به مرۆڤی مه‌دیته‌رانه‌یی. ئه‌م تاقمه‌ی دوایی له چاخی به‌رله مێژوودا به ته‌واوی ئاسیای خۆرنشین‌دا بڵاو بوونه‌وه و له ده‌ریای مه‌دیته‌رانه‌وه هه‌تا تورکستانی ڕووس و ده‌ره‌ی سێند بنه‌گر بوون. به‌گشتی ئه‌م دوو ڕه‌گه‌زه به «ئاسیایی» ناودێر کراون که زاراوه‌یه‌که بۆ نیشان‌دانی تۆره‌مه جیاوازه‌کان و ده‌ڵێ ئاسیایی نه «سامی»یه و نه هیندوئورووپایی. تاقمێک له توێژه‌ران که ویستوویانه ڕاشکاوانه‌تر بدوێن ئه‌م ڕه‌گه‌زه‌یان به قه‌فقازی یان خه‌زه‌ری یان یافسی[1] ناودێر کردووه. له‌م ڕه‌گه‌زه‌دا سێ ده‌سته دیارن:

---

١ـ یافسی واته سه‌ر به تۆره‌مه‌ی به‌ره‌بابی «یافس»ی کوڕی «نووح» که ده‌بێته باپیره گه‌وره‌ی هۆز و نه‌ته‌وه‌کانی هیند و ژێرمه‌ن .و.

١- ئوورارتییەکان یان وانییەکان[1]، کە دەبنە دانیشتووانی کۆنی ئەرمەنستان، هەروەها کاسییەکان، عیلامییەکان، خوتییەکان (هیتییەکان) و میتانییەکان.

٢- لیکییەکان، کارییەکان، میسییەکان و هەروەها ئێترووسکییەکان و ئێقریتۆشیان.

٣- ئیبێرییەکان و باسکاکان.

وێدەچێ کە تەواوی ئەمانە بە زمانێکی پەیوەست و پێکەوە گرێدراو دوابن. جا ئەم بۆچوونە بۆتە هۆی پەیدابوونی ئەم گریمانەیەی کە پێیوایە دەبێ سۆمێرییەکانیش هەر لەم تاقمی ڕەگەزییە بووبن، بەڵام لە ڕۆژگارانی زۆر دووردا لێیان دابڕاون. ئەم سەرچاوەیەی ئاسیایی، واتە ئەو ڕەسەنایەتییەی ڕەگەزی کە تەواوی نەتەوەکانی ئاسیای خۆرنشین تێیدا هاوبەشن، زۆر دواتر دەبێتە بەدیهێنەری کولتووری ئەم هەرێمەی جیهان. ئەم تۆرەمە خەڵکە بەتایبەت هونەرێک دەخولقێنێ کە بە هونەری ڕەسەنی ئاسیای خۆرنشین دێتە ژمار و ئێرانیش بە هێنانە ئارای دەفرە نەخشینەکانی خۆی، بە یەکێک لە ماکە و هۆکارەکانی گەشەی دادەندرێ.

زانیاریی ئێمە سەبارەت بە دینی لەمێژینەترین دانیشتووانی ئێران زۆر کەمە. لە ناوچە و مەڵبەندی دووچۆمان کە دانیشتووانەکەی هەر لە ڕەسەنی جەماوەری بانووی ئێران بوون، پێیان وابوو کە ژیان ئافراوی خواژنێکە و سەرلەبەری جیهان پتر کۆنە هەتا خولقاو و بەپێچەوانەی بۆچوونی میسرییەکان پێیان وابوو کە سەرچاوەی ژیان مێیە نەک نێر. ئەو کۆمەڵە پەیکەرۆکە ڕووتانەی خاتوونەخوایان کە لە نێو شوێنەوارەکانی بەرلە مێژووی ئێراندا دۆزراونەوە، ڕێگەمان بۆ خۆش دەکەن کە لە بیر و باوەڕی ئادەمیزادی بەرلە

---

١- ئوورارتووەکان یان دانیشتووانی ناوچەی «وان»ی کوردستان. ڤان.و.

**مێژووی ئێران حاڵی بین. وادیارە ئەم خاتوونەخوایە دەبێ هاوسەرێنێکی بووبێ کە هاوکات هەم شووی بووە و هەم کوڕی. بێگومان دەبێ بۆ دۆزینەوەی دەسپێکی زەماوەندی نێوان مەحرەمان بگەڕێینەوە دینەکانی سەرەتایی. ئەم دابە لە خۆرنشینی ئاسیادا باو بوو. ئێرانییەکان و دواتر نەبەتییەکان[1] ئەم نەریتەیان لە کۆمەڵانی خۆجێیی بە میرات وەرگرت[2]. هەروەها بنەمای زەماوەندی نێوان دایک و کوڕ کە پێشینەی زۆر کەمە، هەر دەگەڕێتەوە سەر ئەم ڕێبازە دینییەی کە باسی کرا. هەروەها ڕەنگە بیروڕای گوێزرانەوەی خزمایەتی و گەڕانی خوێنی ڕەسەن لە لایەن بەرەی دایکەوە، هەر لێرەوە گەرای دانابێ و ئاشکرایە کە ئەم ڕوانگەیە لە نێو عیلامییەکان و ئێترووسکییەکان[3] و میسرییەکان و بەتایبەت لە نێو لیکییەکان‌دا زۆر باو بووە. چاکە لێرەدا وەبیری بێنینەوە کە لە نێو کۆمەڵێک نەتەوەدا ژن سەرکردەی لەشکر بووە و هۆزی چیانشینی گووتی لە کوردستان ئەم نەریتەی ڕەچاو کردووە.**

**گومانی تێدا نییە کە تەوەرەی بارودۆخی سیاسی لەسەر پێکهاتەی بنەماڵەیی و جڤاتی پیران یان کەیخودایەتی هەڵدەسووڕا. بیروبۆچوونی بەخشینی دەسەڵات بە کەسێکی سەرۆک کە زۆر دواتر بوو بە شا، ماوەیەکی پێچوو هەتا لە ئێران‌دا وەدی هات و وەڕاست گەڕا. بارودۆخی سرووشتیی ناوچەکە، کۆمەڵێک ناوەندی بچووک و دوور لە یەکتری بەدی هێنابوو، هەر بۆیە**

---

١ـ یەکێک لە هۆزەکانی عەرەب کە لە سەدەی شەشەم‌دا لە عەرەبستانەوە بەرەو باکوور تێهەڵچوون.پ.

٢ـ ئیحسانی یارشاتر دەڵێ ئەم مەبەستە جێی گومانە. چونکە بەپێی دەقێکی کۆن، جەمشید لەگەڵ خوشکی خۆی زەماوەندی کردووە.م.

٣ـ یەکێک لە هۆزەکانی ئاسیای بچووک کە لە سەرەتاکانی هەزارەی یەکەمی پێش‌زایین‌دا لە ڕۆژاوای شێوەدوورگەی ئیتالیا بنەیان داگرتووە.

ناکۆکی و ناتەبایی نەیتوانی باڵیان بە سەر بکێشێ و شەڕ و کێشەیان لە نێواندا نەقەوما.

### ئێران لە دەسپێکی هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا

لە سەرەتای نیوەی دووهەمی هەزارەی چوارەمی پێش‌زایین‌دا، یەکەمین نیشانەکانی هەڵوەشانەوەی یەکانگیربوونی کولتووری هەورگەڕیی نەخشینی ئێران وەبەرچاودێ. لەناکاو کاری هەورگەڕیی نەخشین لە شووش پەکی دەکەوێ و بنەی دێ و هەورەهاڵی سەرتاپا سووری هەنگڵەداری وەکوو قۆری جێی دەگرێتەوە. ئەم شێوازە هێندە نامۆ نییە و بەئاشکرا وێنەی لە دەسکاری دەشتی دووچۆمان هەڵگیراوەتەوە و سەردەمەکەی ناسراوە بە ئوورووکی چوارەم[1]. ئەم سەردەمە لە ئاڵوگۆڕی شارستانییەتی دووچۆماندا دەوری سەرەکی گێڕاوە، چونکە لە کۆتایی‌دا دەگاتە داهێنانی خەتی وێنەیی. ماوەیەک دواتر و لە ئاخرین سەردەمی بەرلە دەسپێکی هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا شارستانییەتێک لە شووش بەدی دێ و ئەگەرچی زۆر کەوتۆتە ژێر باندۆری بەهێزی دووچۆمان، بەڵام دیسانیش دەتوانێ خەتی تایبەتی خۆی کە بە «عیلامیی بەرایی» ناودێرە، دابێنێ (ق ١٦). ئەم هەنگاوە هاوکاتە لەگەڵ پادشایەتیی «جێمدەت نەسر» لە دەشتی بەربڵاوی دراوسێ کە دووچۆمانە.

شووش تەنیا شار و ناوچەیەکی باشووری ئێران نییە کە دەکەوێتە ژێر باندۆری خۆرنشینییەوە. کەندەوکۆژە تازەکانی شوێنەوارناسی لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کەنداوی فارس دەریانخستووە کە سەرانسەری ڕەخی باڵی باکووریی دەریا سەری وەبەر ئەم کارتێکرانە هێناوە. وەکوو دیارە لە سەرەتای ئەم

---

١- ئوورووک یەکێکە لە شارە بەناوبانگەکانی بابلی کەونارا و ئێستا هەرەسەکانی ماون و پێی دەڵێن «ورکە». ب.

چاخەوە و لە ماوەی هەزارەکانی دواتردا، ئەم بەشە بچووکەی ئێران بێپسانەوە سەرقاڵی ملانە و بەربەرەکانی بووە لەگەڵ برووزی کولتووری بەهێز و پتەوی دووچۆمان.

ق ١٦ـ خەتی عیلامیی بەرایی [خەتی سەرەتایی]

وا وێناچێ کە ناوەندە کولتوورییەکانی باڵی ڕۆژاوای بانووی ئێران کەوتبنە ژێر تین و تەوژمی دەرەکی. شێواز و نەریتی دەفری نەخشین تەکولۆی تێنەکەوت و هەورگەریی «گیان» ئەگەرچی لەسەر پێوشوێنی ڕابردووی دەڕۆیی، بەڵام بە دوای نەخش و دیمەنی جوان و تازەتردا دەگەڕا. لە باڵی باکووری ڕۆژهەڵات شتێکی وەکوو ئەوان وەبەرچاو نەهاتووە و لە «حەسار»ی نیزیک «دامغان» ئاڵوگۆڕێکی خاو و خلیسک خۆی دەنوێنێ کە چەند سەدەیەکی کێشاوە، هەر جارێک کۆمەڵێک دەهاتن و جێی کۆمەڵی پێشوویان دەگرتەوە، لە

ژمارەی کاسە و دیزە و گۆزەی نەخشین کەم دەبۆوە و دەفری ڕەش و ڕەشبۆر دەچوونە جێیان. ئەم دەفرانە لە ڕەنگ و قەوارەدا تەواو لە بانووی ئێران نامۆ دەنوێنن (و٥). بە وردبوونەوە لەم دەفرانە بۆمان دەردەکەوێ کە کۆچەرانی بنەگربووی نێو ڕیزەکانی خەڵکی خۆماڵی کاریان لە ئاڵوگۆڕی ڕەوتەکەدا کردووە. ئێمە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی سەرچاوەی ئەم کولتوورە تازەوە نازانین و تەنانەت ئێستا ناکرێ بڵێین کامە نەتەوە لەگەڵ خۆی هێناویەتی. وێدەچێ ئەم کولتوورە لە ناوچەکانی پاڵەوپاڵی سەیحوون و جەیحوون و دەشتەکانی تورکستانی ڕووس و تەنانەت ڕەنگە لە ناوچە دوورەدەستەکانی جەرگەی ئاسیای ناوەندییەوە، هاتبێ. ئەم کولتوورە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بانووی ئێران تەنەوەی کرد، بەڵام پاشان لە باکوور بایەخی زیاتری پێدرا و بە کەناری دەریادا ڕۆیی و گەیشتە کاپادۆکییە و شوێنەواری لە «کولتەپە» دۆزرایەوە. ئەم دەفرانە کە وەکوو دەسکاری کۆنی دووچۆمان دەچن، لەبەروەی لوولەدارن ڕمێن پەیدا دەکەن.

جەرگەی بانووی ئێرانیش کەوتە ژێر باندۆری دەرەکی. لە سێلکە خانووبەرەی سەر بە بنەبانی جاری سێهەمی [ئاوەدان بوونەوەی] گەیشتنە خاڵی کۆتایی و کوێر بوونەوە. بەپێی ئەو بارستە ئەستوورە خۆڵەمێشەی کە بە سەریان کشاوە، وادیارە دەبێ تووشی سووتمانێکی قورس بووبنەوە. بەشێک لە کاول و هەرەسەکانی ئێرە خانووی تازەیان لەسەر ساز دەکرێتەوە. دەفر و ئامانی نەخشین خاشەبڕ دەبن و ڕەنگی یەکتەختە سوور و بۆر دەچنە جێیان. شکڵ و شێوازی ئەم دەفرانە ڕاست وەکوو ئەو دەفرانە دەچن کە لە شووش دۆزراونەوە و سەبارەتن بە بنەبانی هەزارەی چوارەمی پێشزایین. مۆری گردەڵە بوو بە جێگرەوەی مۆری تەخت کە لە تۆپەڵەقوڕ ساز دەکرا و ئەوەش نیشانەکی

دیار و ئاشکرایە کە نووسینەوە گەیوەتە سەر تەتەڵەی قوڕین. ئەو تەتەڵانەی کە بە خەتی عیلامیی بەرایی نووسراون و لە کەندەوکۆژەکانی شوێنەوارناسی‌دا دۆزراونەوە، هەموویان لە قوڕەسوورە ساز کراون. وێدەچێ کە شوێن‌دانانی وردەوردە و نەرم و ئاشتیخوازانەی ئەو جەماوەرەی لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران کەلکیان لە هەورووهاڵی ڕەش وەردەگرت، وێڕای دەرکەوتنی شارستانییەتێک کە خەتی عیلامیی بەرایی لەگەڵ خۆی هێناویە و مۆرکی زاڵبوونێکی بەزەبروزەنگی پێوە دیارە، گەلێک جیاوازە. ئەم نەتەوەیە هونەرێکی یەکجار سەرتر و دەوڵەمەندتر و پێشکەوتووتری هێنایە سێلکە و ئەوەش بێ‌گومان دەگەڕێتەوە سەر ئاکامی لێکدرانی کولتووری خۆماڵی لەگەڵ کولتووری دووچۆمانی کە لە درێژەی سەدەکانی ڕابردوودا لە شووش هەڵدەدا و گەشە دەکا. وەبەرچاوهاتنی مۆرکی ئاسەواری شووش لە سێلکە و وێکچوونی بێ‌سێ‌ودووی، دەریدەخا کە ئەم شارستانییەتە بە دەستی زۆر داسەپاوە.

دانانی خانووبەران وردەکاریی زیاتریان تێدا کراوە، بەڵام دیسانیش سەردەرانەی دەرگاکان بە شێوەیەکی سەیر نەوین. لە حاند زارکی خانووبەران ئاورگێکی دووبەر دامەزراوە کە وادیارە دەبێ یەکیان چێشتیان لەسەر لێنابێ و ئەوی دیکە نانیان لێ کردبێ. لە سووچێک کووپەیەکیان بۆ تێکردنی ئاو بە زەوی‌دا ڕۆبردبوو. لەم ماڵە بچووکەدا، کەل‌وپەلێکی کەم و ساکار و سازکراو لە قوڕی شێلدراو خۆیان دەنوێنن و ئەگەرچی یەکجار سەرەتایین، بەڵام پێویستیان بە تاقچە و کەرکەرۆکەی بەردینی نەوییە و کولێنی جێی ڕاگرتنی بژیویش وەبەرچاو گیراوە. مردوویان بە قوونەوە لە ژووری ماڵەکان‌دا دەناشت و بستێکیان گڵ وەسەر هەڵدەدا و دەیانتەپاندەوە و ڕێکیان دەکرد. هەرچی شتومەکی گرانبایی و پێداویستی تایبەت بوو دەخرایە پاڵدەستی و ئەمانە لەچاو

کەلوپەلی هەژارانەی نێو گۆڕەکانی سەردەمی پێشووی سێلکە، زۆر بایەخدارترن (ق ١٧). وێڕای دەفری تازەی سوالێن، کووزووی وردەڵەی بەردین کە ڕەنگە عەتردان بووبێ و دەوریی بچووکی بەردین و جوانتاشراو و ئاوێنەی مزینی خڕ و هێندێک ڕەپ و کووڕ لەگەڵ کۆمەڵێک خشڵ و سڵسڵە و پلپڵە بەدی هاتن. زۆر جاران مردوویان بە زێڕوزەمبەران دەڕازاندەوە کە بریتی بوون لە: ملوانکەی زێوین کە بە قیل بەردی لاژوەردی تێدەگیرا، زێڕ و سەدەفی زێوئاژنی لەپکلەپک، گوارەی زێڕ و بەردی لاژوەرد، بازنەی زێوین و بەرمووری درێژ کە بە زێڕ، زێو، لاژوەرد، یاقووت و بەردەسپی دەهۆندرایەوە (ق ١٧). وێدەچێ کە لە نێو ئەم ماڵانەی سێلکەدا چەند شوێنێک هەبووبێ بۆ کڕین و فرۆشتنی بەردی لاژوەرد کە لە چیاکانی پامیرەوە دەهاتن و دەگەیەندرانە دووچۆمان، چون لەوێ خوازیارێکی زۆریان هەبوو. ئەو هەمووە زێڕ و زێو و متومووروو و گەوهەرەی کە بەوپەڕی وردەکاری دەکرانە خشڵ و بە دەسکاری وەستاکارانی شووش و تەنانەت دووچۆمانیش دادەندران، دەکرێ بڵێی کە پێشەنگی ئەو گەوهەرگەرییە دۆزراوەی نێو گۆڕی پادشایانی «ئوور»ە کە سەیر دنیای سەرسوڕماو کرد.

سەنگ و بایەخی ئەو کولتوور و شارستانییەتەی کە لە شووش ناسراوە و هەتا جەرگەی ئێران پەلی هاویشتووە، پێش هەموو شتێک لەبەر داهێنانی نووسینە کە هەتا ئێستاش ڕەمزی خوێندنەوەی تەتەڵەکان وەکوو گرێپووچکە نەکراونەوە (ق ١٨)؛ بەڵام خەتی نیمچەوێنەیی ئەوان نیشانەی پێشکەوتنێکی بەرچاوە لەچاو خەتی وێنەیی لە سەردەمی پێشوودا. توێژەران نووسینی ژمارە و کۆکرانەوە و داشکاندنی دەقەکانیان بۆ ڕوون بۆتەوە، هەر بۆیە ڕەنگە بکرێ ئەوانە بە بەڵگەنامەی دارایی دابندرێن و بخرێنە ڕیزەی بەڵگەنامەی




ق١٧ـ سیلکە: دوو گۆڕی سەر بە سەردەمی خەتی عیلامیی بەرایی

ژمێریاری و پسوولەی داهات و دەرکەوت. هێندێک لەم تەتەڵانە کون کراون و پەتێکیان تێخراوە هەتا بە کاڵاوە هەڵواسرێن و ئاوایە کە دۆزراوەکانی سیلکە گریمانەی پسوولەبوونیان دەسەلمێ. بە داهێنانی خەت، مۆری گردەڵە دەبێتە باو کە لەسەر قوڕەسوورەی کزربۆوە هەڵدەکەندرا و بە واژۆی خاوەنی دادەنـدرا (ق ١٩). وێدەچێ درۆشـم و هێماکانی سـەر ئـەم چەشنە مۆرانـە، تێبەسـتەی هونەری هەورگەریی نەخشینی باوی سـەردەمی پێشـووی بـانووی ئێران بێ. سیلکە تەنیا جێگایەکی باڵی خۆرنشینی بانووی ئێرانە کە شوێنەواری نووسراوی سـەر بـە دەورانـی بەرلـە هەخامەنشـییەکانی لـێ دۆزراوەتـەوە. بـەم شـێوەیە کارپێکرانی خەت و نووسین لە ئێراندا سوور بۆتەوە، ئەگەرچی داهێنانی خەت دەگەڕێتـەوە بـۆ دەشـتـەکانی بـاڵی باشـوور کـە ڕاسـتەوخۆ بـە دووچۆمـانـەوە

بەسترابوونەوە. خەت بەپێی گەشەی شارستانییەت و کولتووری عیلامی و پاش کۆمەڵێک سەرکەوتن و دەسکەوتی سیاسی، گەیشتە بانووی ئێران و بێگومان ئەم پەل هاویشتنە ئامانجی ئابووریشی تێدا ڕەچاو کرابوو. هەتا ئەو دەمەی کە شارستانییەتی عیلامی لە جەرگەی ئێراندا مابوو، خەت خۆی ڕاگرت، بەڵام وێدەچێ بە چۆڵ کرانی ئەم ناوەندە بازرگانییە، بۆ ماوەی چەند سەدەیەک پەکی کەوتبێ و بە سەر کوێربوونەوەدا کەوتبێ.




ق١٨- سێلکە: تەتەڵەی عیلامیی بەرایی

ئێمە لە گەرمەی کاروباری شوێنەوارناسیی خۆماندا، چەند شوێن و ناوەندێکی ئێرانمان لە هەزارەی سێهەمی پێش‌زایینیدا خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە کە کەوتوونە ژێر باندۆری کولتووری دەرەکی و ڕوون بۆوە کە ئەم ڕەوتە هەم لە باشووری خۆرنشین و هەم لە باکووری خۆرهەڵات بۆتە هۆی بەدی هاتنی کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە کولتوور و شارستانییەتی کۆنی ئێراندا و تەنانەت



ق١٩- سێلکە: کۆمەڵێک مۆری گردەڵەی سەر بە سەردەمی تەتەڵەکانی عیلامیی بەرایی

جاری وایە ئەوەندەیان کارتێکردووە کە بە جارێک هەڵیانگێڕاوەتەوە یان چواربەندە و پێکهاتەی هەزاران ساڵەیان گۆڕیوە. هەر چۆنێک بێ ئێران سەری وەبەر تەواوی ئەم ئاڵوگۆڕانە هێنا، بەڵام دەستی لە گەشە و پەرەی شارستانییەتی خۆی هەڵنەگرت و بۆ دەرەوە و دوورەدەستانی بەڕێکردن. ئەوەی ڕاستی بێ ئێران لەو کاتەدا کە کولتووری دەرەوە وەردەگرێ، کولتوور و شارستانییەتی خۆی دەنێرێ بۆ هەندەران. لێرەدا تەنیا نموونەیەک دێنینەوە: ئەو

شارستانییەتەی کە لە نیوەی دووهەمی هەزارەی چوارەمی پێش‌زایین‌دا لە ناوچەی دووچۆمانی باکووری ـ واتە ئاشووری داهاتوو ـ سەری هەڵدا، شێوازێکی شاز و شکۆمەندی لە هەورگەری‌دا برەو پێدا کە لە ڕووی ڕەنگ و ڕووکار و ڕازانەوەی‌ڕا دیارە وێنەی لە ناوەندە کولتوورییەکانی ئێران هەڵگیراوەتەوە کە بریتی بوون لە سێلکە و حەسار.

وەکوو ئاشکرایە ئێران بەپێی هەل و هەڵکەوتی جوغرافیایی بۆتە شارێی هاتوچۆ و تێکەڵاوی و بزووتنەوەی گەلان و گۆڕینەوەی بیر و باوەڕ و کولتووران. جا بۆیە هەر لە سەردەمانی بەرلە مێژووڕا و بۆ ماوەی پتر لە هەزار ساڵ بوو بە دەورگێڕێکی نێوبژیوان و پردێکی پەیوەندی لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرنشین‌دا. ئەم پردەی نێوان خۆرهەڵات و خۆرنشین هەرگیز لەم ڕەوتەدا دوورەپەرێز و کەنار ڕانەوەستا و دەستی وەرگرتن و بدەی کراوە بوو، یانی وەریدەگرت، گەشەی پێدەدا و پاشان دەیگواستەوە.

**ئێران لە هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا**

لە سەرەتای هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا، پێدەشتی بەرێژەوی دووچۆمان لە قۆناخی بەرلە مێژوو دادەبڕێ و پێ دەنێتە چاخی مێژوویی. بەپێی پاشماوەی کۆمەڵێک دەقی نووسراوی جەماوەری نیشتەجێی مەودای نێوان دوو چۆمەکە کە سەبارەتن بە دیرۆکی نیشتمانی خۆیان، یەکەمین تیشکەی ترووسکەدار دەبزوێ و جەرگی ئەو پەردە ڕەش و تاریکە دەدڕێ کە ماوەی دووهەزار ساڵ بە سەر ڕووکاری دیرۆکی ئێران کشابوو. هەڵبەت دەبێ عیلام لەم ڕێسایە دەرهاوێژرێ کە زۆر زوو پێی‌نایە چاخی مێژوویی؛ بەڵام ئەوەی کە سەبارەتە بە سووزیان (شووش) و ئێمە هێندێکی کەم و کورتی لێ دەزانین، زۆربەی تایبەتە بە سەرچاوەکانی بابلی و لەوێمان وەرگرتووە. ئەو سەرچاوانەش مەبەست و

بابەتێکی ئەوتۆیان پێنییە دەربارەی مێژووی ناوچە و مەڵبەندەکانی نێوخۆ و جەرگەی بانووی ئێران، چونکە ئەوان هەر باسی ئەو ناوچە سنوورییانە دەکەن کە لە لایەن چیانشینانەوە ئاوەدان کرابوونەوە و کۆمەڵانی سۆمێری و سامیڕەگەزی دووچۆمان بێپسانەوە پەیوەندییان پێیانەوە بووە. ئەم هۆزانە لە باشوورەوە بەرەو باکوور بریتی بوون لە: عیلامییەکان، کاسییەکان، لۆلۆبییەکان و گووتییەکان(ق٢٠). تەواوی ئەمانە سەر بە تاقمێکی ڕەگەزین و زمان و زاراوەکانیان سەر بە توخمێکن. تین و تەوژمی جەماوەری دووچۆمان کە زووتر توانیبوویان داموودەزگای پادشایەتیی بەهێز دامەزرێنن، هەمووی ئەوانیان ناچار کرد کە سەردەمێک پێکەوە یەکگرتوو بن، ئەگەرچی بۆ دەمێکیش بووبێ. هەرا و کێشەی نێوان ڕەوەندەکان و نیمچەڕەوەندەکان لەگەڵ جەماوەری بنەگرتوو درێژەی کێشا. بەپێی نووسینەوە و گێڕانەوەی قەڵەمدارێکی بابلی کە لەو ڕۆژگاریدا ژیاوە، شارستانییەت لە بنارەکانی چیای زاگرۆسەوە واوەتر نەچووە. وەکوو دیارە ماوەی ٢٥٠٠ ساڵی پێدەچێ هەتا ئێرانی بە خۆیاندا دێن و ئیمپراتۆریی هەخامەنشی دادەمەزرێنن و ئەو کات سنووری دنیای ژیارمەند تا ئاسیای ناوەندی پەل داوێ و دەگاتە باکووری سەیحوون. هەر کاتێک کە وڵاتی بابل دەکەوتە دەست خانەدانێکی بەهێز، تینهێنانی دەشتی دووچۆمان بۆ سەر چیانشینان پتری شاڵاو دێنا. لە لایەکی دیکەوە لاوازی و دارمانی بابل وەکوو تووڕەی کەڵەشاخێک وابوو کە بە گوێی چیانشینانیدا دەدا هەتا بەرەو پێدەشتی دەوڵەمەند داورووژێن و مل بنێنە تاڵان و تەنانەت لە چەند قۆناخێکدا بۆ ماوەیەکی زۆروکەم درێژ داگیری بکەن.

زۆر جاران ئەم وێنا گشتییە عیلام ناگرێتەوە و لێی دەردەچێ. عیلامییەکان لەو زنجیرە کێوانەوە کە دەشتی سووزیانیان لە باکوور و خۆرهەڵاتەوە گرتبووە

ئامێز داوەریبوون و لە چواریەکی هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا، بناغەی پادشایەتییەکیان دامەزراندبوو کە حکوومەتی بە سەر ناوچەیەکی بەربلاوی چیا و دەشتان‌دا دەکرد و بەشێکی گرینگی لێوارەکانی کەنداوی فارس هەتا بووشێهری دەگرتەوە. بەردەنووسی پادشایەک کە بە زمانی سۆمێری نووسراوە لەم ناوچەیە دۆزراوەتەوە، چونکە لەو سەردەمەدا ئەگەرچی عیلامییەکان خاوەنی خەتی تایبەتی خۆیان بوون، بەڵام بە خەتی دراوسێیەکانیان دەیاننووسی و تەنانەت کاریان بە زمانەکانیشیان دەکرد. کاتێک زنجیرەی میرانی سامی‌ڕەگەزی سارگۆن لە «ئاگادێ» بناغەی حکوومەتیان دانا، عیلام بۆ پاراستنی ئازادی و سەربەستیی خۆی کەوتە شەڕ و ملانەیەکی توندوتیژ. هێزەکان بارتەقای یەکتر نەدەهاتنەوە و یەکیان لاسەنگ بوو. سەرکەوتەی گەورە دوو جاری عیلام بەزاند و تەنانەت وێدەچێ کە «شووش»یشی وەسەر قەڵەمڕەوی خۆی گێڕابێ. وادیارە «مانیشتووسوو»ی کوڕی سارگۆن لە شەڕی دژی عیلام‌دا سەرکەوتووتر بووە و تەنانەت هێزەکانی دەگەنە واوەتری کەنداوی فارس هەتا ئەو شارێیە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان کە کەرەسەی خانووبەرە و کانزای کانگاکانی چیانشینانی پێدا ڕادەگوێزرا. لە ڕۆژگاری «نارام سین»دا، هەرا و ڕاپەڕینێک کە عیلامی گرتەوە هەتا چۆمی «زێ»یە، زۆر بە توندی سەرکوت کرا (و ٧). نارام سین کارگێڕێک بۆ حکوومەتی شووش دادەنێ و ئەویش چەند کۆشکەڵ و خانووبەرەی جوان و خۆشی لێ ساز دەکا. زمانی ئەکەدی، زمانی عیلامی دەبەزێنێ و تەنانەت ناوی خەڵکیش زۆربەیان دەبنە سامی. لاساکردنەوەی کوێرانە، کولتووری خۆماڵی دەخاتە مەترسی، بەڵام لە سایەسەری جێپەنا و پەسیوە سەخت و چڕ و ئەستەمەکانی، خۆی بۆ ڕادەگیرێ. ئەوەی ڕاستی بێ ڕێبازی ئاشتیخوازانە و شارەزایانەی نەتەوەی




٢٠ـ نەخشەی شوێنەوارناسیی ئاسیای خۆرنشین

پێملکراو، وردەوردە بارودۆخەکەی بردەوە سەر ڕەوتی جارانی. یەکێک لەوان بە ناوی پووزوور ئینشووشیناک کە نارام سین دەیکاتە حوکمداری گەورەی شووش و دەچێتە جێی سەرکردەیەکی سامیڕەگەز، بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی بەدی دێنێ و هێندەی پێناچێ کە عیلام لە ژێر دەسەڵاتی بێگانە دەرباز دەکا. ئەم حوکمدارە گەورەیە لە لایەکەوە شانبەشانی دەقی ئەکەدی، دەقی زمانی عیلامی و خەتی عیلامیشی برەو پێدا کە بە ڕیز لە سەرەوەڕا بۆ خوارەوە دەنووسرا و لە لایەکی دیکەوە بە بیانووی پاراستنی قازانج و بەرژەوەندیی سەرۆکی سامیڕەگەزی خۆی، بەرفرەوان کردنەوەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ڕەچاو کرد و ئەسپی بەرەو ناوچە دوورەدەستەکانی باکووری تاو دا و تەنانەت پەیوەندیشی لەگەڵ گووتییەکان دامەزراند. پووزوور ئینشووشیناک کە پیاوێکی ئاوەدانکەرەوەی گەورە بوو، بە تێرژاندنی خەنیمەت و دەسکەوتی پەلامارەکانی بۆ سەر هۆز و نەتەوە بەزیوەکان، شووشی خەنی کرد و کۆمەڵێک پەرستگا و خانووبەرەی لێ ساز کرد. وای لێهات کە میران و قوڵەپادشاکانی دراوسێی چوونە خزمەتی و سەریان وەبەرهێنا. ئەم سەرۆکە پاش نەمانی نارام سین سەربەخۆیی ڕاگەیاند و بە سەرکردایەتیی خۆی هێرشی بردە سەر بابل و تەنانەت پێی نایە خاکی «ئەکەد»یش، بەڵام زۆر بە زەحمەت پاشەکشەیان پێکرد. لەوی بەو لاوە بە یەکجاری لە پادشایەتیی لاوازی ئەکەدی دابڕا و توانی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ. دارزانی دەسەڵاتی پادشایەتیی ئەکەد لە چاوی دراوسێیانی چیانشینی ون نەبوو. سەربەستی و سەرکەوتنەکانی پووزوور ئینشووشیناک هێز و ورەی وەبەرنابوون و کارێکی وای کرد هەتا گووتییەکان و لۆلۆبییەکان یەک بە دوای یەکدا لە بەرزەبنارانەوە دابەزن و هەڵکوتنە سەر بابل و بیگرن.

لۆلۆبییەکان ئەو ناوچە و مەڵبەندانەیان گرت کە کەوتوونە سەر ڕەوگەی شارێی کۆنی بەغدا و کرماشان کە بەرەو هەمەدان و تاران دەڕوا و هەتا ئێستاش هەر ماوە. تەمەنی ئەم ڕێگایە چەند هەزار ساڵە و یەکێکە لەو دەگمەن بازگە سروشتییانەی ڕوو دەکاتە بانووی ئێران. سارگۆنی ئاگادێ، پێشتر ئەم تیرە و هۆزە چیانشینانەی بەزاندبوو، بەلام قورسترین زەبر نارام سین وەشاندی. پاش ئەو سەرهەڵدانەی کە باسی کرا، حوکمداری سامیڕەگەز، لە شەڕ و تێکهەڵچوونێکی بەربلاودا، توانی هاوپشتی و یەکانگیریی گووتی و لۆلۆبییەکان تێکبشکێنێ و یاد و بیرەوەریی ئەم سەرکەوتنە لەسەر تاشەبەرد و تەلانی کێوێکی«شارەزوور» هەڵکەندراوە و بە نەمری ماوەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ لەم زەمانەدا وەکوو پێشوو، تێکهەڵەنگووتنی هۆزەکانی شاخستانی و ڕەوەندەکانی دەشتەکی هەر نەدەگەڕایەوە سەر شەڕوشوور. جەماوەری چیانشین بەپێی هەلومەرجی ژینگەی خۆیان، ڕێگاکانی بەرەو باڵی خۆرنشینی ئێرانیان بە دەستەوە بوو. بەم شێوەیە بزووتن و هاتوچۆی کاروانەکانی بازرگانی دەکەوتنە ژێر چاوەدێری. ئەگەرچی ئەوان خۆیان بە خەنیمی بابل دەزانی، بەلام دیسانیش کالا و کەلوپەلیان بۆ دەنارد و لە ڕەوتی هەڵسوکەوتی ئاشتیخوازانەی بازرگانیی خۆیاندا، بەناچاری دەکەوتنە ژێر باندۆری دراوسێیانی شارستانیتر. ئەم بابەتە لە ڕووی دوو بەردەتاشەوە ڕوون دەبێتەوە و دەسەلمێ کە بە فەرمانی دوو کەس لە پادشاکانیان لەسەر تاشەبەردەکانی ناوچەی «سەرپێڵی زەهاو» هەڵکەندراون و واوێدەچێ کە لانیکەم یەکیان وێنەی لە بەردەتاشی«نارام سین» هەڵگیرابێتەوە (ق ٢١). لەم دیمەنەدا، میرێکی خۆماڵی کەوانێکی بە دەستەوەیە و پێی ناوەتە سەر سینەی

دوژمنێکی بەزیوی پشتەوقەفار، کە وادیارە دەپاڕێتەوە و داوای لێبووردن دەکا. ئەم بەردەتاشە کە زۆر هەڵوەریوە، دەڵێ ئەم میرە ناوی «تارلوونی»یە.

بەردەتاشێکی دیکە کە زیاتر جێی بایەخە و بریتییە لە دوو دیمەن، کەوتۆتە سەر سینەی ڕەوەزێکی زارکی ڕێگای گوندی تازەی سەرپێڵی زەهاو. ئەم بەردەتاشە دیمەن و قەڵافەتی «ئەنووبانینی»ی پادشای لۆلۆبی دەخاتە بەرچاو کە ڕیشی درێژ و تەشویێتاشە و کڵاوێکی تەپلەخڕی کردۆتە سەری و جلوبەرگی کورتی کردۆتە بەری و کەوانێکی پێیە لەگەڵ تەورێکی ساکار. پادشا دوژمنێکی پشتەوقەفاری پێخوست کردووە و لەسەری چەقیوە.



ق٢١- بەردەتاشی هوورین لە شێخخان

خاتوونەخوای«نینی» بەرەوڕووی ڕاوەستاوە و کڵاوێکی وەک سەلکەزوڕنای لە سەری ناوە و باڵاپۆشی پەشمینی کوڵکن و شۆڕابەداری ئاودامێنی دەگاتە سەر گوێزینگی. نینی دەستێکی بەرەو پادشا ڕاداشتووە و بە دەستەکەی دیکەی دوو دیلی ڕووتی پەت کردوون. وەکوو دیارە لە دیمەنەکەی لای بەرەوەدا شەش دیلی دیکە ڕست کراون. دیلەکان هەموو ڕووتن و دەستیان لە پشتەوەڕا بەستراوە. دەقێک کە بە زمانی ئەکەدی نووسراوە، پاڕانەوەی تێدایە لە دەرگانەی کۆمەڵێک خێو و خاوەند ـ کە زۆربەشیان ئەکەدین ـ هەتا دژی دوژمنانی یاریدەی بدەن (ق ٢٢).

ئەوەی ڕاستی بێ چونکە بەردەتاش و بەردەنووس لەم سەرزەمینەدا زۆر کەمن، ئەم دووانەی باسمان کردن خاوەنی نرخ و بایەخی تایبەتین بۆ بەرچاوڕوونی سەبارەت بە کولتووری خۆجێیی. هەموو دیاردە و نیشانەکان دەریدەخەن کە جەماوەری ئەم ناوچەیە خاوەنی خەتێکی تایبەت نەبوون هەتا زمانی خۆیانی پێ بنووسنەوە. لە ڕاستیدا واوێدەچێ کە ئەوان لەو ڕۆژگارەدا کەموزۆر کەوتوونە ژێر باندۆری شارستانییەتی بابلی و لەبەر تێکەڵاوبوون و هاتوچۆیان لەگەڵ دراوسێیانی باڵی خۆرنشین، فێری خەت و زمانی ئەکەدی بوون و کاریان پێکردوون. هەروەها دەکرێ بڵێین کە هاوکات پۆلی ئەنگوستبژێری هونەرمەندانیان لە شوێنەوارەکانیاندا هەتا ڕادەیەکی یەکجار زۆر کەوتوونە ژێر باندۆری هونەری دووچۆمانی. لێرەشدا وەکوو عیلام، شارستانییەتی دووچۆمان بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە یان لە ڕێگای زەبروزەنگی سپاوە دزەی کردە ناوچەکە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەرک و دەوری ئێرانییانەی ئەم دوو بەردەتاشە، یەکجار گرینگ و نەپساوەیە. بیری داتاشینی دیمەنی ئەوتۆ پەرەی گرت و بە درێژاییی مێژووی لەمێژینی ئەم سەرزەمینە، پادشایان وێنەیان

لێهەڵگرتوونەوە. ئەم بەردەتاشانە کە تۆماری شەڕ و تێکهەڵچوونیان بە ڕووکارەوە دیارە و کەوتوونە سینەی ڕەوەزان و لەسەر ڕەوگەی کاروانان خۆیان دەنوێنن، تەنەوەیان کردە گۆشە و کەناری ئێران.



ق٢٢ـ بەردەتاشی ئەنووبانینی، پادشای لۆلۆبییەکان

لە نێوەڕاستەکانی ئەم هەزارەیەدا، پەلاماری گووتییەکانی چیانشین لە باڵی خۆرنشینی چۆمی زێی بچووکەوە کە دابەزیبوونە دەشتی دیالە، حکوومەتی بابلیان خستە لەرزە. گووتییەکان لە ماوەی چەند سەدەیەکدا هەڕەشەیەکی

بێپسانەوە بوون بۆ سەر جەماوەری دەشتەکی. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە بەستێنەکانی ڕووباری باڵەک (بالیخ) کراون و لقێکی ڕووباری فوراتە، ڕوون بۆتەوە کە سارگۆنی ئاگادێ (ئەکەد) بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی ئەم چیانشینانە، بناغەی شوورە و قەڵاتێکی قایم و پتەوی داناوە و جێنشینەکانی پەرەیان پێداوە. ئاکامی هێرش و پەلاماری چیانشینان سەرەنجام سەرکەوتنی بە شوێن‌دا هات و خاشەی حکوومەتی ئاگادێیان کێشا. وێدەچێ کە عیلامیش لە چنگیان دەرباز نەبووبێ. گووتییەکان بۆ ماوەی ١٢٥ ساڵ بوونە ئاغا و کوێخای دڕ و بێبەزەی ناوچەکە. شار و گوندیان کاول کردن و شیرازەی چەند حکوومەتێکیان پساندن و خاشەیان کیشان و تەنیا دەستیان لە چەند قوڵەمیرێک نەبزاوت.

لیزگەی درێژی پادشاکانیان، نیشانەی سەردەمێکی پڕ ئاژاوەیە. وادیارە لە دەوروبەری کلکەی دەسەڵاتی گووتییەکان‌دا، کولتوور و شارستانییەتی بابل گیانێکی تازەی وەبەر هاتۆتەوە و توانیویەتی پەکی هەنگاوی تێکدەرانەیان بخا. بەم شێوەیە جووڵانەوە و خەباتێکی بەرەبەرە دژی ئەوان پێک دێ و زنجیرەی پادشایانی تازەی ئوور لێیان وەخۆ دەکەوێ. پادشایانی شەڕکەری بابل هەڵیانکوتایە سەریان و تێکیان‌شکاندن. دیسانیش شووش و تەواوی دەرە و دەشتی سەر بە بابل و هەرێمەکە دەچنەوە سەر دۆخی جارانیان؛ بەڵام تەمەنی دەسەڵاتی ئەم خانەدانە کورتی هێنا. هێشتا سەدەیەک بە سەر دەسەڵاتیان‌دا تێنەپەڕیبوو کە ئاخرین پادشایان بەزی و بە دیل بردیانە چیا. ئەم جار نۆرەی سەرهەڵدانی سەرکەوتەیەکی نوێ بوو بە ناوی «سیماش» و وێدەچێ خەڵکی شاخستانەکانی خۆرنشینی ئیسفەهان بووبێ. سیماشی پادشا لەو دیوی چیای زاگرۆسەوە شانی لە شەڕی پادشایانی بابل شل کرد و هاوکات دەسەڵاتی

بە سەر شووش و عیلامیش‌دا شکایەوە و حکوومەتی بە سەردا کردن. هێندەی پێنەچوو کە بەرەیەک بە دژی خانەدانی سیماش پێکهات و زنجیرەی پادشایانی «ئیسین» بناغەی دەسەڵاتیان دانا و عیلامیان گرت و بنەیان بە حکوومەتی خانەدانی سیماش هێنا، بەڵام بۆ جارێکی دیکەش دایانەوە دەست بێگانان.

لە مەودای هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا، نرخ و بایەخی دەوری ئێران لە ژیانی هۆز و نەتەوەکانی ئاسیای خۆرنشین‌دا ڕوون دەبێتەوە. پادشایەتییە گەورەکانی دووچۆمان کە لەسەر تەوەرەی ئابووریی گەشەکردووی شارستانی هەڵدەسووڕان، لە بواری ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریی خۆیان‌دا چاکیان هەڵدا و یەکڕۆژەیان، دووڕۆژە بوو. پێویستیی ئەوان بە کرینی کەرەسەی خاو بۆ ساز کردنی خانووبەرە و چەکوچۆڵ و کەلوپەلی هونەری و ڕەچاوکردنی قازانجی گشتی پەرەی ئەستاند. شان‌بەشانی پێهەڵچوونی دەسەڵاتی میری، زۆربەی کەلوپەلە پێویستەکان لە چەند ناوەندێکی دووچۆمان ساز دەکران. هەڵوێست و ڕێبازی ئابووریی پادشایان، ئەم شوێنانەی ناچار کرد هەتا زیاتر لە پێشوو بکەونە دوای دۆزینەوەی بازاڕی کڕین و فرۆشتن. جا بە مەبەستی وەدی هێنانی ئەم ئامانجە لە سەردەمی حکوومەتی سارگۆنی ئاگادێ‌دا، چەند کۆمەڵێکی بازرگانان لە ئاسیای بچووک کەوتنە جموجووڵ. ئاسیای بچووک ناوەندێکی ڕاستەقینەی ئاڵوگۆڕی کاڵا بوو بۆ بازرگانانی سامی هەتا بتوانن کەلوپەلە پێویستەکانی وڵاتی خۆیان دابین بکەن. ئێرانیش وەک پێویست توانیبووی سەرنجی حکوومەتە شلک و تازەکان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و چونکە دەکەوتە پاڵەوپاڵ و نیزیکیان و پڕ بوو لە کانگای دیار و دەوڵەمەند، تەواوی ئەوانەی لە خۆیان ڕادەدی، قرمیان لێ خۆش کردبوو کە باڵی خۆرنشینی بخەنە سەر قەڵەمڕەویان. وەکوو ئاشکرایە ئەم خاکە قورقوشمی ئەرمەنستان و

لاژوەردی «بەدەخشان»ی پێدا ڕادەگوێزرا، بەڵام خۆشی لە هەرێمی «ماد» خاوەنی کانگای دارمالی زێڕ و هەروەها قورقوشم و قەڵایی بوو. بەردی چاک و لەباری بۆ دانانی کۆشک و پەرستگاکانی بابل دەناڵی و داروباریشی یەکجار بەناوبانگ بوو. لە هەزارەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا پادشایانی بابل بە دوو مەبەست تینیان بۆ ئێران دێنا: یەکەم بۆ ئەنگاوتنی ئامانجی سیاسی، یانی خۆیان دێناودەبرد و قۆشەنیان دەبزاوت هەتا ڕێ لە پێکهاتنی حکوومەتێکی ڕێک‌وپێک بگرن و ئاوا بتوانن ناوچەکانی دراوسێیان بهاوێنە سەر قەڵەمڕەویان و شارستانییەتی خۆیان بە سەردا بسەپێنن، جا کاتێک ئامانجی یەکەم وەدی هاتبا، ئەوی دیکە هەر بە لێوان بوو، کە بریتی بوو لە باری ئابووری و ڕاگواستنی سامانی ئێران بۆ ناوەندەکانی بابل؛ بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ سەرەڕای بێ‌هێزی و لاوازیی حکوومەتەکانی، لەم کێشە و ملانەیەدا سەرکەوت. لە ماوەی ئەم هەزارەیەدا چیانشینانی ئێران دوو بەرەی پادشایانی بابلیان تل پێدان و خاشەیان کێشان. ئەم خانەدانەی کە سارگۆنی ئاگادێ (ئەکەدی) بناغەی حکوومەتی بۆ دانابوون بە دەستی گووتییەکان تێداچوون و پادشایانی خانەدانی سیماش، تۆماری تەمەنی ئەو زنجیرە میرانەیان تێکەوەپێچا کە بە سێهەمین زنجیرەی ئوور ناسرابوون.

ئێمە هیچ شتێک سەبارەت بە باری سیاسیی بانووی ئێران و تەنانەت بارودۆخی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دووچۆمان نازانین؛ بە چەشنێک کە سنووری دەسەڵاتی پادشایەکی عیلامی، لۆلۆبی یان گووتی بە لامانەوە ڕوون نەبۆتەوە. لە سێلکە بۆ ماوەی نیزیک ۲۰۰۰ ساڵ بە سەر کەلەبەر و بۆشایی‌دا دەکەوین و سەرچاوەی زانیاریمان کوێر دەبێتەوە؛ بەڵام لە «گیان» ڕەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی بەبێ ئاڵوگۆڕێکی قووڵ و گرینگی جێی باس درێژە دەکێشێ.

**هونەری هەورگەری لەسەر ڕەوتی بەرهەمهێنانی سواڵینەی نەخشین دەڕوا و شوێنەوارەکان زۆر وەکوو ئەوانە دەچن کە لە شووش دۆزراونەوە و بە شێوازی دووهەم ناودێر کراون (ق٢٣).**



ق٢٣ـ شووش: دەفرێکی سواڵین، سەر بە شێوازی دووهەم

ئەو دەفرانەی دۆزراونە وەکوو دیزەڵەی بن خڕ دەچن و لای سەرەوەیان بە ڕەنگی ڕەش نەخشێندراوە. بەرچاوترین دیمەنی سەر ڕووکاریان باڵندەی باڵئەنگاوتوویە. ئەم شێوازە کە بۆتە هەوێنی سەرەکی، باوی ناسراوی هونەری دووچۆمانە و هەڵویەکە و ڕۆبۆتە نێچیری (ق ٢٤).



ق٢٤ـ گیان: دەفری سواڵین، سەر بە چینی چوارەم

لە کۆنە قەبرەکانی ئەم ناوچەیەدا، کۆمەڵێک خشڵی مزقەڵایی[1] و زێوین، نیوتانج و بەرمووری مرواری و گوارە دۆزراونەوە. ئەو دەرزیلانەی کە دامێنی

١ـ مەفرەق. مەفرەغ یان برۆنز.و.

جلوبەرگیان پێ لە یەکتری قایم کردوون و لە مزقەلآیی ساز کراون یەکجار زۆرن. هێندێکیان وەکوو دەرزی سەریان پەخ نەکراوەتەوە و هێندێکیان سەریان پەخ و پان یان قووچەکییە و وەکوو ئەوانە دەچن کە لە گۆڕەکانی پادشایانی «ئوور»دا دۆزراونەوە. لە «تەپەی حەسار» کاری جێگۆڕکەی سوالێنەی ڕەنگین لەگەڵ سوالێنەی «ڕەش ـ بۆر» کۆتایی پێدێ. لە باڵی خۆرنشینی بانووی ئێران، نیشانەی گەشە و پەرەی بەرچاوی بواری کانزاگەری بەدی دەکرێ، بەتایبەت ئەو شتە بچووکانەی کە زۆربەیان لە مزقەلآیی ساز دەکران. مزقەلآیی لەو سەردەمیدا کەم بووە و ڕەنگە بایەخی لە زێڕ و زیو پتر بووبێ. ئێران لەم ڕۆژگارەدا پێ دەنێتە چاخی مەفرەق.

### ئێران لە هەزارەی دووهەمی پێشزاییندا

بەرچاوترین ڕووداوی نێو مێژووی ئاسیای خۆرنشین لە ماوەی هەزارەی دووهەمی پێشزاییندا، پەیدابوونی ئەو هۆزانەن کە دەکرێ لەو برگە زەمانییەدا بە هیندوئورووپایی ڕەسەن و خۆماڵی ناودێر بکرێن. ئێرانیش لەم ڕەوتی کۆچوبارە دەرباز نابێ، بەڵام ئەم کۆچەرە تازانە ناتوانن دەورێکی بەرچاو لە بانووی ئێراندا بگێڕن. وادیارە ئەم هیندوئورووپایییانە لەبەر تین هێنانی تیرە و هۆزەکانی دیکە، زێد و نیشتمانی خۆیان بەجێهێشتبێ و لە دەشتەکانی «ئووراسی»ی باشووری ڕووسیاوە داوەریبن. وادیارە کە لە جەنگەی کۆڕەودا بوونە دوو قۆڵ، یەکیان کە ئێمە پێی دەڵێین لقی خۆرنشین بە دەوری دەریای ڕەشدا لێهاڵانەوە و پاش تێپەڕین بە «باڵکان» و «بۆسفۆر»دا، دزەیان کردە نێو خاکی ئاسیای بچووک. ئەم لقە لە نێو نەتەوەکانی ئاسیاییدا، کە وێدەچێ دانیشتووانی ڕەسەنی ناوچەکە بووبن، بنەی دادەکوتێ و هێندەی پێناچێ کە

**دەگەنە قۆناخی باڵادەستی و یەکییەتیی هیتییەکان[1] دادەمەزرێنن. دواتر ئەو پادشایەتییەی پێکی‌دێنن، دەبێتە یەکێک لە چالاکترین ئەندامانی یەکییەتیی حکوومەتانی ڕۆژاوا. هیتییەکان سەرکەوتنەکانی خۆیان لە ئاسیای بچووک پەرە پێدا و هەتا بابلیش کردیانە شەڕانخێوی و گرتیان و دایانڕووتاند. ئەوەی ڕاستی بێ ئەم هێرشە سەرکەوتنێکی بێ‌ئاکام بوو. چونکە ئەوان نەیانتوانی درێژە بدەن بە سەرکەوتنەکانیان و خێرایەکی وەرسووڕان و پاشەکشەیان کرد؛ بەڵام هەر ئەم هۆزە پاش تێپەڕاندنی قۆناخێکی تێمان و کرێ و بێ‌وازی لە نیوەی دووهەمی هەزارەی بەرباس‌دا، سەرلەنوێ وەخۆ کەوتنەوە و هێزێکی زۆریان تێزایەوە و لە ئاکام‌دا چەند حکوومەتێکی دراوسێیان تەفروتونا کرد و خاشەیان کێشان، بۆ نموونە پادشایەتیی هووریان و میرانی میتانی تێداچوون دوابەدوای ئەم کارانە، کەوتنە بەرەوڕووی میسر کە ئەو سەردەمی لەوپەڕی پەرەی دەسەڵاتی خۆی دابوو لە ناوچەی سووریا و فەلەستین.**

**لقی ڕۆژهەڵاتی کە بە ناوی هیندوئێرانی ناسراوە، بە شانی ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەردا خرمژنی کرد. دەستەیەکیان کە وادیارە دەبێ زۆربەیان کەسانی شەڕکەر بووبن، لە «قەفقاز»ەوە تێپەڕین و هەتا گەوە و پێچی ڕووباری فورات گیر نەبوون. ئەوان لەگەڵ هووریانی خۆجێیی، کە هۆزێکی ڕەسەنی ئاسیایی بوون، تێکەڵاوبوون و پادشایەتیی میتانییان پێکهێنا و بۆ پەرەی دەسەڵاتیان هەر بە دووچۆمانی باکوورییەوە نەوەستان، بەڵکوو دەوری حکوومەتی ئاشووریشیان تەنی و دۆڵ و دەرەی زاگرۆسی باکووریشیان وەسەر خۆیان گێڕا کە مەوتەنی هۆزی گووتی بوو. بەم شێوەیە توانییان بناغەی دەسەڵاتیان پتەو بکەن. پڕشنگدارترین زەمانی درەوشانەوەی دەسەڵاتی ئەم**

---

١ـ خوتییەکان

پادشایەتییە دەگەڕێتەوە بۆ دەورووبەری ساڵی ١٤٥٠ی(پ.ز). میسر بوو بە هاوپەیمانی و بە دەسەڵاتترین فیرعەونەکان، کچیان دان بە پادشایانی میتانی؛ بەڵام کێشە و هەرا و ڕقبەرقەی نێوخۆی خانەدانی میری، حکوومەتی وا بە سەر کزی و لاوازیدا خست کە ئیتر نەیتوانی لە حاند هێز و بڕشتی پەرەگری حکوومەتی هیتیدا خۆی بگرێ و سەربەستیی بپارێزێ. لە بنەبانی سەدەی چاردەهەمی پێشزایینیدا، میتانییەکان بە یەکجاری لە لاپەڕەی ڕۆژگار پاک بوونەوە، بەڵام شارستانییەتێکیان لە پاش خۆیان بە میرات بەجێهێشت، کە هونەری پتەویان توانی لە نێو هونەری سۆمێرییەکاندا ڕیشە دابکوتێ و بە تێکەڵ بوون لەگەڵ جوانکاریی میسری و «ئێژەیی» دەوڵەمەندتر بوو. وادیارە کە دوای تێکەوەپێچرانی تۆماری تەمەنی پادشایەتیی میتانی، هوورییەکان توانییان کاکڵ و شیلەی هەوێنی ژیارمەندی و کولتووری هیندوئورووپایی وەربگرن و تەنیا چەند لایەنێکی دین و ناوی خودایانی خۆیان وەکوو یادگار پاراست. بەم شێوەیە بەپێی ڕێکەوتنێکی کە لە نێوان پادشای هیتییەکان و پادشایەکی میتانیدا نووسراوە، ناوی چەند خودایەکی وەکوو میترا(مێهر)، ڤاروونا، ئیندرا و نازانیا هاتوونە گۆڕ، کە هەموویان دەگەڕێنەوە نێو باوەڕی میتانییەکانی هیندوئورووپایی. ئەم خودایانە لەو کاتەدا توانیویانە لە هیند جێگای خۆیان خۆش بکەن و لە لایەن هیتییەکان و کاسییەکانەوە ڕێزیان لێ گیراوە. هیندوئێرانییەکان چەند دەقێکیان سەبارەت بە بەخێوکردن و ڕاهێنانی ئەسپ لە پاش بەجێماوە کە وێدەچێ خۆیان هێنابێتیان بۆ ئاسیای خۆرنشین. بەپێی ئاسەوارێکی دیکە وادیارە هیندوئورووپایی باوەڕیان بە دینێکی جووتخودایی بووە. یەکیان بریتییە لە خودای مەزن کە دەبێتە خودای توخم و ماکەکانی

سروشتی، لووتکەی چیاکان، ڕەشەبا و باران و ئەوی دیکەیان خاتوونەخوایەکی گەورەیە کە جاری وایە [سەمبولی] خۆرە و هەلی وایە [سەمبولی] زەمینە.

لقێکی ئەم شەنگەسوارە شەڕکەرانە، بە شانەوشانی پێچ و گەوە و کەلەکاوکەلەکی زاگرۆسی ناوەندیدا ئەسپیان تاودا و گەیشتنە ناوچەیەکی بەرەوەی شارێی کاروانان، ناوچەیەکی کە بۆ بەخێوکردنی ئەسپی ڕەسەن بەناوبانگە. ئەوان وەکوو کەمینەیەکی چالاک لەم ناوچەیە بنەیان داکوتا، بەڵام وادیارە کە هەر خێرایەکی بە دەست جەماوەری هۆزی کاسی کە بە ڕەسەن ئاسیایی بوون، بەرەو توانەوە چوون. بە گشتی تەنینەوەی هێز و دەسەڵاتی ئەم لقە بچووکەی هیندوئوورووپایی هەتا ڕادەیەک وەکوو ڕووداوی هەڵمەتی کیمیرییەکان و سەکاییەکان دەچێ لە سەدەی هەشتەمی پێش‌زایینیدا. دەبێ لەم پێداچوونەوە خێرایەی ڕەوتی مێژوودا سەبارەت بە پەیدابوونی تۆرەمەیەکی تازە لە ئاسیای خۆرنشین، ئەم خاڵەمان لەبەرچاو بێ: هەر جارێک کە لە ڕووی بەڵگە و شانیکی کۆن و پەتەوڕا، تێکەڵاوبوون و لێکدرانی دوو تاقمی ڕەگەزیی زۆر جیاوازی وەکوو ئاسیایی و هیندوئوورووپایی، ڕوون دەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر تێکەڵاوبوونەکە لاسەنگیش بووبێ، کەم و زۆر بۆتە هۆی سەقامگیربوونی ڕەگەزی تێکەڵاو یان دوورڕە لە بواری سیاسی، سپایی، ئابووری و کولتووریدا و ئەم ڕەوتە لە چاخی بەرلە مێژوودا جێی سەرسوڕمانە. هەر بۆیە ئەو حکوومەتانەی کە لە پێش‌دا تەنیا بریتی بوون لە چەند میرنشینی بچووکی پرش‌وبڵاو و دەسەڵاتیان بە سەر کۆمەڵێک شاری سەربەست یان پەرستگا و جەغزێکی دینیدا دەڕۆیشت، بوونە چەند کۆنفێدراسیۆنێکی بەهێز و تەنانەت توانییان کۆمەڵێک پادشایەتیی چالاک و بەدەستوبرد دامەزرێنن و بە تین و تاو بەرەوپێش باژوێن و بکەونە ڕیزی پێشەوەی حکوومەتە هێزدارەکانی

هاوچەرخیان. ئاوا بوو حاڵ‌وباڵ و چارەنووسی هیتییەکان و میرانی میتانی و وەکوو دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە «کاسی»یەکانیش هەر ئەم ڕەوتەیان پێواوە.

سەرەنجام ئەو تیرە و هۆزە گەورانەی کە پێکهێنەری لقی ڕێک و یەکانگیری باڵی خۆرهەڵاتی کۆچەرانی هیندوئورووپایی بوون، بەرەبەرە بەرەو خۆرهەڵات داخزین و لە ئەوبەررووبار (ماورالنهر) و جەیحوون (ئاموودەریا) تێپەڕین. پاشان دوای مانەوەیەکی کەم و کورت لە دەشتی باکتەریا (بەلخ)، بە دەربازگەکانی هیندوکوش‌دا هەڵکشان و کەوتنە سەر ڕەوگەی لەمێژینەی هێرشبەرانی هیندی و بە ڕێ‌وبانی «پێنج‌شێر» و ڕووباری «کابول»دا شۆڕ بوونەوە. هەڵبەت ڕەنگە لە جەنگەی هرووژمی تێپەڕینیان بە باکتەریادا چەند تیرە و تۆرەمەیەکیان بەرەو خۆرنشین ڕادابێ، بەڵام داخوا ئەوان لەو زەمانەدا شیاوی ئەوە بوون کە بتوانن دەست بە سەر ناوچەی «حەسار»دا بگرن؟ سەبارەت بە دوایین قۆناخی نیشتەجێ‌بوون لەم دەشتەدا، بۆچوونەکان جیاوازن و قرەی توێژەران نەبڕاوەتەوە، چونکە بەپێی ئەو کەندەوکۆڵانەی لێی کراون، وادیارە هەڵمەتێکی بەگوڕ، ڕەگ و ڕیشەی دەرهێناوە. ئەگەر زەمانی پەلامارەکە سەبارەت بێ بە نێوەڕاستەکانی هەزارەی دووهەمی پێش‌زایین، دەبێ ئەم خاشەکێشانە بدرێتە پاڵ ئەو بزووتنەوەی هیندوئورووپایی کە پێشتر باسمان کردن؛ بەڵام ئەگەر بێتوو پێمان وابێ پەلامارەکە دەکەوێتە سەدەکانی بنەبانی هەزارەی دووهەم، دەبێ گومانمان بچێتە سەر شەپۆلی تازەی جەماوەری هیندوئورووپایی کە ئێرانییەکانیان هێنایە نێو خاکی بانووی ئێرانەوە.

**عیلام**

لە هەزارەی دووهەمی پێشزاییندا، لە عیلام حکوومەتێکی تازەی پادشایەتیی نەتەوەیی دادەمەزرێ کە پادشاکانیان بە خۆیان دەڵێن: «خودا، باوکی گەل و پادشای ئەنزان و شووش.» لەم سەردەمەدا بەڵگەنامەکانی ئابووری بە زمانی ئەکەدی نووسراون، بەڵام هەبوونی کۆمەڵێک وشەی خۆجێیی، نیشانەن بۆ گەشەی شارستانییەتی خۆماڵی و نەتەوەیی و ئەم ڕەوتە لە بواری دینیشدا هەر وایە؛ ئێمە لێرەدا تووشی خاتوونەخوای «شالا» و«ئینشووشیناک»ی شووی دەبین کە بەرەگەیان لە خودایانی بابلی بڕیبۆوە. لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی پێشزایینەوە، عیلامییەکان پەلاماری بابلیان دا و گرتیان و یەکێک لە مەزنەکانیان لەوێ زنجیرەی پادشایەتییەکی تازەی دامەزراند. ماوەیەک دواتر عیلامییەکان حکوومەتی پادشایانی «ئیسین»یان ڕووخاند و هەروەها دەستیان بە سەر شاری ئووروک و بابلیشدا گرت. کاتێک پادشای بەرزەجێ «حامووڕابی»[1] لەسەر تەختی پادشایەتیی بابل پاڵی دایەوە، بوو بە کۆسپی سەر ڕێگای پەرەی دەسەڵاتی عیلام. عیلامییەکان پاش هەوڵ و تێکۆشانێکی بێهوودە لە پێناو پاراستنی خۆیاندا لە لارسا، تێکوپێک شکان و ناوی عیلام بۆ ماوەی سەدەیەک لە ساڵنامەکان سڕایەوە؛ بەڵام پاش ئەم ماوەیە پادشایەکی نەتەوەیی بە ناوی «کووتیر ـ ناخوونتێ»[2]، سەرلەنوێ حکوومەتێکی بەهێز دادەمەزرێنێتەوە و عیلامی ناویان دیتەوە ئارا. بەڵگەنامەکانی سەر بە سەردەمی دەسەڵاتی کووتیر ـ ناخوونتێ بە زمانی ئەکەدی نووسراون و ئاوا دەردەکەوێ کە بڕشت و بڕستی جیهانی سامی لە ماوەی سەدەی ڕابردوودا چەندە

---

١ـ حەمووڕابی
٢ـ کووتیر ـ ناهوونتێ

بەهێـز بـووە. دوای دەیـان سـاڵی دیکـە ئیدی ئێمـە تـووشی نـاوی عیلام نـابینـەوە و لـە پـەڕوپۆ دەبێتـەوە و بنـەی دێ. بـەم شـێوەیە سـەردەمی سەرکەوتنە بەرچاوەکانی کاسییان دادێ.

**کاسییەکان**

بەپێی هێندێک بەڵگەنامە و نیشانەی کۆن، وادیارە لە سەرەتاکانی حکوومەتی کـوڕی حـامووراپیدا، قۆشـەنی بابـل توانیبوویـان بەرپـەرچی پـەلامارەکانی کاسییەکان بدەنەوە. لەوی بەو لاوە بۆ ماوەی سەدە و نیوێک، بابل کەوتە بەر شەپۆلێکی نەرم و پێدزکانەی ئەو چیانشینانەی ڕوویان دەکردە دەشتان و بە شـوێن کـاردا دەگـەڕان. کاسـییەکان لـە نێوەڕاسـتەکانی سـەدەی هەژدەهـەمی پێش‌زایین‌دا، بە زۆرەملـی خۆیـان بـە بابل‌دا کرد و بـە زەبـری هێزی چەکدار حکوومەتەکەیان ڕووخاند. زاڵبوونی ئـەوان کە بـە درێژتـرین و خـۆڕاگرترین دەسەڵاتی دەرەکی دادەندرێ لە دووچۆمان، ٥٧٦ی ساڵی درێژە کێشـا و هـەتا ساڵی ١١٧١ی پ.ز. بڕی کرد. زێد و نیشتمانی سـەرەکیی کاسییەکان، کەم‌وزۆر دەبێتە جەرگەی ئەو زنجیرە کێوانەی کە ئەمڕۆ بە لوڕستان ناسراوە؛ بەڵام بە بـڕوای تاقمێـک لـە تـوێژەران، قەڵـەمڕەوی دەسـەڵاتیان لـە بـاڵی بـاکوور و ڕۆژهەڵاتەوە خۆی کێشابۆوە و هەتا ناوچەی«هەگمەتانە»ش پەڕی هەڵدابوو. لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی پێش‌زایینەوە، زۆربەی هۆز و نەتەوە ڕەسەنەکانی ئاسیایی، کەوتبوونـە ژێر بانـدۆری فەرهـەنگی ئـەو هیندوئورووپایی‌یانـەی کە بناغـەی مەزنـەوەجاخێکی کـەم و پـوختی سـەربازییان پێکهێنـابوو. ئـەم تاقمـە توانیبوویان بگەنە نێو ڕیزی چینی دەسەڵاتدار و خۆیان داسەپێنن؛ بەڵام هێندەی پێنەچوو کە زمانی خۆیان لە بیر چۆوە. ئەو دەق و سەرچاوانەی بابلی کە باسی کاسـییەکان دەکـەن، قامـک لـەسـەر هـەبـوونـی ڕەوتێکـی بـاوەڕمەندانەی

جووتخودایەتی دادەنێن لە نێو کۆمەڵی خوداکانیاندا و چەند خودایەکی ڕەسەنی ئاسیایی لە پاڵ خودایانی بابلی خۆیان دەنوێنن. لە نێو ئەم کۆمەڵەیەدا خودایانی هیندوئورووپاییش دیارن و ژمارەیەکیان بریتین لە: شووریاشن یان هەمان«سووریا»ی هیندووەکان، ماررووتاش یا«مارووت»ی هیندی و«بووریاش» کە دەبێتە «بۆرێئاس»ی یۆنانییەکان. وێدەچێ کە لە ڕوانگەی کاسییەکانەوە ئەسپ دیاردە و نیشانەیەکی خودایەتی بووبێ و ڕەنگە بە دەستی چینی دەسەڵاتدار چووبێتە ئەو ناوچەیە؛ وەک چۆن لە حکوومەتی میتانیشدا ئەم کارە هەر ئاوا ئەنجام درابوو. خودای خۆماڵییانەی «کاشوو»، بێگومان ئەو هۆزەی پێ ناودێر کراوە، چونکە ئەم کارە دابێکی باوی نێو هۆزەکانی ئاسیایی بوو.

کۆنترینی ئەو سەرچاوانەی کە ناوی کاسییەکانیان تێدا هاتووە، دەقەکانی سەبارەت بە سەدەی بیستوچوارەمی پێشزایین و سەر بە سەردەمی «پووزوور ئینشووشیناک»ن. واوێدەچێ کە ئەوان لە ماوەی هەزارەی سێهەمی پێشزاییندا بە هێند نەگیرابن. ئاشوورییەکان پێیان گوتوون «کاسی» و سترابۆن [سترابۆ] بە کۆسایوویی ناوی هێناون و دەڵێ مەوتەنیان پتر دەکەوێتە شانی ڕۆژهەڵات و دەرە و دۆڵی خەزەر و لای سەرووی تاران. هێندێک کەس لایان وایە کە ناوی قەزوێن و دەریای کاسپیەن (خەزەر) لە ناوی ئەوانە وەرگیراوە. وشەی یۆنانیی«کاسیتیرۆس» بە واتای قەڵایی، ناوی کانزایەکە کە لە «جێژیانی کاسییەکانەوە دێ». ناوی هەگمەتانە بەرلە سەردەمی مادەکان «ئاکاسیا» بووە کە لە ئاشووریدا «کار- کاسی» بە واتای شار و هەرێمی کاسییەکانە. لە ڕاستیدا ڕەنگە زاراوەی «کاسی - سی» یان «کاس- پی» خاوەنی واتایەکی بەربلاوتری ڕەگەزی بێ و لە نێو کۆمەڵەی هۆزانی زاگرۆسدا

تەنیا بە ناوی هۆزێکەوە نەگیرسێتەوە و تێکڕای جەماوەری ئاسیایی بگرێتەوە. ناوی کاسییەکان هەروەک دواتر سترابۆن باسی کردووە، وەکوو کۆنە میراتێکی دانیشتووانی پێشوویە و ئەگەرچی جەماوەری خۆجێیی لەمێژ بوو بڕابوونەوە، بەڵام ئەم ناوە بە سەر پەلاماردەرانی تازەدا سەپێندرا.

بیرەوەریی پەلامار و سەرکەوتنی کاسییەکان بە شێوەیەکی قووڵ و بێبڕانەوە لە ناخی بابلییەکاندا پنجی داکوتا. ئەم یاد و بیرەوەرییە تێکەڵاوی ترس و تۆقینە لە داسەپانی دەسەڵاتی پڕ زەبروزەنگی بێگانەکان و دەتوانێ پاساودەرەوەی مانەوەی درێژماوەیان بێ؛ بەڵام دیسانیش بەجێمانی کەلەپوورێکی کەم و کورتی نووسراوی سەر بە سەردەمی کاسییەکان، جێگای سەرسوڕمانە و ئەم گریمانەیەی هێناوەتە گۆڕ کە دەبێ سەردەمەکەیان تووشی داوەستانێکی درێژخایەن بووبێ. وادیارە کاسییەکان بوونە هۆکاری بەدی هاتنی ئەم بێدەنگی و قەتیس‌مانە درێژماوەیەی باڵی بە سەر بابل و عیلامدا کێشاوە؛ بەڵام لە لایەکی دیکەوە و بەپێی کۆمەڵێک زانیاری بۆمان دەردەکەوێ کە کاسییەکان پەیوەند و نێوانێکی بێنێوبڕیان هەبووە لەگەڵ میسری سەردەمی «ئەمارنا». لەم ڕۆژگارەدا ئاشوور هێزێکی دێتەوە بەر، چونکە توانی سنووری خۆی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و بە بەستنی پەیمانێک لە حۆلوان دیاری بکا.[1]

بڕانەوەی کاسییەکان و داڕووخانی دەسەڵاتیان ناگەڕێتەوە سەر بزووتنەوەی بابلییەکان؛ بەڵکوو عیلام وەکوو یەکەم حکوومەتی هاوسەردەمیان، کە بەوپەڕی دەسەڵاتەوە بابلی خستبوویە ژێر چۆکەوە، هێزی وەبەرهات و زەبری یەکلاکەرەوەی وەشاند. بەم شێوەیە لە دەوروبەری هەزارەی سێهەمی

---

١ـ لە دەقی وەرگێڕانی ئینگلیسیدا ئەم ڕستەیەی لێ زیاد کراوە: «دوای لەشکرکێشانی ئەدەد نیراری یەکەم».م.

پێش‌زایین‌دا، خانەدانێکی تازە لە عیلام بوونە خاوەنی تاج و تەخت. چەند مەزنێکی پایەبەرزی وەکوو«شووترووک ـ ناخوونتێ»، «کووتیر ـ ناخوونتێ» لەگەڵ «شیلهاک ـ ئینشووشیناک»، سەردەمی زێڕینی عیلامیان بەدی هێنا. یەکێک لە پادشایانی پێشووتریان بە ناوی «ئوونتاش ـ هووبان» یان «ئوونتاش ـ گال» کە بە گەورەترین بناغەدانەری ئەم دەسەڵاتە بووژاوەیە دادەنرێ، وڵاتەکەی بە سازکردنی کۆمەڵێک شاری تازە و جوان و نۆژەن‌کردنەوەی شارە کۆنەکان، خۆش کرد. ئەگەر بۆ هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەی دەسکاری وەستاکاران تەنیا پەیکەرەی«ناپیر ـ ئاسوو»ی شاژنی «ئوونتاش ـ هووبان» بخەینە بەرباس (و ۱۸)، بۆمان دەردەکەوێ کە لە سەردەمی ئەودا، هونەر، بەتایبەتی هونەری کانزاگەری گەیشتبوویە ئەوپەڕی درەوشانەوەی خۆی. بابل بە خۆی و حکوومەتی بەرەو نەمانی کاسی، تازە بە ڕکەبەرێکی مەترسیدار نەدەهاتە ژمار، بەڵکوو ئاشوور وەکوو هەڕەشەیەک خۆی دەنواند کە دەستی دۆستایەتیی بۆ لای بابل درێژ کردبوو. لەم کۆ و کاتەدا شەڕێک هەڵدەگیرسێ و عیلام یەکەمین سەرکەوتنی نەپساوەی بە ناوی خۆی تۆمار دەکا.

لە سەردەمی حکوومەتی «شووترووک ـ ناخوونتێ»ی یەکەمدا (۱۲۰۷ـ ۱۱۷۱ی پ.ز). عیلام دەگاتە پەڕپەڕۆچکەی هێز و دەسەڵاتی. ئەم پادشایە کۆمەڵێک پەرستگای لە تەواوی شارە گرینگەکانی قەڵەمڕەوی‌دا ساز کرد. شووترووک ـ ناخوونتێ پێشاوبڕکەی ئاشووری دایەوە و بە سەرکردایەتیی خۆی هێزی گاڵ دا و بابلی گرت و بنەی بە دەسەڵاتی دوایین پادشای کاسی هێنا و «کووتیر ـ ناخوونتێ»ی کوڕی خۆی لە جێی دانا و ئەویش پەیکەرەی مەردووخ [مەردووک]ی خودای نەتەوەیی بابل ڕادەگوێزێتە

شووش. وڵاتی بابل لە ژێر دەسەڵاتی چیانشینانی ئێران ڕزگار دەبێ و دەکەوێتە بەر نیری ئێرانییانی دەشتەکی. لە زەمانی شا «شیلهاک ـ ئینشووشیناک»دا (١١٦٥ـ ١١٥١ی پ.ز)، سەرکەوتنەکانی عیلام هەتا دوورەدەستان پەڕ هەڵدەدا. قۆشەنچییانی لە باڵی باکوور باڵادەست بوون و هەتا ناوچەی دیالە ڕۆیشتن و گەیشتنە دەوروبەری «کەرکووک». لەوێوە ئەسپیان تاودا و پاشەکشەیان بە هێزەکانی ئاشوور کرد و بابلیان گەمارۆدا. بەم شێوەیە سەرتاسەری دەرە و دۆڵی دیجلە و زۆربەی لێوارەکانی کەنداوی فارس و زنجیرە چیای زاگرۆسیان کەوتە بەردەستی. سەرلەبەری ناوچە و مەڵبەندەکانی ڕۆژاوای ئێران، کە لەگەڵ گیرانی باڵی خۆرنشین و باشووری زاگرۆس پەرەی ئەستاندبوو، لەم سەردەمەدا بوونە یەک و یەکانگیر و بە سەرۆکایەتیی عیلام، بناغەی یەکەمین پادشایەتییان دامەزراند.

لە جەنگەی ئەم سەرکەوتنانەدا، هەست و سۆزێکی نەتەوەیی لە عیلام دەبووژێتەوە و تینی تێدەزێ و ڕەنگ دەداتەوە. وای لێدێ کە زۆربەی هەرە زۆری تەتەڵە و بەردەنووسەکان بە زمان و خەتی عیلامیی بەرایی دەنووسرێن و دژکردەوەی بەرەنگاربوونەوەی کولتووری بێگانە پتر پەرە دەستێنێ؛ ئینشووشیناک دەگاتە پلەی خودایەکی نەتەوەیی و پادشا و بنەماڵەی پادشایەتی لە ماوەی ژیانی خۆیاندا بە خودا دادەندرێن. تازەگەرییەک لە بواری هونەری و نژیاروانیدا سەر هەڵدەدا و شووش دەبێتە یەکێک لە ناوەندە گەورەکانی هونەری؛ بەڵام وەک چۆن لە مێژووی نەتەوە کۆنەکاندا باوە، هەموو سەرکەوتن و پێهەڵاچوونێک، دابەزینی خێرای بە شوێنەوەیە. چارەنووسی عیلامیش لە بنەبانی هەزارەی دووهەمی پێشزایینیدا ئەوتۆ بوو. دابەشبوونی عیلام هاوکاتە لەگەڵ گەشە و گوورانی خانەدانێکی نوێ بە سەرۆکایەتیی

بوختوننەسسەر [بوختوننەسر یان نەبووکۆدۆنۆسۆر] لە بابل. ئەم پادشایە پاش چەند جارێک تێکشکان لە جەنگەی پەلاماردانی عیلامدا، سەرەنجام بەزاندی و «شووش»ی گرت و پەیکەرەی «مەردووک»ی بە شانازی و شکۆوە گێڕایەوە شوێنی جارانی لە بابل. بۆ جارێکی دیکە عیلام لەسەر لاپەڕەی مێژوو سڕایەوە و ئەم جارەیان سێسەد ساڵی پێچوو. دوو حکوومەتی تازە دامەزراوی بابل و ئاشوور، بە مەبەستی زاڵبوون بە سەر دەشتی دووچۆماندا کەوتنە ڕقبەرقە و ملانەیەکی درێژخایەن. بانووی ئێران گەشە و بزووتنەوەی تێدا نەما و کەوتە ڕیزی دواوە، بەڵام بە سەر چۆلەواری و تێداچووندا نەکەوت. ئەم هەرێمە بەناچاری چەند سەدەیەک هەستی لە خۆی بڕی و چاوەڕوانی کۆمەڵێک ڕووداو مایەوە کە بە تەواوەتی ڕوخساری دنیای کۆنیان گۆڕی.

ئەو بۆشایی و دابڕانەی کە لە ماوەی هەزارەی سێهەمدا پەنجەی بە سەر «سیێلکە»دا گرتبوو، لە هەزارەی دووهەمیشدا درێژەی کێشا و ژیان لەم شوێنەی جەرگەی بانووی ئێران تەنیا لە نیزیک بنەبانی هەزارەی دووهەمی پێش‌زایین‌دا دەستی پێکردەوە. ئێمە پێشتر باسی چارەنووسی «حەسار»ی باکووری ڕۆژهەڵاتمان کرد کە لە ماوەی نیوەی دووهەمی هەزارەی دووهەمدا ئاسەواری نەما؛ بەڵام«گیان» لە قوڵی خۆرنشین، بە سەرچاوەیەکی بەنرخ دادەندرێ و دەروویەکمان سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمی بە ڕوودا دەکاتەوە. چینی سێهەمی گردی «گیان» کە وادیارە دەبێ درێژەی کولتووری سواڵینەی نەخشینی خۆماڵی بێ (ق ٢٥)، کۆمەڵێک سواڵینەی نوێی سەیری سێپێچکەی ناخۆماڵییانەی تێدا دۆزراوەتەوە. بە بڕوای ئێمە ئەمانە ناکرێ لە هەرێمێکی دووری وەکوو «چین»ەوە هاتبن. چوونی ئەم چەشنە دەفرانە بۆ خانە و لانەی کاسییەکان، هاوکاتە لەگەڵ چوونی مێرخاسانی هیندوئوروپایی بۆ

نێو ئەو هۆز و نەتەوانەی کە پێشتر باسمان کردن. تۆرەمەی میرانی میتانی لەگەڵ خزمانی نیزیکی خۆیان ڕێچکەیان بەست و لەسەر باڵی ئەو ناوچە بەرپێژەوە بنەیان داکوتا کە دەتگوت کەمەی کەوانە و لە زاگرۆسەوە دەچوو بۆ ئاسیای بچووک و بە باکووری سووریادا تێدەپەڕی. دەبێ بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی ئەم دەفرە سەیر و تایبەتانە، باڵی خۆرنشین لە سووریا یان ئاسیای بچووک بکەونە بەر سەرنج و پشکنین؛ چونکە لەم ناوچانە ئەم چەشنە دەفرانە دیتراونەوە. واوێدەچێ کە لە چەند ناوچەیەکی زاگرۆس دەفری سێپێچکە باو بووە و بە قووڵی ڕیشەی داکوتاوە و زەمانێکی درێژخایەن خۆی پاراستووە. ئەوەی ڕاستی بێ لە گۆڕەکانی «لوڕستان»دا، وێڕای کۆمەڵێک کەلوپەلی مزقەلایی (مەفرەق)، کە سەبارەتن بە هەزارەی یەکەمی پێشزایین، سواڵینەی ئاوا دۆزراونەوە.



ق٢٥ـ گیان: دەفری سێپێچکە، سەر بە چینی سێهەم

لە چینی دووهەمی «گیان»دا، سواڵینەی بەرلە هاتنی ئێرانییەکان خۆی دەنوێنێ، بەڵام چەشنێک گەڕانەوەی تێدا بەدی دەکرێ بۆ سەر نەخشاندنی

دەسکاری هەورگەران بە دیمەنی بوونەوەران. وەکوو دیارە ئەم شێوازە لە سەردەمی چینی سێهەمی‌دا کوێر بۆتەوە. ئەم ڕازاندنەوەیە شێوازێکی تازەیە و مەودای دیار و لێکدابڕاو، وێڕای کۆمەڵێک هێڵ و خەت و کووزی هاوتەریب یان چوارخانە، دەستیان تێکگرتووە و لە نێوەڕاستەکانی هەزارەی دووهەمی پێش‌زایین‌دا هەتا ناوچە دوورەدەستەکان بڕەوی ئەستاندووە و تەنانەت گەیوەتە«فەلەستین»یش (ق ٢٦).


ق٢٦ـ گیان: دەفرێکی سواڵین، سەر بە چینی دووهەم

شان‌بەشانی ئەم دەفرانەی خۆماڵی، چەشنێکی دیکە بەدی دێ کە گڵێکی نەرم و برووقەداری بۆ دەشێلدرێ و بە کۆمەڵێک هێما و نیشانەی هەندەسی دەنەخشێندرێ. لەم کارەدا ڕەنگی ڕەشی تۆخ و جاری وایە هەڵپریواوی خۆنەگر خۆی دەنوێنێ. ئەم جۆرە هەورە ئەمڕۆ بە «کاڵای خابوور» ناسراوە و بۆ لای خۆرنشین هەتا مەڵبەندی دەریای ڕۆم [دەریای نێوەڕاست، دەریای سپی یان مەدیتەرانە] پەرەی ئەستاندووە. ئەم چینەی گردی «گیان» سەبارەتە بە سەردەمی هێرشی«هیکسۆس»ەکان و گیرانی بابل بە دەستی کاسییەکان؛ واتە ئەم دوو

بزووتنەوە و ڕاپەڕینەی کە ڕایەڵوپۆیان یەکتری گرت و جارێکی دیکە توانییان بینە پردی نێوان دەریای مەدیتەرانە و زاگرۆس.

کاول و هەرەسەکانی چینی یەکەمی«گیان» کەوتۆتە ژێر کارتێکرانێکی یەکجار ئاڵۆز و شێواوی دەرەکی. بەبێ وەبەرچاو گرتنی هەلومەرجی بارودۆخی سیاسیی نەتەوە دراوسێیەکانی دانیشتووی خۆرهەڵات و خۆرنشینی زاگرۆس، ئاستەمە ئاڵوگۆڕەکانی هەورگەریی ئەو سەردەمە بکەوێتە بەر تاقیکرانەوە و توێژینەوە. وەکوو دیارە لەمێژینەترین سواڵینەکانی ئەم ڕۆژگارە، لەسەر شکڵ و شێوازی شەربەی ژێکەڵەی تۆزێک گووپن خۆیان دەنوێنن و بە دیمەنی بوونەوەران یان شێوەیەک حەسیری گرێچن نەخشێندراون (ق۲۷).



ق۲۷ـ گیان: شەربە، سەر بە چینی یەکەم

ئێمە دەزانین ئەم دەفرانە سەرچاوەیان دەگاتەوە کوێ و دیارە کە وێنەیان لە هونەری «هووری» هەڵگرتۆتەوە. ئەم دەفرانە دەسکاری میتانییەکان بوون، کە پادشاکانیان لە سەدەکانی پازدە و چاردەی پێش‌زایین‌دا، بەرەو ڕۆژهەڵات پەرەیان بە قەڵەمڕەوی خۆیان دا و دەستیان بە سەر زاگرۆسی نیشتمانی «گووتییەکان»دا گرت. لەم دواییانەدا کۆمەڵێک گۆڕ لە«گیان» دۆزراونەوە کە دەفری لەم

شێوەیان تێدا بووە؛ بەڵام بۆ یەکەم جارە کە دەفرەکان ساکارن و هیچ شتێکیان لەسەر نەکێشراوەتەوە. ئێمە لەمێژە لێمان ڕوون بۆتەوە کە ئەم دەفر و گەواهێراتانە، وەکوو ئەوانەی بابلی سەردەمی بنەبانی دەسەڵاتی کاسییەکان دەچن، لە سەدەکانی سێزدە و دوازدەی پێش‌زایین‌دا.

واوێدەچێ کە لەم برگە زەمانییەدا، شەپۆلی هەڵکەوت و ڕووداوەکانی باڵی خۆرنشین، کە لە ماوەی چەند سەدەیەکدا باڵی ڕۆژهەڵاتی بانووی ئێرانیان خستبوویە ژێر باندۆری خۆیان، بنەیان بڕابێ. بابل و ئاشوور کەوتنە نێو مەیدانی کێبەرکێ و ملانەیەکی درێژخایەن و ڕەنگە کێشەی نێوانیان، پەیوەندیی مابەینی زاگرۆس و دنیای خۆرنشینی هەڵبڕیبێ و شەپۆلی کولتووری خۆرهەڵاتی جێی گرتبێتەوە. یەکەم نیشانەی گۆڕان ئەوەیە کە لە «سیێلکە» و «گیان» دەفری «ڕەش ـ بۆر» یان ڕەشی یەکدەست ساز کراوە، کە پێشتر نموونەی وەبەرچاو نەهاتووە. ئێمە بە سۆراغی ئەو دەفرانە دەزانین، چونکە زووتر لە هەزارەی سێهەمدا، ئەو کۆچەرانەی دروستیان دەکردن، وردەوردە لە «حەسار» بنەیان داکوتابوو. ئەم ڕەوتە کارێکی وای کرد هەتا دەفری نەخشین پاشەکشەی پێبکرێ و قۆناخی تازە لە باکووری ئێران پەرە بگرێ. ئەم کولتوورە بە زۆرەملی خۆی بە «سیێلکە»دا دەکا و گۆڕستانی «ئەلف» تەنیا دیزە و گۆزەی ڕەش ـ بۆری لێوەدەرکەوتووە. لە «گیان» کەم‌وزۆر پاشماوەی سەردەمی ڕابردوو باڵادەستە، بەڵام دیسانیش بۆتەوە خاوەنی شکڵ و شێوازی دەفری تایبەت بە خۆی. وێدەچێ ئەو گریمانەیە وابێ کە پێی‌وایە دەفرە بەرباسەکان لەگەڵ تیرە و هۆزی دەرپەڕێندراوی باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی، گەیشتوونە ئێران و ڕەنگە خاپووربوونی «حەسار»، پتر شیکەرەوەی بابەتەکە بێ. ئەم شریتە کێوانەی وەکوو کەوان پاڵیان ڕێکداوە، هەتا ئەو کاتی وەکوو قەڵغانێک

وابـوون لـە نێـوان خـەنیمانی بـانووی ئێـران و دنیـای بـاكوور و بـاكووری خۆرهەڵاتی‌دا؛ بەڵام ئـەوەی ڕاسـتی بـێ لێرەوە بەرلـەوەی خـودی پـەلاماردەر سەروسۆراغی پەیدا بێ، تین و تـەوژمی كولتـووری دەسـت پێدەكا و وادیـارە شوێنەواری لە گۆڕستانی «ب»ی «سیێلكە»دا وەبەرچاو دێ. لە ڕاستی‌دا هـەر ماوەیەک دواتر، شەپۆلێكی نوێ بە كولتوورێكی تایبەت و فرەباش و داهێنەرانە، بـوو بـە جێگـرەوەی دەفـری ڕەش ـ بـۆر. ئـەوەی باسـی دەكـرێ كولتـووری گۆڕسـتانی «ب»ی «سـیێلكە»یـە كـە دەبـێ ئێمـە بابدەینـەوە سـەری و لەگـەڵ كولتووری گۆڕەكانی «شێوازی لوڕستان»ی لە «گیان» هاوشێوەیە. ماوەیەک لەمەوبەر جووتیارانی خەڵكی گوندی «خۆروین» كە ٨٠ كیلۆمیترێک كەوتۆتـە باڵی خۆرنشینی تاران و لە بەرپاڵی باشووری زنجیرە چیای ئەلبورزە، ئاڵقەی پێكەوە گرێدرانی ئـەم دوو كولتـوورە دۆزرایەوە. ئـەم شـتانەی ئێرە هـەر لـەو توخم و ماكەیەن كە لە گۆڕستانەكانی «ئەلف» و «ب»ی «سیێلكە»دا دیتراونەوە، بەڵام دەفرەكان ـ بێجگە لـە چـەند شاكووپەیەكی ناقۆڵا و ئـاسـایی ـ زۆربـەیان ڕەش ـ بۆرن. ئێرە لەچاو گۆڕستانی «ئەلف» ئاسنی زیاتر تێدا دۆزراوەتەوە كە زۆربەشی هـەر خشـڵە. كۆمـەڵێک ئەنگوسـتیلەی كەللەبـەرانی زۆر بـاو بـووە و لوولێنەیەكی بەرچاویش بەدی دەكرێ كە زۆر وێدەچێ تایبەتی نێو گۆڕان بێ.

ئەگەر بێتوو بمانهەوێ كە زنجیرەی دانەبڕاوی ئـەم قۆناخانـەمان بـۆ ڕوون ببێتەوە و بزانین لە كوێوە یەكتر دەگرنەوە، بێگومان پێویستە هەتا شوێنەوارە دۆزراوەكان بە سەر سێ قۆناخی جیاوازدا دابەش بكەین:

١ـ دەوروبـــەری ســـەدەی دوازدەهـــەمی پێش‌زایـــین، تیـــرە و هۆزەكـــانی گەڕانگەڕان، هێزێكی دەرەكی تینیان بۆ دێنێ و بەرەو خۆرنشـین و باشـووری

خۆرنشین پاڵیان پێوەدەنێ و ئەمانە ئاسەوارەکانیان لە گۆڕستانی کەنارای «ئەلف»ی «سیێلکە»دا وەبەرچاو دێ.

٢ـ لە «خۆروین» تێکەڵاوییەک دەکەوێتە نێوان شوێنەوارەکانی گۆڕستانی کۆنی«ئەلف»ی سیێلکە و کولتوورێک کە ئەم لە جێی خۆ هەڵکەندران و کۆڕەوەی بەدی هێناوە.

٣ـ گۆڕستانی کەنارای «ب»ی سیێلکە نیشاندەری کولتووری دەسەڵاتێکی تازەی داسەپێندراوە کە دەبێتە هۆی کۆمەڵێک جووڵانەوەی بەربڵاوی دوایین قۆناخەکانی هەزارەی دووهەمی بانووی ئێران. ئێمە لە جەنگەی دۆزینەوەی گۆڕستانی «ب»دا، دەرفەتی ئەوەمان هەبوو کە بۆچوونەکەی خۆمان سوور بکەینەوە. بەپێی ئەم بۆچوونە، ئەو کولتوورە باس کراوە سەبارەتە بە یەکەمین تیرە و هۆزەکانی ئێرانی کە دەوروبەری ساڵی ١٠٠٠ی پێش‌زایین، گەیشتوونە باڵی خۆرنشینی بانووی ئێران.

داهاتنی چاخی مەفرەق (مزقەڵایی) کە لە ئێراندا هاوکاتی ساڵی ٢٠٠٠ی پێش‌زایینە، وادیارە ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی لە بواری ئابووریی ئەم سەرزەمینەدا بەدی نەهێناوە. ئەمە ڕاستە کە کۆمەڵێک ناوەندی گوندەکیی سەبارەت بە کلکەی چاخی کوچک بەدی هاتن و پەرەیان گرت، بەڵام هەرگیز نەگەیشتنە پای شارە بەرچاوەکانی خۆراوا. باری ئابووریی ئەم جێگایانە لەچاو شارە گەورەکانی بابل، ئاسیای بچووک و میسر بە دواکەوتوو دادەندرێ؛ هەڵبەت عیلام جیاواز و ناوازەیە و وێدەچێ کە زۆر بەوردی لەگەڵ دووچۆمانی دراوسێی ئاشتیی پاراستبێ. بێگومان بارودۆخی بانووی ئێران و شێوەی پەیوەندییەکانی نێوخۆ، بە هۆکاری پلە دووی کاروبارەکانی ئەودەم دادەندرێ. ئەوەی ڕاستی بێ کەمبوونی ئاو گرێی وەبەر کاری کشتوکاڵ دێنا و چۆنیەتی کەش‌وهەوا و

هەلومەرجی هەرێمایەتی، پتر ژیانێکی کۆچەرانە و نیمچەکۆچەرانەیان دادەسەپاند و دەکەوتنە پلەی یەکەم؛ بەڵام لە درێژاییی هەزارەی دووهەمی پێشزایینیدا، ئێران لەچاو پێشوو هێندە ناکەوێتە دەرەوەی جەغزی دنیای ژیارمەندی سەردەمی خۆی. لەم چەرخوخولەدا، لە سایەی کانگا دەوڵەمەندەکانی خۆیەوە پێ دنێتە مەیدانی ئابووریی جیهانی و لە ئاستێکی بەربڵاودا دەبێتە هۆی گەشەی کوتوپڕی ئابووریی شارەکی لە مەڵبەندەکانی خۆرنشین. هەڵبەت ئەوەی ڕاستی بێ ئابووری بازرگانی گەشەیەکی ئەوتۆ ناکا و ئاڵوویری کاڵا هەر لە قۆناخەکانی سەرەتاییدا چەق دەبەستێ. بازرگانانی دەوڵەمەند کە دەبوو بە ناوچەی بێتەناهی و کەسبەکەسدا تێپەڕن، سەرمایەی خۆیان ناخەنە مەترسی و وای بە چاک و بەرژەوەند دەزانن کە ئەوەی هەیانە لەگەڵ پادشایان، پیاوماقووڵان و پێشەوایانی دینی بیخەنە گەڕ و ئاوا قازانجێکی قورس کۆ بکەنەوە. لەم ڕەوتەدا بازرگانان دەبوونە ورکەخۆری دین و حکوومەت. هەروەها لەم سەردەمەدا کۆمەڵێک پیاوی کۆنەکڕ دەخولانەوە و ئاسنەواڵەیان کۆدەکردەوە و دەیانتواندەوە و وەکوو ئاسنگەر ملیان لە کار دەنا. تاقمێک لە شارەزایان و پسپۆڕان لەبەر گوێزەگوێزیان بۆ ئێروئەوێ، دەسکاری خۆیان لەو ناوچە و مەڵبەندانەدا بڵاو دەکردەوە کە پێشتر هەرگیز نەیانتوانیبوو دەستیان پێی ڕابگا.

تێکەڵ کردنی مز و قەڵایی و داهێنانی کانزای «مزقەڵایی»، گەشەی بە شێوەی سازکردنی کەلوپەلی کانزایی دا و داوای دابینی کەرەسەی خاو برووزی ئەستاند. لێرەدا ئێران بە خۆی و کانگا و پاشەکەوتی دەوڵەمەندەوە، وەکوو یەکێک لە گرینگترین بەرهەمهێنەرانی مز، قەڵایی، قورقوشم، دار و بەردی خانووبەران، دەچێتە ڕێزەی گەلانی ژیارمەند. جاران کە مشتەرییەکانی هەر

دراوسێیانی باڵی خۆرنشین بوون، وای لێهات کە ڕۆژبەڕۆژ مشتەریی تازەی لە دوورەدەستانەوە بۆ پەیدابوو. هیند بێئەوەی بتوانێ جێی بابل بگریتەوە، دەبێتە یەکێک لە گەورەترین کڕیـارانی بەرهـەمی کانگاکانی ئێـران. هاوکات لەگـەڵ گەشە و پەرەی پەیوەندییەکانی بازرگانی، کاروانەکانیش پتر دەبـوون و خەڵک زیاتر لە پێشوو دەچوونە دوورەدەستان. پەرەپێدانی پەیوەندیی سیاسی، بۆ وێنە لەگەڵ حکوومەتی میتانی، سـەنگبایی و ناوبـانگی بـانووی ئێران پێهـەڵدەبا و ڕێگای پەلهاویشتنی بۆ لای ڕۆژهەڵات و ئەوبەری زاگرۆس خۆش دەکا. یەکێک لە دیاردە بەرچاوەکانی پەیوەندیی ئێران لەگەڵ باڵی ڕۆژاوا، ئەم ئاڵوگۆڕانەن کە لە هەزارەی دووهەمی پێشزاییندا بە سەر هەورگەریی ئەم سەرزەوییەدا دێن و بە نیشانەی پەیوەندێکی نەپساوەی نیزیکی بـانووی ئێران لەگـەڵ فەرهـەنگ و شارستانییەتی ئەو هەرێمە دادەندرێ. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئێران بێتـە دەنگ و بڵێ توانیویەتی لە ئابووریی ئاسیای خۆرنشیندا خاوەنی پلە و پێگە بێ. باڵادەستبوونی سیاسیی ئێران، کە پتر لە پێنج سـەدەی هـەزارەی دووهـەمی پێشزایین دەگریتەوە و سێبەری دەخاتە سەر هەرێمێکی ژیارمەندی وەکوو بابل، دەبێ هەر لە چوارچێوەی ئەم ئاڵوگۆڕەی بواری ئابووریدا لێکبدرێتەوە.

***

بەشی ٢

# هاتنی ئێرانییەکان

## کۆچی مادەکان و پارسەکان

لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێشزاییندا، دوو ڕووداوی یەکجار گرینگ کە هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نەبوو، مۆرکی خۆیان هاویشتە سەر مێژووی هۆز و نەتەوەکانی ئاسیای خۆرنشین. ڕووداوەکان بریتی بوون لە کۆچی بە کۆمەڵی هیندوئورووپایییەکان و برەوی کارپێکرانی ئاسن. ئەگەرچی ئەم دوو هەڵکەوتە دەکەونە برگەیەکی هاوکاتەوە، بەڵام ناکرێ هەڵکەوتی دووهەم بە ئاکامی هەڵکەوتی یەکەم لێکبدرێتەوە. هاتنی هیندوئورووپایییەکان وێدەچێ کە بە زۆر باراندا هاوشێوەی هرووژمی پێشوویان بێ و ڕەنگە هەر بەو ناوچانەدا تێپەڕیبن. هەروەک چۆن بناغەدانەرانی پادشایەتیی هیتی لە بنەبانی هەزارەی سێهەمی پێشزاییندا، سەرتاسەری «باڵکان» و «بۆسفۆر»یان بڕی و گەیشتنە ئاسیای بچووک، ئاواش تیرە و هۆزەکانی دانیشتووی تراس (تراکییە) و «فەریجییە»ش، دەوروبەری ساڵی ١٢٠٠ی پ.ز. لە ژێر تەوژمی

شالاوی«ئیللیرییەکان»دا[١] خۆیان گەیاندە ئاسیای بچووک؛ «دورگەکان دڵیان لە خێڵەوە هات و ڕشانەوە و بەجارێک دانیشتووانی خۆیان لە دەم دەرپەڕی.» لەم سەروبەند و هاتوباتەدا فەریجییەکان، ئەرمەنەکان، تراکییەکان، میسییەکان[٢] و هۆز و خێڵاتی باڵکان هەڵیانکوتایە سەر پادشایەتیی هیتی و تۆزیان لێ بە با کرد و لەم کارەساتەدا تەڕ و ویشکیان پێکەوە سووتاند و دەستیان لە دۆست و دوژمن نەپاراست. شەپۆلی ئەم هرووژمە فەلەستینییەکانیشی گرتەوە کە لەو هەرێمەی ئێستایان بنەیان داکوتا و ناوی هۆزی خۆیان لەسەر ئەو شوێنە دانا. هێز و قۆشەنی پەلاماردەران، واتە «هۆزە دەریاوانەکان» بە خۆیان و سوارەی شەڕکەر و کۆمەڵێکی بەرچاو عارەبانەسوار و پاڵپشتیی پەل و پۆلی گەمێیان کە شانبەشانیان دەریایان دەبڕی، لە سووریا و فەلەستینەوە تێپەڕین و لە پشت دەروازەکانی میسر قوتبوونەوە. لەوێ تەنیا بەرەنگاربوونەوەی ئازایانە و چالاکانەی «ڕامسێس»ی سێهەم توانی وڵاتەکەی لە چارەڕەشی ڕزگار بکا. هۆزە بەهێز و گەنجەکانی پەلاماردەر، کاتێک لە میسر بەرپەرچ درانەوە، هەڵمەتیان بردە سەر سووریا و ئاسیای بچووک. لە ئاسیای بچووک دوو حکوومەتیان دامەزراند کە بریتی بوون لە پادشایەتیی فەریجی(فەریژی) لە خۆرنشین و پادشایەتیی «مووشکی» لە خۆرهەڵات. لە باڵی خۆرنشین چەند میرنشینێک دامەزران، بۆ نموونە لە حەلەب، حەما، کارکێمیش[٣] و مەلەتییە.

ئێران، ئەو خاک و سەرزەمینەی کە ئێرانییەکان لە دەسپێکی هەزارەی یەکەمی پێشزایین‌دا لێی وەژوور کەوتن، ئەم جارەیان جیاواز لە هەزار ساڵ

١ـ ئیللیرییەکان دەبنە چیانشینانی باڵکان لە درێژەی دەریای ئادریاتیک‌دا.ب.

٢ـ جەماوەری دانیشتووی سەرزەمینی کۆنی هەڵکەوتووی باکووری خۆرنشینی ئاسیای بچووک کە شاری ئەفسانەیی ترزوا بەشێکە لەوی.ب.

٣ـ لە وەرگێڕانی ئینگلیسی‌دا کراوەتە «کەرخی میسان».م.

لێرەوبەر کە هرووژمیان بۆ هێنا، کەوتە ژێر کارتێکران. وادیارە ئەم جاریش داگیرکەران هەر ئەو دوو ڕێ و ڕەوگەی پێشوویان بڕی و بە «قەفقاز» و «ئەوبەرڕووبار»دا تێپەڕین و بە کۆمەڵی چڕوپڕ و بێنێوبڕ، گەیشتنە جێ. وەکوو ئاشکرایە لەم سەردەمەدا نەکەوتنە بەر گوڕمی شەپۆلی توانەوە لە نێو جەماوەری خۆجێیی ئاسیایی‌دا. ئەوان چەشنی میتانییەکان، هوورییەکان و کاسییەکان هەپروون بە هەپروون نەبوون، کە تەنیا ورکەوپرکەیەکی دین و زمانیان لە پاش بەجێبمێنێ. ئێرانی بە جووڵانەوەیەکی نەرم و پێدزکانە لە ماوەی سەدان ساڵدا سەرەنجام تەواو پنجیان دادەکوتن و دەبنە مەزن و دەمڕاستی ئەم خاکە و خۆیان لە گرتنی دنیا خۆش دەکەن.

لقی خۆرهەڵاتیی ئەو ئێرانییانەی کە لە ئەوبەرڕووبارەوە هاتبوون، نەیتوانی بگاتە باشووری هیندوکوش و پێیدا بڵاو ببێتەوە، چونکە سەرانسەری ناوچەی ڕۆخج (ئاراخۆزی) و پەنجاب، پێشتر کەوتبوویە دەست خزمانی ئاریایی یان بە واتایەکی تر هیندووەکانی داهاتوو. وەکوو دیارە ئەوان لە سەردەمی کۆڕەوی پێشووی هیندوئورووپایی‌یەکان لەو شوێنە دامەزرابوون؛ جا هەر بۆیە کۆچەرانی تازە ناچار بوون ملی ڕێگای خۆرنشین بەرەو بانووی ئێران بگرنەبەر کە لە بەلخەوە ڕوو دەکاتە جەرگەی ئێران. ئەم بەشەی خاکی ئێران هێندەی هیند سەرنجی ڕانەدەکێشا و چەند بستێکی زەوی‌وزاری نەبێ، ئەوی دیکەی بە کەلکی کشت‌وکاڵ نەدەهات. ئێرانییەکان هەرگیز ئامانجی داگیرکردنەوەی ڕۆخجیان وەلا نەنا. شەڕی سەخت و درێژخایەن بەزینی هۆزی «ڤێدایی» لێکەوتەوە و هەرێمەکە وەسەر خاکی ئێران گەڕا.

شەپۆلی بەربڵاوی کۆچ و کۆڕەوی هیندوئورووپایی‌یەکان بۆ ئاسیا، واتە کۆچانی تراکییەیی ـ فەریجییەکان بۆ ئاسیای بچووک و هاتنی ئێرانییەکان بۆ

**بانووی ئێران، پەیوەست بووە بە گوێزەگوێزی بە لێشاوی هۆزە داگیرکەرەکانی باشـوور و خۆرنشـینی ئورووپـا لـەو سـەردەمەدا. کێلتییـەکان و ئیتالیاییـیـە سـەرپانەکان، وەکـوو هیندوئورووپاییـیـەکانی نێـو ئێـران، بوونـە جێگـرەوەی سـەردرێژانی خۆمـاڵی. ماوەیـەکی کـەم بەرلـە دەرکـەوتنی ئێرانییـەکان، شارستانییەتی سەردەمی مینۆئێن[1] بە لافاوی هێرشـی سـەرپانەکان تـەفروتونا بوو. دەوروبەری ساڵی هەزاری پێش‌زایین، سەرپانەکان پەلاماری ئینگلستانی نیشـتمانی سـەردرێژەکانیان دا و گرتیـان. هێرشـبەران پـەرەیان بـە چەنـد شـێوەزارێکی هینـدوئورووپایی دا، هـەروەک چـۆن ئێرانییـەکانیش شـێوەزاری خۆیان هێنا و سەپاندیان. لێرەدا مەبەستێک دێتە ئاراوە کە جێی بایخە. ئەگەر بێتوو خزمایەتیی نیزیکی نێوان شێوەزارکانی ئیتالیایی و کێلتی ڕێ بدا کە ئۆباڵ لەسەر بوونی کۆمەڵێکی ڕەگەزی و تەنانەت سیاسـیش بکێشـین لـە سـەردەمی کۆنی باب و باپیرانیان‌دا، بەگوێرەی تێگەیشـتنی تـوێژەران پەیوەنـدێکی زمـانی هەیە لە نێوان هیندوئێرانی و ئیتالیایی و کێلتی (سیلتی)دا. هەروەها توێژەران لایان وایە کە پارسیی کۆن لەگەڵ زمانی سلاڤییەکانی باڵت خزمە و ئەم بابەتە گریمانەی ئەوەی ساز کردووە کە باب‌وکاڵی ئێرانییەکان دراوسێی سلاڤییەکان بوون. بە بڕوای توێژەران ئۆسیتەکانی ئێستا، ئالّقە و گەوی پێکەوە گرێدرانی نێوان سلاڤییەکان و ئێرانییەکان بوون.**

**ئەو دەشتەکی و بیابانگەردانەی کە هرووژمیان کردە ئورووپا، لە ڕاستی‌دا وەکوو ئێرانییەکان ئاژەڵدار بوون و هێندێکیشیان لـە کشـت‌وکاڵ دەزانـی. ئـەم**

---

١ـ مینـۆئێن سـەردەمێکی بەرلـە مێژوویـیـە و بریتییـە لـە سـێ بـەش: مینـۆئێنی کـۆن. مینـۆئێنی نێوەڕاست و مینۆئێنی نوێ. ناوی سەردەمەکە دەدرێتە پاڵ یەکێک لە ئوستوورەکانی یۆنـانی بـە ناوی «مینۆس» کە شارستانییەتەکەی لە دورگەکانی مەدیتەرانە و بەتایبەت لە «کریت» گەشەی کردووە.ب.

جەماوەرە چاکیان لە ڕاهێنان و بەخێوکردنی ئەسپ دەزانی و هێزی سوارە و عارەبانە سواریان دەستەبەری سەرکەوتنی ئازایانەیان بوون. گۆڕەکانیان وەکوو گۆڕستانە کۆنەکانی ئێرانی، میچیان بە کوورەبان هاتبۆوە و وێنەیان لە خانووبەرەکانی «نۆردیک» هەڵگیرابۆوە. ڕەنگە ئەم کارە ڕەنگدانەوەی هەمان ڕوانگەیە بێ کە گۆڕەکانی «ئیترووریا»ی[1] سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێشزایینی وەکوو خانووبەرە لە ڕوو ساز کراوە. ئەم نۆردیکانەش چەشنی ئێرانییەکان بەرەبەرە هەنگاویان دەنا و جووڵانەوەی پڕبەر و سێبەریان توانی ئاڵوگۆڕێکی قووڵ و بنەڕەتی بە سەر ئورووپا بێنێ.

ئەوەی بوو بە بەرگێڕەوەی پێشکەوتی ئێرانییەکان، شاخ و کێوی هاوتەریبی زنجیرە چیای زاگرۆس نەبوو، ئەگەرچی وەکوو شوورەیەکی قایم و پتەو، ڕێی دەرچوونیان پڕ بوو لە گرێکوێرە. لە باڵی خۆرنشین شریتەیەک حکوومەتی لەمێژین و خاوەن کولتووری سەدان ساڵە – ئەگەر نەڵێین هەزاران ساڵە ـ وەکوو بەرزەدیوارێک پەرەی ژیارمەندانەیان ئەستاندبوو. خێڵات و هۆزانی ئێرانی کە شانبەشانی کەل و کەلەکە و لابەلای زاگرۆسدا بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەیانئاژاوت، لە باشوورەوە بەرەو باکوور تووشیان هاتن کە بریتی بوون لە: عیلام کە سووزیان (شووش) و ناوچەکانی نێوپەڕی دەگرتەوە؛ دووچۆمان کە لە باکووری بابل سنووری هاوبەشی هەبوو لەگەڵ ئاشوور و سەرەنجام هێندێک دوورتر بۆ لای باکوور و باکووری ڕۆژهەڵات بە شانی «گۆلی وان»دا، یانی ئەو شوێنەی کە زاگرۆس لە چیاکانی قەفقازدا

---

١ـ ئیترووریا یان ئیترووری، ناوچەیەکە لە ئیتالیا. ئیترووسکەکانی بە ڕەگەز هیندوئورووپایی کە لە ئاسیای بچووکەوە هاتبوون. لەوێ نیشتەجێ ببوون. ب.

دادەکووژێ و دەبێتە نیشتمانی حکوومەتی ساوای ئوورارتوو (ئارارات) کە ١٤٠٠ ساڵ دواتر بناغەی پادشایەتیی ئەرمەنستانی دامەزراند.

لەو سەردەمەدا ئێرانی ئەوەندەیان هێز و بڕشت نەبوو کە بتوانن ئەم لەمپەرە بشکێنن. لە ماوەی چوار سەدەی داهاتوودا، ئەوان توانییان نەتەوەی ڕەسەن و خۆماڵی بتوێننەوە و شارستانییەتی تایبەتی خۆیان سەقامگیر بکەن. ئەم شارستانییەتە لەسەر تەوەرەی کولتووری حکوومەتانی دراوسێی کە ڕێگای چوون بەرەو باڵی خۆراوایان لێ گرتبوو، بەڵام هەمیشەش بە نەیاری دانەدەندران، بە خۆیدا هات و پەلی داکوتا. داگیرکەران لە دۆڵەکانی زاگرۆسدا نیشتەجێ بوون و گەلاڵەیەکیان بۆ ژیانی سیاسی، کولتووری و هەتا ئەندازەیەکیش دینیی خۆیان دارشت کە شارستانییەتە باسکراوەکانی پێشوو بۆیان ئامادە کردبوون؛ بەڵام دواتر هەر خۆیان ئەم شارستانییەتانەیان تواندنەوە.

نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پ.ز. لە مێژووی مرۆڤدا بە خاڵێکی وەرچەرخان دادەندرێ. ناوەند و مەکۆی «سیاسەتی جیهانی» لەم سەردەمەدا، جێگۆڕکە و گوێزەوە دەکا و بەرەو باکووری ناسازگار و بێڕێژەو هەڵدەکشێ و لەم ڕەوتەدا شەڕ و ملانەی بوون بە هێزێکی جیهانی ڕەنگ دەداتەوە. وەکوو دیارە شارستانییەتە پڕشنگدارەکانی پێدەشتە خۆشکەشوهەوا و بەرپێژەوەکانی دەرەی «نیل»ی نیشتمانی میسرییەکان یان دەشتە بەربڵاوەکانی پاراو بە ئاوی دیجلە و فورات کە مەوتەنی «سۆمێری ـ سامییەکان» بوون، پێشتر ئەم قۆناخەیان بڕیبوو. لەم زۆرانبازییەدا سێ خەنیم خۆیان دەنوێنن: ئاشوورییانی سامیڕەگەز کە خاوەنی پادشایەتی و حکوومەتێکی بەربڵاون؛ ئوورارتوو، پادشایەتییەکی بەهێزی ڕەسەنی ئاسیایی و ڕقەبەری چڕ و سەختی

ئاشوورییەکان کە جاری واشە بەزاندوویانن؛ سەرەنجام ئارییاییەکان یانی ئێرانییەکان کە پاش تێکهەڵچوونی دژوار و درێژخایەن، توانییان بە سەر هەردک خەنیمی خۆیاندا زاڵ بن و بە خەنیمەت و دەسکەوتەکانیان یەکەمین ئیمپراتۆریی جیهانییان دامەزراند.

دیاری کردنی هۆکاری ئەم بزووتنەوە بەربڵاوانەی هۆزەکانی هیندوئورووپایی کە لە بەشی هەرە زۆری دنیای ئووراسیدا[1] نواندوویانە هێندە سووک و ساکار نییە. توێژەران وای بۆ دەچن کە زەووزووی یەکجار زۆری مێگەل و گاران و ڕەوەی ئەسپ و بارەبەران، ئاژەڵدارانی ناچار کردوون هەتا بە شوێن دۆزینەوەی لەوەڕگەی تازەدا، تۆتەکە نەگرن و بخولێنەوە. ئەم ڕەوتە کە بوو بە هۆی تێداچوونی نێوەنێوەی گیاجاڕەکانی ئووراسیش، ڕەنگە تینی بۆ هێنابن تا بۆ چارەسەری گرفتەکەیان بە دوای جێگای زەمەند و زەنوێری خۆشلەوەڕدا بگەڕێن. ئەم سوارە شەڕکەرانەی خەنیمی هۆزانی نیشتەجێ، پیاوی کارامە و شارەزا و بەئەزموونی تێکهەڵچوونان بوون و لە سایەسەری ئازایەتی خۆیانەوە توانییان پەرە بە کولتووریان بدەن. جووڵانەوە و کۆڕەویان سەدان ساڵی درێژە کێشا و سەرەنجام سەرکەوتووان و بەزیوان وا تێکەڵ بوون کە لە یەکتری نەناسرانەوە و شوێنەواری توخمە و ماکەیان بزر بوو.

لێرەدا گرێ و گرفتی وەرگرتنی ئیزنی مانەوە و نیشتەجێبوون، بەو شێوەیەی کە لە کلکەی سەدەی چوارەمی زایینیدا حکوومەتی ڕۆم بۆ «بەربەر»ەکانی کردە باو، لە ئارادا نییە. سوارانی شەڕکەری ئێرانی بە خۆیان و ژن و منداڵ و سامانی ئاژەڵەوە تێرژان و هەلی لێکدابرانی بەرچاوی هەرێمەکەیان قۆزتەوە کە چەندین حکوومەتی بچووکی تێدا بەدی هاتبوو.

---

[1] ـ ناوێک کە جاری وایە دەدرێتە پاڵ دوو کیشوەری ئاسیا و ئورووپا.م.

زۆربەی سەرۆک خێڵەکان وێڕای سوارەکانیان سەریان وەبەر میرانی خۆجێیی دێنا و دەبوونە پیاویان. چەکدارانی شمشێروەشێنی بەکرێگیراو بەرەبەرە جێی مەزن و ماقووڵانیان دەگرتەوە هەتا ڕۆژایەک ببنە جێگرەوەی ئەو میرانەی ببوونە خزمەتکاریان. بەم شێوەیە میرنشینە بچووکەکان، کە زۆربەیان لە شارێک و باغ و باغات و زەویوزاری دەوروبەری تێنەدەپەڕین، کەوتنە چنگ کۆچەرانی تازەهاتوو. لە ماوەی چەند سەدەیەکی بێنێوبڕدا، بەرەبەرە ڕەوتی جێگرتنەوە گەیشتە سەرەنجام و بە شێوەیەکی جیاواز ئێروئەوێی بانووی ئێرانی گرتەوە و دانیشتووانی خۆماڵی ڕۆژبەڕۆژ ناچار بوون کە پتر خانە و لانەی خۆیان بۆ قۆشەنی پەلاماردەر بەجێبهێڵن. جارێ بۆمان ناگونجێ کە مێژووی ئەم پەلوپۆ هاویشتنە بنووسینەوە، چونکە سەرچاوەکان زۆر کەم و پرشوبڵاون. ساڵنامەکانی ئاشووری، تاقانە بەڵگەی نووسراوی بەجێماون، بەڵام ناسینەوە و بەراوردی ناوی پادشایان، میران، شارەکان و ناوچەکان ئەوەندە دژوارە و یەکلایی نابێتەوە کە بێدەنگەی لێ بکەین باشترە؛ ئەگەرچی وێدەچێ ڕووداوێکی وەکوو کێشەی نێوان ڕۆم و «بەربەر»ەکان قەومابێ، بەم جیاوازییەوە کە لێرە لەبری ڕووباری «ڕاین» و «دانووب»، لەمپەری چیا ببوونە بەرگێڕەوەی لێشاوی پەلاماری بێبەرگێڕەوەی هۆزەکان بۆ نێو جیهانی ژیارمەند. لەوێ ڕۆم یەکگرتوو بوو، لێرە شارستانییەتەکان بەربڵاو. بەپێی ئەو قسانەی کران، زۆر بێگرێ تانوپۆ و پێکهاتەی کولتووری ئێران وەبەرچاو دێ و هەستی پێدەکرێ.

ماوەیەکی کەمە کە ئێمە لێکۆڵینەوەمان سەبارەت بە شارستانییەتی ئەم شەرکەرانە، بەتایبەت شارستانییەتی خێڵەکی دەست پێکردووە کە باڵی بە سەر ئاوەدانیی کاشان کێشاوە و ئێستا دەمانهەوێ قسەی لێ بکەین. لە سەر گردی

دەسکردی سیێلکە کە باسی شوێنەوارەکانیمان کرد، هێرشبەران هەر دەگەنێ، لەڕێوە قەڵاتێکی شکۆمەند و پتەو ساز دەکەن و گەڕەک و خانووبەران دەخەنە داوێنی و بە شوورە و کڵاوقووچان دەورەی دەدەن (ق ٢٨).



ق٢٨- شاری سیێلکە: کەلاڵەیەک کە بە خەیاڵ داڕێژراوەتەوە.

لەوێ گۆڕانێکی بەرچاو لە شێوازی ناشتنی مردووان‌دا بەدی دێ کە دەبێ بە نیشانەی جێگیربوونی هۆز و ڕەگەزی تازە و دەرپەڕاندنی ئەوانی پێشوو دابندرێ. تازە مردوو لە ژووری ماڵەکان‌دا نەدەنێژران. گۆڕستان چەند سەت گەزێک لە ئاوەدانی دوور خرایەوە کە پێیان دەگوت «شاری مردووان».



ق۲۹ـ سێلکە: کۆمەڵێک خشڵی زێوین و مزقەڵایی، سەر بە گۆڕستانی«ب»

مردوویان هەروەکوو پێشوو بە کەلوپەلەوە دەناشت، کە جاری وایە لە هێندێک گۆڕاندا ژمارەیان دەگاتە سەتیش (و٦). وەکوو دەرکەوتووە دەبێ هەموو



ق٣٠ـ سێلکە: چەک و ئامرازی مزقەڵایی و ئاسنین، سەر بە گۆڕستانی«ب»

مردوویەک کڵاوێکی چەرمی ڕازاوە بە پەرەنگ و پووڵەکەی زێوینی کرابێتە سەری، کە چەرمەکە بۆتەوە خۆڵ و تێداچووە و هەر ئەو زێوانە ماون. بڕ و

جۆری خشڵی زێوین و مزقەڵایی زۆر و بەرچاون و بریتین لە: دەرزیلە کە وێنەی سەرەکانیان لەسەر بیچمی بوونەوەران ساز کراون و دڵخوازی جەماوەری نۆردیکی بوون و شێوازێکی هەرە چاکیان تێدا ڕەچاو کراوە. پاشان دەگاتە دەسبەند، گوارە، ئەنگوستیلە، گوڵەسەر و ئاغزوونە و قولاپی کەمەرە کە بۆ ژن و پیاوان بووە. خرخاڵ پتر لە مزقەڵایی و جاری واشە لە ئاسن دادەڕێژرا (ق ٢٩). هەر چەشنە چەکێکی وەکوو شمشێر، خەنجەر، مەتاڵ و نووکەتیر لە ئاسن یان مزقەڵایی ساز دەکران (ق٣٠).

گۆڕی هەرکام لە سوارانی شەڕکەر، کۆمەڵێک خرینگە و پرینگەی مزقەڵایی و ئاسنی وەکوو لغاو و سەرکەللە و سینەڕێزی ئەسپی تێدا وەبەرچاو دێ (ق٣١). بە مەبەستی دابینی خۆراکی مردوو مەنجەڵی گەورەی هەنگڵەداری مزقەڵایی و چەنگاڵ یان شیشی دوولکەی مزقەڵایی و ئاسنینی گۆشت برژاندن دەخرانە گۆڕەکانەوە. ئەم مەنجەڵانەی باسیان کرا لە نێو «سیت»ەکان چێشتیان تێدا ساز دەکرا.

ئەوەی ڕاستی بێ بەشی هەرە زۆری دەفرەکان بریتی بوون لە دەفری سواڵینەی نەخشین یان یەکڕەنگی ڕەش- بۆر، سوور و خورمایی کاڵ کە لە ماڵان کەلکیان لێوەردەگیرا یان تایبەتی ڕێوڕەسمان بوون. لە ڕووی ئەم دەسکارانەوە دەردەکەوێ کە کارگەی هەورگەری بە شێوەیەکی بەربڵاو کاریان تێدا کراوە. ئەوەی یەکجار سرنج ڕادەکێشێ گۆزەڵەیەکی لوولە درێژە و لەوە ناسکترە کە هەمیشە کاری پێکرابێ و ڕەنگە تایبەتی هەڵپرژاندنی شلاوکێکی پیرۆز بێ لە جەنگەی ناشتن‌دا (ق ٣٢).



ق٣١ـ سیلکە: مۆری گردەڵەی بەردین و وردەکوت و خرینگە و پرینگەی ئاسن و مزقەڵایی، سەر بە گۆڕستانی«ب»



ق٣٢ـ سێلکە: کۆمەڵێک دەفری نەخشینی سواڵین، سەر بە گۆڕستانی «ب»

ئەم چەشنە دەفرە شاز و هەرە جوانە لە سەرتاسەری ئێران‌دا ڕمێنی پەیدا کرد و لە سێلکە، گیان ، لوڕستان، باشووری تاران، دەوروبەری کەرەج، باشووری گۆلی ورمێ و ناوچەی سندووس[1]، دۆزراوەتەوە. ئێمە تەنانەت ئەم جۆرە گۆزەڵەیەمان لە «نادعەلی»ی سەر لێواری ڕووباری هیلمەند (هیرمەند)ی قەراخ بیابانی خیزەڵانی سیستانی ئەفغانیش، وەبەرچاو هاتووە. ئەم بەرهەمەی سێلکە یەکجار جوان و نەخشین و دەوڵەمەند و پڕ مانایە. بێگومان ڕیشەی سەرەکی و ڕەسەنی، دەگەڕێتەوە بۆ سەر دیزە و گۆزەی ڕەنگینی بانووی ئێران کە هەرگیز نێوبڕی تێنەکەوت. هەروەک ئاشکرایە ڕووکاری هەوڕوهاڵی سێلکە ئەوەندە چڕوپڕ نەخشێندراون کە مۆرکی چێشکە و داهێنانێکی تازەیان پێوە دیارە، کە هیچ شوێنێک بە بەتاڵی بەجێ‌ناهێڵێ. وێڕای کێشانەوەی شکڵ و دیمەنی هەندەسی کە لە نێویان‌دا بازنەی خۆر خاوەنی جێگە و پێگەیەکی تایبەت و شیاوی سرنجە، هێندەی پێناچێ کە قەڵافەتی ئەسپ جێی بزنەکێوی دەگرێتەوە و لە شێوەی کاری هونەری «هاڵشتات»[2] دەکا. ئەسپ و خۆر وەکوو دوو سەمبول، شان‌بەشانی یەکتر دەڕۆن و کەم‌وزۆر لە هونەری تێکڕای هۆز و نەتەوەکانی هیندوئورووپایی‌دا پەرە دەستێنن و دەگەنە پلەیەکی هێژا لەم ڕەوتەدا. لەسەر ڕووکاری دەفرەکانی سێلکە، ئەسپی باڵدار خۆی دەنوێنێ و هەر ئەم دیمەنە لە سندووس لەسەر پەلکەیەکی خڕی مزقەڵایی شەقڵێندراوە و ڕەنگە خلخلە و پلپلەی ڕازاندنەوەی ئەسپی شەڕگە بووبێ.

---

١ـ ناوچەی سندووس کەوتۆتە نێوان مەهاباد و شنۆ و شاری نەغەدەی تێدا ساز کراوە.و.

٢ـ هاڵشتات یەکێکە لە شارەکانی ئێستای ئۆتریش (نەمسا). ساڵی ١٨٤٦ی زایینی، لە پەنا کانگا خوێیەکانی ناوچەی Salskammergut، گۆڕستانێکی کەونارا دۆزرایەوە کە هەزار گۆڕی لە خۆ گرتبوو. ئەم گۆڕستانە پەردەی لەسەر هەبوونی شارستانییەتێک لادا کە بە شارستانییەتی هاڵشتات بەناوبانگە و بریتییە لە دوو قۆناخ: قۆناخی یەکەم دەبێتە ١٠٠٠ـ٧٠٠ی پێش‌زایین و قۆناخی دووهەم لە ٧٠٠ هەتا ٥٠٠ی پێش‌زایین بڕ دەکا.ب.

کێشرانەوەی وێنەی مرۆڤ لەسەر بەرهەمەکانی سێلکە لەچاو دەسکاری یۆنان لەمێژینەترە، چونکە لە سەدەی هەشتەمی پێش‌زایین، لارِوخساری مرۆڤ سواڵینەی گەشەکردووی پێ‌نەخشاوە. لەسەر دەفرەکانی سێلکە، دیمەنی پیاوان لە جەنگەی تێکهەڵچوونیان‌دا خۆ دەنوێنن کە کڵاوی بە باڵ و پەڕیان کردۆتە سەر و کورتەکەوایەکی ڕێک و چەسپیان کردۆتە بەر (ق٣٣). لەسەر ڕووکاری مۆرێکی گردەڵە، دیمەنی جەنگاوەرێکی ئەسپ‌سوار شەقڵێندراوە کە هەر جلکی ئەوتۆی پۆشیوە و پێڵاوی نووکهەڵگەڕاوەی لە پێ‌دایە و لەگەڵ دێوەزمەیەک تێهەڵچووە (ق٣١، بڕواننە مۆرەکە). لەسەر مۆرێکی دیکە کە بە شێوەیەکی ناشیانە هەڵکەندراوە، پیاوێک لەسەر گەردوونە یان عارەبانەیەکی دووئەسپە چەقیوە و تیریکی بەرەوڕووی نێچیری ناوەتە بەر کەوانی.

وەکوو دیارە، ئەمە دیمەنی ڕاوچی و شەڕکەرە کە هونەرمەندی هەورگەر و بەردتاش نەخشاندوویانن. ئەو مەبەستانەی ئەوان دایانهێناون ڕەسەن و کۆنباون لە هونەری ئێرانی‌دا و مۆرکیان بە سینەی ڕۆژگارەوە دیارە.

بانی گۆڕەکان بە بەرد یان سواڵینە داپۆشراوە و بە کوورەبان هاتوونەوە و گڵیان وەسەر هەڵدراوە. لەم گۆڕانەدا هەمان بیر و باوەڕی هۆزەکانی نۆردیکی هیندوئورووپایی ڕەنگ دەداتەوە کە کاتی خۆی دەستیان بە سەر ئیتالیای کۆن‌دا گرتبوو؛ بەڵام سەرەڕای تەواوی ئەم ئاڵوگۆڕانە لە بواری ناشتنی مردووان‌دا، ئێرانییەکان وا زوو پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ داب و نەریتی لەمێژینەیان نەپساند و وازیان لێ نەهێنا. گۆڕی کووروشی گەورە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر سووربوونەوەی ئەم بۆچوونە.



ق٣٢- سێلکە: دەفرێکی سواڵینی لینجاودراو [کاشی]، سەر بە گۆڕستانی«ب»

زۆربەی ئەو قاپێلکەسەرانەی لەم گۆڕستانە کۆنەدا دۆزراونەوە، لە تۆرەمەی «سەرپان»ن و پێشتر لە بانووی ئێراندا نەبوون. ئەم کاژەڵاکانە وەبیرهێنەوەی هەمان تۆرەمە سەرپانەکانی هیندوئورووپایین کە هاوکات رژانە ئیتالیا، ئورووپای خۆرنشین و تەنانەت «برۆتانی»ش. پۆپەی گردی سێلکە کە چەند گوندێکی کۆنی بەرلە مێژووی لێ سازکرابوو، کاول و تەخت کران، هەتا فەرمانڕەوای نوێ بناغەی کۆشک و بارگای لێ دابنێ. ئەم خانەمیرە ئێستا نەماوە، بەڵام لە لایەک هەرەسێکی بەسەریەکدا تەپیوی ٤٠ گەز درێژ دیارە و پێ و داوێنی دیوارەکان نێوەنێوە بە خشتی کاڵ و بەرد هەڵچندراوە کە بەڕوونی نیشانەی نژیاروانییەکی تازەیە و هەتا ئەو کاتە لە بانووی ئێراندا باو نەبووە. زۆر وێدەچێ کە سەرکەتووان دەبێ بە ئاشنایەتی و تێکەڵاوبوون لەگەڵ

دراوسێیان و له ڕه‌وتی په‌ره‌ی ورده‌ورده‌ی خۆیاندا فێری ئه‌م شێوازی کاره بووبن. ته‌ختکردنی جێگایه‌کی پان‌وبه‌رین به مه‌به‌ستی دانانی کۆشک و ماڵه مه‌زن و میران، پێویستی به شان و باهۆی هه‌زاران کرێکار، وه‌ستاکار، خشتبڕ و کۆمه‌ڵێک هونه‌رمه‌ند و خاوه‌ن‌پیشه‌یه. جا هه‌ر بۆیه ده‌کرێ بگه‌ینه ئه‌م ئاکامه که میران بۆ خۆیان و پیاوماقووڵانی پایه‌به‌رز و پاسه‌وانه‌کانیان، خه‌ڵکیان به بێگار گرتوون و کاریان پێکردوون. ئه‌م کۆمه‌ڵگایه پێشتر به سه‌ر دوو به‌شی زۆر جیاوازدا دابه‌ش کرابوو، که‌وایه دیاره کۆمه‌ڵی چینایه‌تی پێکهاتووه و ته‌نانه‌ت نێوه‌رۆکی ده‌وڵه‌مه‌ند و هه‌ژارانه‌ی گۆڕه‌کان به‌جوانی جیاوازیی چینایه‌تی ده‌خه‌نه‌ڕوو: به‌شێک له مردووکان به خشڵ و پلێڵه‌ی زێوین و چه‌کوچۆڵ و که‌ل‌وپه‌لی فره‌چه‌شنه‌وه نێژراون، به‌ڵام گۆڕی هه‌ژاران ته‌نیا چه‌ند پرکه پرینگه و پووله‌که‌ی ئاسن و گۆزه و گۆزه‌ڵه‌یان تێدایه. گۆڕی هه‌ژاران به شێوازی ماڵی جه‌ماوه‌ری باشووری به کووره‌بان دانه‌پۆشراون. تۆبڵێی ئه‌م هه‌ژارانه خه‌ڵکی خۆماڵی نه‌بووبن که سه‌ریان وه‌به‌ر داگیرکه‌ران هێنابێ؟ ئه‌مه گریمانه‌یه‌کی وێچوویه، چونکه که‌ل‌وپه‌لی نێو گۆڕه‌کانیان بریتین له ئامراز و که‌ره‌سه‌ی کشت‌وکاڵ و پیشه‌ی ده‌سکرد.

له جه‌نگه‌ی دامه‌زرانی چینی سوارانی شه‌ڕکه‌ر و سه‌رکه‌وتوودا، گوندی به‌رله مێژووی سێلکه، بوو به شارۆچکه یان شارێکی خاوه‌ن شووره و کلاوقووچه. کۆشک و ئه‌و کۆمه‌ڵه خانووبه‌ره‌ی پێیه‌وه لکاون له‌گه‌ڵ چه‌ند گه‌ڕه‌کێکی ئاوه‌دان و ڕه‌نگه په‌رستگایه‌کیش، دیواری وایان به گه‌ڕانگه‌ڕیدا لێهالاوه‌ته‌وه که ده‌یانتوانی له حاند گه‌مارۆی دوژمندا خۆڕاگر بن. حوکمدارانی تازه نه‌ک ته‌نیا هه‌ر ده‌چوونه شه‌ڕی یه‌کتر و میرانی خۆجێیی، به‌ڵکوو له‌گه‌ڵ گه‌وره‌هێزانی خۆراواش، به‌تایبه‌ت ئاشوورییه‌کان تێکهه‌ڵده‌چوون، ئه‌گه‌رچی

جاری واشە دەبوونە داردەست و بەکرێگیراویان. ڕوخساری بانووی ئێران وردەوردە دەگۆڕێ و لە کۆشک و تەلارسازیدا، وێنە لە شێوازی ئاشووری هەڵدەگیرێتەوە و کەموزۆر وردەکارییەکانی دەپارێزرێ و ڕەچاو دەکرێ. شارەکانی ئێران شوورەی چەندقەد بە دەوریاندا تێوەدەسووڕایەوە و خەندەکی پڕئاو یان ڕووباریان هەڵدەگێڕانەوە و دەوری شوورەیان پێ دەدان. لە نێو شوورە و دیواری پڕپەمشاریدا کلاوقووچە بەژنیان پێهەڵچووە. پارێزەرانی شاران لە سووچ و کەلێنی پڕپەی دیواران پەنایان گرتووە و داوێنی حەوشەی قەڵایان بە بەرد داندراون. ئەمە چاخێکی تازەی شارنشینییە لە ئێراندا و وادیارە دەبێ داهێنانی ئەو ڕەگەزە بێ کە بنەی لێ داگرتووە و دەبێتە سەردەق و دەسپێکی بەدی هاتنی ڕەوتی یەکییەتی و یەکبوونی بەشێکی زۆری میرنشینان و قوڵەپادشایانی ئێران (ق٣٤).



ق٣٤- شاری کیشێسیم لە باکووری خۆرنشینی ئێران کە لەسەر تەتەڵەیەکی ئاشووری دارێژراوە.

پادشا لەگەڵ مەزنان و هاوڕکێفانی دەژیا و حکوومەتی بە سەر جەماوەری خواردەستەی‌دا دەکرد. دەرەبەگانی خۆماڵی خەرج و بژیویان بۆ دابین دەکرد و نێچیروانی لەگەڵ ڕاوەماسی و ئاژەڵداری میرانەیان پێوەبەسترابوو. فەرمانڕوا خاوەنی زەوی‌وزاری تایبەت بوو کە کۆیلە کاریان تێدا دەکردن و جووتیارەکان دەبوو بەشێکی بەرهەمیان بۆ ئەو وەلانابا. هەروەها دەبوو بۆ کاروباری هەمووانی، وەکوو لێدانی ڕێگا، جۆماڵ، هەڵبەستنی پرد و دانانی قەڵا و قایمان، شان بدەنە بەر بێگاری.

ئەوەی ڕاستی بێ پشتەمێرانی میری لەگەڵ کۆمەڵ و ئاپۆرای مەزن و ماقووڵانی بارگا کە دەبوونە نێوک و نێرکی قۆشەن و دامەزراندنی پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ حوکمدارانی خۆجێیی کە پێویستی بە بەخشینی دیاری هەبوو، وێڕای خەڵات کردنی خەڵک و ڕەنگە پێشەوایانی دینی و گەلێک شتی دیکەش هەموویان خەرجێکی وایان تێدەچوو کە زۆر جاران پیتاک و داهاتی دیکەی حکوومەت دەروەستیان نەدەهات. جا هەر بۆیە خۆیان لە شەڕ خۆش دەکرد و ئەگەر بێتوو ئاکامی چاکی لێ کەوتبایەوە، دەسکەوتەکان کەلێنی کەمبوونی داهاتی پیتاکیان پڕ دەکردەوە.

کۆمەڵ بە سەر چەند چینێک‌دا دابەش دەبوو: پادشا، مەزنەوەجاخان، ئازادمەردانی خاوەنی زەوی‌وزاری کشت‌وکاڵی، خەڵکانی ڕەش‌وڕووت و کۆیلان. لەم ڕۆژگارەدا هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵێک نیشانەی تێکهەڵچوونی نێوان خەڵکی بەلەنگاز و گوندەکی لەگەڵ مەزنەوەجاخان بەدی دەکرا. لە یەکەم سەدەکانی هەزارەی یەکەمی پێش‌زایین‌دا، زۆر وێدەچێ کە بارودۆخی ئێران وەکوو

«هیلیارد»[1] بێ کە «هۆمێر» باسی دەکا. واوێدەچێ کە لە کۆشک و سەرای پادشایان و میرانی ئێرانی سەدەکانی نۆهەم و هەشتەمی پێش‌زاییندا، کۆمەڵێک غولام و کەنیز و کۆیلە و تاقمێک وەستاکاریش هەبووبن کە تەواوی پێداویستییەکانی مەزنی خۆیان دابین کردبێ. هەڵبەت تاقمێک سنعاتکار و خاوەن‌پیشەی ئازادیش هەبوون، بەڵام زۆر بەهەڵکەوت کاریان پێ ئەسپێردراوە. زێدەبەرهەمی ئەم ئابوورییە داخراوە دەفرۆشرا و ئابووریی نەتەوەیی پشت‌ئەستوور بوو بە بەرهەمی کشت‌وکاڵ و ئاژەڵدارییەکی یەکجار گرینگ و بەربڵاو. هەروەها ئەم چاخە هاوکات بوو لەگەڵ زەمانی پەرەگرتنی ڕەوتی قوڵەئاغایەتی [واتە وردەمالیکی]. تێکرای توێژەران لایان وایە کە بێ‌گومان وەرزێرانی ئێرانی لەو سەردەمەدا لەچاو وەرزێرانی دووچۆمانی یان میسری پەروباڵیان کراوەتر و ئازادتر بوون. واوێدەچێ کە کشت‌وکاڵ بەرەو دابەش‌بوونی مڵک و پەیدابوونی وردەمالیک پەلی کوتابێ. ئەم بارودۆخە لەچاو هەل‌ومەرجی زاڵ بە سەر خۆرهەلاتی چاخی مزقەلاییدا کە بوو بە بنەمای مێژووی ئابووریی جیهانی، پێشکەوتنێکی جێی سەرنج بوو.

شان‌بەشانی پەرەی کشت‌کاڵ، دەرهێنان و ڕەنیوهێنانی بەرهەمی کانگاکانیش کە بە دەست میرانەوە بوو، ڕەمێن پەیدا دەکا. ئێران یەک‌وچان دەوری بەرهەم‌هێن دەگێڕێ و ئەم بوارەی کارەکانی لە نێوەرۆکی ساڵنامەکانی ئاشووریدا زۆر چاکی ڕەنگداوەتەوە. پادشایانی ئاشوور پەیتاپەیتا پەلاماری بانووی ئێرانیان دەدا و تالانێکی زۆر و زەبەندی مز و ئاسن و لاژوەردیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

---

١ـ ناوی کۆنی یۆنان لە پاڵەوان‌نامەکانی یۆنانیدا.ب.

میر کە نەیدەتوانی هەر بە داهاتی کشتوکاڵ و کانگا و گرتنی خەنیمەتان بەڕێ بچێ و کاروباری قەڵەمڕەوی ڕاپەڕێنێ، دەبێتە پشتیوانی بازرگانان کە لەم سەردەمەدا زۆربەیان ئێرانی نین و ئەگەر بێتوو دەسەڵاتێکی ئاشقەداهات نەیانپارێزێ، کاریان بڕ ناکا و جەغزی هەڵسووڕانیان بەرفرەوان نابێتەوە. بازرگانیی دیار و بەکڵۆ پتر بریتی بووە لە خشڵ و کەلوپەلی جوانی زێڕین و زێوین و گەواهێراتی دەگمەن و کووتاڵی پڕ نەخش و نیگار. میر بێئەوەی لە جەغزی قەڵەمڕەوی خۆی و جەماوەری بترازێ، خۆی دەداتە پەرەی ناوەندەکانی بازرگانی و دانانی هەمار و هاندانی خەڵک بۆ گەشەی کاروباری بازرگانی لە شار و شارۆچکاندا. بەم شێوەیە بناغەی ئابوورییەکی تێکەڵاو و تایبەت لە ئێراندا بەدی دێ کە زیاتر لەسەر تەوەرەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری هەڵدەسووڕێ و ئەم ئابوورییە وەرزێری [یان گوندەکییە] سەدان ساڵ خۆی ڕادەگرێ و پاش هەخامەنشییەکان دەگاتە ئەوانەی پێدەگەن و جێگایان دەگرنەوە. جا هەر بۆیە دەکرێ بڵێین ئێران بە خۆی و ئابووریی وەرزێریی دەرەبەگانە و بە نەبوونی شاری گەورەی وەکوو ئاشوورییەکان و بابلییەکان و میسرییەکان، زیاتر وەک یۆنانی هاوچەرخی خۆی دەچێ.

پەرەگرتنی ڕۆژبەڕۆژی ئاسن لە سەردەمی بەرباسدا، بەگشتی بنەما و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابووری ژێروژوور دەکا. ئەگەرچی هیتییەکان و میتانییەکان لە سەدەی پازدەهەم و میسرییەکان لە سەدەی دوازدەهەمدا ئاسنیان دەناسی، بەڵام دیسانیش هەتا سەدەی نۆهەم بۆ حەوتەم، لە ئێراندا هێندەی کەلک لێوەرناگیرێ. کارپێکرانی ئامرازی نوێی ئاسن، گەشە بە ڕەنێوهاتنی بەرهەمان دەدا و ئەم ڕەوتەش دەبێتە هۆی دابەزینی بەرچاوی نرخی کەلپەل. شێوەی پێشکەوتووتر، ڕێگای ڕاپەڕاندنی کاروباران خۆشتر دەکا و

زەوی‌وزاری بەیار و چۆڵەوار بە سەر ئاوەدانی‌دا دەخا. کانگای ئاسن کە زیاتر و دەوڵەمەندتر بوون لە کانگای مز، ئەو ناوچانەی بووژاندەوە کە پێشتر بۆ کاری بازرگانی ئاورێکی وایان لێ نەدەدرایەوە و بۆ نموونە دەبێ ناوی باکووری ئێران و هەرێمەکانی دەوروبەری بێتەگۆڕ. ئاڵوگۆڕی بەربڵاوی جیهانی، هەر لە ئیسپانیاوە هەتا چین دەتەنێتەوە و کاروباری بازرگانی یەکاودوو گەشە دەکا و ئەگەرچی ئێران سنووری ناگاتەوە هیچ دەریایەک، بەڵام دیسانیش لەم بوارەدا دەگاتە جێگە و پێگەیەکی تایبەت. ئەو هەرێمەی کە دەبێتە مەیدانی هەڵسووڕانی ئێران لە کاروباری بازرگانی و گۆڕینەوەی کەل‌وپەل و کاڵادا، لە لایەکەوە سەرزەمینی غالیا (گۆل) و برۆتانی و لە لایەکی دیکەوە هەتا هیند، ئاسیای ناوەندی و چین دەگرێتەوە.

وەکوو دیارە، کاتێک ئێمە لەم سەردەمەدا باسی ئاسن دەکەین، نابێ هەنگاوی بێ‌پارێز باوێین؛ چونکە پەرەی دەکارکرانی ئاسن، نابێتە جێگرەوەی مز و مزقەڵایی کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن و بە شێوەیەکی بەرچاو کەلکیان لێوەرگیراوە. گۆڕستانی کۆنی سێلکە زۆر بە چاکی شوێنەواری سەردەمی تێپەڕینی لە سەدەکانی سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش‌زایین‌دا پاراستووە و دەیخاتەڕوو. گۆڕی پایەبەرزانی هێزی سوارە، پڕن لە چەک‌وچۆڵ و شمەکی ئەسپ و کەرەسەی دیکەی ئاسن، ئەگەرچی دیسانیش کەل‌وپەلی مزقەڵاییش هەر وەبەرچاو دێن. سەرەڕای ئەمەش ئاسن هێندەی مز دەکار نەکراوە. ئەگەر بێتوو لە کۆگای خەنیمەتەکانی ئاشووری وردبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە قەت ئامراز و شمەکی ئاسنی تاڵان‌کراوی شارەکانی ئێران ناگاتە پای مز و نیوهێندەی دەبێ و نابێ. ئەم ڕەوتە ڕوونی دەکاتەوە و قسەکەی هێرۆدۆت دەسەلمێنێ کە دەڵێ دەوروبەری ساڵی ٥٠٠ی پ.ز. کۆمەڵێک لە تیرە و هۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی

ئێران وەکوو ماساژێتەکان، ئاسنیان نەناسیبوو. بوونی هێندێک خرینگە و پرینگەی ئاسن لە گۆڕی هەژارەکانی «سێلکە»دا، بە بەڵگەیەکی پتەو داناندرێ، ئەگەرچی دەکرێ وەک پێوەری هەڵسەنگاندن لەگەڵ شوێنەکانی دیکە بخرێتە بەرچاو. وەکوو ئاشکرایە هێزە چەکدارەکانی سارگۆنی دووهەم، لە بنەبانی سەدەی هەشتەمی پێش‌زایین‌دا، هێشتاش بە تەور و نێزەی مزقەلایی تەیار بوون و خەزێنەی «ئالیاتێس»ی فەرمانڕەوای یەکجار دەوڵەمەندی لیدییە لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش‌زایین‌دا، دەفری کەندەکاری‌کراوی ئاسن و زێڕ و زێوی تێدا بووە. هەروەها «کرۆزووس»ی جێنشینی، کۆمەڵێک دەفری ئاسنی وەکوو دیاری نارد بۆ پێشەوای غەیبزانی [پەرستگای] دۆلفی. هەروەها گەلێک نووکەتیر و قوڵەنێزەی سەر دوولکەی ئاسن لە نێو گۆڕەکانی «سێلکە»دا دۆزراونەوە، بەلام هەر ئەم شێوە شتانە کە سەر بە سەدەی حەوتەمن و تازە لە شووش وەدەرکەوتوون، هەموویان لە مزقەلایی ساز کراون. لێرەدا پێویستە وەبیری بێنینەوە کە کۆژەرانی شارە دەوڵەمەندەکانی وڵاتی ئوورارتوو بۆیان روون بۆتەوە کە کەل‌وپەلی ئاسن لەچاو مزقەلایی زۆر کەمترن.

به خاشەبڕبوونی شارستانییەتی سەردەمی گۆڕستانی لەمێژینی «ب» لە سێلکە، ژیان لەم ناوچەیەدا بە یەکجاری بنەی دێ و دادەکووژێ. لە «گیان»، لەسەر ئەو چینە خاکەی کە هەڵگری شارستانییەتێکی هاوشێوەیە، کۆمەڵێک بینای قایم و پتەو سازکراون کە بنڕیسمەی دەرگاکانیان تەواو لەسەر شێوازی ئاشوورییەکانی سەدەی هەشتەمی پێش‌زایینە. ئەم دیمەنە دەریدەخا کە خاپووراندنی بەشێک لەم شارانەی شوورەی سەخت و پتەو لە ئامێزی گرتبوون، کاری هێزەکانی ئاشووری بووە و مێژووەکەی ناگەڕێتەوە بۆ بەرلە سەدەی

هەشتەم و حەوتـەمی (پ.ز)، واتـە ئـەو سـەردەمەی کە ئیمپراتـۆریی ئاشـوور بەوپەڕی تواناوە سەرقاڵی تێکهەڵچوونە لەگەڵ ئێرانی شلک و ساوا.

وەکوو پێشتر باسمان کرد، برەودان بە کارپێکرانی ئاسن، هەم لە کاروباری سپایی و هەم لە بواری کشتوکاڵدا، ئاڵوگۆڕی بە سەر بارودۆخی بازرگانیی سەدەکانی سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێشزاییندا هێنا. ئەم بازرگانییە کە لەسـەر تـەوەرەی کـڕین و فرۆشـتنی مـز و کـانزای تایبـەتی تێکـەڵاوبوونی هەڵدەسووڕێ، بە هاتنی ئاسن، داوا لەسەر کڕینی مز بە جارێک دادەبەزێ و جێگە و پێگەی ئەو ناوچانەی کە کەرەسەی خاویان دەنارده دەرەوە، دەگۆڕێ. ئاشوور کە یەکە کڕیار و دەکارکەری بازاڕ بوو، کانگای ئاسنی نەبوو. وڵاتی ئوورارتووی دراوسێی ڕێگای بە ناوچە پڕ کانگاکانی لێواری دەریای ڕەش و ئەوبەر قەفقازی لێ تەنیبوو. جا هەر بۆیە سرنجی کەوتە سەر ئێران و ئەویش نەک هەر تەنیا لەبەر کانگای ئاسن، بەڵکوو پتر لەبەروەی کە دەیتوانی ئاسنی پێداویسـتی ئاشـوورییەکان لـەو ناوچانـەوە بێنـێ کـە ئـەوان دەسـتیان پێیڕانەدەگەیشت و بە خاکی خۆیدا ڕایدەگواست. ئاشووری جگە لە ئاسن، بە شێوەیەکی بەرچاو خوازیاری کڕینی مز و بەردی لاژوەردیش بوون. هەروەها دەبێ بزانین کە دەرە و دەشتی ئێران ناوەندی زۆر و زەوەندی بەخێو کردنی باشترین تۆرەمەی یەکسم بوو کە قۆشـەنچییانی ئاشـووری گیانێکی خودایـان پێیانەوە بوو. هەڵبەت کۆمەڵێک هۆکاری دیکەش بوونە دنەدەر و ڕێکخۆشکەری هەڵوێستی پەلاماردەرانەی ئاشوور بۆ سەر ئێران. پێویست بوو ئەوان هەر چۆنی بۆیان دەلوێ، ناوچەی زاگرۆس کە سنووری باڵی ڕۆژهەڵاتی پادشایەتی بوو نـەهارووژێ و دەبـوو چیانشـینانی ئـازای ئـەو ناوچەیـە کـە پەستاپەسـتا دەسەڵاتیان پەرەی دەستاند، پێمل کرابان. ئەم ناوچەیە بەتایبەت شوێنێکی لەبار

بوو بۆ پیلانگێڕانی پادشایانی ئوورارتوو و بە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە و هەمیشەیی دادەندرا بۆ سەر حکوومەتی ئاشوور. پادشایانی ئاشوور زۆر جاران هەوڵیان دەدا کە ناوچەکە بگرن و بیخەنە سەر خۆیان و حکوومەتێکی دەسنێژی لێ دامەزرێنن، بەڵام سەرنەدەکەوتن و ئەگەریش سەردەکەوتن، دەسەڵاتیان هێندەی نەدەبرد و زۆربەی پەلامارەکانیان سەرلەبەری بۆ تاڵانی شارەکان بوون. گوند و شار دەسووتێندران و خاپوور دەکران. خەڵک بە دیل دەگیران و گاڕان و مێگەل و ڕەوەیان ڕادەدرا و خەزنەخانەی کانزا و گەوهەران دەستیان ڕێدەخرا و هەڵدەتەکان. دانیشتووان لە تاوان پەنایان دەبردە بەر چیا و خۆیان دەرباز دەکرد و پاش کشانەوەی هێزەکانی ئاشووری، دەگەڕانەوە. ئاشوورییەکان بەهەڵکەوت و بەپێچەوانەی ئەوەی قەڵەمدارەکانیان تۆماریان کردوون، بە کاوی دڵی خۆیان گەیشتوون. ئەوان زۆربەی جاران ئەوەندەیان هێز لە نێو هۆزە بەزیوەکاندا دەهێشتەوە کە بتوانن دوای ماوەیەکی کەم و کورت، هەرایەکی دیکە هەڵگیرسێننەوە.

ئەم ڕەوتی دوژمنایەتییە کە سەدان ساڵی درێژە کێشا، تەنانەت توانی شوێنپەنجەی بخاتە سەر پێکهاتە و ڕێکخستنی سپای ئاشوورییەکان. هەروەک چۆن چین لە سەردەمی دەسەڵاتی پادشایانی «هان»دا ناچار بوو خۆی لەگەڵ هەلومەرجی داسەپیوی سوارانی بیابانگەردی بگونجێ و گۆڕانێک بە سەر جلوبەرگ و چەکوچۆڵی جەنگاوەرانی بێنێ، ئاشوورییەکانیش ناچار کران کە پێکهاتەی لەشکریان تازە بکەونەوە و بیگۆڕن. لە سەردەمی پادشایەتیی «ئاشوور نەسیرپاڵ»دا (٨٨٤ ـ٨٦٠ی پ.ز)، سپای ئاشوور هێشتا هێزی سوارەی پێکنەهێنابوو. چەکی زەبروەشێنیان بریتی بوو لە عارەبانەیەکی ساکار کە ئەسپ ڕایدەکێشا و کارێکی وای بۆ نەدەکرا و زیاتر بۆ ڕاگرتنی ورە و باری

دەروونی بوو. ئەم عارەبانەیە لە جەنگەی ئاژوانی بۆ شەرگەی پڕ هەوراز و لێژی چیاکانی زاگرۆس و بەرەورووبوونی لەگەڵ سوارانی خەنیم، تێدەما. تێپەڕینی عارەبانە بە کەل و ملەی کاروانەڕێدا، بە کارێکی قارەمانانە دادەندرا، هەر بۆیە هونەرمەندانی ئاشووری زۆر جاران دیمەن و قەڵافەتی پادشایان لە سەر عارەبانەیەک دەکێشایەوە کە بە کێو یان رووباریکدا تێدەپەڕی. بۆ تێکهەڵچوون لەگەڵ سپای سوارە، دەبوو سپایەکی ئەوتۆ پێکهاتبا و ئاشوورییەکان سێ‌ودوویان لێ‌نەکرد. ئێرانییەکان چەند سەدە بەرلەوەی کە خۆیان بۆ شەڕ لەگەڵ ڕژمییەکان تەیار بکەن و شانیان لە شانی بدەن و تینیان بۆ بێنن هەتا سپای سوارە پێک‌بێنن، توانییان ئەم گۆڕانە بە سەر ئاشوورییەکان‌دا بسەپێنن.

پێکهێنانی سپای سوارە، لەڕێوە دیمەنی شەڕی گۆڕی. ئاشوورییەکان کە هەتا ئەو زەمانی زیاتر بە دوای گرتن و بردنی ڕەوەی ئەسپانی خۆشبەزدا دەگەڕان و گرتنی خاکی دوژمنیان وەبەرچاو نەدێنا، وایان لێهات کە زۆر قووڵ بە ناخی ئێران‌دا ڕۆبچن و بگەنە جەرگەی زاگرۆس. پادشایانی ئاشوور لە ساڵنامەکانیان‌دا خۆیان هەڵدەکێشن کە توانیویانە بگەنە شوێنی وا کە هیچکام لە پێشنییەکانیان پێیان تێنەناوە. گەلێک جار ناوی کێوی «بیکنی» دێتە گۆڕ، کە دەبێ مەبەست کێوی دەماوەندی نیزیک «تاران» بێ. هەروەها باسی دەشتێکی شۆرەکات دەکەن کە دەکەوێتە باشووری کێوی «بیکنی». دەستەیەک لە زانایان کە مێژووی بارگای «تیگلات پیلسەر»ی سێهەمیان سەبارەت بە شەڕی ساڵی ٧٢٨ی پ.ز. خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە، پێیان وایە دەبێ مەبەست ئاراخۆزیا (قەندەهار) و هیلمەند[١](سیستان) بێ، کە هیچ وێناچێ وابێ.

---

١ـ هیلموند یان هیرمەند

## پێکهاتنی یەکییەتیی ماد

لە ساڵنامەکانی شەلمانسەری سێهەمدا، بۆ یەکەم جار باسی کۆمەڵێک ئێرانی دەکا کە لە بەرەی زاگرۆس چوونە بەرەنگاربوونەوەی سپای ئاشوور. ئاشوورییەکان ساڵی ٨٤٤ی پ.ز. پارسەکان[١] و ساڵی ٨٣٦ی پ.ز. مادەکانیان[٢] ناسیون، بەڵام خۆ هیچ بەڵگەیەک لە ئارادا نییە کە پێمان وابێ هۆزی پارس بەرلە هۆزی ماد گەیوەتە ئێران. بەپێی نووسراوەکانی ئاشووری، لەم سەردەمەدا پارسەکان نیشتەجێی باڵی خۆرنشین و باشووری خۆرنشینی گۆلی ورمێ بوون و مادەکان کەوتوونە باڵی باشووری خۆرهەڵاتی بەرەو نیزیکی هەگمەتانە. ئەوەی راستی بێ وێناچێ کە وشەی «پارسوا» و «مادای» هەڵگری مانای هۆزی و رەگەزی بن، بەڵکوو زیاتر وێدەچێ کە ناوی ئەو ناوچانە بن وا هۆزە باسکراوەکان لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆیەمی پێشزاییندا لێیان نیشتەجێ بوون. کۆچ و کۆڕەوی سەرلەبەری هۆز و خێڵاتی ئێرانی ماوەیەکی زۆری پێدەچێ. سێهەمین و گرینگترین کۆڕەوی ئێرانییەکان، کۆچی خێڵاتی «زیکیرتوو»یە کە بە راوێژی یۆنانی پێیان گوتوون «ساگارتی»[٣]. ئەمانە زیاتر بۆ لای شانی رۆژهەڵات رۆیشتوون و هەتا تەوریز و سنوورەکانی قەڵەمرەوی پادشایەتیی ئوورارتوو چوون. لقێکی مادەکان هەتا ئیسفەهان بەرەو خوار رۆیشتن و لەوێ عیلامییەکان بەرەگەیان لێگرتن. هێندێک پتر بۆ لای رۆژهەڵات، هۆزی «پارتاوا»[٤]یان هەمان پارتەکانی داهاتوو لە گوێی دەریای

---

١ـ پارسووا [پارسوێ = پەسوێ.و.]

٢ـ مادای

٣ـ ساگارتین

٤ـ پەرسووە

خەزەر بنەگر بوون و «هارایڤا»کان[1] لە باشووری خوراسان و هەرات جێیان خۆش کرد.

«شەمشی ئاداد»ی پادشای ئاشوور (٨٢٣–٨١٠ی پ.ز) بە شانازییەوە دەڵێ کە توانیویەتی سەرکردەیەکی ئێران بە خۆی و ١٢٠٠ چەکدارەوە لە باکووری گۆلی ورمێ ببەزێنێ. ئەم ژمارەیە خاوەنی مانایەکی گرینگە، چونکە شارەدێیەکانی بەشووورە و قەڵاتی دەرەبەگانی ڕۆژاوای ئێران، سەرجەم چەکداریان لە ٢٠٠٠ تا ٣٠٠٠ کەس تێنەدەپەڕی و ڕقبەرقە و پێکەوە نەحاوانەوەیان هۆکارێکی کارساز بوو بۆ سەرکەوتنی هەڵمەتی هێزەکانی ئاشووری. هەڵبەت لەم ڕۆژگارەدا ناوی ئەو میرانەی قەڵەمدارانی ئاشووری تۆماریان کردوون، زۆربەیان ئێرانی نین و ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر کۆچ و کۆڕەو و نەگیرسانەوەیان، چونکە ئەگەر لە جێگایەک بە یەکجاری بنەیان داکوتابا، وردەوردە دەسەڵاتیان پەرەی دەگرت. هەروەها لەم ڕۆژگارەدا، چەند ناوێکی ئێرانیمان لە نێو ڕیزەکانی سپای «ئوورارتوو»دا وەبەرچاو دەکەوێ. پادشایەتیی «ماننا» دەکەوێتە نێوپارەی ناوچەکە و باشووری گۆلی ورمێ کە بەشی هەرە زۆری کوردستانی ئەمڕۆ لە خۆ دەگرێ و خەڵکەکەی ئاسیایی بوون. ماننا ئەوەندە بەهێز بوو کە بتوانێ ڕێگای پەرەی مادەکان بێ.

وێناچێ پارسەکان ماوەیەکی درێژخایەن لە باکووری خۆرنشین تۆتەکەیان گرتبێ. ڕەنگە ئاکامی بزووتن و کۆڕەویان بگەڕێتەوە سەر پەلاماری نەپساوەی ئاشوورییەکان، یان تین بۆ هێنانی ئوورارتووەکانی دراوسێی باکووری یان هۆز و خێڵاتی دیکە. ئەوەی ڕاستی بێ ئەوان لە سەدەی هەشتەمی پێش‌زایین‌دا، وردەوردە بەرەو باشووری ڕۆژهەلات و بە بنارەکانی زاگرۆس‌دا داکشاون.

---

١ـ هەرەیڤە

ڕەنگە دەوروبەری ساڵی ٧٠٠ی پ.ز. لە ناوچەی خۆرنشینی چیاکانی بەختیاری هەتا خۆرهەڵاتی شاری تازەی «شووشتەر»، لەو جێیەی کە ئەوان ناویان ناوە «پارسوواش» یان «پارسووماش» و لە ساڵنامەکانی ئاشووریدا تۆمار کراوە، نیشتەجێ بووبن. هەروەک لەو سەردەمەدا زۆر باو بووە، تیرە و هۆزەکان ناوی خۆیان لە شوێنی نیشتەجێبوونیان دەنا و جاری وایە گەورەترین شاری خۆشیان پێ ناودێر دەکرد.

کلکەی سەدەی نۆهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی (پ.ز)، سەردەمی گلۆربوونەوەی دەسەڵاتی ئاشوورییەکانە و تین و تەوژمی ئوورارتووی جیرانیان تەنگیان پێ هەڵدەچنێ. پادشایەتیی ئوورارتوو، تەمەنێکی وای بە سەردا تێنەپەڕیوە و هەتا سەرەتاکانی سەدەی نۆهەمی (پ.ز)، پارسەنگی پێ ڕاست ناکرێتەوە؛ بەڵام لەم چاخەدا دەگاتە پۆپەی دەسەڵاتی، چونکە ماوەیەکی دیار و بەرچاوە کە زۆربەی قوڵەمیرانی ناوچەی «نائیری»، کە لە سەدەی دوازدەوە لەگەڵ پادشایانی ئاشووری شەڕیان بووە، پێکەوە پێکدێن. ئەم ناوچەیە لە ڕۆژهەڵاتەوە، واتە لەو شوێنەی کە دوو لکی ڕووباری فورات یەکتر دەگرنەوە، هەتا گۆلی وان و دەرە و دەشتی ڕووباری ئاراس، پەڕی هەڵدابوو. بە باری ڕەگەزیدا، جەماوەرەکەی بە درێژەی تۆرەمە و زاوزێی هوورییەکانی دووچۆمانی باکووری دادەندران. لە سایەسەری دەقی کۆمەڵێک تەتەڵەی بەجێماوی پادشایانی ئوورارتوو کە بە ڤانیک (وانی = ڤانی) ناسراون، زمانی ئاخاوتنی ئەوانمان لێ ڕوون بۆتەوە کە نیزیکە لە شێوەزارەکانی ئیبێریان یان گورجیی هاوڕەگەزی زمانی قەفقازی. ئەو هەرێمە پڕە لە چیای سەرکەش و دەشتی زۆر بەرپێژەو کە بە ئاوی ڕووبار و کانیاوان پاراو دەبن و بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەناڵن. ئێرە جێگایەکی لەبار و گونجاوە بۆ بەخێوکردنی

ئەسپ کە بەشێکی داهاتی ئەوێی پێ دابین دەبێ. لێرەواری بەربڵاو و کانگای هەمەچەشنە قۆڵیان تێکخستووە و کەش‌وهەوای پاک و سازگارە. جا کەوایە هیچ سەیر نییە کە لێرە شارستانییەتێکی خۆکرد و بەهێز بەدی هات کە بناغەی لەسەر پاشماوەی شارستانییەتی کۆنی بابل داندرابوو.

شوێنەوار و ساڵنامەکانی ئاشووری و تەتەڵە و بەردەنووسەکانی بەجێماوی پاتشایانی ئوورارتوو، لەگەڵ ئاکامەکانی کاروباری شوێنەوارناسی، ڕێگامان بۆ خۆش دەکەن کە بەپێی کۆمەڵێک بەڵگەی پتەو، دیمەن و ڕوخساری شارستانییەتی ئەم حکوومەتە داڕێژینەوە. لەم ڕەوتەدا بۆمان دەردەکەوێ کە کۆمەڵێک تیرە و هۆزی پرش‌وبڵاوی دۆڵ و دەشتان پاڵیان بە یەکەوە داوە و پادشایەتییەکی یەکانگیر و یەکگرتوویان پێکهێناوە.

بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە کە کۆمەڵێک شاری شوورەداری پڕ قەڵا و قایمە و نژیاری گەورە هەبوون کە دانیشتووانی دووچۆمان لەو شێوازەیان نەزانیوە. هەڵبەت نژیاروانیی ئوورارتوو کە زیاتر لەسەر بەرد ساغ ببۆوە، گەلێکی بایەخ دەدا بەوەی کە پایەی دیواران هەتا دەگاتە میچ بە بەرد هەڵبچندرێ و کوورەبانی بکەوێتە سەرشانی، بەڵام هەرگیز نەگەیشتە داهێنانی کۆڵەکەی یەکسەرەی بەردین و داتاشینی سەرەکۆڵەکە. لەوێ کۆڵەکە بە دوو ڕیزە پێچ و گەوەی لێهاڵاوە ڕازابوونەوە و هەر دەتگوت لە ڕەوتی پێگەیشتن‌دا بەرەو شێوازی «ئیۆنیی بەرایی»، قۆناخێکی نوێیان بەدی هێناوە. بەکورتی لێرەدا چەشنێک نژیاروانیی تایبەت و باوی نێو پارسەکان لە پاسارگاد و تەختی‌جەمشید دێتەوە بەرچاومان. نابێ لە بیرمان بچێ کە پارسەکان بەرلەوەی بە تەواوی زاڵ بن بە سەر فارس [پارس]دا و بنەی لێ داکوتن و پاش ئەوەی

ناوچە سنوورییەکانی ئوورارتوویان چۆل کرد، لە هەر ناوچەیەکی نیشتەجێ بوون، کۆشک و قەڵا و خانووبەرەی ئەوتۆیان ساز کرد.

کاتێک پارسەکان هاتنە خاکی ئێرانەوە، ماوەیەکی درێژ لە تەنیشت ئەم حکوومەتە گەنج و چالاکە خانخانی و دەرەبەگییەدا، ژیانیان تێپەڕاند و زۆر شتیان لە شارستانییەتەکەی خواستەوە. لە ڕۆژگاری دیاری گەشەی ئوورارتوودا، کە ئاکامی کزبوون و داڕووخانی ئاشوور بوو، پارسەکان وێڕای هۆزەکانی باکووری خۆرنشینی ئێران، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی تازەوە. لە ئوورارتوو، شا «ئیشپووینی» کە «مینوا»ی کوڕی خۆی کردبوو بە شەریکەدەسەڵاتی، تەواوی ناوچەکانی شانبەشانی زێی گەورە و دیجلەی سەرووی لە چنگ ئاشوور دەرکێشا و تەنانەت لە باشووری گۆلی ورمێ دەستی بە سەر سەرزەمینی ماننائاکاندا گرت. دوابەدوای ئەم سەرکەوتنانە، سازکرانی کۆمەڵێک قەڵا و قایمە و شاری تازە دەستیان پێکرد، چونکە دەبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی دژکردەوەی لەنەکاوی ئاشوورییەکان، تەیار بووبان. جا هەر بۆیە لە گۆشەی باکووری خۆرنشینی گۆلی ورمێ، جێگایەکی وەکوو «مووساسیر» کە ناوەندێکی گرینگی سیاسی و دینی بوو لە زەمانی خۆیدا، هەتا سەردەمی پادشایەتیی سارگۆنەکان، لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئوورارتووەکان دانەبڕا(ق٣٥).



ق٣٥- شار و پەرستگەی مووساسیر لە باکووری خۆرنشینی ئێران؛ لە

ڕووی بەردەتاشێکی ئاشوورییەوە کێشراوەتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ بۆمان ڕوون نەبۆتەوە کە پارسەکان بۆ چ ماوەیەک لە ژێر دەسەڵاتی ئوورارتووەکان‌دا ماونەوە، بەڵام دیارە ئەو کاتەی کە لەو ناوچەیە دەرچوون، زۆر بە چاکی لە شارستانییەتی ئەوان ڕاهاتوون و توانیویانە بەشێکی لەگەڵ خۆیان بەرن بە دیاری. وەکوو ئاشکرایە پرشنگی کاروباری نژیاروانی لە نێو کولتووری پارسەکان‌دا ڕەنگی داوەتەوە و لە هەر جێگایەک بنەیان داکوتاوە، خێرایەکی کردوویانەتە باو و پەرەیان پێداوە؛ چونکە پارسەکان لە ڕۆژگاری ماڵبەکۆڵی و کۆچەری‌دا شتی ئاوایان نەدەزانی.

ئیشپووینی و مێنوا لە باڵی باکوور و باشوورەوە پەرەیان بە سەرکەوتنەکانی خۆیان دا و حکوومەتێکیان دامەزراند کە قەڵەمڕەوی بەربڵاوی دەگەیشتە شانی ئاشوور و تەنانەت لێشی تێدەپەڕی. بەردەنووسەکانیان دەریدەخا کە چالاکی و جووڵانەوەیان بۆ گەشەی باری شارستانی، نەبۆتە کۆسپی سەر ڕێی

سەرکەوتنی هێزەکانیان. له بواری ئاوەدێری‌دا، دەستیان کرد به ڕاکێشانی جۆگه و جۆباری بەردین و لێدانی کەرێزان و بەم کاره بەربڵاوەیان، ڕوخساری گەلێک ناوچه و مەڵبەندیان بەتەواوی گۆڕین و زەوی بەیاریان بەراو کردن. بێگومان خێڵاتی پارس لەم کارانه ڕاهاتبوون که توانییان له شارستانییەتی خۆیان‌دا گەشه و پەرەیان پێ بدەن.

له جەنگەی حکوومەتی «ئەرگیشتی»دا[1] که هاوچەرخی «شەلمانسەر»ی سێهەم بوو، شەڕی نێوان دوو کەڵەهێزەکەی ناوچه درێژەی کێشا، ئەگەرچی ئاشووری گەلێکیان پەلامار دێنا، بەڵام دیسانیش سەرکەوتن هەر به ئوورارتووەکان بوو. لەم هەرا و تێکهەڵچوونانەدا سەرلەنوێ ناوی «پارسووا» هاتەوه گۆڕ. سەرکەوتووی مەزن «ئەرگیشتی»، تەواوی ناوچه و مەڵبەندەکانی گەرانگەڕی گۆلی ورمێی خسته سەر قەڵەمڕەوی خۆی و کاتێک به شانی خۆرنشین‌دا وەرسووڕا، زۆربەی قوڵەمیرانی وڵاتۆکەی خۆرنشینی ئاسیای بچووکی پێمل کردن، که هەتا ئەو زەمانی پاشکۆ و دەسنێژی حکوومەتی ئاشوور بوون. ئەو کزی و داهێزانەی که دەسەڵاتی ئاشووری تەنیبۆوه هێند بەگوڕ بوو، که وێنەدەچوو تازه بتوانێ بووژەڵه بێتەوه و هەستێتەوه سەرپێ، هەر بۆیه هەموو لایەک پێیان وابوو تازه ئاشوور کاری کراوه و دەبێ مەیدانەکه بۆ ئوورارتوو چۆڵ بکا؛ بەڵام کاتێک گەورەپیاوێکی وەکوو «تیگلات پیلسەر»ی سێهەم هاته سەر دەسەڵات، بارودۆخەکەی به جارێک گۆڕی.

پادشای تازەی ئاشوور، وەکوو برووسکه و با وەخۆکەوت و تەواوی ناوچه داگیرکراوەکانی مابەینی ڕووباری فورات و دەریای مەدیتەرانەی ئەستاندەوه و شاردووری دووهەمی پادشای ئوورارتووی بەزاند. پاشان شەڕەکەی گواستەوه

---

١ـ ئارگیشتی، ئەرژیشتی

بۆ جەرگەی خاکی دوژمن و شاری شکۆمەند و لە گیراننەهاتووی پایتەختی لە بەستێنی گۆلی وان، گەمارۆ دا، بەڵام بۆی نەگیرا. پەلامارەکانی ئاشوور بۆ سەر مەڵبەندی زاگرۆس پەرەیان گرت و جارێکی تر ناوی میرانی ئێرانی و ئاسیایی و قەفقازی لە ساڵنامەکانی ئاشووریدا خۆیان دەنوێنن. قۆشەنچییەکانی دەسکەوتێکی زۆریان دەبێ و هەر لە تەنیا شارێکی داگیرکراو دە تۆن لاژوەرد بە خەنیمەت دەگیرێ(؟). پاشان تیگلات پیلسەر، شەڕی کێشایە نێو مادەکان لە باکووری خۆرنشینی هەگمەتانە. لە نێو دەقی قەڵەمدارانی پادشایانی ئاشووریدا، ناوی ناوچەی «پارسووا»ش وەبەرچاو دێ. پادشای ئاشوور هێزەکانی خۆی گاڵ دا بۆ کێوی «بیکنی» یان هەمان دەماوەند و دەوروبەری دەشتی شۆرەکات (کەویری نمەک). لە نێو جەڵلەی ناوی شار و قەڵا داگیرکراوەکاندا، باسی «شیرکاکی»[1] یان «شیلکاکی» دەکرێ، کە وێدەچێ هەمان سێلکە بێ. هەروەها لە ساڵنامەکاندا باسی مەڵبەندی نیشای ـ یان دەشتی نیسا ـ کراوە لە باشووری شارێی هەگمەتانە، کە لەبەر ئەسپانی خۆشبەزی بەناوبانگ بووە و کەوتۆتە ناوچەی «گیان». هەر جێگایەکی دەگیرا وەکوو هەرێمێک دەخرایە سەر قەڵەمڕەوی ئاشوور و حوکمدارێکی بۆ دیاری دەکرا و شارە خاپوورکراوەکانی جەنگەی شەڕان، نۆژەن دەکرانەوە. ئەم کارە ڕەنگە لە گیان ڕووی دابێ، چونکە لەسەر گردەکە شوێنەواری کۆشکی ئاشووری وەبەرچاو دێ. پادشای ئاشوور سەرەڕای ئەوەی کە جیهانگیرێکی گەورە بوو، بە جیهانداریکی بەمشوور و کارزانیش دادەندرا. لەبری ئەوەی کۆمەڵانی ئاشووری بکۆچێنێ و لە ناوچە داگیرکراوەکان دایانمەزرێنێ و سەرزەمینی خۆی بە سەر چۆلەواریدا بخا، تیرە و هۆزە بەزیوەکانی لە جێی خۆیان هەڵکەندن و ڕایگواستن و پاکتاوێکی

---

١ـ شیرکەری

ڕاستەقینەی ڕەگەزی ڕەنگی دایەوە. دوای پەلاماردانی ماد ٦٥٠٠٠ دیلی لەگەڵ خۆی هێنا و لە «دیالە» و بە درێژاییی کەوشەنی ئاشوور کۆچوباری پێخستن و ئارامییەکانی بانووی ئێرانی گواستنەوە بۆ ماد. تەنانەت بابلیش وەبەر هەڵمەتی پادشا کەوت و خرایە سەر قەڵەمڕەوی ئاشوور.

«ڕووسا»ی یەکەمی پادشای تازەی ئوورارتوو، هەوڵی دا کە تیرە و تایفەکانی سەر سنوورانی کۆ بکاتەوە و وەکوو هۆزێک لێکیان هاڵێنێ و بە پشتیوانی و یاریدەی ئەوان، شکستەکانی ڕابردوو تێهەڵێنێتەوە. ئەم هەڵوێست و ڕێبازەی چاکی بۆ گرت و تاقمێک لە سەرۆک خێڵەکانی مادیشی گرتەوە کە لە نێویاندا بۆ یەکەم جار تووشی ناوی دیاکۆ دەبین. دیاکۆ هەمان «دیۆکێس»ە کە هێرۆدۆتی مێژوونووسی یۆنانی باسی دەکا و بە بناغەدانەری پادشایەتیی مادی دادەنێ، بەڵام بەپێی دەقی ساڵنامەکانی بارگای پادشایانی ئاشووری، دیاکۆ نەگەیوەتە پلەیەکی ئەوتۆ کە باسی کرا. هەرچۆنێک بێ دیاکۆ بە یەکێک لە سەرۆکانی ماد دادەندرێ کە هەستی بە مەترسییەکی قورس و گران کرد بۆ سەر تیرە و تایفە و خێڵاتی لێکدابڕاوی ماد و بۆ یەکەم جار کەوتە سەر دارشتنی گەڵاڵەی یەکییەتی و یەکبوونەوەیان.

گرینگترین هەنگاوی سارگۆنی دووهەم (٧٢٢ ـ ٧٠٥ی پ.ز) بریتی بوو لە گرتنی سامەڕا و کۆچپێدانی ٣٠٠٠٠ جوولەکە بۆ نێوخۆی وڵاتەکەی کە تاقمێکیان گەیشتنە خاکی مادەکان، بۆ وێنە لە «ئیسفەهان»ی داهاتوو، بنەگر کران. بەم شێوەیە توخم و تۆرەمەی هۆز و خێڵات لە زاگرۆس تێکەڵاو بوون و لە بنەبانی سەدەی هەشتەمی پێش‌زایین‌دا، یەکی دیکەشیان پێوە زیاد بوو. ئەم تێکەڵاوییە پەلوپۆی هاویشت و ڕیشەی داکوتا و کۆمەڵێکی بەدی هێنا کە هەتا ئەمڕۆش نەبڕاوەتەوە. لێکهەڵوەشانی بابل کارێکی وای کرد کە قەڵەمڕەوی ئاشوور

بەرفرەوان بێتەوە و لەگەڵ عیلام ببێتە دراوسێی ڕاستەوخۆ و سنووریان لە یەکتر بگەڕێتەوە. هێندەی پێنەچوو کە سارگۆن هرووژمی کردە سەر عیلام، کەچی سەرکەوتنێکی وەچنگ نەهێنا. سەرهەڵدان و ئاژاوە لە عیلامەوە تا ئاسیای بچووک تەشەنەی کرد. ئەگەرچی سارگۆن لە چەند بەرەیەکدا شەڕی دەکرد، بەڵام ماد بە گرینگترین شەڕگەی دادەندرا. ڕاپەڕینی «ماننا» بە ڕێبەرایەتیی سەرکردەیەکی ئێرانی و بە دنەی «ڕووسا»، زۆر بە توندی سەرکوت کرا، بەڵام خاو بوونەوە هێندەی پێنەچوو، چونکە ئوورارتوو هەروا بەهێز بوو. پارسەکان تووشی پەلامارێکی دیکەی ئاشوورییەکان بوونەوە و ٢٨ کەس لە سەرۆک خێڵانی ماد بەناچاری سەریان وەبەر دەسەڵاتی سارگۆن هێنا.

پاتشای ئوورارتوو لە ساڵی ٧١٥ی پێش‌زایین‌دا، بە پشتیوانی پادشای ماننا، هەڵمەتی بردە سەر ئەو هەرێمە. دیاکۆ، یەکێک لە سەرۆکانی ماد و هاوپەیمانی ئوورارتوو، بە مەبەستی سەلماندنی وەفاداری، کوڕێکی خۆی وەک بارمتە ناردە پایتەختی «ڕووسا» و لە بەرژەوەندیی وی هەنگاوی هەڵێنایەوە. سارگۆن لەڕێوە دژکردەوەی نواند و جارێکی تر هاوپەیمانانی داپڵۆسین و دیاکۆ بە دیل گیرا و لەگەڵ بنەماڵەکەی دوورخرایەوە بۆ «حەما»ی سووریا. تۆبڵێی ژیان و مانی دیاکۆ قەرزداری ڕێز و بایەخی کەسایەتیی خۆی بووبێ کە لە نێو خێڵاتی «ماد»دا هەیبوو، یان نەخێر دەگەڕێتەوە بۆ لێکدانەوەی وردی سارگۆن کە پێی وابوو کاتێک سەرکردەیەکی شەڕکەری لە بەر چنگی‌دا بێ، هەر کاتێک بە پێویستی بزانێ دەتوانێ وەکوو پادشای ئوورارتوو بیخاتە بەرڕکێفی؟! هەر چۆنێک بێ، هەڵوێست و هەنگاوی «ڕووسا» بە ئامانجی دابینی قەڵغانی پاراستن لە سنوورەکانی قەڵەمڕەوی‌دا، شکستی هێنا و هەرێمێکی بێلایەن کە پیاوانی ئێرانی بتوانن دەوری تێدا بگێڕن، سەری نەگرت. ڕوون و ئاشکرایە و

دەبێ بیسەلمێنین کە دیاکۆخوازانی بەرایی، کار و هەنگاوی پێشوو دەدەنە پاڵ ئەو کەسەی کە بۆ یەکەم جار خۆی لە نێو مادەکاندا نواند و هێرۆدۆت ناوی لە مێژوودا تۆمار کرد، ئەگەرچی لە ڕاستیدا پاشەوارەکانی بوونە هەوێنی ڕاستەقینەی پێکهاتنی یەکیەتیی ماد و لە پێناو سەربەستبوونیدا شیریان وەشاند.

ساڵی دواتر، سارگۆن دیسانیش دەچێتەوە «ماد» و لیزگەی ناوی میرانی خۆجێیی لە ساڵنامەکاندا دوورودرێژە. شای ئاشوور ساڵی ٧١٣ی پ.ز. درێژەی بە شەڕ و تێکهەڵچوون دا و ٤٥ کەس لە سەرۆکانی مادی پێمل کردن کە هێندێکیان لەولای هەگمەتانە (هەمەدان) دەژیان. پادشای ئاشوور لە ساڵنامەکانی بارگای خۆیدا بە سەرکەوتنەکانی لە ماد و بەزاندنی میرانی دەسەڵاتداری ماد دەنازێ، بەڵام ڕاستەقینە شتێکی دیکەیە: ئەم سەرۆک و سەرکردانە خاوەنی دەسەڵاتێکی ئەوتۆ نەبوون و هەرکامەیان تەنیا بە پاڵپشتی پۆلێکی دەوروبەریان ببوونە حوکمداری شارەدێیەکی ماد. یەکێک لەو سەرۆکانە دیاکۆیە کە هەڵیانداشت بۆ تاراوگە و دەستی چارەنووس خێڵ و خانەدانی هاویشتنە سەر ڕێچکەی ڕێبەرایەتی و بوون بە فەرمانڕەوا. لە زەمانی حکوومەتی کوڕەکەیدا کە هێرۆدۆت پێی دەڵێ فرائۆرتێس [فرەوەرتیش]- بەڵام بەپێی بەردەنووسی «بێستوون»ی داریووش، ناوی بە «خشەسریتە »ش هاتووە[1]- ئاواتی دڵخوازی دیاکۆ کە بریتی بوو لە یەکیەتیی ماد، وەدی دێ.

وێدەچێ لە سەردەمی حکوومەتی سێناخریبدا (٧٠٥-٦٨١ی پ.ز) کە زۆر بەگەرمە سەرقاڵی شەڕ و ملانە بوو لەگەڵ سەرهەڵداوانی بابل و عیلام و

---

١- داریووش دەڵێ «فرەوەرتی» بوو، بەڵام بە خۆی دەگوت خشەسریتە. لە خانەدانی هووەخشتەرە.و.

خەنیمانی میسر و یەهوودییە، وەکوو ڕۆژگاری سارگۆنی دووهەم، تەنگیان بە مادەکان هەڵنەچنیبێ و تەوژمەکە خاو بووبێتەوە. ڕەنگە ئەم هەڵوێستە یەکێک لـەو هۆکارانـە بـووبێ کـە هێـزە ئێرانییـەکانی لـە دەوری بنەماڵـەی دیـاکۆ کۆکردبێتەوە و بە یەکگرتوویی سەریان وەبەر سەرۆکایەتیی خشەسریتە هێنابێ. ئەوەی ڕاستی بێ خشەسریتە لە پێش‌دا حوکمداری شارێک بوو، بەڵام هێندەی پێنەچوو کە بوو بە سەرۆکی یەکییەتییەکی بەهێز. وەکوو دیارە خشەسریتە پیـاوێکی خـاوەن هـورم و هێـزا بـووە، چونکـە پـاش ئـەوە ئێسـارهادۆن [ئیسارحادۆن] بوو بە جێگرەوەی «سێناخریب»، لەڕێوە باڵوێزێکی ناردە لای. خشەسـریتە، هـەر تـەنیا مادەکـانی لـە خـۆی نەهاڵانـد، بـەڵکووماننـایی و کیمیرییەکانیشی کۆکردنەوە. کیمیرییەکان بە ڕەسەن ئێرانـی بـوون کـە لەگـەڵ سەکاییەکان لە کۆڕەوێکی تازەدا بە «قەفقاز»دا تێپەڕین و سەریان لە ئاسۆی دوو حکوومەتی ڕقەبەری ئاشوور و ئوورارتوو هێنایەدەر.

### کیمیرییەکان و سەکاییەکان

هرووژمی هۆز و خێڵاتی ئێرانی لە بنەبانی سەدەی هەشتەمی پێش‌زایینەوە، هـەرا و ئاژاوەیـەکی وا بـەگـوڕم لـە بـاکووری خۆرشـینی ئێـران دەنێتـەوە کـە پریشـکەی ئاورەکـەی دەگاتـە ئاسـیای بچـووک و هـەتا سـووریا و فەلەسـتین دەتەنێتەوە. ئەم باڵی باکووری خۆرنشینە پێشتر لەبەر شەڕ و کێشـەی نێوان ئاشـوور و ئوورارتـوو و مـاد بـارودۆخی شـێوابوو. لێشـاوی کیمیرییـەکان و سەکاییەکان هیچ وەک هاتنی مەند و پێدزکانەی مـاد و پارسـەکان نـەبوو لـە سێ‌چوار سەدەی پێشوودا. ئێستا ئیتر باسی ئـەو تیرە و هۆزانـە نییـە کـە بـە شوێن دۆزینەوەی لەوەڕگەی مۆر یان پەنا و پەسیوێکی بێ‌مەترسی‌دا دەگەڕان، بەڵکوو باسی شەپۆلی لافاوی ئاگرپژێنی شەڕکەرانی سووکەڵەسوار و تاڵانکەرە

کە لە بناری باشووری چیاکانی قەفقازەوە لووزەویان بەستووە. هێرۆدۆت هێندێک لە ڕووداوەکانی برگەی ئەم ڕۆژگارەی تۆمار کردوون و مێژوونووسانی ئاشووریش کۆمەڵێک زانیاریی بەنرخیان خستوونە سەر پەڕەی ساڵنامەکان. لە ساڵنامەکان‌دا ناوی کیمیرییەکان و سەکاییەکان بە گیمیرڕای و ئیشکووزای تۆمار کراون و ڕاست ئەم ناوانە لە تەوراتیش‌دا هاتوون. وێدەچێ هۆزی یەکەم بە ڕەسەن خەڵکی قریم (کریمێ) بن و بە ناوی ناوچەی خۆیانەوە ناودێر کرابن. وێناچێ قسەکەی هێرۆدۆت وابێ کە دەڵێ سەکاییەکان وەخۆکەوتوون و کیمیرییەکانیان ڕەپاڵ ناوە. ئەم دوو هۆزە پێکەوە خزمی نیزیک بوون و کەم‌وزۆر بە زمانێک دەدوان و بە تالان و چەتەیی بەڕێدەچوون. پێشتر لە سەردەمی سارگۆنی دووهەم‌دا، ئوورارتوو یەکەم حکوومەت بوو کە کەوتە بەر زەبری خەسارباری کیمیرییەکان. ئەگەرچی پاش پەلامار پاشەکشەیان پێکرا، بەڵام زەبرێکی وا گورچووبڕیان وەشاند کە ڕووسای یەکەمی پادشای ئوورارتوو لە حەیبەتان خۆی کوشت.

کیمیرییەکان بوونە دوو قۆڵ: قۆڵێکیان بە شانی گۆلی ورمی‌دا بزووتن و ماوەیەک دواتر بوونە هاوپەیمانی خشەسریتە. قۆڵەکەی دیکەیان کە بریتی بوون لە بەشی هەرە زۆری سووکەڵەسوارانی شەڕکەر، پاش پەلامارێکی سەرنەکەوتوو بۆ سەر سنوورەکانی باکووری ئاشوور، بایاندایەوە سەر باڵی خۆرنشین و ئاسیای بچووک و بە شەڕوشووڕ و تاڵان‌وبڕۆ، ڕەوگەی خۆیان خاپوور کرد. پاشان لەگەڵ «ترێر»ەکان و خێڵاتی دیکەی ئاسیایی، کۆنفیدراسیۆنێکیان پێکهێنا و لە لێواری باشووری دەریای ڕەش و ناوچەی «سینۆپ» و ڕێژاوگەی هالیس (قزڵ ئیرماق) بنەیان داکوتا و نێوەنێوە بۆ داڕووتاندنی مەڵبەندەکانی ئاسیای بچووک دەبزووتن. هەر ئەوانە بوون کە

خاشەی حکوومەتی فەریجییەکانیان کێشا و ئەوەندەیان تین بۆ «میداس»ی دوایین پادشایان هێنا کە خۆی کوشت. لیدییەش کەوتە بەر گورمی پەلاماریان و «ژیگێز»ی پادشایان، ئەگەرچی شارە یۆنانییەکانی ئیۆنییەش پشتیوانییان لێدەکرد، بەڵام بەرگەی نەگرت و کوژارا. ماوەیەک دواتر، ئاشوور بانیپاڵ لە کەل و ملەی کلیکییە تێکیشکاندن و تەقورەویان تێکەوت و هەزارەزیلەیان چوونە پاڵ تاقمەکانی سەکایی.

ئەم هۆزەی دوایی، لە سەرەتای پادشایەتیی «ئێسارهادۆن»دا، بە لایەکی دیکەدا ڕۆیشتن و پاشەکشەیان بە هێزی سوارەی کیمیری کرد بۆ باشووری هەگمەتانە و لە باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی گۆلی ورمێ و لە خاکیماننا، کە دەسەڵاتی ئاشووری بە سەرەوە نەمابوو، بە پتەوی بنەیان داکوتا و نیشتەجێ بوون . ئەم نەیارە سامناکانە، لە دەقی پێشگۆتنەکانی ئاشوورییانی هاوچەرخدا، ناویان کەوتە پاڵ مادەکان و ماننا‌کان. پێشگۆتنەکان سەبارەتن بە هێرشی هێزەکانی ئاشوورییان بۆ سەر جەرگەی ئێران، کە ئامانج لێی کەمتر خۆنواندن و بڵاوکردنەوەی تۆوی ترس و تۆقین بوو، بەڵکوو زیاتر هێنان و ڕادانی ڕەوەی ئاسپان بوو بۆ بەررکێفی سوارانی ئاشووری. لە زەمانی پادشایەتیی «پارتاتوا»دا بەگوێرەی سەرچاوەکانی ئاشووری یان وەک هێرۆدۆت دەڵێ «پرۆتۆتیس»، قەڵەمڕەوی پادشایەتیی سەکایی، بەشێکی هەرە گەورەی هەرێمی ئاترۆپاتێن ـ واتە ئازەربایجانی ئەمرۆ ـ ی دەگرتەوە، کە ناوەندەکەی دەکەوتە باشووری گۆلی ورمێ. پادشای ماننا دانی هێنابوو بەو دەسەڵاتەدا و وێدەچێ لەگەڵ مادەکانیش نێوانیان خۆش بووبێ. ئەوەی ڕاستی بێ چونکە ئوورارتوو هەروا بە خەنیمێکی سامناک دادەندرا، پادشای ئاشوور هەڵدەسووڕا کە بە سەریاندا سوار بێ. پارتاتوا کە بەم سەرکەوتنانەی هێزێکی وەبەرهاتبوو،

خوازبێنیی شادۆتێکی ئاشووریی کرد و وێدەچێ زەماوەندەکە سەری گرتبێ، بەڵام مێژوو لەم بارەدا هیچی نەدرکاندووە و بێدەنگە.

**پادشایەتیی ماد**

نیشتەجێبوونی سەکاییەکان لە باشووری گۆلی ورمێ، نەیتوانی بەر بە پەرەی دەسەڵاتی ماد بگرێ. فرەوەرتیشی سەرۆکیان کە توانیبووی یەکییەتی و یەکبوونیان لە نێودا بەدی بێنێ، قەڵەمڕەوی بەربڵاوی دەسەڵاتی لە هەمەدانەوە تا ڕۆژهەڵاتی دەماوەند و باشووری کەنارەکانی دەشتی شۆرەکاتی ناوەندیی ئێران، چەتری هەڵدابوو. فرەوەرتیش(خشەسریتە) لەگەڵ کیمیرییەکان و ماناکان دەبێتە هاوپەیمان و پشت بە بەڵێنی پشتیوانیی سەکاییەکان دەبەستێ؛ هەر بۆیە پاش ئەوەی پارسەکانی پێمل و دەستەمۆ کردن، بڕیاری دا زەبرێکی گورچووبڕ لە نەینەوا بوەشێنێ. هەڵبەت نابێ لە بیرمان بچێ کە پارسەکان لە بنەبانی سەدەی هەشتەمەوە، پتر داکشابوونە باشووری ڕۆژهەڵاتی گۆلی ورمێ و لە ناوچەی دەوروبەری پارسووماش نیشتەجێ ببوون. بڕیاری ئازایانەی فرەوەرتیش بۆ لێدانی نەینەوا، چارەڕەشی و کارەساتی بۆ مادەکان بە دواوە دەبێ، چونکە «مادیس»ی کوڕی «پارتاتوا»ی سەکایی، کە هاوپەیمان و پشتیوانی ئاشوورە، لە پشتەوەڕا پەلاماری دەدا و دەیبەزێنێ و گیانی لێ دەستێنێ و ئەمەش دەبێتە ساڵی (٦٥٣ی پ.ز). سەکاییەکان هەلەکە دەقۆزنەوە و هێرش دەبەنە سەر ماد و دەیگرن و وەک هێرۆدۆت دەڵێ بۆ ماوەی ٢٨ ساڵ (٦٥٣ ـ ٦٢٥ی پ.ز) دەسەڵاتیان بە سەریدا دەشکێتەوە.

دوای شکانی مادەکان، سەکایی هێزێکیان وەبەردێ و هەڵدەکوتنە باڵی خۆراوا. لەم هەڵمەتەدا دەستیان لە ئاشووری هاوپەیمانی پێشوویان ناپارێزن و بە یاریدەی سوارانی ڕاکردووی شەڕ لەگەڵ ئاشوور بانیپاڵ، ئاسیای بچووک،

باکووری سووریا، فنیقییە، دەمیشق و فەلەستین دادەڕووتێنن و کاولی دەکەن. نەقڵ و نەزیلەی ئەم پەلامار و تراتێنە لە کتێبی «ئێرمیا»دا [بەشی٤، ئایەی ١٣][1] هاتووە و بە ڕاوێژێکی خەماوی دەستاودراوەتەوە: «بڕوانن! دوژمن پەلاماری هێناوە و ئێستا وەکوو هەور دەگاتە سەرمان؛ عارەبانەکانی دەڵێی گێژەڵووکە و ڕەشەبان و ئەسپەکانی لە هەڵۆ تیژباڵترن. سەلا لە خۆمان کە تازە تێداچووین.» فیرعەونی میسر، خۆی دەکڕێتەوە و پارەیان بۆ دەنێرێ و سەری ئەسپیان پێ وەردەگێڕێ و سەکایی بە دەم تاڵانوبڕۆوە دەگەڕێنەوە زاگرۆس.

### کەڵوپەلە مەفرەقییەکانی لوڕستان

بیست ساڵێکی پتر پێچوو هەتا ئەو شوێنەوارانەی کە گوندنشینانی ناوچەی کرماشان، بەتایبەت جووتیارانی هەرسین، ئەلەشتەر و خوڕڕەمئاباد لە باشووری لوڕستان، دۆزیبوویاننەوە، چوونە نێو خەزنەخانەی عەنتیکەداران و موزەکانی ئورووپا و ئەمریکاوە و هەزاران کەڵوپەلی مەفرەق و ئاسن بوونە ڕازێنەرەوەی ئەو شوێنانە. هەموو یان بەڕاستی زۆربەی هەرە زۆری ئەو شتانەی دۆزراونەوە، هی ئەو گڵکۆیانەن کە هەتا ئێستا هیچکامیان بە شێوەیەکی زانستی هەڵنەدراونەوە و کاریان لەسەر نەکراوە. بەپێی گێڕانەوەکان، ئەم گڵکۆیانە بریتین لە کۆمەڵێک قوڵکەی وا کە تەختی بنەوەیان سەنگڕێژ کراوە و هەموویان بە تەختەبەردێکی پان داپۆشراون. زۆربەی ئەم گڵکۆیانە، گڵیان لەسەر هەڵدراوەتەوە و بە ورکەبەردان جەغزێکیان بە دەوریدا هاتووە.

---

١ـ ئێرمیا یەکێکە لە چوار پێغەمبەرە گەورەکانی بەنیئیسرائیل. پێشگۆتن و شینگێرانەکانی لەسەر کاول و هەرەسی بەیتولموقەددەس لە تەوراتدا تۆمار کراوە.ب.

زۆر بە هەڵکەوت شارستانییەتێکی خۆکردی وەکوو شارستانییەتی لوڕستان وەبەرچاو دێ کە بێئەوەی هیچ نیشانەی پەیوەندییەکی قووڵی لەگەڵ شارستانییەتی پێش خۆی هەبێ ـ وەک چۆن لەم ناوچەدا دۆزراوەتەوە ـ پێگەیشتووە و گەشەی



ق٣٦ـ لوڕستان: شمشێری ئاسن



ق٣٧ـ لوڕستان: دەسکی خەنجەری مەفرەق

کردووە و کەلپەلی مەفرقی بەرهەم هێناوە. ئەگەر بێتوو تێکڕای ئەو شتومەکە زۆر و فرەشێوە و فرەچەشنە نەخشین و ڕازاوانە لە پەنای یەکتر کۆ بکەینەوە،



ق٣٨- لوڕستان: کوڵینگی مەفرەق

بەرلە هەموو شتێک بیرمان بۆ ئەوە دەچێ کە دەبێ خاوەنی ئەو شتانە هۆزێکی شەڕکەری سوارە یان عارەبانەسوار بن، کە لە جێگایەک ئۆقرە و تۆتەکەیان نەگرتووە و هەر بۆیە ئاشق و تامەزرۆی سامانێکی وا بوون کە بتوانن لەگەڵ خۆیان ڕایگوێزن. لە لوڕستان ئاسەوارێکی وا کە شیاوی ڕاگوێزران نەبن، یەکجار دەگمەنن. ئەم بۆچوون و تێبینییە، بە نەبوونی شوێنەواری نیشتەجێبوون لە تەنیشت گۆڕەکان، سوور دەبێتەوە. لە نێو ئەو شتانەدا، چەکوچۆڵێکی زۆر وەبەرچاو دێ، بۆ نموونە شمشێری درێژی ئاسنی دەسک ئاسن کە بە سەری ئادەمیزاد یان ئاژەڵ ڕازێندراوەتەوە (ق ٣٦)؛ یان شمشێری



ق٣٩- لوڕستان: دەرزیلەی مەفرەق

قوڵەی مەفرقی دەسک ساکـار و هلۆڵ، لەگەڵ خەنجەری مەفرق یان ئاسن کە دەسکیان بە دیمـەنی ئادەمیزاد یـان ئاژەڵ نەخشـێندراون (ق٣٧). هــەروەها کوڵینـگ و تـەوری ئاسـن یـان مـەفرق (مزقـەلایی) کـە زۆربـەیان بـە دیمـەنی بوونەوەران یان ئەندامێکی بوونەوەران ڕازێندراونەوە (و ٨)؛ شـاز و سـەرنج ڕاکێشـترینی تـەورەکان ئەوانـەن کـە دەم یـان دەسکیـان لەسـەر شـێوەی شـەویلاکەی داپچـڕاوی بوونـەوەرێک داڕێـژراوە و باڵنـدەیەک خەریکـە لێـی دەردەپەڕێ (و٩، ق٣٨).

هەروابێتەوە نابێ ئەم شتانەی خوارەوەشمـان لـە بیـر بچـێ: سـەرنێـزە، قوڵەنێزەی دووفلیقانە، سەرەتیری ئاسن یان مـەفرقی وەک گـەڵای دارخورمـا، قووچەکی یان سێپەلکە؛ تلیسقەوفلیسقە یان قفڵ و قەڕازەی ئەسپ و عارەبانە، بەتایبەت لغاو و سەرکەللەی یەکسەرە یـان جومگـەدار، کـە تێکڕایـان بـوارێکی کراوەیان بۆ وەستاکاران دەڕەخساند (و ٢١). لەسەر ڕووکاری ئەمانە دیمەنی ئەسپ، بزنەکێوی، گا، بوونەوەرانی ئەفسانەیی یان تێکەڵکراو لەگەڵ عارەبانان دەنەخشێندران (و١٠). لە نێو شتە زۆر دەگمەنەکاندا دەبێ باسی دەسکارێکی مزقـەلایی (مـەفرەق) بکـرێ کـە خولـخولـە و زەنگوڵـەیـەکی پێوەیـە و دەبـێ بـۆ چوڵەپێچ کران بووبێ. لەسەر ڕووکاری ئەم دەسکارە دوو پیـاو لەگـەڵ چەند شێران تێکهەڵچوون و دوو گا کەوتوونە لای سەروویان و دوو مەیموونیش لە سەرووترن. ئەم شتە دەبـێ لـە سـەری کەژوویـەکی نەخشـین خرابـێ و قـۆڵی عارەبانـەی بـە ئەسـتۆبەندی ئەسپەوە گرێ دابـێ، کـە لـە دیمـەنی بەردەتاشـی ئاشوورییەکاندا دەبیندرێ (و١٠). هەر لەو شێوە شتانە دەکرێ باسی سەری ئەسـتۆبەندێکی مــەفرق بکــەین کــە دوو شــێری ســەمبولیک و هەڵۆیــەکی باڵئەنگاوتووی لەسەر شەقڵێندراوە (و١١- ١٢). چەند لغاوێکیش هەن کە دوو

قەڵافەتیان لەسەر داڕێژراوە و وێدەچێ دیمەنی ڕێورەسمی بەخشینی پلە و پایە بێ (و١٣).

لە نێو سڵسڵە و پلپڵەی خۆ لە گوڵدان و ڕازانەوەدا، دەرزیلەی فرەچەشن وەبەرچاو دێن کە سەرەکانیان لەسەر شێوەی سەری ئاژەڵ و باڵندان یان قەڵافەتی سەرتاپاخواری بوونەوەران داڕێژراون (و١٤، ق٣٩). لەسەر ڕووپەڕی کەمەرەیەکی کە بەجوانی نەخشێندراوە، زۆر بەوردی دیمەنی ڕاو و کۆمەڵێک بابەتی ئەفسانەیی شەقڵ کراوە. ئاوێنەی مەفرەقی ئەو زەمانە هێندێکیان دەستەیان لەسەر قەڵافەتی ژنێکی ڕووت داڕێژراوە کە لە لاجەوە دەڵێی دەمی شمشێری زۆر شازی لوڕستانە (و١٩). لە نێو وردەشتی نەزرینەدا کە هێشتاش بە چاکی نازانین چۆن و لە کوێیان کار پێکردوون، دیمەنی بزنەکێوی یان ئاژەڵی دیکەی کێوی بە شێوەی سەمبولێک هەڵکەندراون و تێکهەڵچوونی قارەمانێک لەگەڵ دوو دڕندە دەخەنە بەرچاو (و٢٤). لە نێو کەلوپەلی پێویستی بەڕێوەچوونی ڕێورەسمی دینیدا چەند دیزەڵەی مزقەڵایی وەبەرچاو دەکەون کە نەخش و نیگاری تایبەت بە میوانداری یان دێوی لەسەر پاشوو چەقیوی بەرەوڕووی داری پیرۆزیان لەسەر هەڵکەندراوە(ق٤٠).

دەبێ بۆ دەرزیلەی سەروپرچان کە سەری پانکەڵەیان نەخش و نیگاری هەڵزەقاویان پێوەیە باسێکی تایبەت دابمەزرێ. ئەو ڕوخسارەی کە لە ڕووبەڕوورا بە تەواوی دیارە، دەبێ دیمەنی «خاتوونەخوای دایک»ی نێو هۆز و نەتەوەکانی ئاسیایی بێ کە لە ئاسیای بچووکەوە هەتا شووش دەپەرسترا. وەک لەسەر ڕووکاری هێندێک لەو وردەشتانەڕا دیارە، ئەم خاتوونەخوایە لینگی لێک بڵاون و مەمکی ڕێککوشیون و خەریکە دەزێ (و٢٨). هەزاران پەیکەرۆکەی ئاوا لە ڕۆژهەڵاتی نیزیک دۆزراونەوە و لە شووش ئەم خاتوونەخوایە سەمبولی

داهات و بەرهەمی بەرپێژەوە و بە ناوی «کیویرشە» لە ماوەی سەدان ساڵدا پەرستراوە. ئەم ڕێبازە کە بە «نانایا» ناودێر کراوە، هەتا سەردەمی پارتەکان بڕی کردووە و کۆمەڵێک پەیکەرۆکەی سواڵینەی ئەم خاتوونەخوایە لە گۆڕستانی کۆنی پارتەکاندا دۆزراونەوە. لێرەدا بە سەر پرسیارێکدا دەکەوین: داخوا ئەم دایکەیە کە سەمبولی داهات و بەرهەمی بەرپێژەوە، هەمان ئاناهیتا نییە؟ داخوا لە ڕووی یەکترخوێندنەوەی ڕێوشوێنی پەرستن و هێندێک لەو دیمەنانەی وەبەرچاو دێن، دەبێ ئاناهیتا نەبێ؟ ئەم بۆچوون و گریمانەیە لە ڕووی قەراخی هێندێک دەوریرا دەسەلمێ کە تایبەتی دابودەستووری دینین و دیمەنی ماسی و هەناریان لەسەر شەقڵێندراوە و ئەوانیش سەمبولی ئاو و بەرهەمی بەرپێژەون.




ق٤٠ـ لورستان: دیزەڵەی مزقەلایی

هەروەها دیمەنی نەخشێندراوی سەر کیتەڵەیەکی مەفرەقی مووزەی لووڤر، بەڵگەیەکی دیکەیە و ڕەنگە نموونەی سەرەکیی دیمەنی ئەهوورامەزدا بێ(و٢٧).

ئەم دەرزیلانە کە لای سەرەوەیان بریتییە لە پەڕەیەکی پانکەڵە، ڕەنگە لە قەڵشتی دیواری بەردینی نژیارێک (پەرستگایەک؟) ڕۆکرابن و لەوێ دۆزرابنەوە. ئەم کارە دابی کۆنباوی ڕۆمییەکان دەخاتەوە یاد کە بە مەبەستی تەراندنی نەخۆشیی «چاوقوڵکە» بزماریان لە دیواری پەرستگایان دادەکوتا. ڕەنگە لە لوڕستان سازکرانی پەیکەرۆکەی ئەم خاتوونەخوایە بە مەبەستی وەدی هاتنی ئاواتی تێری و تەسەلی و زۆربوونی بەرهەم و داهات لە دیواری پەرستگایان درابن. ئەم ڕوخسارانە لەسەر شێوازی ڕووبەڕوو نەخشێندراون، بە شێوەیەک کە هەستی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان هێزی خوایەتی و بڕواداردا بەدی دێنێ. تەتەڵەکانی لوڕستان دەکەونە ڕیزی کۆنترین شوێنەوارە دەسکردەکانی مرۆڤ کە «ڕێسای هاودەقی»یان تێدا ڕەچاو کراوە، [یانی دیمەنەکان بە شێوەیەکی دەقاودەق دەکەوتنە بەرەوڕووی یەکتر یان تەواو لە ڕووبەڕووڕا نیشان دەدران.] ئەم شێوازە داهێنانی تایبەتی هونەری ئێرانییە و پێشتر لەسەر ڕووکاری دەفرە نەخشینەکانی گۆڕستانی سیێلکەدا وەبەرچاو هاتووە و وەستاکارانی سەردەمی پارتیش بە شێوەیەکی بەربڵاو پەرەیان پێداوە.

وەک دەڵێن، لە شوێنێکی نە هێندە دووری کە ئەم دەرزیلانەیان لێ دیتراوەتەوە، گۆڕستانێک هەبووە و گۆڕەکانی پڕ بوون لە یەسکوپرووسکی تێکەڵوپێکەڵ. تۆبڵێی لێرە نێژرانی دوو قۆناخی هەبووبێ، وەک چۆن لە نێو موغەکان‌دا باوە؟ موغەکان هەر ئەو کەسانە بوون کە لە نێو مادەکان‌دا بە کاروباری دینی ڕادەگەیشتن و چەشنی هۆزانی بیابانگەردی نۆردیک (باشووری)، سەرەتا تەرمی مردوویان لە دەرەوە دادەنا و پاشان [یەسکوپرووسکیان] بە خاک دەسپارد.

ههروهها زۆر پێویسته كه بهوردی له شاخی درێژی ئهو بزنهكێوییه خوردبینهوه كه شاكاری پهیكهرسازانی لوڕستانه (و ١٥). ئهم شێوازه بهوپهڕی شارهزایی له هونهرمهندانی ئاشووری خوازراوهتهوه و بۆ چكۆله كردنهوهی پهیكهران بوونه پێشهنگی وهستاكارانی ههخامهنشی. ئهم هونهرمهندانه هێنده چاكیان له دهرهێنانی جهغزی ڕوخسار نهدهزانی و بۆیان ههڵنهدهزهقی و كهپۆ ههمیشه درێژ و چاو خڕ و تهواو داپچڕاو بوون (و ١٦). زۆر بهههڵكهوت شارستانییهتێكی وا وهبهرچاو دێ كه كولتوور و هونهری بگاته شانی شارستانییهتی دهسكاری لوڕستان. بهردهوامی و نهپسانهوهی كولتووری كۆنی ئهم ناوچهیه تهنیا له چهند دهفرێكی سێپێچكهی باوی ههزارهی دووههمی پێشزایینردا خۆی دهنوێنێ و وادیاره دهبێ ماوهیهكی درێژ خهڵك كاریان پێكردبن و ئێمه له توێژینهوهكانماندا زۆر جاران تووشیان هاتووین. له لایهكی دیكهوه زۆر وێدهچێ كه تهواوی ههوروهاڵه نهخشینهكانی لوڕستان ڕهسهن و خۆماڵی بن. ههڵبهت له نێو ئهم شوێنهوارانهدا چهند پارچهیهكی باوی كلكهی ههزارهی دووههمی پێشزایینیش وهبهرچاو هاتوون. هونهری لوڕستان خاوهنی خاڵی هاوبهش و پهیوهندییهكی زۆره لهگهڵ كولتووری گۆڕستانی «ب»ی سیێلكه، و ئهویش هی ئهو تیره و هۆزانهی ئێرانین كهوا ماوهیهك زووتر هاتوونه بانووی ئێران.

هونهری لوڕستان دهیان نموونهی ڕهسهن له ئاسهواری كولتووری ئهم سووكهڵهسواره ئازایانه دهخاته بهرچاو كه بریتین له چهكوچۆڵ، تلیسقهوفلاسقهی ئهسپ، دهفری مزقهڵایی یان ههوری لوولهدرێژ كه پێشتر باسیان كراوه. ههروهها باسی كۆمهڵێك پهیكهرۆكهی مزقهڵایی و وردهشتی خۆجوانكردن و دهرزیلهی نهخشێندراو به دیمهنی بوونهوهران كراوه، كهچی

دیسانیش شکڵ و شێوەی تازەبابەت کە لە ناوچە و هەرێمەکانی دەوروبەر و دووردەستەوە هاتوون کەم نین. بێجگە لە هونەری کۆنی دووچۆمان کە دیمەن و قەڵافەتی «گیلگامێش»ی[1] تێکهەڵچوو لەگەڵ هەموو چەشنە دڕندەیەک دەخاتە بەرچاو، کەندۆخینی وردەکارانەی «کەرکووک»یش بەدی دەکرێ کە بە کۆمەڵێک بابەتی ئەفسانەیی و خەیاڵی، هونەری بتسازیی ئاشووری دەوڵەمەند دەکا. هونەری ئاشووری شوێنەواری خۆی لەسەر ئەو دەفرانە بەجێهێشتووە کە تایبەتی داب‌ودەستووری دینی بوون و دەسکیان لەسەر شێوازی سەری بەرانەکێوی داڕێژراون. تەورەکان لەسەر شێوازی سەری بوونەوەران ساز کراون کە دەڵێی دەمی تەورەکەیان یەق کردۆتەوە و دەبێ وێنەیان لە هونەری هوورییەکان هەڵگیرابێتەوە. ئەگەر بێتوو بە هەڵە نەچووبین، سەری قولاپەی نەخشێندراوی کەمەران، هونەری کۆن و تایبەتی سەکایی‌یەکانە و شتی ئەوتۆ لە کەندوکۆژەکانی باشووری ڕووسیادا دۆزراونەوە. کۆمەڵێک بابەتی باوی سەدەی هەشتەم یان حەوتەمی پێش‌زایین، کە لە هونەری «سووری ـ هیتی»ش‌دا وەبەرچاو دێن، خۆیان لەسەر ئەم وردەشتانە دەنوێنن. بۆ وێنە ڕاوکەرێکی کە تیرەکەی بزنەکێوییەکی ئەنگاوتووە و ئەویش بە شێوەیەکی سەیر سەری بۆ لای پەلاماردەرەکەی وەرسووڕاندووە. ئەم بابەتە لە نێو هونەری میرنشینەکانی هیتی‌دا باوە بووە کە کەوتوونە ئاسیای بچووک و باکووری سووریا و ناوبانگی بە «هیرۆگلیفی» ڕۆیشتووە. لەم ئاخرییانەدا، نموونەیەکی جوانی ئەم دیمەنە لە جەنگەی کەندەوکۆژەی «قەرەتەپە»دا دۆزراوەتەوە. دەکرێ ئەم دەسکارانە لەگەڵ شتەکانی ناوچە دوورەدەستەکانیش پێکەوە بەراورد بکرێن و هەودای پەیوەندییان لەگەڵ شارستانییەتی «سیس»ەکانی ئەم بەرەی قەفقاز و جەماوەری

---

١ـ گلگامێش، گلگەمێش



لوڕستان: پەڕەیەکی زێوین

ئەوبەری قفقاز و تەنانەت ڕەنگە «چین»یش لە دەمامکی «تائۆتیە»دا، یەکتر بگرێتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێ تازە هونەر دەکەوێتە خزمەت ڕوانگە و لێکدانەوەی کۆنباوی نەتەوەکانی ئێرانی. هەر لەسەر ئەم ڕەوت و ڕێبازەیە کە دەوری «زوروان»[1]، خودای [نێرمێ]، لەگەڵ دووانەی ئوورمەزد (ئەهوورامەزدا) و ئەهریمەن کە لە داوێنی خۆی بەربوونەوە، دەردەکەوێ. هەروەها سێ کەسایەتیی پایەبەرزی سەمبولی سێ سەدەی مێژووی مرۆڤ، لەسەر پەڕەیەکی زێوین، دەناسرێنەوە. سێ کەسایەتی کە لە ڕێوڕەسمێکی دینیدا هێمای دەسەلات یان «بەرسوم» وەردەگرن[2]. لە دیمەنێکی دیکەدا، خاتوونەخوایەکی

---

١- زورڤان

٢- گیاپیرۆزە

چەندسەر، لە گژ دوو دێوەزمەی شاخداری ملدرێژ ڕاچووە کە شەویلاکەیان لێ داپچڕیوە. ئیزەدێکی «هەزارگوێ» و «هەزارچاو» هەیە بە ناوی «سێرەئۆشا» [سرووش] کە وێڕای «میترا» و«ڕاشنوو»، تەرازووداری کاروباری ئەو مردووانەن کە دەیانهەوێ بە باریکەپردی «چینڤەت»دا بپەڕنەوە کە لە دەمی شمشێر تەسکترە.[1] هەبوونی بتی ئاوا لە نێو گۆڕی مردوواندا، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرای لە پشتە: مردوو بۆیە خاتوونەخوای پێیە هەتا لە تاوانی خۆش بێ. سەمبولی بوونەوەرییانەی سێرەئۆشا، کەڵەشێرە کە دوو تا چوار سەرە کەڵەشێر لە دیمەنەکەدا دیارن[2].



لورستان: پەیکەرەی مەفرەقی

بە ڕێکخستن و پێکەوە هەڵسەنگاندنی ئەم تێبینی و لێکۆڵینەوانە لە بواری کەلالەیەکی ڕەگەزیدا و بە هەوڵ و تێکۆشان بە مەبەستی ڕۆچوونی زیاتر بەم گرێکوێرەیەدا کە سەرەپرچک و هەودای دەگاتەوە نێو دین و ڕێبازەکانی دوور و نیزیک، دەگەینە ئەم ئاکامەی کە لە نێو کۆمەڵی توێژەراندا گەلێکی لایەنگر هەیە: تیرەیەکی سوارانی شەڕکەر کە پێشتر کەموزۆر لە نێو هۆزەکانی ئێرانیدا توابوونەوە، تێکەڵی هۆزێکی ئاسیای بوون. ئەم تۆرەمە تازە شەڕکەرە، لە ماوەی کۆچ و کۆڕەوی خۆیدا، دەستی لە تالانوبڕۆ نەپاراست و گەیشتە هەر

---

١ـ لە گێرانەوەی ئیسلامیدا هاتووە کە «پردی سیرات» لە مووی سەر باریکتر و لە ئەڵماس تیژترە.و.

٢ـ وەکوو بۆمان ڕوون بۆوە ئەم برگەیەی دوایی لە وەرگێرانەکەی دوکتۆر موعین دەرهاوێژراون.و.

جێگایەک خاپووری کرد و چەند ناوچەیەکی ئاسیای خۆرنشینی بە تراتێن و ڕمبازێن داڕووتاند. دەبێ بیسەلمێنین کە زۆربەی کەلوپەلەکانی لوڕستان سەبارەتن بە سەدەی هەشتەم و حەوتەم و تەنانەت پێشتری پێشزایین. بەڕاستی پێویستە کە تویژەرێکی باریکبینی مێژوو بە دوای شوێنپێی کیمیرییەکان و سەکاییەکاندا بگەڕێ و دوایین کۆرەوی کۆچەران بێنێتە بەرچاو. ئەو کۆچەرانە پاش هرووژمی تالانکەرانەیان کە قەفقاز و سنوورەکانی میسر و لێوارەکانی ئاسیای بچووکی گرتەوە، لە زاگرۆس پاشەکشەیان پێکرا و چوونە ژێر دالدەی حکوومەتی مادەکان و سوارەکانیان بە سەر ناوچەیەکدا کەوتن کە باشترین تۆرەمەی ئەسپی لێ بەخێو دەکرا. لەوێ کارسازترین هۆکاری سەرکەوتن کە بریتی بوو لە سوارە و ئەسپی چالاک، هێزێکی بەرچاویان بۆ حکوومەتی ماد پێکهێنا، کە تازە لە گەڵای داری دەدا و گەیبوویە پۆپەی دەسەڵاتی.

**کیاگزار [کیاکسار]**[1]

هێرۆدۆت پێیوایە ئەو ساڵانەی کە کیاکساری کوڕ و جێگرەوەی فرەوەرتیش (خشەسریتە) بە نابەدڵی سەری وەبەر دەسەڵاتی سەکاییەکان هێنا، بۆ داهاتووی هێز و لەشکرداریی مادەکان، خێری پێوە بووە. فەرمانڕەوای ماد، پێکهاتەی هێزەکانی خۆی سەرلەنوێ داڕشتەوە و سوارە و پیادە و کەوانداری بە جوێ دانان. هەروەها وێدەچێ کە وێنەیەکی زۆری لە ڕێوشوێنی هێزی سەربازیی سەکاییەکان هەڵگرتبێتەوە کە لە شەڕی پارتیزانیدا گەلێک شارەزا و بەئەزموون بوون. تەنانەت وێدەچێ کە مادەکان هێندێک شێوەی کۆنباوی هونەری سەکاییشیان ڕەچاو کردبێ. کیاکسار (هووەخشتەرە)،

---

١ـ هووەخشتەرە

هەلومەرجی سیاسیی خۆی بە گرتنی چەند ناوچەیەکی دەوروبەری گۆلی ورمێ، پتەوتر کرد. وەک هێرۆدۆت دەڵێ، توانی لە شەڕی «مادیس»ی سەکایی‌دا، سەرکەوتنی پڕشنگداری یەکلاکەرەوەی چارەنووس‌ساز وەچنگ بێنێ و وێدەچێ مادیس بە خۆی و دارودەستەی خاکی ماننای بۆ خەنیمانی چۆل کردبێ.

**گەنجینەی [زێوییەی] سەقز**

بە بڕوای ئێمە، بەسەرهاتی ڕابردووی سەکایی‌یەکان لە هەلکەوتێکی دەگمەن‌دا، تیشکی دەخرێتە سەر، کە خەڵکی گوندی [زێوییەی] سەقزی باشووری گۆلی ورمێ، لەم دوایی‌یانەدا، ئاسەواری دەدۆزنەوە و دەیخەنە بەرچاو. لامان وایە ئەم کۆما ئاسەوارە سەری دەگاتەوە سەر خەزێنەیەکی میری و ڕەنگە زەمانێکی هی پارتاتوا یان «مادیس»ی کوڕی بووبێ، بەڵام لێمان ڕوون نییە کە داخوا لە گۆڕێک‌دا دۆزراونەوە یان لە حەشارگەیەک‌دا. ئەم کۆمەڵەیە بە سەر چوار دەستەی تەواو جیاوازدا دابەش دەکرێ: بێگومان هێندێکیان لە ڕووی نێوەرۆکی هونەری و شێوەی کارەوە ئاشوورین؛ تاقمەکەی دیکە سەکایین؛ لەوان بترازێ کەلوپەلی تێکەڵەی هونەری «ئاشووری - سەکایین» و زۆر وێدەچێ کاری هونەرمەندانی ئاشووری بن و سەرەنجام دەستەی چوارەم، دەسکاری کارگەی خۆماڵی و ڕەنگە ماننایی بن، بەڵام بە هێندێک شێوازی جوانکاریی هونەری ئوورارتوو نەخشێندراون.

لە نێو کەلوپەلەکانی دەستەی یەکەم‌دا، دەبێ باسی دەسبەندێکی زێڕی بێخەوش و شاز بکرێ کە زۆر بەوردی کاری لەسەر کراوە و هەردک سەری بە دوو کەللەشێری شەویلاکە داپچڕاو، داکووژاوە. سەرێکیان لە جێی خۆی دەجووڵێتەوە و هاتوچۆ دەکا هەتا دەسبەندەکە بچێتە مەچەکەوە و بە

ئاڵقەرِیزێکی وردەڵە دادەخرێ. قەفی دەسبەندەکە بریتییە لە چوار لۆی تەخت کە هەتا بەرەو نێوەراست دەرِۆن، پانتر دەبنەوە و لەو جێیەی تەواو پان رادەکەون، دوو بەچکە شێری راکشاو، هەڵزەقێندراون. ئەمە شاکارێکە لە هونەری کەندۆخان و زێرِینگەرانی ئاشووریدا. لەسەر رووکاری پەرِەیەکی زێرِین دوو دەستە بوونەوەر و جنۆکەی باڵدار هەڵزەقێندراون کە بەرەو داری دەسکردی ژیان دەرِۆن. لەسەر ئەو پەرِە مەفرەقانەی کە بە سەر سندووقە دارینە پرِ گەنجەکەدا کشاوە، کۆمەڵێک بزنەکێوی شەقڵێندراون کە خەریکی هەڵبەزدابەز و راوراوێنن و هیچیان مافیان بە سەر هیچیانەوە نییە و پەلە گوڵی داودی، بە شێوازی کۆنی ئاشووری، لە یەکتری دابرِیون. شانەوشانی سندووقەکە، کە رووکەشی مەفرەقی پێوەیە و یەکجار ژەنگار گرتوویە، بە دیمەن و قەڵافەتی پایەبەرزانی بارگا رازاونەوە کە پێنجیان جلوبەرگی ئاودامێنی ریشۆڵەداریان پۆشیوە و وێدەچێ یاران و هاورِکێفانی پادشای ئاشووری بن، بەڵام ئەوانەی لە دواوە وەبەرچاو دێن و هەشت کەسن بەلەکیان رووتە و رەنگە پاسەوانی میری بن کە بەوپەرِی وردەکارییەوە هەڵکەندراون. بابەت و نێوەرِۆکی ئەوتۆ لە نێو کۆشک و تەلاران، لەسەر رووبەری تەتەڵەی هەڵزەقێندراو، وێنەگەریی نەخشینی دیواران و کاشی رەنگین و گەوهەربەند زۆر بەدی دەکرێن. لە رووی هێندێک نیشانە و تایبەتمەندییەوە دەردەکەوێ کە دەبێ ئەو کۆمەڵەیە سەر بە سەردەمی پادشایەتیی ئیسارحادۆن (٦٨١–٦٦٨ی پ.ز) یان هێندێک دواتر بێ. ئەم مێژووە، نابێتە کۆسپ لەسەر رێگای ئەم بۆچوونە کە پێی وایە دەکرێ بەشێک لەم گەنجینەیە، گیازی شادۆتی ئاشووری بێ کە مێردی بە پارتاتوای پادشای سەکایی کرد. شوێنی دۆزرانەوەی ئەم گەنجینەیە یەکێکە لەو گوندانەی کوردستان کە هەتا ئەمرۆ ناوی خۆیان پاراستووە.

وەکوو دیارە «سەقز» ناوی خۆی لە سەکاییەکان یان سەککەکان وەرگرتووە، کە لە تەورات و دەقەکانی ئاشووریدا بە ئیشکووزای ناودێر کراون. لە ڕاستیدا تێکڕای دیاردە و نیشانەکان دەمانخەنە سەر ئەم بڕوایە کە سەقز پایتەختی سەکاییەکان بووە، ئەم مەبەستە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زەمانەی کە سەکایی توانییان دەست بە سەر قەڵەمڕەوی «ماننا»دا بگرن لە باشووری



ق٤١ـ گەنجینەی [زێوییەی] سەقز: کەشەفی زێو

گۆلی ورمێ و ئەوەندەش دەزانین کە زۆر جاران ناوی هۆزی سەرکەوتوو، پایتەختەکەی پێ ناودێر کراوە.

بەرچاوترین شتی نێو تاقمی دووەم، بریتییە لە کالانێکی زێڕینی جوانی دەسکاری سەکایی. ئەم کالانە بە کۆمەڵێک سەری بزنەکێویی هەڵزەقێندراو ڕازاوەتەوە. قەفی شاخی بزنەکان وەکوو کەمەی ئامێری چەنگ هاتوونەوە. جێدەستی ئەم کالانە لە زێڕی عەیارچاکە و لە هەردک بەرانەوە سەری مرۆڤی لەسەر هەڵزەقێندراوە و شێوازێکی زۆر وردەکارانەی تێدا ڕەچاو نەکراوە. سەرەکان تەواو هاوشێوەن و کەموزۆر وەکوو دەمامکی «تائۆتیە» دەچن (و١٧). چەند پەڕە و پەلکەیەکی زێڕینیش، کەمەرەی پانی کالانەکەیان ڕازاندۆتەوە (و٢٩). زانایان لەسەر دیاری کردنی مەبەست و ئامانجی پەلکە تەتەڵە زێڕینەکان، کە ڕەنگە کرابنە ڕووکەشی سندووقان، دوودڵن (و٢٠). ئەو دیمەنانەی کە لە سەریان شەقڵکراون و هەڵزەقاون بریتین لە چەند کەللەسەری ورشەگ(؟)[1] کە لە ڕووبەڕوورا دیارن و بە خەت و کووزی کەوانی تێکخراون. نێوەنێوە بزنەکێوی و بزنی ڕاکشاو کە پەلیان بردوونەوە بەرخۆیان وەبەرچاو دێن و شاخیان بە شێوەی ڕەسەنی هونەری کۆنباوی سەکایی بۆ لای تیغەرەی پشتیان، پشتەوشکێن بۆتەوە. ئەوەی لە نێو ئەم دەستەیەدا جێگای سەرسوڕمان و تێڕامانی تایبەتە، کەشەفێکی زێوە کە ٣٦ سانتیمیتر پانە و لێوارەکەی بەحاڵ و دووبەلا بۆ لای ژوورەوە هەڵگەڕاوەتەوە و بە گوڵەبزماری سەرخڕۆکەی زێڕ نەخشێندراوە (ق٤١).

وەکوو دیارە ڕووکاری ئەم کەشەفە بە شێوەیەکی ورد و باریک کەندەکاری کراوە و بریتییە لە چەند ڕیزەبابەتی فرەچەشن کە هەرکام لە نێو بازنەیەکدا

---

١ـ چەشنێک پشیلەی کێوی کە قەڵافەتی بە قەد ڕێوییە و ئازایە و لە تزرەمەی بەورەباریکەیە.و.

خولاونەوە. نێوەڕاستەکەی دەڵێی قوبەی قەڵغانە و گوڵێکی شازدە پەلکەیە کە حەوت بازنەی بە دەوری‌دا لێهاڵاوەتەوە. پاشان دوو ڕیزە سەرەنێزە دیارن کە بە حەوت بازنەی دیکە لێک جودا کراونەوە. دواتر ڕیزە بوونەوەرێکی وەکوو ورشەگ بەدی دەکرێن کە لەسەر کەلەکەی چەپ ڕاکشاون و سەریان هەر بەو شانی‌دا وەرسووڕاندووە و دەڵێی لەو کەرویشکانە خەفتاون کە بە شانی ڕاست‌دا بازرە بوون و بە ڕیزێک سەری ورشەگی دڕندە لێکدابڕاون. ئەم سەرانە کە تەنیا دەنکێکیان لە ژێر داڕێژراوە، دوو ڕیزن، کە جارێک ڕوویان لە لای ڕاستە و جارێک لە لای چەپ. ڕیزێکی سەرەوەی کەرویشکەکان و ڕیزێکی کە بە دەوری ورشەگەکان‌دا لێهاڵاونەوە هەر لەو دڕندانەی کێوین کە باسیان کرا. جەللەی ورشەگی ئەم جار لەسەر چینچکان هەڵتووتەکاون و دەڵێی بۆ ڕاوێ ڕاساون و هەر جووتەی ڕوویان لە یەکتری کردووە. ئەم دیمەنە وەکوو نەخش و نیگاری سەر کالانی هەڵکەندراوی سەکایی دەچن کە لە «کێلێرمێس» و لە جەنگەی کەندەوکۆژەی «مێلگونۆڤ»دا دۆزراونەوە. لە ڕیزی ئاخری‌دا، لیزگەیەک گەڵای تیژکەڵە کە هێلێک بە نێوەڕاستیان‌دا تێپەڕیوە، دەستیان تێکگرتووە و بنیان لێواربەلێواری گوڵەبزمارە زێڕەکان ڕۆیشتووە. گومانی تێدا نییە کە ئەم هێما و نیشانانە دەبێ دەقێکی نووسراویان بەدی هێنابێ و ئەمە تەنیا شوێنەوارێکی نووسراوە کە لە نێو کەل‌پەلەکانی سەکایی‌دا دۆزراوەتەوە(ق٤٢).

هونەر و نووسینی سەر ئەم کەشەفە، بەڵگەیەکی هێژایە بۆ ئەوەی بتوانن بە کۆنترین شوێنەواری دیرۆکیی سەکایی دابنێین کە ڕێسا و ڕێ‌وشوێنی ناسراوی «سیت»ی تێدا ڕەچاو کراوە. تۆبڵێی ئەم شێوە نووسینە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خەتی «هیرۆگلیفیی هیتییەکان» نەبێ کە بەرلە سازکرانی ئەم کەشەفە، لە ئاسیای بچووک و باکووری سووریا برەوی هەبوو؟ تاقمێک لە

دەرزیلە ساکارە زێڕەکان، دەیسەلمێنن کە ئەم خەزێنەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش سەدەی هەشتەم و ئێمە وامان پێخۆشە کە مەودای نێوان سالانی ٦٨٠ و ٦٢٥ی پێشزایینی بۆ دیاری بکەین.

لە نێو کەلوپەلەکانی دەستەی سێهەمدا، دەکرێ باسی دەسک یان هەنگلی زێڕینی مەنجەلۆکان بکرێ، کە یەکیان لەسەر شێوەی شەهێنێکی دەندووک خواری چاوخڕ دارێژراوە و ئەوەندەی ئاگامان لێیە، یەکێکە لە هەلکەوتووترین شاکارەکانی هونەری سەکایی و بەشێکی زۆریان لە گۆڕی سەکاییەکانی باشووری ڕووسیادا دۆزراونەوە و دەکەونە نێو چوارچێوەی هونەری



ق٤٢ـ گەنجینەی [زێوییەی] سەقز: دەقێکی نووسراو لەسەر کەشفی زێو

جوانکاری و نەخشاندنی «ئووراسی» لە هەرێمی گیاجاڕی ئەو ولاتەدا (و٢٥). دەسکەکەی دیکە لەسەر دیمەنی شێر دارڕژاوە (و٢٦)، بەلام شێرێکی ئارام و دەستەمۆیە و بەپێچەوانەی هونەری ئاشوورییەکان سەیر جوانە، ئەگەرچی وێنەشی لە هونەری سەکاییەکانی باشووری ڕووسیادا وەبەرچاو دێ. شتێکی

دیکەش کە وامان پێ باشە بیخەینە نێو ئەم دەستەیەوە، دەسبەندێکی گران و سەنگینە کە هەردک سەری مراوییە و پێکەوە جووتن، بەڵام سەریان بە پشتەوەدا شکاوەتەوە. قەفی دەسبەندەکە پێچپێچە و لە هونەری هەخامەنشیدا سەرنجێکی زۆری خراوەتە سەر و لە گەنجینەی سەقزدا بە تەواوی ناسێندراوە (و٣١). گرینگترین خشڵ کە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن هەموو کوت و لەتەکانی پارێزراوە و خراوەتەوە سەر یەکتر، تۆق یان سینەبەندێکی زۆر پانی زێڕە (و ٣٢)؛ لێرەدا نابێ لە بیرمان بچێ کە بەداخەوە کەل‌وپەلەکانی گەنجینەی سەقز بە شێوەیەکی بێبەزیی‌یانە لە کاتی دابەشین لە نێو خەڵکی ئاواییدا شکاون و کوت‌کوت کراون. ئەم سینەبەندەی باسی دەکەین بە دوو هێڵی پانی وەکوو کەوان ڕازێندراوەتەوە. کۆمەڵێک ئاژەڵ و بوونەوەری لێکدراو کە ڕوویان کردۆتە دوو داری سەمبولیک لەسەر ئەم هێڵانە نەخشێندراون. پۆلێک دار، چەند سەرێک نێرییەکێوی، دێوانی باڵدار، گاگەلی باڵدار لەسەر دیمەنی ئادەمیزاد (لاماسوو)، کۆمەڵێک قەلافەتی ئەفسانەیی لەگەڵ بەری داری کاژ کە کەوتوونە قەراخان، هەموویان هێندە دیار و ئاشنان، کە ئەگەر بێتوو لە گۆشە و کەناران کەروێشک ملیان نەنابا لە هەڵبەزدابەز و دڕندەیەکی خۆمەڵاس‌داو بەدی نەکرابا، دەکرا بڵێین ئەمە دەسکاری زێڕینگەرانی ئاشوورییە؛ بەڵام دیمەنی کەروێشک و دڕندەی خۆمەڵاس‌داو، ڕاست هەروەک ئەوانەن کە لەسەر کەشەفەکە نەخشێندراون و بەڕاشکاوی سەر بە شێوازی سەکایین. ئەم پارچەزێڕە، زیاتر لە هەموو شتێکی دیکە، بیری هەبوونی هونەرێکی نوێ دەخاتەڕوو کە لە باکووری خۆرنشینی بانووی ئێراندا، گووڕاوە و ڕووی کردۆتە گەشە. ئەم شێوازە وێنەی لە هونەری ئاشووری هەڵگرتۆتەوە کە ڕیشەی دەچێتەوە سەر

هونەری سەکایی و بژتە دوو تۆوە؛ واتە دوو کولتوور کە لە باڵی خۆرنشین و باکوورەوە پەرەی دەستاند و خەریک بوو هەموو لایەکی دادەگرت.

لە دەستەی چوارەم و ئاخریدا، پەڕەیەکی تەنکەڵەی زێڕمان وەبەرچاو دێ کە ڕەنگە بە کەمەرەیەکی چەرمەوە دروابێ. لەسەر ڕووکاری ئەم پەڕەیە دوو ڕیز ئادەمیزاد دیارن کە باج و پیتاکیان پێیە و دەیبەن. ئەمانە چەند سەر ئاژەڵێکیان بە دوای خۆیاندا پەت کردوون و ڕایاندەکێشن. ئەم ڕووکەشە چەکوچخۆر کراوە و دیمەنەکانی لەسەر شەقڵێندراوە (ق٤٣). بێجگە لە چەند جیاوازییەکی بچووک، ئێمە لێرەدا ڕاستەوڕاست تووشی هونەری لوڕستان دەبین. مرۆڤەکان لووتیان درێژە و ڕاست لە نێوچاوانیان هەڵچووە و نە چەنەیان هەیە و نە ڕیشیان بەرداوەتەوە. هەموویان کڵاوی پانکەڵەی پشتەوشکێنیان لە سەریان ناوە و جلێکی ئاودامێنیان پۆشیوە و کەمەرەیان لەسەر بەستووە. هەروەها ئاژەڵەکانیش لەسەر شێواز و ڕێوشوێنی هونەرمەندانی زێوگەریی لوڕستان نەخشێندراون. چاویان بادامین، موویان بە چەند ڕیزە خەتێکی هاوتەریب دیاری کراون. ماسوولکەیان زۆر بە زەقی نیشان دراون. سمی دووقاشی ئاژەڵەکان کە تەواو لە لاجەوە دیارن، ئەو قەڵشتەی کە دەیانکاتە دوو کوت، خۆ نەدەبوو ئاوا دیار بن. ئەم شوێنەوارە بۆ باری ناسینی هونەری خۆجێیی، یەکجار گرینگە کە هۆگری و تێکەڵاوبوونی لەگەڵ هونەری لوڕستان ڕەوتێکی سروشتی و بەجێوڕێیە، چونکە هاوچەرخ و دراوسێی یەکتر بوون. هێنانە گۆڕی مەبەستی باج و پیتاکدەران بابەتێکی گرینگە کە هونەری هەخامەنشی لەسەر لادیواری پلیکانەکانی «تەختیجەمشید» گەشە و پەرەی پێداوە.



ق٤٣ـ گەنجینەی سەقز: کەمەرەی زێڕ

نرخ و بایەخی ئەم کۆمەڵە ئاسەوارە هێژایە، بۆ ناساندنی سەرلەبەری هونەری زێڕینگەرانی ئاشووری و سەکایی زۆر بە سانایی هەستی پێدەکرێ، گەنجینەی [زێوییەی] سەقز، بەڵگەیەکە لەسەر گەشە و پەرەی چاوەڕواننەکراوی ئەم هونەرانە. مادەکان لە ڕۆژگاری پێکهێنانی شارستانییەتی خۆیان‌دا، بێ‌نێوبڕ لەگەڵیان لە پەیوەندی‌دا بوون و لێمان ڕوونە کە هونەری سەکایی بارتەقای هونەری ئاشووری، شوێنی لەسەر هونەری تایبەتی مادەکان داناوە و هەردک لایان بەشێک لە هونەری ڕەسەنی خۆیان بەجێهێشتووە. لێرەدا هەر بۆ نموونە تەنیا ئاماژە دەکەینە کالانی شمشێری یەکێک لە مەزنەوەجاخانی مادی کە لە ڕیزەی کۆڕی هاوڕێیانی «داریووش»دا وەبەرچاو دێ. ئێمە لێرەدا پاشماوەی ئاسەواری سەکاییمان لەسەر ڕووکاری ئەم چەکەی مادی بۆ دەردەکەوێ (بڕواننە بەشی ٢، قەڵەمکێشی ٧٠).

ڕوون و ئاشکرایە کە ناکرێ هونەری خۆماڵییانەی جەماوەری دانیشتووی باکووری خۆرنشینی ئێران بخرێتە پشت گوێ و تێنەهێندرێ، چونکە ڕەنگە ئەوە

**هونەری مانناییی بێ کە توانی لەم بەشەی ئێراندا، گەورەترین یەکییەتیی سیاسی بەدی بێنێ؛ بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە شتێکی زۆر سەبارەت بەو هونەرە نازانین و چەند ژمارەیەکی کەمی نەبێ، وەبەرچاومان نەکەوتوون. ئەوانەی بە دەستەوەن هیچیان لە ڕەوتێکی کەندەوکۆژەی زانستیدا نەدۆزراونەوە (و٣٣ـ٣٤).**

## پادشایەتیی ماد

**لە سەردەمی پادشایەتیی هووەخشتەرەدا، سەکایی بەزێندران و مانناکان دانیان بە دەسەڵاتیدا هێنا و پارسەکان پێملی بوون و چوونە ڕیزەی جەماوەری بەرفەرمانی. ئەو ئێستا ببوو بە خاوەند و فەرمانڕەوای بێبەرگێڕەوەی بانووی ئێران و وەکوو ئاشکرایە «هەگمەتانە»ی کردە پایتەخت، کە بە واتای شوێنی کۆبوونەوەیە[1]. پاشان خۆی لە ئاشوور هەڵکرد، کە پێشتر توانیبووی بەرپەرچی پەلاماری [فرەوەرتیش]ی باوکی بداتەوە، کە ئازایەتی بوو بە خەنیمی گیانی. وادیارە دەبێ هووەخشتەرە [کیاکزار] هەڵمەتەکانی خۆی بە داگیرکردنی «هارهار»ی کەناری «دیالە» دەست پێکردبێ کە ناوەندی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتیی ئاشوورییەکان بوو لە دۆڵ و دەشتەکانی زاگرۆس، هەتا ئاوا ڕێگای «نەینەوا»ی بە ڕوودا بکرێتەوە. فەرمانڕەوای ماد ئێستا بۆ پەلاماردانی پایتەختی ئاشوور تەنیاباڵ نەبوو: یەکێک لە میرانی بابلی بە ناوی «نەبۆپۆلاسسەر»[2]، لەبەر سیاسەتی شارەزایانە و مشوورخۆرانەی خۆی و لاوازبوونی ئاشوور، بوو بە میر و دەسەڵاتداری بێلەمپەری بابل و شاڵاوی**

---

١ـ ئیکباتان (هەمەدان)، هەمان «هەگمادانە»یە و ڕەنگە بە واتای شوێنی کۆبوونەوەی مادان بێ.و.

٢ـ نابۆپۆلەسسار (Noabopolassar)

بردە سەر پادشای پێشووی، بەڵام فیرعەونی میسر کەوتە نێوان و بوو بە نێوبژیوان و ئاشووری ڕزگار کرد. هەڵبەت ئەم بارودۆخە هێندەی خۆ نەگرت و ساڵی ٦١٥ی پ.ز. هووەخشتەرە هەڵیکوتایە سەر نەینەوا و هێزەکانی ئاشوور زۆر بەگەرمە لێی وەدەست هاتن؛ هەر بۆیە ئەویش ڕەوگەی پەلاماری گۆڕی و لەشکری بەرەو باکوور گاڵدا و پایتەختی پێشووی لێگرتن. نەبۆپۆلاسسەر تۆقی و کەوتە پەلەپرووزە و خێرایەکی پەیمانی پێکهاتنی لەگەڵ پادشای ماد بەست و بارگرژییەکە بە زەماوەندی «بۆختوننەسر»ی[1] جێگرەوەی میری بابل لەگەڵ «ئامیتیس»ی نەوەی هووەخشتەرە، خاو بۆوە. بەپێی سەرچاوەکانی مێژوویی، شکستی هووەخشتەرە لە شەڕی نەینەوادا، دەگەڕێتەوە سەر یاریدەی سەکاییەکان کە چوونە فریای ئاشوور. هووەخشتەرە سەرلەنوێ هەڵمەتی بردەوە سەر ئاشوورییەکان و تەنگی پێهەڵچنین. ساڵی دواتر (٦١٢ی پ.ز)، هووەخشتەرە و نەبۆپۆلاسسەری هاوپەیمان، نەینەوایان گرت. دوایین پادشای ئاشوور ڕایکردە حەرران و دوو ساڵ دواتر ئەگەرچی میسر باڵی گرت و یاریدەی دا، بەڵام ئەم جارەیان هاوپەیمانان زەبرێکی وایان لێ وەشاند کە بۆ هەتاهەتایە ئاشوور ناوی لە نێو لیزگەی کەڵەهێزانی دنیادا سڕایەوە. دەبێ لە بیرمان بێ کە پادشایەتیی ئوورارتووش هەر لەو سەردەمەدا تێکهەڵگلا و خاشەی بڕا. هووەخشتەرە [کیاکزار] زیاتر بە شانی خۆرنشیندا ئەسپی تاودا و خۆی لە لیدییەی ناوەندی گەشەکردووی بازرگانیی جیهانی ئەو سەردەمە، خۆش کرد. هێزەکانی ماد و لیدییە بۆ ماوەی پێنج ساڵ، گیرۆدەی شەڕێکی بێئاکام بوون و وەک هێرۆدۆت دەڵێ ڕۆژگیرانێک یان زۆر وێدەچێ نێوبژیوانیی بۆختوننەسەر- کە لە بابل جێی باوکی گرتبۆوە - هەراکەی داکووژاند. جارێکی

---

١- نەبووکۆدۆنۆسۆر، نەبووکەدنەسسەر

دیکەش زەماوەندێک پەیمانی پێکهاتنی پتەوتر کرد. پادشای لیدییە کچی خۆی دا بە «ئاستیاگ»ی[1] کوڕی هووەخشتەرە، کە ساڵی ٥٨٤ی پ.ز. جێی باوکی گرتەوە. بەپێی ئەم پەیمانە ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق) وەکوو سنووری نێوان دوو حکوومەتەکە دیاری کرا.

سەرتاسەری ئاسیای خۆرنشین، بێجگە لە لیدییە، لە نێوان مادەکان لە باکوور و بابل لەگەڵ سووریا و فەلەستین و عیلام لە باشوور، دابەش کرا. هێز و بڕشتی ماد ڕاستەقینەیەک بوو کە بابل دەبوو دڵی لێی بترسێ و بۆختوننەسر کە بە بوونی ئەو هەڕەشە گەورەیەی دەزانی، بە مەبەستی بەرەلێگرتنی پەلاماری لەناکاوی، شوورە و قەڵای سەخت و ئەستەمی ڕێتێنەچووی لە سنوورەکانی باکووری قەڵەمڕەوی خۆی ساز کردن. بابل چاوەڕوانی ڕووداوێکی ئەوتۆ بوو: پێشگۆتنەکانی «حێزقیال» وەکوو پێشگۆتنەکانی «ئێرمیا» جێیسەرنج و وریاکەرەوە بوون. وەختی خۆی پێشگۆتنی ئێرمیا بە ڕاست دەرچووبوو کە گوتبووی لافاوی هرووژمی هێزی ماد، وێڕای ئوورارتوو وماننا و سەکایی، کە ببوونە پاشکۆ و یاریدەری، بە سەریان وەردەبێ. شەڕ و تێکهەڵچوون بە سەرکردایەتیی «نەبوونید»ی ئاخرین پادشای بابل لە دەوروبەری حەرران دەستی پێکرد. ئەوەی ڕاستی بێ ئاستیاگ خۆی خۆش کردبوو کە بابل بگرێ و خاشەی دەسەڵاتی پادشای بکێشێ، چونکە نەبوونید ببوو بە دەمڕاستی پەرستگای گەورەی «سین»، کە لە ڕاستیدا ناوەندێکی گرینگی بازرگانی و بانکداری بوو لە ناوچەکەدا. حەرران کە ڕێگایەکی دەچۆوە سەر دەریا و لەنگەرگاکانی مەدیتەرانە [دەریای نێوەڕاست]، ببوو بە سێڕێیانی بازرگانیی نێوان باکوور و ڕۆژهەڵات لەگەڵ ڕۆژاوا. نەبوونید خۆی

---

١ـ ئەژدەهاک. ئیشتوویگو

بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئاستیاگ ئامادە کرد و بە زیرەکی لەگەڵ کووروشی دووهەمی فەرمانڕەوای پارسەکان پێکهات کە دەیهەویست چنگ بە سەر شارێی بازرگانیی هەگمەتانەدا بگرێ. ڕقەبەرێکی تازە پێی نابوویە مەیدانەوە. پادشایەتیی پارس لەم ڕۆژگارەدا هەراش و لە خەمڕەخسیو بوو. هۆزی گەنج و بەهێزی پارس کە تازە گۆپاڵی لە خیزی هاتبووەدەر، بە سەرۆکایەتیی پادشاکەی، کە یەکێک بوو لە ئازاترین سەرکردەکانی دنیای کۆن، خۆی لە گرتنی دنیا خۆش کرد.

ئێمە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتیی حکوومەتی ماد نازانین و وەکوو پێشتر باسمان کرد، پیاوانی خانەدانی دیاکۆ، بە هەوڵ و هەڵسووڕانی بوێرانە و بە پشوودرێژی و بڕینی ڕێگای هێمنانە یان نواندنی زەبروزەنگ، توانییان کۆمەڵێک میرنشینی پرش‌وبڵاو، کۆ بکەنەوە و بیانخەنە ژێر باڵی خۆیان و حکوومەتێکیان پێ دامەزرێنن. یەکانگیربوونی ئێرانییەکان لەچاو تیرە و هۆزەکانی میسری و سۆمێری، زۆر بە خاوی ڕێگای بڕیوە، چونکە ئاگادارین کە ئەوان هەر پاش تێپەڕبوون لە قۆناخی ڕاو، بوونە کۆمەڵانی ڕێکوپێکی جووتیار و ئاژەڵدار و کەوتنە سەر دامەزراندنی حکوومەتانی پادشایەتی. هۆکاری ئەم دواکەوتنە دەگەڕێتەوە سەر تێکەڵاوبوونی تێکڕای ئەو تیرە و تۆرەمانەی کە جەماوەری مادیان پێکدێنا و بارودۆخی سروشتی و هەرێمی و کەش‌وهەوا کە دانیشتووانی هەزارەی یەکەمی پێش‌زایین، تووشی هاتبوون دەوری خۆی گێڕا. سەرکەوتووانی ئێرانی بۆ ئەوەی بتوانن بە سەر جەماوەری ڕەسەنی خۆماڵیدا زاڵ بن و پێکەوە بیانکوڵێنن، پێویستیان بە زەمانێکی درێژخایەن بوو. لە بنەبانی سەدەی هەشتەمی پێش‌زاییندا هێشتا ئەم

ڕەوتە نەگەیبوویە سەرەنجام و سەقامگیربوونی ئێرانییەکان، ڕەوتێکی درێژ و دژوار بوو.

ئێران بە ئاوی ڕووباری وەکوو نیل و دیجلە و فورات پاراو نابێ؛ ئەم ڕووبارانەی کە هەموو ساڵێک هەڵدەستن و ناوچەکانی دەوروبەریان دەبووژێننەوە و خاکی بەپێزەوی لێمشتان دێنن. وەرزەبارانی ڕێکوپێک کە بتوانێ پەڵە بە زەوی بدا و تێراوی بکا، نایگرێتەوە. لە ڕۆژگارانی هەرە کۆنەوە، ئاو بۆتە کوولەکەی ڕوحی ئەم سەرزەمینە، چونکە مرۆڤ تەنیا دەتوانێ لە جێگایەک سەقامگیر بێ کە ئاوی بۆ دابین بکرێ. جا هەر بۆیە دانیشتووانی ئێران بە ناچار بوونە تۆوی هەرزن و هەر یەکەی پەڕیوەی جێیەک بوون و نەیانتوانی وەکوو حەشامەتی میسر و دووچۆمان لە دەوری یەکتر وەکۆبن. ئەم مەبەستە زۆر بە جوانی لە ڕووی ئەو گرد و تەپۆڵکە دەسکردانەوە دەردەکەوێ، کە لێرولەوێ و لە مەودای دەیان کیلۆمیتری‌دا وەبەرچاو دێن و زەمانێکی لەمێژین نشیمەنگای کۆمەڵانی خەڵک بوون. هەلومەرجی سروشتی بوو بە هۆی پەرەی چەشنێک سەربەخۆیی لە هەر ناوچە و تەنانەت دەرە و دۆڵێک‌دا و هەتا ئێستاش شوێنەواری هەر ماوە[1]. جا هەر بۆیە ئێران پڕە لە خێڵاتی کۆچەر و نیمچەکۆچەر و بنەگر، کە هەرکام زاراوە و داب و نەریتی خۆیان پاراستووە. هەر بۆیە لە ڕوانگەی سیاسییەوە، یەکگرتوویی و یەکپارچەیی خاکی ئێران بەند بووە و بەندە بە هەڵسوکەوتی ئەو فەرمانڕەوایانەی کە حکوومەتیان بە سەردا کردووە و دەیکەن. هەڵبەت هۆکاری دەرەکیش دەوریان لە پێکهاتنی یەکییەتیی «ماد»دا گێڕا کە بریتین لە: گەفی ئوورارتووەکان لە لایەک و

---

١ـ ئەم بۆچوونە لە ناوی وشەی «دەرەبەگ»ی کوردیش‌دا ڕەنگی داوەتەوە. دەرەبەگ بریتییە لە «دەرە+ بەگ». واتە کەسێکی مەزن و میری دۆڵ یان دەرەیەک بێ. دواتر ئەم وشەیە ماناکەی پەرەی ئەستاندووە.و.

هەڵوێست و ڕێبازی دەسەڵاتپەرستانەی ئاشوور لە لایەکی دیکەوە کە پتری تین بۆ هێنابوون. مادەکان لەو هەلومەرجەدا ناچار بوون کە لەم دوو ڕێگایە یەکیان هەڵبژێرن: یان ژیان لە بن سێبەری یەکییەتی‌دا، یان مل ڕاکێشان بۆ ئەگەری توانەوە لە ژێر نیری بێگانەدا. ئەوان ڕێچارەی یەکەمیان هەڵبژارد و ڕەنگدانەوەی ڕوونی ئەم هەنگاوە لە ناوی«هەگمەتانە» [هەگمادانە]ی پایتەختیان‌دا وەبەرچاودێ کە بە واتای شوێنی کۆبوونەوەی [مادانە]. ئەم شارە کەوتۆتە سەر ئەو ڕێگایەی کە هێزەکانی ئاشوور بەزاندبوویان و بە مەبەستی هەس‌دانەوەی هێرشکەران لێدرابوو. سەرکەوتنی لەرزۆک و خۆنەگری ئاشوورییەکان، وای لێ‌کردن کە بەرەو ڕەچاوکردنی سیاسەتی کۆلەداری هەنگاو باوێن و ئەم بۆچوون و لێکدانەوەیە لە ڕووی ئەو کۆمەڵگا کۆلەدارییانەی جوولەکانەوە ڕوون دەبێتەوە کە لە «ڕەگا»ی[1] نیزیک تاران، دایانمەزراندن. ئەوەی ڕاستی بێ ئەم کارەیان تەنیا بۆ دڵدانەوەی خۆیان بوو، چونکە ئیمپراتۆریی نەینەوا نەیدەتوانی هەگمەتانە باوێتە پشت‌گوێ. ئەگەر بێتوو بڕوا بە دەقی نێوەرۆکی ساڵنامەکانی ئاشووری بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە هیچکام لە تیرە و هوزەکانی ژێردەسەڵاتیان بە ئەندازەی مادەکان ڕانەپەڕیون. مادەکان بە چەکی خۆیان لە پێناو سەربەخۆیی‌دا خەباتیان دەکرد و بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەیەکی بەگوڕتر لە حاندی دوژمن، پاڵیان بە یەکترەوە دەدا. سەرەتای دامەزرانی حکوومەتی ماد هێندە بە ئاشتی و ئارامی تێنەپەڕیوە کە ئیدەئالیستێکی وەکوو هێرۆدۆت باسی دەکا.

ئەگەر بکرێ بڵێین کە پێکهاتەی دام‌ودەزگای سیاسیی مادەکان، زۆر وەکوو هی ئاشوورییەکان چووە، خۆ دیسانیش هیچ زانیارییەکمان سەبارەت بە

---

١ـ ڕاگا، ڕاگە، ڕێگا و ڕێگە هەموویان لەگەڵ ڕەی (ڕێ) دەچنەوە سەر بنج و بنەوانێک.و.

چوارچێوەی کولتووری ماکی و میناکیی[1] ئەوانەوە بە دەستەوە نییە. لە ڕاستیدا هۆزێکی کە هێشتا لە جەغزی ژیانی پڕ کوێرەوەریی کشتوکاڵ و گوندەکیدا دەژیا و بە مەبەستی سەقامگیربوونی لە شوێنی خۆی دەجەنگی، هەر دەگاتە شانی ژێرمەنەکان، ڤاندالەکان، ویزیگۆتەکان و فرانکەکان. بە باری هونەریدا، مادەکان دەبێ چەشنی سەکاییەکان و کیمیرییەکان، وردەکار و خاوەن چێشکە بووبن و چەکوچۆڵی نەخشێندراو، قایشوقورووش و خرینگە و پرینگەی ڕازاوەی ئەسپ، هەوروهاڵی زێر و زیو و جلوبەرگی چەشناوچەشنی ڕەنگینی گوڵدۆزیکراو و زیوارگیراو، لە نێویاندا باو بووبن.



ق ٤٤ـ پیاوێکی مادی کە وێنەی لە ڕووی بەردەتاشێکی ئاشووری هەڵگیراوەتەوە.

لە بەردەتاشەکانی ئاشووریدا، دیمەن و قەڵافەتی چینی خواردەستە وەبەرچاو دێن: پیاوەکان ڕیش و سمێڵیان چڕوپڕە و لەسەر کورتەکراسێکی تەسکەبەر

---

١ـ ماددی و مەعنەوی

کەوڵێکیان هاویشتۆتە سەر شانی خۆیان. کاڵە و پێتاویان هەتا ئەژنۆیان هەڵکێشاوە و چەند سەر ئەسپێک بە دیاری دەبەن بۆ سەرکەوتووانی ئاشووری (ق٤٤).

بە پێداچوونەوەی گەنجینەی [زیوییەی] سەقز، دەکرێ گەلاڵەیەکی گشتیمان لە هونەری ئەوان بێتە بەرچاو؛ ئەو هونەرەی کە وادیارە پاش زاڵ بوون بە سەر تیرە و هۆزی لە خۆیان ژیارمەندتردا خوازراوەتەوە و پەرەی پێدراوە. ئەوەی ڕاستی بێ تەنیا چەند شوێنەوارێکی هونەریی مادەکان بە یادگار ماوەتەوە کە بریتین لە: شێرەبەردینەی هەمەدان کە بەشی هەرە زۆری سواوە و تێداچووە(ق٤٥)، چەند گۆڕێکی لە بەرد داتاشراو کە یەکیان لە نیزیک سەرپێڵ [ی زەهاوە و کەوتۆتە سینەی ڕەوزێکی] بنارەکانی زاگرۆس (ق ٤٦)؛ ئەوانی دیکە [وەکوو فەقرەقایە و] کەوتوونە کوردستان (ق ٤٧)[1]. لە ڕاستیدا



ق٤٥ـ شێرەبەردینەی هەمەدان

---

١ـ ئەوەی پێشووش هەر لە کوردستانە.و.





ق٤٦- دووکانی داود: گۆڕی داتاشراو لەسەر سینەی ڕەوزێکی نیزیک سەرپێڵ[ی زەهاو].



ق٤٧ـ فەخریکا [فەقرەقا]: گۆڕی داتاشراو لە سینگی زەرد و ماهێکی باشووری گۆلی ورمێ



[تێبینی: ئەم وێنەیە خۆم زیادم کردووە و فەخریکا یان فەقرەقا کەوتۆتە باڵی باکووری مەهاباد و ١٥ کیلۆمیترێکی لێ دوورە.و.]

ئەمانە کۆمەڵێک بەردەتاشی شکۆمەندن کە لەسەر سینەی ڕەوەز و تیشەشاخێک داتاشراون. ئەوەی لە [سەرپێڵی زەهاوە]، دیمەنی ڕێورەسمێکی دینی دەخاتە بەرچاو کە پیاوێک چەپکە «بەرسوم»ێکی تایبەتی ئەم ڕێورەسمانەی بە دەستەوەیە.

## عیلام و پارسەکان

### سەرەتای پادشایەتیی هەخامەنشییەکان

لە ڕاستیدا ئێمە هیچ شتێک سەبارەت بە عیلامی نێوان سەدەی دوازدەهەم تا نێوەڕاستەکانی سەدەی هەشتەمی (پ.ز) نازانین و تەنیا جاروبار ئاماژەیەکی تێژتێپەڕ سەبارەت بە شەڕی لەگەڵ ئاشوورییەکان لە ساڵنامەکاندا، تۆمار کراوە. هۆکاری ئەم تاریکییەی کە لە بواری دۆزینەوەی سەرچاوە و زانیاریدا باڵی بە سەر عیلام کێشاوە، دەبێ بگەڕێتەوە سەر کۆمەڵێک ڕووداوی نێوخۆ و دەرەکیی چارەنووس‌ساز کە زۆر لەزەبر ئەم حکوومەتەیان ڕاوەشاندووە و ژێروژووریان کردووە. یەکێک لەو ڕووداوانەی کە باسیان کرا بریتییە لە هاتن و بنەگربوونی توخم و تۆرەمەی تازە کە شوێنێکی بەرچاویان لەسەر ڕەوتی لاوازبوونی عیلام دانا. ئەم تۆرەمانە، خێڵاتی پارس و تەنانەت ئارامییەکانی باڵی چەپی ڕووباری دیجلەش بوون، کە زۆر لە کۆنەوە، بنەیان لەوێ داکوتابوو.

سەبارەت بە پارسەکان، پێویستە بڵێین کە دەوروبەری ساڵی ٧٠٠ی پێش‌زایین لە پارسووماشی بناری چیاکانی بەختیاری نیشتەجێ بوون. پارسووماش کەوتۆتە خۆرهەڵاتی شووشتەر و ناوچەیەکی ئەوبەرەوبەری چۆمی کاروونە و دەبێتە ئەو شوێنەی کە پێش ئەوەی چۆمەکە بەرەو باشوور بخوشێ، قۆرتی تێدەکەوێ و لێدەهاڵێتەوە. لەو زەمانەدا تازە عیلام دەسەڵاتی ئەوەی نەمابوو کە پێشیان پێبگرێ و نەهێڵێ لە نێو قەڵەمڕەوی خۆیدا نیشتەجێ بن. عیلام حکوومەتی بە سەردا دەکرد و وێدەچێ پارسەکان مەزنایەتیی ئەوانیان سەلماندبێ. پارسەکان بە سەرۆکایەتیی هەخامەنش،

حکوومەتی بچووکی خۆیان دامەزراند، کە لە چارەی نووسرابوو زۆر گـەورە بێ و ناوی هۆزی پارسیان کردە پێناسەی.

تێکهەڵچوونی نێوەنێوەی نێوان ئاشوور و عیلام دەگەڕایەوە سەر هەڵوێستی پادشایانی عیلام لەسەر پرسەکانی سەبارەت بە بابل. بەم شێوەیە لە چاخی پادشایەتیی «هووبان ئوومێنا»دا (٦٩٢ـ ٦٨٨ی پ.ز)، بە مەبەستی پشتیوانی لە مافی مسـۆگەری پادشـای بابـل لـە ئاسـت ئاشـوور، هێزێکی زۆر و زەوەنـد کۆکرایەوە و لەو کاتەدا بۆ یەکەم جار ناوی پارسەکانی «پارسووماش» هاتـە گۆڕ. شەڕێکی قورس و خوێناوی و بێئاکام لە هێلوولێ (حێلوولێ) قەوما. هێندەی پێنـەچوو کـە «سـێناخریب» بـابلی گرتـەوە و جـارێکی دیکـە عـیلام پاشەکشەی پێکرا بۆ سەر سنوورەکانی خۆی.

ئاشوور بە مەبەستی خاشەکێشانی دوژمن، تەواوی هێز و توانای لەشکری و سیاسیی خۆی دژی عیلامی بەرەو تێداچوون، خستە گەڕ. لە لایەکەوە بە شوێن ڕێبازی جویبوونەوەدا دەڕۆیی و لە لایـەکی دیکـەوە تـەنیا پشـتیوانیی لـەو قوڵەمیرانە دەکرد کە گفتیان دەدا، پێی وەفادار بن. پادشای ئاشوور بە دڵی خۆی دەسـەڵاتدارانی عیلامـی دادەنـان و لێی دەخسـتن. لـە کـەش و هەوایـەکی ئـاوا هـاڵۆزدا، لەبـەر دەمتێکنـانی خـودی عیلامییـەکان و ڕژانـی خـوێنێکی زۆر، بارودۆخەکە ئەوەندەی دیکە شێوابوو. عیلامـی ببوونـە دوو بـەرەی لایـەنگر و دژی ئاشوور و لەم هەلەدا، حکوومەتی بچووکی پـارس درێژەی بـە گەشـەی نەرم و پێدزکانەی خۆی دەدا.

چیشپیش (٦٧٥ـ ٦٤٠ی پ.ز)، کوڕ و جێنشینی هەخامەنش، پێشتر ناوی بە «پادشای شاری ئانشان» ڕەنگی دابۆوە و ئەم ناوچەیەی بە دەستەوە بوو هەتا دەگەیشـتە بـاکووری ڕۆژهـەڵاتی پارسـووماش. ئەگـەرچی توانیبـووی لـە ژێـر

ده‌سه‌ڵاتی عیلام ده‌رباز بێ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بێتوو قسه‌كه‌ی هێرۆدۆت ڕاست بێ، وادیاره كه ده‌وروبه‌ری ساڵی ٦٧٠ی پ.ز (؟) به‌ناچاری سه‌ری وه‌به‌ر ده‌سه‌ڵاتی «فره‌وه‌رتیش»ی پادشای ماد هێناوه. وه‌كوو ده‌زانین فره‌وه‌رتیش به مه‌به‌ستی لێدانی ئاشـوور، هێزێكـی گـه‌وره‌ی كۆكردبـۆوه و یه‌كییه‌تییـه‌كی بـه‌ربڵاوی پێكهێنـابوو، بـه‌ڵام بـه هـۆی شكسـتی ئـه‌م هه‌ڵوێسـت و هه‌نگاوانـه و نـه‌مانی فـــره‌وه‌رتیش لـــه ســـاڵی ٦٥٣ی پێش‌زایـــین‌دا و دوابـــه‌دوای وی هێرشـــی سه‌كایی‌یه‌كان و پێمل‌بوونی ماده‌كان بۆ ماوه‌ی ٢٨ ساڵ، چیش‌پیش سه‌ری له ئاست ده‌ســه‌ڵاتی ماده‌كـان بـادا و ده‌ربـاز بـوو. ئـه‌م فه‌رمانڕه‌وایـه لـه حانـد ده‌سه‌ڵاتی به‌ره‌و داڕمانی عیلام‌دا، هێزی زیاتری وه‌به‌رهات و هه‌رێمی پارسه‌ی خسته سه‌ر حكوومه‌ته‌كه‌ی خۆی. وادیاره كه هه‌وڵ و تێكۆشانی له‌سه‌ره‌خۆ و پشـوودرێژانه‌ی چیش‌پیش بـۆ داهـاتووی حكوومـه‌تی شـلك و تازه‌دامـه‌زراوی [پارسـه‌كان] ده‌بـێ زۆر گرینـگ بووبـێ. چیش‌پیش بـه هاویشـتنی هـه‌نگـاوی بوێرانه و به‌پارێز، توانی ناوچه و مه‌ڵبه‌ندێكی به‌ربڵاو بگرێ و ئه‌وه‌نده‌ی بۆی ده‌كرا، خۆی له تێوه‌چوونی شه‌ڕی نێوان زلهێزه‌كان ده‌پاراست و هه‌ر له‌سـه‌ر ئه‌م ڕێبازه، به شێوه‌یه‌كی ئاقڵانه داخوازه‌كانی  عیلامی برده‌وه‌پاش. عیلام له‌و كاتـه‌دا پشـتیوانی لـه «شـه‌مه‌ش شـومووكین»ی پادشـای بـابـل ده‌كـرد كـه ئاشوور بانیپاڵی برای لێی خستبوو.

دوای نه‌مانی چیش‌پیش، قه‌ڵه‌مڕه‌وی پادشایه‌تیی پارسـه‌كان بریتـی بـوو لـه هه‌رێمی پارسووماش كه ئانشان (ئه‌نشان) و «پارسه»شی خرابوویه سه‌ر. ئه‌و وه‌كوو پادشایانی «مێرۆڤینژی»[1]، جه‌غزی ده‌سه‌ڵاته‌كه‌ی له نێوان دوو كوڕی

---

١ـ مێرۆڤینژی یان مێرۆڤینژین، بریتین لـه‌و زنجیره پادشـایانه‌ی كه بۆ یه‌كـه‌م جـار لـه فه‌رانسـه حكوومه‌تیان كردووه.م.

خۆیدا دابەش کردبوو: یەکەم ئاریارەمنە (دەوروبەری ٦٤٠-٥٩٠ی پ.ز) کە لە نێو دەسرۆیشتوویی و دەوڵەمەندیدا پێی نابوویە جەغزی ژیان و ئەویتر کووروشی یەکەم (دەوروبەری ٦٤٠-٦٠٠ی پ.ز)، کە بوو بە پادشای گەورەی پارسووماش. بەهەڵکەوت تەتەڵەیەکی زێڕ لە هەمەدان دۆزراوەتەوە، کە بە خەتی بزماری و بە زمانی پارسیی کەونارا،[1] سەرناوەکانی ئاریارەمنەی لەسەر نووسراوە (ق٤٨).



ق٤٨- تەتەڵەی زێڕی ئاریارەمنە، کە بە خەتی بزماریی پارسیی کەونارا نووسراوە.

ئاریارەمنەی پادشا لەم دەقەدا دەڵێ: «ئەم سەرزەمینەی پارسەکان کە من خاوەنیم، ئەسپی باش و پیاوی چاکی تێدایە، کە یەزدانی مەزن ئەهوورامەزدا باربووی کردووم. من پادشای ئەم سەرزەمینەم.» ئەم تەتەڵەیە کۆنترین بەڵگەنامەی تا ئێستا ناسراوی سەبارەت بە هەخامەنشییەکانە (هەڵبەت دەستەیەک لێی دووشکن و [پێیان وایە دواتر ساز کراوە و هەڵبەستراوە]). لەم دەقەدا باسی پێشکەوتی بەرچاوی خێڵاتی پارس کراوە لە سەدەی حەوتەمی پێشزایینیدا، بەڵام وەکوو دیارە خێڵاتی پارس تازە لە قۆناخی دەوارنشینیڕا پێیان نابوویە قۆناخی نیشتەجێبوون. ئەلفوبێی پارسەکان کە بە کۆمەڵێک

---

١- زمانی «پارسیی کەونارا»، خوڵقێندراوی دەم و دەستی تاقمێکە لە توێژەران. چونکە ئەوەی ڕاستی بێ، داریووش لە بەردەنووسی بێستووندا دەڵێ بە زمانی «ئاریە»م نووسیووە، نەک زمانی پارسی (!؟).و.

هێمای بزماری نووسراوەتەوە، نیشانەی پێشکەوتێکی ڕاستەقینەیە لە خەتی نیشانەیی و بڕگەییی ئاشوور و عیلامدا کە هێشتاش کاریان پێکراوە و بە بازێکی گەورە دادەندرێ، جا با پارسەکان وێنەشیان لەوان هەڵگرتبێتەوە. پارسەکان لە سەرەتای مێژووی خۆیانەوە، واتە لەو کاتەوە کە تازە حکوومەتی بچووکیان خەریک بوو خۆی دادەڕشت، کارێکیان کرد کە وێدەچێ دانیشتووانی ڕەسەنی بانووی ئێران لە ماوەی سەدان ساڵدا، هەرگیز بۆ لای نەچووبووبن و ئەویش بریتییە لە نووسینەوەی زمانی خۆیان بە خەتی تایبەتی خۆیان. تەتەڵەی ئاریارەمنە، کە بۆمان دەردەکەوێ شوێنەوارێکی تاقانە نییە لە چەشنی خۆیدا، ئەوەندە وەکوو کارێکی کەس‌نەکردە دەچێ کە زۆرێک لە توێژەران و زانایان بە بەڵگەیەکی ڕەسەنی نازانن. پارسەکان هەر لە سەرەتای شارستانییەتی خۆیاندا، ڕەسەنایەتی و تازەگەریی ڕووحی داهێنەری خۆیان نیشان داوە و توانیویانە بیروبۆچوونی دەرەکی وەربگرن و بە وزەی بلیمەتیی سروشتیی خۆیان، دەستاوی بدەنەوە و ڕێکوپێکی بکەن.

ئەو ڕووداوانەی کە لە عیلام قەومان، کارێکی وایان کرد کە ئاشوور دیسان وەخۆ کەوێتەوە و هێزەکانی دژی ئەو حکوومەتە بجووڵێنێتەوە. «تاماریتوو»ی پادشای عیلام کە بەڕاشکاوی وێڕای بڵێ وەفاداری «ئاشوور بانیپاڵ»ە، سەرکردەیەکی خۆماڵی لەسەر دەسەڵاتی لابرد و ئەویش هەڵات، بەڵام ڕێی دەرنەکرد و قۆشەنچییانی ئاشووری گرتیان و بردیانە نەینەوا. هێندەی پێنەچوو کە هەڵوێستی دوژمنانەی پادشای تازەی عیلام دژی ئاشوور ڕەنگی دایەوە و بارودۆخەکە زیاتر بەرەو گژری ڕۆیی، هەر بۆیە ئاشوور بانیپاڵ تەمای گرت زەبرێکی کوشندەی لێ بوەشێنێ. بۆ وەدی هاتنی ئەم مەبەستە پادشای ئاشوور دوو ئامانجی وەبەرچاو گرتن کە بریتی بوون لە شووشی باڵی باشوور و

«ماداکتوو»ی باڵی باکوور، لە دۆڵەکانی نێوپارەی لای ڕووباری کەرخە. ماداکتوو لەگەڵ چەند شارێکی سەر ڕەوگەی ڕووباری کەرخە گیران. سەرەنجام ئاشوور بانیپاڵ، شا ماریتووی بردەوە سەر تەختی دەسەڵاتی شووش و دۆخی جارانی. ئەم ڕێکخستنەوە تازەیە هێندەی بە بەرەوە نەبوو؛ پادشای ژێر داڵدەی ئاشوور جارێکی دیکەش لێخرا و پەنای بردەوە بۆ پشتیوانەکەی خۆی.

سەرلەنوێ هێزەکانی دژی ئاشوور هاروژانەوە و ئاشوور بانیپاڵ لێبڕا کارەکەی لەگەڵ عیلام یەکلایی بکاتەوە. ئاشوور کە تەنیا چارەکە سەدەیەکی مابوو هەتا تۆماری تەمەنی تێکەوەپێچرێ، خاشەی عیلامی کۆنترین دوژمنی بابلی، کێشا.

ماداکتوو دیسان گیرایەوە و کەرخە بوو بە بوارگەی سپای سەرکەوتەی ئاشوور. شووش تاڵان کرا و ئاشوورییەکان بە شوێن پادشای ڕەویوی عیلامدا، گەلێک شاری ئەو نیشتمانەیان گرتن، بۆ وێنە «دوور ئوونتاشی» واتە «چۆغا زەنبیل»ی ئێستاکە، کە «ئوونتاش ناپیرشا» بناغەی بۆ پایتەخت دانابوو. قۆشەنچییانی ئاشوور بە شوێن سەرکەوتنەکانی خۆیاندا، لە ڕووباری «ئیدیدە» یانی «ئابدیز»ی ئێستاکە تێپەڕین و گەیشتنە «هیدالوو» کە دەبێ لە ناوچەی شووشتەر بێ. سەرداری ئاشووری لەوێشی تێپەڕاند و خۆی گەیاندە یەکەمین بەرزاییەکانی کوێستانەکانی بەختیاری کە خاڵی سنووری خۆرنشینی پادشایەتیی پارسووماش بوو. پادشای ئەم سەرزەمینە کە قەڵەمدارانی ئاشووری ناویان بە کووررووش تۆمار کردووە، کووررووشی یەکەمی کوڕی چیشپیش بوو کە مەبەستی نواندنی وەفاداری سەبارەت بە سپای سەرکەوتوو، «ئارووکوو»ی کوڕە گەورەی وەک بارمتە ناردە ئاشوور.

ئەم ڕووداوە، کە دەبێتە یەکەمین وێککەوتنی ڕاستەوخۆی پارسەکان و ئاشوورییەکان، کۆمەڵێک زانیاریی بەنرخمان سەبارەت بە چوارچێوەی دیاریکراوی سنوورەکانی خاکی پارسووماش دەخاتە بەردەستی. نابێ لە بیرمان بچێ کە «مەسجیدسولەیمان»ی ئێستا، واتە ناوەندی هەڵێنجانی نەوت، دەکەوتە ئەو قەڵەمڕەوەی پارسووماشەوە. بەکورتی لێرە، پاشماوەی تەپۆڵکەیەکی توورەکەڕێژ وەبەرچاو دێ کە پاڵی بە چیاوە داوە (ق٤٩). دەستەیەک لە توێژەران لەبەر هەبوونی نەوت لەو ناوچەیەدا، لایان وایە شوێنەکە ئاورگایەکی هەرگیز نەکووژاوە بووە و بە هەڵم و گازی کانە نەوتەکان ئاییساوە. بەپێی لێکۆڵینەوەکانی ئێمە دەبێ ئێرە وەختی خۆی ئاوەدان و نیشمەنگای میران و پادشایان بووبێ. لەوێ ئێستاش سێ ڕیزە هەیوان دیارن. دیوارەکان بە گابەردی ویشکەچن هەڵچندراون و زۆر وەکوو ئەو نژیارانە دەچن کە بە «سیکلۆپێئین» ناسراون (و٣٥)[1]. شوورەی گەڕانگەڕی لە ڕووی خوارەکەوپێچەکەیڕا، وادیارە تایبەت بە خۆڕاگری و بەربەرەکانی سازکراوە. دە پلیکان بە دوای یەکتردا هەڵکشاون کە پانایی یەکیان هەتا دەگاتە سەر گردەکە، ٢٥میترێک دەبێ. ئەم کۆمەڵە زۆر شاز و هەڵبژاردەیە و بە داهێنانێکی تازە دادەندرێ لە بانووی ئێراندا. نە عیلامییەکان و بابلییەکان و ئاشوورییەکان و نە خەڵکی خۆماڵیی مەڵبەندەکە، هەرگیز شێوازی ئاوایان نەدیوە. تەنیا خاک و ناوچەیەکی نیزیک و دراوسێی ئێران کە ئاوا بەڕوونی شوورە و دیواری لێ ساز کراوە و بە بەربڵاوی ئەم شێوازە نژیاروانییەی تێدا ڕەچاو کراوە، قەڵەمڕەوی پادشایەتیی ئوورارتوویە.

---

١ـ ئەم نژیارانە دراونە پاڵ دێوەزمە یەکچاوەکانی نێو ئەفسانەی یۆنانی و مەبەست لەو نژیارە زۆر گەورانەیە کە لە گابەردان سازکراون.ب.

هۆزی ئوورارتوو، ئەو کاتەی کە پارسەکان لە باڵی خۆرنشینی گۆلی ورمێ دەژیان، دراوسێی پاڵەوپاڵیان بوون و تەناتەت ماوەیەکیش پارسەکانیان بردنە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خۆیان. کەوایە دەکرێ گردی مەسجیدسولەیمان بدرێتە




ق٤٩ـ کەلاڵەی گردی مەسجیدسولەیمان

پاڵ ئەو پارسانەی کە دوای سەدەی هەشتەم، لە باکووری ئێران کۆچوباریان تێکناوە و ڕۆیشتوون و لە بناری کوێستانەکانی بەختیاری تاوڵ و ڕەشماڵیان هەڵداوە. لە ڕاستیدا ئەم گردە، شوێنێکی تاق و تاقانە نییە و ٢٥ کیلۆمیتر

ئەولاتــر بەشــانی بــاکووری خۆرهــەڵاتدا، لــە جێگایــەک کــە پێــیدەڵێن «بەردەنیشاندە» و دووسێ کیلۆمیتریک لە ڕووباری کاروونەوە دوورە، نۆیاری لەم چەشنە، بەڵام بەربڵاوتر لە تەنیشت کانی و ئاو و کاول و هەرەسی شارۆچکەیەک، وەبەرچاو دێ. ئێمە سێ کۆڵەکەی بەردمان وەدەرخستوون، کە وادیارە دەبێ ڕۆژی خۆی سەریان وەبەر بێڵایەکی سێسووچ هێنابێ. ڕەنگە لەم دوو شوێنە بناغەی یەکەمین خانەمیری پارسەکان بە دەستی هەخامەنش یان چیشپیش داندرابێ. ئێمە وامان پێخۆشە بڵێین گردی پارساگادیش کە هەمیشە بۆتە هەتەڵۆکە و مەتەڵۆکەیەک، بە جێگایەکی وەکوو ئەوانەی پێشووی بزانین. ئەم شوێنە دەبێ کاری پادشایانی بنەماڵەی هەخامەنشی بێ، بنەماڵەیەکی کە لە زەمانی پادشایەتیی ئاریارەمنەوە بوو بە فەرمانڕەوای فارس و تەتەڵەی زێڕینی ئاریارەمنە ئێستا بە دەستەوەیە. جا هەر بۆیە ئاسەوارەکانی گردی مەسجیدسولەیمان، بەردەنیشاندە و پاسارگاد، دەبێ بە پێشەنگی تەختیجەمشید، دابندرێن. شێوازی کاری تەختیجەمشید، هەر ئەو شێوازەیە کە پارسەکان دوابەدوای چوون بۆ باشووری خۆرنشینی بانووی ئێران، ڕەچاویان کردەوە و سیلەچاویان داوەتە دەسکاری دراوسێیانی باکووریی خۆیان و ئێران پێشینەی شێوازی ئاوای تێدا نەبووە. بە بڕوای ئێمە دەبێ هەر لەو گۆشەنیگایەوە بڕوانینە گۆڕەبەردینەی «داودوختەر»ی نیزیک فەهلیان (ق٥٠). بێگومان «داودوختەر» دەبێ یەکێک لە پادشایانی سەرەتای پێکهاتنی دەسەڵاتی هەخامەنشی دایتاشیبێ و بۆتە وێنە و نموونەیەک بۆ گۆڕەبەردینەکانی کە لە سەردەمی حکوومەتی داریووشەوە لە نەخشی ڕۆستەم بوونە باو و سینەی ڕەوەزیان ڕازاندەوە.



ق٥٠ـ گۆڕەبەردینە داودوختەری فارس

کە لە سینەی ڕەوەزێک داتاشراوە.

لەبەروەی دەسەڵاتی مادەکان لە زەمانی هووەخشتەردا، ڕۆژبەڕۆژ پتری پەرە دەستاند، دوو حکوومەتی بچووکی پارس، نەیانتوانی لە ژێر ڕکێفی بەزێنەری نەینەوا دەرباز بن، ئەگەرچی بەپێی ڕێککەوتن لەسەر دابەشینی ناوچەکان، لە نێوان ماد و بابلییەکاندا، مەڵبەندی شووش و سووزیان دەکەوتنە نێو قەڵەمڕەوی بابلییەکان. پاش نەمانی ئاریارەمنە، ئارشامی[1] کوڕی جێی گرتەوە. ماوەیەک لێرەوبەر تەتەڵەیەکی زێڕینی ئەویش لە هەمەدان و هاوکات لەگەڵ تەتەڵەکەی باوکی دۆزرایەوە. ئەویش خۆی بە « شای مەزن، شای شاهان، شای پارسە (پارس)، کوڕی ئاریارەمنە» دەناسێنێ و لەگەڵ دەقی تەتەڵەکەی باوکی بێ جیاوازییە. ئەم دوو بەڵگە بچووکە دەبێ بەڵگەنامەی بنەماڵەی میری بووبن کە کووروشی گەورە لەگەڵ خۆی بردوونی بۆ هەمەدان. ئێمە لە ڕووی دەقی تەوراتەوە ئەم مەبەستەمان بۆ ڕوون بۆتەوە و وێدەچێ گەڕان و هەڵکۆڵینەکانی شووش و تەختیجەمشیدیش، ئۆباڵی لەسەر بکێشن. دەبێ ئەوەندەمان لە بیر بێ کە نابێ هیچکام لەو بەڵگانەی لەم دوو پایتەختە

---

١ـ ئارشامە، ئارشامێ

کۆنەدا دۆزراونەوە و سەریان دەگاتە دەیان هەزار تەتەڵە، بە بەشێک لە بەڵگەنامەکانی ئارشیوخانەکانی میری دابندرێن یان وەک بەڵگەی سەر بە کاروباری پادشایەتی دەستەبەندی بکرێن.

بەم شێوەیە، تەتەڵەی ئارشام دەریدەخا کە ئەم پادشایە، پاش نەمانی ئاریارەمنە و بەرلە مەرگی خۆی، حکوومەتی بە سەر «پێرسید»یش‌دا کردووە. ڕەنگە کەمبووجییەی یەکەم لەسەر دەسەڵاتی لادابێ و بۆ پەراوێزی ڕادابێ. بەپێی گێڕانەوەی هێرۆدۆت، ویشتاسپ (گوشتاسب)ی کوڕی، لە سەرەتای حکوومەتی کووروروشی گەورەدا، حوکمداری پێرسید بووە. بەرەبابی ئاریارەمنە تەنیا تاجی پادشایەتییان لە کیس چوو، بەڵام دواتر لە ژێر دەسەڵاتی بەرەبابی کووروروش‌دا، هەروەک میر و حوکمداری ناوچە و مەڵبەندەکانی خۆیان مانەوە. دەقێکی دۆزراوەی داریووش لە شووش بەڕوونی دەریدەخا کە لە جەنگەی نووسرانەوەی‌دا کە دەبێتە ساڵانی سەرەتای حکوومەتەکەی، ویشتاسپی باوکی و ئاریارەمنەی باوەگەورەی هەر ماون.

کەمبووجییەی یەکەمی پادشای پارسووماش و ئانشان و ڕەنگە پارسەش، بوو بە زاوای ئاستیاگی پادشای ماد کە مەزن و فەرمانڕەوای بوو. لە ڕاستی‌دا ئەم زەماوەندە نیشاندەری سەنگ و بایەخی بەرەبابی ئەوە لە نێو خانەدانی هەخامەنشی‌دا و ڕەنگدانەوەی پرشنگی دەسەڵاتی هەردک حکوومەتی یەکگرتوویە لە ژێر سێبەری ئاڵایەکی فەرمانڕەوایەتی‌دا. بەرهەمی ئەم زەماوەندە لە دایکبوونی کووروروشی گەورەیە کە پاسارگادی کردە پایتەختی خۆی و کۆمەڵێک کۆشک و پەرستگەی لێ ساز کرد. بەپێی دەقی ئەو بەردەنووسانەی کە لە داوێنی دیواری کۆشکی خۆی هەڵکەندراون، کووروروش خۆی بە «پادشای گەورەی هەخامەنشی» ناودێر کردووە. ئەم سەرناوە دەریدەخا کە کووروروش

هێشتا لە ژێر فەرمانی ئاستیاگی باپیریدا بووە. هێندەی پێنەچوو کە کووروووش تینی بۆ عێل و عێلاتی بە ڕەسەن ئێرانی و ئاسیاییەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتی قەڵەمڕەوی بە میرات بەجێماوی باوکی هێنا، کە سەری وەبەر بێنن. نەبوونیدی پادشای بابل کە هەستی بە سرشتی خۆپەرستانەی کووروووش کردبوو، بەگوێرەی سیاسەتێکی ورد و باریک و بە یاریدەی کووروووش، هەرایەکی دووبەرەکیی نایەوە و لە ئاکامدا توانی حەرران لە چنگ مادەکان دەرکێشێتەوە، کە بەرەگەی ڕێگای چوون بۆ ئاشووریان لێ تەنیبوو. کاتێک ئاستیاگ بەو کاکەوبرالەیەی نێوانیانی زانی کە بە دژی وی دەشکایەوە، ناردی بە شوێن کووروووشدا کە بچێتە هەگمەتانە (ئیکباتان)، بەڵام بە گوێی نەکرد. پادشای ماد هیچ چارەیەکی دیکەی نەما، جگە لەوەی کە هەڵگەڕانەوەکەی بە زەبری هێز وڵام بداتەوە. دوو جار شەڕی قورس و خوێناوی قەومان و جاری دوایی خودی ئاستیاگ سەرکردایەتیی تێکهەڵچوونەکەی دەکرد، بەڵام بەرگەی نەگرت و شکا و بە دیل گیرا و کووروووش بەوپەڕی ڕێز و دڵپاکی لەگەڵی جووڵایەوە. بە فەرمانی کووروووش هەگمەتانە کرایە پایتەختی ئێرانی یەکگرتوو. سەرکەوتنی کووروووش بە سەر ئاستیاگدا لاپەڕەیەکی نوێ بۆ مێژووی هۆزی پارس دەکاتەوە، کە چارەنووس لەگەڵ مادەکان لێکیدان و یەکانگیری کردن.

***

## بەشی ٣

# خۆرهەڵات دژی خۆرنشین

## پادشایەتیی هەخامەنشی

مێژووی ئەم ئیمپراتۆرییەی کە هەخامەنشییەکان بە زەبری شمشێر دایانمەزراند، دەگەڕێتەوە بۆ سێیەکی نیوەی دووهەمی هەزارەی یەکەمی پێشزایین. گەلان و شارستانییەتەکانی دیکە هەر لەسەر ڕەوتی پێشوویان دەڕۆیشتن، بەڵام بەگشتی لە تەواوی دنیای ئاوەداندا، ئیمپراتۆریی هەخامەنشی دەکەوێتە ڕیزی پێشەوە و ئەرکی سەر شانی مێژوونووسانە کە هەمیشە زۆربەی هەرە زۆری ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارە بخەنە بەرباس و توێژینەوە. خەیاڵی دامەزراندنی حکوومەتێکی تاقانە لە ئێراندا، قەرزداربارى هەخامەنشییەکانە و ئەوان وەڕاستیان گێڕا. سەربەستی و مانەوەی ئەم حکوومەتە، بوو بە کەلەپوورێک بۆ وەچەکانی داهاتوو.

شێوازی بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆی هەخامەنشییەکان، بە هیچ بارێکدا وەکوو شێوازی ڕۆمییەکان ناچێ کە هۆز و نەتەوە بەزیوەکانیان ناچار دەکرد هەتا سەر وەبەر کولتووری باوی گشتی بێنن و هەتا پلەی ئەوان هەڵکشێن و لە ئابووریی هاوبەشیاندا بەشدار بن. ئەم کارە زۆر جاران وای دەکرد کە جەماوەری خاوەن داب و نەریتی تایبەت، خۆیان بکوتن بۆ پلەکانی سەرووتر. هەلومەرجی کارەکان لە زەمانی کوورووش و داریووشدا، جیاوازە لەگەڵ ئەو

بابەتەی ئێستا باسی کرا. ئەم پادشایانە بێجگە لە هێندێک ناوچەی دوورەدەست کە ئاستی کولتووری خەڵکەکەیان پاشکەوتوو بوو، بە لێکدانی دووچۆمان، سووریا، میسر، ئاسیای بچووک، کۆمەڵێک شار و دورگەی یۆنانی و بەشێک لە هیند، پەرەیان بە جەغزی دەسەڵاتیان دا و چەشنێک شارستانییەتی تێکەڵاویان لەگەڵ بەربڵاوترین ئیمپراتۆریی مێژووی دنیا پێکهێنا. ئەگەر بێتوو هەخامەنشییەکان ئەو هەرێم و ناوچانەیان بەرەو ئاستی شارستانییەتی خۆیان پاڵ پێوەنابا، رەوتێکی گەڕانەوە و پاشکەوتوویی دەستی پێدەکرد. ئەوان دەیانزانی تازە پێیان ناوەتە نێو کۆمەڵی گەلانی هەزار ساڵە و خاوەن شارستانییەتی لەمێژینی پێشکەوتووتر لە خۆیان. تێگەیشتنی کووروش لەو بابەتە، سەربەستیی نێوخۆیی بۆ هۆز و نەتەوەکان کردە دیاری و هەڵوێست و ڕێبازی زیرەکانەی داریووش، ئەم کولتوورە دەوڵەمەندە کۆنانەی پاراست و رەنگە بۆ گەشەی سەقامگیری و ڕاگیرانی لەنگەری وڵات، پارسەنگ بووبن. ڕانەگیرانی پارسەنگ و هاوسەنگی لە سەرتاسەری مێژووی ئیمپراتۆریدا، خاڵێکی شاراوەی لاواز و جاری وایە مەترسیدار بوو کە ڕێگای لە مەیل و تاسەی پەرەی هۆزی گەنج و دانەسەکنیوی پارس تەنی و بە یەکێک لە گەورەترین هۆکارەکانی تێشکان و دارمانی دادەندرێ.

خۆگرتنی ئیمپراتۆریی ڕۆم، دەگەڕایەوە سەر رەوتێکی خاو و بەساوەساو لە درێژەی سەدان ساڵدا و ئەم دواکەوتنی پێگەیشتنە، ببوو بە دەستەبەری هێز و سەقامگیربوونی. هەخامەنشییەکان بە خۆیان و بە حکوومەتێکی گومناوی قوڵەپادشایی لەپرێک، لە بنارەکانی باشووری خۆرنشینی ئێران، سەریان هەڵدا و لە ماوەی دەسەڵاتی وەچەیەکدا، پادشایەتییەکی بەربڵاویان پێکهێنا کە هەتا زیاتری پەرە دەستاند، هێزی سەقامگیربوونی پتر دادەبەزی. هەرا و ئاژاوەکانی

جەنگەی دوای نەمانی کوڕی کوورووش لەم شاهانشاهییەدا، ئەوەندە لەگوڕ بوون کە تەنیا پیاوێکی بەدەسەڵاتی وەکوو داریووش دەیتوانی دایانکووژێنێ و سەروبەری کارەکان وێکبێنێ و بارودۆخەکە هێور بکاتەوە. دەکرێ ئەم سەردەمە پەژارەبارەی دیرۆکی هەخامەنشییەکان لەگەڵ شەڕەکانی نێوخۆی ڕۆم بەراورد بکرێ. لە ڕۆمی ڕۆژگاری «ئووگوست»دا، وەکوو ئێرانی سەردەمی داریووش، پاش ڕاتڵەکانێکی بەگوڕ، خۆ ڕێکخستنەوە دەستیان پێکرد و بە شێوەی ئاڵوگۆڕی سیاسی، دانانەوەی بنەمای دامودەزگای گشتی و چاکسازیی ئیداری و کۆمەڵایەتی، ڕەنگیان دایەوە. دیسانیش سەرەڕای هاویژرانی هەنگاوی ئاوەزمەندانە و دووربینانە، هێزی ڕاکردن و کشانەوەی هۆزان و نەتەوەکانی پێکهێنەری ئیمپراتۆری بۆ دەست لێکبەردان، بنەی نەهات و سەرەنجام شیرازەیان لێکهەڵوەشاند و ڕووخاندیان.

**کووروش (٥٥٩ – ٥٣٠ی پ.ز)**

کووروش بۆ شەڕ و تێکەوتنی ڕاستەوخۆی لەگەڵ ماد، نەیدەتوانی پشتی بە یاریدەی بابلی هاوپەیمانی دوورەدەستی ببەستێ و دەبوو هێزەکانی خۆی بە تەنیایی ئەم ئەرکە ڕاپەڕێنن. هەڵبەت کاری کۆکردنەوە و یەکخستنی ئەم هێزانە لە کۆمەڵێک هەوڵ و هەڵسووڕانی بەربڵاوی پێشوودا بە مەبەستی بەدی هێنانی یەکییەتی و هاوپشتی لە نێوان خێڵاتی خۆجێیی و قۆشەنی ئێرانی و تەنانەت ئائارياييش‌دا، دەستی پێکردبوو. هێرۆدۆت لیزگەی ناوی ئەم تیرە و هۆزانەی تۆمار کردوون کە لە گۆشەی باکووری خۆرنشینی دەریای خەزەرەوە هەتا ئوقیانووسی هیند نیشتەجێ بوون و بە پێکهێنەری نێوک و نێوەرۆکی حکوومەتی کووروش. لە قەراری قسان‌را وادیارە وەدی هاتنی ئەم یەکییەتی و هاوپشتییە زیاتر گەڕاوەتەوە سەر ڕەچاوکرانی ڕێوشوێنی هێمنانە و دەکرێ قبووڵی بکەین

کە هەر لەو زەمانەوە قوتابخانەی ئەنجومەنی حەوتەوانە یان حەوت کەسە دامەزرێندراوە و بۆتە ئەنجومەنێکی پاتشایەتی و پێکهاتووە لە مەزنانی پارس و خودی شا سەرۆکیان بووە. بەم شێوەیە لە چوارچێوەی ئێراندا بە واتایەکی تایبەت، یەکییەتییەک بەدی هات کە سەرۆکهۆز و سەرخێڵان، بە چەشنێکی چالاک بوونە بەشداری دامەزراندنی حکوومەت، ئەگەرچی هەموویان نەریت و کولتووری دەوارنشینی یان نیشتەجێبوونی خۆیان پاراستبوو.

زاڵبوونی هەخامەنشییەکان بە سەر مادەکاندا، هیچ وەکوو سەرکەوتنی بابلییەکان و عیلامییەکان و کارتاژەکان[1] ناچێ، بە سەر ئەو تیرە و هۆزانەدا کە بەزێندراون و هەمیشە تووشی کوشتاری خوێناوی و تالانوبڕۆ بوونەوە. هەگمەتانە [ئێکباتان = هەمەدان]، نە تەنیا هەر پارێزرا، بەڵکوو هەروا بە پایتەختی مایەوە و بوو بە ناوەندی ئارشیوخانەی میری و زۆر وێدەچێ کە کووروش دوو تەتەڵەی زێڕینی ئاریارەمنە و ئارشامی لەگەڵ بەڵگەنامەکانی دیکەی خانەدانی میری، ڕاگواستبێتە ئەو شوێنە. کاربەدەستانی مادی کە چەند پیاوێکی پارسیش بوونە هاوکاریان، لەسەر کاری خۆیان لانەدران. گۆڕانی دەسەڵاتەکە ئەوەندە بە نەهێنی کرا، کە نەتەوەکانی باڵی خۆرنشین، لایان وابوو حکوومەتی پارسی هەر حکوومەتی مادییە. کووروش پاش ئەوەی بۆی کرا هەردک پادشایەتی لە ژێر فەرمانی خۆیدا بکاتە یەکپارچە، لەسەر لووتکەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەکی بەربڵاودا ڕاوەستا کە پڕ بوو لە کان و کانگای دەوڵەمەندی سروشتی و هەڵکەوتی جوغرافیایی هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندبوو کە ببێتە پردی پەیوەندیی نێوان شارستانییەتەکانی خۆرنشین و خۆرنشینی دوور. ئێران لە

---

١ـ قەرتاجەنە. شارێکە لە ئیسپانیا و لەنگەرگایەکی کەنار دەریایە.و.

سەرتاسەری دیرۆکی خۆیدا، لەو ئەرکە قورسەی دانەبڕاوە کە دەستی چارەنووس لە ماوەی هەزاران ساڵ مان و مانەوەیدا، خستوویەتە سەر شانی.

کووروش، ئەم ڕێبەرە هێژا و شەڕزان و بەهێز و وریایە، ئێستاکە دوو ئامانجی لە بەرچاو بوو: یەکیان گرتنی باڵی خۆرنشین و هێنانە ژێر ڕکێفی کەنارەکانی دەریای مەدیتەرانە کە تەواوی گەورەڕێیانی تێپەڕیو بە ئێراندا دەچوونەوە سەر لەنگەرگاکانی و هەروەها گرتنی ئاسیای بچووک کە لەو سەرزەمینە و لە تەنیشت لیدییەی دەوڵەمەند، یۆنانی خاوەنی بنکەی دەریاوانی بوون. ئامانجەکەی دیکەی کووروش بریتی بوو لە دابین کردنی تەناهی و هێمنایەتی و دامەزراندنی حکوومەتێکی یاسامەند کە بتوانێ بەشێک لە کولتووری کۆن وەربگرێ و سنوورەکانی دنیای ژیارمەند بۆ لای ڕۆژهەڵات هەتا ناوچەکانی سەیحوون و جەیحوون پەرە پێبدا و باڵی تیرە و عێلاتی «ئێرانی دەرەوە»[1] بگرێ و یاریدەی جووڵانەوەیان بدا. کووروش ژیانی خۆی کردە تەرخانی ئەم دوو ئامانجە و گیانیشی لەسەر ئامانجی دووهەم دانا.

ئەم پادشایە کە میراتگری حکوومەتی ماد، ئاشوور، ئوورارتوو و خۆرهەڵاتی ئاسیای بچووک بوو، تەماشای کرد لیدییەی[2] لە بەردەم قوت بۆتەوە کە کرۆزووس[3] لە ساڵی ٥٦١ی پێش‌زایینەوە حوکماتی بە سەردا دەکرد. هەر بۆیە کووروش سەرەتا بە شێوەیەکی ئاشتییانە سەری بە کلیکییە نەوی کرد، چونکە ڕەنگبوو بە یاریدەی هاوپەیمانانی میسری و بابلیی لیدییە، ڕێگای پێشوەچوونی لێ بگرێ. ئەوسا ژێربەژێر دەستی لەگەڵ پیاوانی دەوروبەری پادشا تێکەڵ کرد و گەڵاڵەیەکی چاکی داڕشت. سەرەتا داوای لە کرۆزووس کرد کە سەر

---

١ـ مەبەست ئەو باڵەی بانووی ئێرانە لە ڕۆژهەڵاتەوە.ب.

٢ـ لوودیا

٣ـ کریزووس

وەبەر دەسەڵاتەکەی بێنێ و ئەویش حکوومەتەکەی لێ نەستێنێ؛ بەڵام کرۆزووس پێشنیارەکەی بردەوە پاش. کووروش هێزەکانی لە ئاشوور کۆکردنەوە و لە رووباری دیجلە تێپەڕی و ملی ئەو رێیەی گرت کە لە داهاتوودا بە «رێگای شاهی» ناودێر کرا و گەیشتە کاپادۆکییە و لە جەنگەی هرووژمەکەیدا دەستی بە سەر «حەرران»دا گرت، کە سەردەمی «نەبوونید» ناوەندێکی گرینگی بازرگانی بوو. لەو کاتەدا هاوپەیمانانی پێشووی پاشەکشە پێکرد کە لەگەڵ میسر و ئیسپارت پەیوەندیی دۆستایەتیی دامەزراندبوو.

یەکەم تێکهەڵچوونی دوو هێزەکە لە نیزیک رووباری هالیس [قزل ئیرماق] قەوما و ئاکامێکی روون و یەکلاکەرەوەی لێنەکەوتەوە. لەگەڵ داهاتنی سەرەتای وەرزی زستان، کرۆزووس پێیوابوو، کووروش دەست هەڵدەگرێ و دەکشێتەوە، بەڵام هێندەیان تین بۆ هێنا کە ناچار بوو سوارەی بەناوبانگی خۆی بێنێتە مەیدان و پادشای ئێرانیش وشترسواران بنێرێتە بەرەوروویان. یەکسمانی لیدییە کە هەتا ئەو کاتە چاویان بە جانەوەرێکی ئاوا نەکەوتبوو، ترسیان رێنیشت و تۆقین و گەیان گرت و ئەم تێکشانە وای لە کرۆزووس کرد کە بۆ پاراستنی گیانی پەنا بەرێتەوە «سارد»ی پایتەختی و دەرگا لەسەر خۆی گاڵە بدا. کرۆزووس بە شارێکی لە گیراننەهاتووی دەزانی، بەڵام کووروش شانی لێ شل کرد و ئابلۆقەی دا و گرتی و بە ویستی خۆی لە نێو کۆمای لیژەدارێکی ئاگریندا سووتا. لیدییە بوو بە یەکێک لە هەرێمەکانی ئێرانی و میرهەرێمێکی پارسیی بۆ دیاری کرا.

پاشان کووروش لە شارە دەوڵەمەندەکانی یۆنانیی سەر لێواری دەریای راسپاردن و داوای لێکردن بێ پەلپ و بەبێ هیچ مەرجێک سەری وەبەربێنن، بەڵام یۆنانی لێیان نەسەلماند. گومانی تێدا نییە کە ئەوان پێشتر لە ڕیزی

جەماوەری بەرفەرمانی پادشای لیدییەدا بوون، بەڵام کاروباری بازرگانی وای ئەنگراندبوون، کە نیری لیدییە قرچۆک دەهاتە بەرچاو و هێندەیان تێنەدێنا. ڕەتکرانەوەی داوای کووروش بە سەربادان و ڕاپەڕین لێکدرایەوە و کووروش لێیان وەخۆ کەوت. شارەکانی یۆنانی یەکبەدوای‌یەکدا، بە زەبری زۆر یان خەیانەتی تاقمێک لە دانیشتووانیان گیران و تەنیا مەلەتییە پارێزرا، چونکە هەر لەڕێوە، دەستی بەردابۆوە. لەم هەرایەدا، بڕشتی زێڕی پارسەکان هێندەی هێزی چەکداریان بڕی کرد. بەستێنەکانی دەریا کرانە دوو هەرێم؛ هەرێمی ئیێۆنییە خرایە سەر «سارد» و هەرێمی قەراخ دەریای ڕەش ناوی گۆڕا بە هەرێمی «دانیشتووانی دەریا» [یان دەریایی‌یەکان].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە پرسی شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووک، بە درێژایی مێژووی هەخامەنشییەکان، چەندەیان دەوری ورد و باریک لە سیاسەتی ئێراندا گێڕاوە و تا چ ڕادەیەک توانیویانە هەل بۆ شەڕی پیرۆزی ئەسکەندەری گەورە بڕەخسێنن. ئێرانییەکان لە زەمانی کووروشەوە بەرەودوا، لەخۆوە نەبوو کە دەیانویست ببنە خاوەنی ئەو ناوچەیە. بەرلە هەموو شتێک بۆ ئیمپراتۆرییەکی گەورە، ڕاگیرانی هورم و ئابڕووی نێونەتەوەیی لە ئارادا بوو. هێزێکی ئەوتۆ نەیدەتوانی لە حاند چەند شارێکی ئانگراوی ڕێگای بازرگانی، پاشەکشە بکا و هەل و هەڵکەوتی بارناسکی شوێنەکەش تێنەهێنێ. ئەم شارانە خاوەنی جەماوەرێکی بایەخدار بوون و پسپۆڕانی کارزان و هێژا و سەربازانی شارەزا و شەڕدیدە خۆیان تێدا دەنواندن. لەنگەرگای ئەو شارانە کە بە لای یۆنانی ئورووپادا شکابوونەوە، خاوەنی داموودەزگای گرینگ و تەیار بوون و بە دەروازەی تێکەڵاوی لەگەڵ دنیای یۆنانی دادەندران. لە لایەکی دیکەوە هەموویان زەنگین و ئاوەدان بوون و وەک ماکەیەکی بەهێز لە کاروباری بازرگانیی

ئیمپراتۆری‌دا دەوریـان دەگێڕا و ئەگـەر بێتـوو هـەمووی لـە جـەغزێک‌دا کۆ کردبانـەوە، دەیتـوانی ئـەو شـوورەیە بڕووخێنـێ کـە ئـەوان لەسـەر ڕێگـای هەڵیانچنیبوو. لاوازیی شارەکانی یۆنانی کە دەگەڕایەوە سەر ناکۆکییەکانـی نێوخۆیی، سەرنجی تەواوی زلهێزەکانی ڕادەکێشا و تروسکەی زێڕی ئێران تەنانەت چاوی غەیبزانی خوای مەزنیشی[1] بە شەوارە دەخست. بێگومـان لـە تەواوی ئەم ناوەندانەدا، چین و توێژە بەهێزەکان بە قازانجیان بوو کە لەگەڵ پارسەکان پێکبێن و سـەرنجیان ڕابکێشـن. هەڵسووڕانی چینی بازرگانان لـە جەرگەی ئیمپراتۆریی گەورەدا، وەکوو دۆزینەوەی خەزێنەیەکی شایان بوو.

دوای ئـەوەی کـووروش لـە کاروبـاری گرتنـی ئاسـیای بچـووک بـۆوە و دەسـتێکی کەوتـەوە بـەرخۆی، لەگـەڵ هێزەکـانی بـەرەو سـنوورەکانی بـاڵی ڕۆژهـەلات جمـی. هیرکـانی (گورگـان) و پـارت کـە هاوکەوشـەنی مـاد بـوون، خرابوونە سـەر قەڵەمڕەوی پارسـەکان و ویشتاسپی بـاوکی داریووشـیان بـە میرهەرێمی خۆیان قبووڵ کرد و کووروش هەروا بـەرەو ڕۆژهـەلات ئەسـپی ئـاژاوت. درەنجیـان [درانجیانـا = زرەنـگ = درەنگیانـا]، ڕۆخـج، مـەرو و بـەلخ (باکتەریا)، یەکبەدوای‌یەکدا، خرانە سەر قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆری. کووروش و هێزەکانی لە جەیحوون (ئاموودەریا) تێپەڕین و گەیشتنە سەیحوون (سیردەریا)، کە دەبێ ئەوێ بە سنووری باکووری ڕۆژهەلاتی ئیمپراتۆریی هەخامەنشییەکان دابندرێ. پادشای ئێران بە مەبەستی پاراستنی ئەم هێڵی سنوورە لە ئاست پەلاماری خێڵاتی دەوارنشینی ئاسیای ناوەندی، شاری بەشوورە و قەڵای قایمی سازکردن.

---

۱ـ مەبەست پێشگۆی ئەلەمپە.م. زلەکاهینی بتی گەورە.ب.

**گیرانی بابل**

کووروورش لە کاتی گەڕانەوەدا، بە مەبەستی نواندنی هەڵمەت و چالاکی، بەرەو سنوورەکانی باڵی خۆرنشین دەڕوا. جەنگەی پەلاماردانی بابل داهاتووە و وێدەچێ هەلومەرجەکە بۆ وەشاندنی زەبری کۆتایی، تەواو ڕەخسابێ و گرێی لە بەر نەبێ. نەبوونید بە خۆی و بە دەسەڵاتی کلۆر و کەلەلای، لە جاران پتر خەریکی پەسن و پەرستنی خودای «سین» بوو. بە تامەزرۆیی دەکەوتە شوێن نۆژەنکردنەوەی ئاسەوارە کۆنەکان و لە بواری شوێنەوارناسی‌دا سەرقاڵی وردبوونەوە بوو. پێشەوایانی دینی لێی ناڕازی بوون و ئەویش ئاوڕی لێنەدەدانەوە و بە سەری نەدەکردنەوە و سەرەنجام هەموو کاروبارێکی بەرگری و بەربەرەکانیی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی دابوویە دەس کوڕەی جێگرەوەی. ڕەشەبا لەسەر سەری گەورەشار کردی بە هاژوهووژ. کۆمەڵانی جوولەکەی دوورخراوە پێشبینیی پەلاماری ئێران دەکەن و پێغەمبەرەکانیان کووروورش وەکوو «ڕزگاریدەر» دەناسێنن. بابل بێئەوەی کەسی وەدەست بێ گیرا و تەنیا جەرگەقەڵای میری چەند ڕۆژێک دەکەوێتە خۆڕاگری. نەبوونید بە دیل دەگیرێ و کووروورش بەپێی داب و نەریتی جوامێرانەی لەگەڵی دەجووڵێتەوە. ساڵی دواتر (٥٣٨ی پ.ز)، کاتێک نەبوونید دەمرێ، دەکرێتە تازییەی گشتی و کووروورش خۆی بەشداری پرسەی دەبێ.

کووروورش خۆی وەکوو سەرکەوتوویەک بە خەڵکی بابل نەناساند، بەڵکوو خۆی بە ڕزگاریدەر و جێنشینی یاسایی و ڕەوای دەسەڵاتی پادشایەتی دانا و بە مەبەستی دەرخستنی سەنگ و بایەخی قەڵەمڕەوی تازەی، خۆی بە «پادشای بابل [و] پاشان هەموو سەرزەمینەکان» ناودێر کرد. تەواوی ئەو پەیکەرانەی خودایان کە نەبوونید هێنابوونی بۆ پایتەخت، بۆ شوێنی خۆیانی گێڕانەوە. لە

**تافی جەژنی ساڵی نوێدا، ڕێوشوێنی پادشایانی بابلی ڕەچاو کرد و دەستی بە سەر دەستی خودای «بەعل»دا هێنا و بەم شێوەیە بەڕەسمی چووە ڕیزی زنجیرەی پادشایانی تازەی بابلەوە.**

**جا لەبەرەوەی کووروش ببوو بە فەرمانڕەوای بابل، تەواوی خاکی سووریاش دەکەوتە نێو جەغزی دەسەڵاتی و دەبوو بە خاوەنی و لەوێش هەر درێژەی بە ڕێبازی خێرخوازانەی خۆی دا. پادشایانی فنیقییە چوونە خزمەتی و سەریان وەبەرهێنا و هێزە دەریاوانییەکانی خۆیان نایە بەردەستی کە بارتەقای دەریاوانانی یۆنانی دەهاتنەوە. کووروش لە یەکەم ساڵی حکوومەتی خۆیدا لە بابل، فەرمانی ئازادیی جوولەکە بە دیلگیراوەکانی پەسند و بڵاوکردەوە و ڕێگای دان بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان و پەرستگەی بەیتولموقەددەس نۆژەن بکەونە و بیبەنەوە سەر هەڕەتی جارانی. هەروەها بڕیاری دا کە تەواوی کەلوپەل و هەوروهاڵی ڕاگوێزراوی زێڕ و زیوی بۆ بگێڕنەوە. لە ساڵی ٥٣٧ی پێشزاییندا پتر لە چلهەزار جوولەکە بە جڵەوداریی زەرووبابێل، لە بابلەوە گەڕانەوە سەرزەمینی پیرۆز [واتە کەنعان]. یەکێک لە کاربەدەستانی پایەبەرزی ئێرانی بە مەبەستی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی میری، لەگەڵیان ڕۆیی. لێرەشدا هەر ئەو ئاکارە جوانە جوامێرانەی کووروش وەبەرچاو دێ کە بە شوێن دڵدانەوە و سوکنایی پێهێنانی مرۆڤدا، هەنگاوی ناوە؛ بەڵام لەبەرەوەی کە پیاوێکی سیاسەتوان بوو، دەیزانی کە خاکی فەلەستین شارێیەکە بەرەو میسری هێشتا نەگیراو. هەڵبەت نابێ ئەو مەبەستەمان لە یاد بچێ کە لە سەردەمی ویدا، سیاسەت لەگەڵ دین تەواو شانبەشانی یەکتر دەڕۆیشتن و ئەگەر کووروش و پاش ئەویش داریووش، ئاوا بە دڵاوایی و دلۆوانی لەگەڵ جوولەکان جووڵانەوە، هەر تەنیا پاراستنی قازانج و بەرژەوەندیی ئەوان لە بەرچاو نەبووە، بەڵکوو**

لێرەدا ڕوانگەی دینیی جوولەکانیش تێدەهێندرێ کە دەکەوتە سەرووی کۆمەڵەی دینەکانی دیکە و لەچاو دینی کلدانی و میسرییەکان، زۆر لە دینی ئێرانییەکان نیزیکتر و هەستپێکراوتر بوو. جوولەکەکان ئەمەگدار بوون و پاش گەڕانەوەیان بۆ نیشتمانی خۆیان، بە گۆرانی و سروودی شادمانی پەسنی ئاکاری جەماوەری ئێرانیان دەدا، چونکە ژیانەوەی «نەتەوەی هەڵبژاردە»، قەرزداربـاری ئێرانییەکان بوو.

ڕووداوگەلی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری، کووررووشیان ناچار کرد کە دژی عێلاتی دەوارنشین بکەوێتە خۆ و زەبریان لێبوەشێنێ؛ جا هەر بۆیە پاش ئەوەی کەبووجییە [کەمبووجییە]ی کوڕی ڕاسپارد هەتا پێداویستییەکانی پەلاماردانی میسر دابین بکا، ڕووی کردە باڵی ڕۆژهەڵات و هێندەی پێنەچوو کە لە شەڕێکدا سەری تێداچوو. تەرمەکەیان هێنایەوە پاسارگاد و لە نێژگەیەکدا ناشتیان کە بەژن و دیمەنی بەرچاوی، وەبەرهێنەرەوەی گۆڕی ئەو یەکەم ئێرانییانەیە کە هاتنە بانووی ئێران و لەسەر شێوازی نۆردیک خانووبەرەی خۆیان ساز دەکردن(و٤٠).

لە نێو پادشایاندا، کەمن ئەوانەی کە پاش خۆیان وەکوو کووررووش ناو و ناوبانگی چاکیان بەجێهێشتووە. کووررووش سەردارێکی مەزن و پێشەوایەک بوو کە بەختیش یاریدەی دەدا. پیاوێکی دڵاوا و خێرخواز کە نەیدەویست ئەو شوێنانەی گرتوونی، هەموویان بخاتە سەر ڕەوگە و ڕێبازێک، چونکە ئەوەندە تێگەیشتوو بوو کە دەستی نەدەبرد بۆ پێکهاتەی باوی ئەو کۆمەڵگایانەی دەیخستنە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی. گەیشتە هەر جێگایەک، دانی بە خودایانی دینە جیاوازەکاندا هێنا. هەمیشە خۆی بە جێنشینی یاسایی میرانی خۆجێیی دادەنا. ئەسکەندەر یەکەم کەس نەبوو کە ئەم ڕێبازەی ڕەچاو کرد،

بەڵکوو تەنیا بە شوێن ڕچەی کوتراوی کووروووشدا هەنگاوی نا و ئاوا کەوتە بەر پەسن و تاریفاتی ئەو کۆمەڵانەی تازە دەچوونە ژێر فەرمانی. شنەبایەکی نوێ هەڵیکرد و سەرتاسەری جیهانی گرتەوە و شارەکانی لە چنگ مۆتەکەی مەرگ و خوێنڕژانی ناڕەوا ڕزگار کرد و ئاگری شارە تاڵانکراوەکانی کووژاندەوە و هۆز و نەتەوەکانی لە داوی دیلی و کۆیلەتی ئازاد کرد.

کووروووش بەرلە هەر کەسێکی دیکە تێگەیبوو کە «دنیای کەونارا، کۆمەڵی شارانی ژیارمەند و خێڵاتی کێویلە، زۆر بە زەحمەت سەر وەبەر ئەو هێزانەی نێوخۆیی دێنن کە دەیانهەوێ هەموویان لە کۆمەڵێکی مرۆیی‌دا بتوێننەوە و بیانکەنە یەکڕەنگ.» ئێمە هەرگیز نابینین کە کووروووش وەکوو ڕۆمییەکان، نەتەوەی ڕکەبەری خۆی بکاتە هاوپەیمانی و سەرەتا چەشنی هاوشانێک لەگەڵی بجووڵێتەوە و پاشان لە جەنگەی لاوازبوونی‌دا، سەری پێ نەوی بکا و بیخاتە ژێر ڕکێفی و بیچەوسێنێتەوە. ئێرانی بە کووروووش دەڵێن «باوکە» و یۆنانییەکان کە نیشتمانی لێ‌گرتبوون بە «سەروەر» و «یاسادانەر» ناودێریان کردووە و جوولەکە پێیان دەگوت «مەسیحی پەروەردگار». ئەگەرچی ڕووحی لەشەڕی، تەنانەت پاش چەندین ساڵ شەڕ و سەرکەوتن، هەرگیز بە سەر سستی‌دا نەکەوت، بەڵام هەمیشە لە سەردەرانەی ڕوانگەیەکی بەرزەوە لە دوژمنی بەزیوی دەڕوانی و دەستی دۆستایەتیی بۆ لای درێژ دەکرد. ئەو لە دەقێکی نووسراوی مێژوویی‌دا کە لە بابل نووسراوە، ئاوا دەڵێ: «ماردووک هەموو دنیای پشکنی هەتا ئەو پادشا دادەوانەی کە بە شوێنی‌دا دەگەڕا، بیدۆزێتەوە؛ پادشایەک کە سەر وەبەر هەستی دڵ و دەروونی خۆی بێنێ. [ماردووک][1]

---

١ـ ماردووک [مەردووک = مەردووخ]، خودای گەورەی بابلییەکان.م.

دەستی گرت و ناوی نا کووروٖوشی ئانشان و پادشایەتیی هەموو دنیای کردە باربووی.»

**پاسارگاد**

زۆربەی ڕۆژگاری پادشایەتیی کووروٖوش بەختی شەڕ و تێکهەڵچوونەکانی کرا لە باڵی خۆرهەڵات و خۆرنشینی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی و دەرفەتێکی وای نەما بۆ چالاکی و هەڵسووڕانی دیکە، بەتایبەت سازکردنی شاران. کووروٖوش وەختایەک کە هێشتا تەنیا میری ئانشان بوو، شووشی کردە پایتەخت و پاشان هەگمەتانە و بابلی وەک پایتەختی هاوینە و زستانە هەڵبژاردن؛ کەچی دیسانیش پاسارگادی بۆ میراتگرانی داهاتووی وەک ناوەندی دەسەڵاتی پادشایەتی بەجێهێشت. بەپێی گێڕانەوەکان لە شوێنێک بناغەی پاسارگادی دانا کە توانی شەڕی یەکلاکەرەوەی لەگەڵ ئاستیاگی [باپیری] تێدا بەرێتەوە و بیبەزێنێ. توێژەران لایان وایە کە ناوی شارەکە دەگەڕێتەوە سەر وشەی «پارسەگەد»[1] کە بە واتای «هۆردووگای پارسەکان»ە. ئەگەر بێتوو ئەم هەڵگێڕانەوەی وشە و جێگۆڕکەیە ڕاست بێ، واتاکەی دەبێتە ئاوێنەی دیمەنی باڵانوێنی شارەکە. لە ڕاستی‌دا ئەم جێگایە، لەشکرگایەکی پان و بەرین بووە کە شوورەیەک دەورەی داوە و کەوتۆتە نێو کۆمەڵێک باخ و سەیرانگا و کۆشک و پەرستگای لێ ساز کراوە. لەو شانەوشانی سەیرانگاوە دوو گای زلەی باڵداری بەردین داندرابوون. لە بەر دەروازەی سەرسەرای باکووری، هێشتاش یەکێک لە جووتە فریشتە چوارباڵەکان وەبەرچاو دێ (و ٣٨). لەسەر بەردەنووسێکی سێ‌زمانەی پارسیی کەونارا، عیلامی و بابلی ئەم ڕستەیە هەڵکەندراوە: «منم کووروٖوش، پادشا،

---

[1] ـ ڕەنگە لە بنەڕەت‌دا «پارسەگە» یان «پارسەگا» بێ. بە مانای جێگای پارسە یان پارسان، دەڵێن دوور نییە گردێکی سەرتەخت و پان بووبێ و پارسەگرد بێ.و.

ههخامهنشی». ئهم شوێنهواره دهبێ سهر بهو سهردهمه بێ که هێشتا له ژێر فهرمانی [ئاستیاگدا] بووه. تالاری دیداری گشتی به دیمهن و قهڵافهتی پێشهوایانی دینی رازاوهتهوه که خهریکن چهند سهر ئاژهڵێک دێنن بۆ قوربانی کران. ههروهها چهند ههیکهلێکی سهر و پهنجه ههڵۆ خۆیان دهنوێنن. سهرهکۆڵهکه بهردهکان لهسهر شێوهی ئهسپ، گا، شێر و شێری شاخدار داتاشراون (ق٥١).



ق٥١ـ پاسارگاد: سهری شێرهبهردینهیهک

لهسهر قهدی کۆڵهکهی چوارپاڵووی کۆشکێکی دیکه، بهردهنووسێکی سێزمانه وهبهرچاو دێ که کووروش خۆی به «شای مهزن» ناودێر کردووه (ق٥٢). بێگومان دهبێ ئێره پاش زاڵبوون به سهر مادهکاندا ساز کرابێ. له جێگای دیکه چهند کۆڵهکهیهکی دار چهقێندراون که وادیاره دهبێ به رهنگی شین، سهوز، سوور و زهرد رهنگێندرابن.

لەسەر بەردەتاشی شانی دەرگاکان پادشا خۆی دەنوێنێ کە وەکازی پادشایەتیی بە دەستەوەیە و بەشێک لە جلوبەرگ و چاوی زێڕکفت کراون. ئاورگایەک لەسەر شێوەی چوارپاڵووی ڕێک و بە بەردی جوانتاشراو، ساز کراوە و زۆر وەک ئەو ئاورگایە دەچێ کە لە نەخشی ڕۆستەم، بەرەوڕووی نێژگەی داریووشە. لە مەودایەکی ئەولاتر، دوو ئاورگای پێپلکەدار وەبەرچاو دێن، کە دەبێ ڕێوڕەسمی دینی لە دەر و دەورەیان ئەنجام درابێ(ق٥٣).



ق٥٢ـ کاول و هەرەسەکانی پاسارگاد



ق٥٣ـ پاسارگاد: ئاورگا

پاسارگاد دیمەنێکی بەربڵاوی هونەری ئێرانییە کە هێشتاش یەکەم هەنگاوەکانی داندرانی بناغەی بە لامانەوە ڕوون نەبوونەوە. سەرەڕای تێکەڵ کران و لێکدرانی شێوازەکان و هێنانە ڕووی کۆمەڵێک گای باڵداری ئاشووری و داتاشرانی پەیکەرەکانی هیتیایی لە لاجەولاجی داوێنی دیواران و ڕەنگاندن بە شێوەی بابلی و هێمای تایبەتی میسری، لە ڕاستیدا هەموویان دەبنە دیمەنێک لە کولتووری نەتەوەیی کە لەو ڕۆژگاریدا زۆر چاکی گەشە کردبوو. هەرچی لە دەرەوەڕا هاتووە، تێکوپێک هەڵشێلدراوە و ڕەنگی گۆڕاوە و بە هەوێنی خۆماڵی دەستاو دراوەتەوە و بۆتە خاوەنی هێز و پێزێکی تازە و هونەرێکی نوێ و تایبەتمەندییەکانی لە نیگای یەکەمدا وەبەرچاو دێن. نژیاروانی ئێرانی، بۆ کایە کردن بە ڕەنگەکان و بەدی هێنانی نسیورووناکی بە شێوەیەکی هەستیارانە جووڵاوەتەوە و نێوەنێوە بەردی ڕەش و سپیی دەکار کردوون. ئەم هونەرە بە نیشاندانی قەڵافەتی ئادەمیزاد لە تەنیشتانەوە و داتاشینی چین و گنجەکانی جلوبەرگان، گەشەیەکی بەرچاوی کردووە. هەموو وردەکارییەکان، جا چ داهێنان بن یان لە دەرەوە خوازرابێتەوە، وەسەر شێوەی ئێرانی گەڕاوە و بە بڕوای گەلێک لە پسپۆڕان، هونەری پاسارگاد زۆر کەوتۆتە پێشەوەی هونەری تەختیجەمشید.

## کەمبووجییە (٥٣٠ -٥٢٢ی پ.ز)[1]

کەمبووجییەی کوڕە گەورەی کووروش لە داوێنی شادژتێکی هەخامەنشی بەرببۆوە و لە هەشت ساڵەی دوایی پادشایەتیی باوکیدا، ببوو بە شەریکەدەسەڵاتی و بە «پادشای بابل» دەناسرا. کووروش بە زیندیسەری خۆی، بەردیای کوڕە چووکەی کردبوویە حوکمداری هەرێمەکانی خۆرهەڵاتی.

١ـ لە دەقەکەدا نووسراوە کەبووجییە. بەڵام لە مێژوودا کەمبووجییە باوە. کامبیز.و.

پاش نەمانی پادشای گەورە، هەرا و ئاژاوەیەک کە وادیارە دەبێ بە فیتی بەردیا بووبێ، تەشەنەی کرد و هەموو لایەکی گرتەوە. کەمبووجییە کە سیاسەتوانێکی بەئەزموون و جیاواز بوو لە خدەوخووی باوکی، تەمای گرت ڕیشەی هەر جوولانەوەیەک لە بنەوە هەڵکەنێ کە دەبێتە هۆی لاوازی و ناسەقامگیربوونی دەسەلاتی پادشایەتی. جا بۆیە سەرەتا بۆ ڕاستەی کاران دەستووری دا کە بەدزی بەردیای برای بکووژن. وادیارە ئامانج لە داسەپاندنی ویست و داخوازی میرانەی پەرەی دەسەلات بوو بە مەبەستی درێژەی پەلاماری سەرکەوتووانە و بوون بە تاقەسوارەی مەیدانی فەرمانڕەوایەتی؛ فەرمانڕەوایەک کە یۆنانییەکان بەئاشکرا پێیان دەگوت«ملهوڕ».

هەڵکوتانە سەر میسر، پێشتر لە زەمانی باوکیدا کەمبووجییەی بۆ ڕاسپێردرابوو هەتا گەلاڵەی پێویستی بۆ دابڕێژێ. کەمبووجییە دوای نەمانی باوکی، توانی هەر هەرایەک ڕۆمرکێنێ و ئارامی باڵی بە سەر نێوخۆی ئێراندا بکێشێ. پاشان پێی نایە ڕکێف و لەگەڵ هێزەکانی بەرەو دەرە و دەشتی نیل کەوتەڕێ. ئاماسیسی فیرعەونی میسر کە ڕەنگە لە زەمانی گیرانی «سارد»ەوە هەستی پێکردبوو کە وێدەچێ ڕۆژایەک تاسەی خۆبەزلزانانەی ئیمپراتۆریی تازەی ئێران، داوێنی وڵاتەکەی بگرێتەوە، لەگەڵ «پۆلیکراتێس»ی فەرمانڕەوای ملهوڕی «سامۆس» بوو بە هاوپەیمان، بەڵام کاتێک هێزی ئێران لە غەززە لەشکربەزی کرد، پۆلیکراتێس پشتی بەردا. هەر لەم کاتەدا یەکێک لە باشترین سەرکردەکانی بە ڕەگەز یۆنانی کە لە خزمەت فیرعەوندا بوو، ڕایکردە لای دوژمن و نهێنییەکانی بەرگری و بەرەنگاربوونەوەی میسرییەکانی لە قاو دا. کەمبووجییە بە یاریدەی ڕەوەندان بە سەحرای سینادا تێپەڕی و گەیشتە بن شوورەی پێلووزیووم، واتە ئەو شوێنەی کە پێسامیتیخی سێهەمی کوڕی

ئاماسیسی تازەمردوو، هێزە بەکرێگیراوە یۆنانییەکانی خۆی لەوێ کۆکردبوونەوە. شەڕێکی قورس و خوێناوی قەوما و سپای میسر خۆی لەبەر زەبری ئێرانییەکان ڕانەگرت و بەرەو مێمفیس کشایەوە؛ بەڵام ئەویش گیرا و فیرعەونی تازە دەست بەسەر کرا و نێردرایە شووش. وێدەچێ کەمبووجییە لە میسر خۆی بە جێنشینی فیرعەونان دانابێ؛ چونکە بە ڕێزەوە لە خودایانی میسری ڕوانی و پیاوێکی پایەبەرزی میسری کردە بەڕێوەبەری کاروباری وڵات و فەرمووی کە بە مەبەستی کارسازی و چاکسازی و ڕەچاو کرانی بەرژەوەندیی خەڵک هەنگاوی پێویست بهاوێژرێ.

بە مەبەستی گەشە و پەرەی دەسەڵاتی ئێرانییەکان لە دنیادا، سێ شەڕ و پەلاماری دیکەش گەڵاڵەیان داڕێژرا کە بریتی بوون لە: لێدانی کارتاژەکانی خۆرنشینی دەریای مەدیتەرانە [دەریای سپی یان دەریای نێوەڕاست]؛ گرتنی خەمرکی ئامۆن کە ڕێگای «سیرنائیکا»ی پێدا دەکرایەوە و سەرەنجام تێکهەڵچوون لەگەڵ حەبەشە؛ بەڵام دەتگوت ئەو مەلە خۆشفەڕەی بە سەر سەری باوکیدا دەسووڕایەوە، سێبەری بە سەر کەمبووجییەوە نەمابوو، چونکە هیچکام لە ئامانجەکانی وەدی نەهاتن و گەڵاڵەکانی بۆ نەچوونە سەر. هەڵمەت بۆ سەر کارتاژەکان هەر پێی نەنایە بواری جێبەجێ کران، چونکە فنیقییەکان ئامادە نەبوون دژی ئەو کۆمەڵگا کۆچەرنشینە وەخۆ بکەون کە کەسوکاری خۆیان بوون. بەگوێرەی دەقی ژێدەرانی یۆنانی، سپایەکی پەنجاهەزار کەسە بەرەو خەمرکی ئاممۆن گاڵ دەدرێ، بەڵام هیچیان ناگەنێ و ڕەشەبای سامناکی خیز و لم دەیانخێکێنێ و بە سەریان دەکشێ. ئەگەرچی لەو ڕێبازەدا تووشی شکست بوونەوە، بەڵام دەسکەوتیشیان هەبوو. یۆنانییەکانی دانیشتووی لیبی(لیبیا)،

سیرنائیکا و بەریقە (بەرقە)، سەریان وەبەر کەمبووجییە هێنا. بەم شێوەیە نیوەی دنیای یۆنانی و بەشی هەرە سامانداری، کەوتە ژێر ڕکێفی پارسەکان.

سەرچاوەکانی یۆنانی کە ڕەنگە چووبنە ژێر باندۆری دنەی سەرچاوەکانی میسری، دەگێڕنەوە کە هێرش بۆ سەر «حەبەشە»ش، کە خودی شا سەرکردەی بووە، شکستی هێناوە. لەشکرچی نان و بژێویان لێ دەبڕێ و لە جەنگەی گەڕانەوەدا، بەشی زۆریان تێدا دەچن؛ بەڵام چەند بەڵگەیەک بە دەستەوەن کە دەریدەخەن سپای کەمبووجییە گەیوەتە «نەبەتە»، چونکە لەوی بەم لاوە تازە ناوی ئەم حکوومەتە لە لاپەڕەی ڕۆژگار دەسڕێتەوە و هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی باسی ناکاتەوە. شارێک بە ناوی «مێرۆئێ»ی ژنی کەمبووجییە ساز دەکرێ و ئەمەش دەیسەلمێنێ کە پەلامارەکەی وەک ئەو چەند ژێدەرەی باسی دەکەن، هێندەش کارەساتبار نەبووە. دەکرێ قبووڵی بکەین کە کەمبووجییە لە گەرمەی سەرکەوتن و پێشکەوتنیدا، لە ئێرانەوە کۆمەڵێک هەواڵی ناخۆشی بۆ هاتبێ و بەناچاری پەلەی کردبێ و ڕێگای قەدبڕی دەشت و بیابانی ڕووتەن و ویشکارۆی هەڵبژاردبێ و تووشی کارەساتێکی ئەوتۆ بووبێتەوە. هەر چۆنێک بێ، لە نێو تەواوی بەزێنەرانی میسردا، بۆ وێنە ئاشوورییەکان و بابلییەکان، هەر تەنیا کەمبووجییە توانیبووی دەست بە سەر هەموویدا بگرێ. سێ سەربازگە بە مەبەستی پاراستنی میسر داندرابوون: یەکەم لە «دافنێ»ی ڕۆژهەڵاتی ئاوڕێژگەی نیل؛ دووهەم لە مێمفیس و سێهەم لە ئێلێفانتین، کە کەمبووجییە هێزی بەکرێگیراوانی جوولەکەی لێ دانابوو.

ئەو کورتەوچانەی کەمبووجییە لە مێمفیس و دوای گەڕانەوەی لە حەبەشە، دەمەتەقەیەکی زۆری لەسەرە. ئەگەر بێتوو گێڕانەوەی سەرچاوەکانی یۆنانی بسەلمێنین، وادیارە ئەم پادشایە لە بواری دینیدا، ڕێبازی باوکی وەلاناوە، کە لە

سەرەتادا کردبوویە سەرمەشقی خۆی. کەمبووجییە گاڵتەی بە دینی میسرییەکان کرد و پەرستگاکانی خاپووراندن و بە تەمای کوشتن خەنجەرێکی لە گای پیرۆزی «ئاپیس» وەشاند. توێژەران لەم بارەدا بۆچوونیان جیاوازە و لێکۆڵینەوە تازەکان لە ڕووی پشتبەستن بە خوێندرانەوەی بەردەنووسەکانی سێراپێئووم (سێرافیئووم)، ڕێگامان بۆ خۆش دەکەن کە بڵێین ناکرێ کەمبووجییە ئاپیسی زامدار کردبێ. خاوەنی ڕاستەقینەی میسر خوداکانی بوون و تێکڕای فەرمانڕەواکانی سەریان وەبەر ئەم مەبەستە هێناوە. جێگای سەرسوڕمانە کە پیاوێکی سیاسەتوانی وەکوو کەمبووجییە کارێکی ئاوا شێتانەی کردبێ. مەگین ئەوەی تووشی نەخۆشییەکی قورسی وەکوو فێداری و دەلووکاری بووبێ، کە یۆنانی پێی لەسەر دادەگرن. ئەوەی ڕاستی بێ شەڕوشووڕ و دەسەڵاتی دەرەکی نەیدەهێشت وەکوو جاران پەرستگاکان دیاری و داهاتیان دابین بێ. هەر خودی ئەم ڕەوتە دەتوانێ سەرچاوەی ئەو ئەفسانەیە بێ کە ئێرانییەکانی بە سەرکەوتووانی دڵڕەق داناوە. لەبەرەوەی هەواڵەکانی ئێران سامناک بوون، کەمبووجییە تەمای گرت بگەڕێتەوە. واوێدەچێ لە ڕێگای گەڕانەوەی‌دا کاتێک گەیشتۆتە باکووری فەلەستین، ڕاپەڕینی بەردیای درۆینە، واتە گێئۆماتای موغی لێ سوور بۆتەوە. گێئۆماتا [گێئۆمات] کە زۆر وەکوو بەردیای برای کەمبووجییە دەچوو، دەیزانی بەردیا ـ بە نەهێنی و بە فەرمانی کاکی ـ کوژراوە؛ هەر بۆیە گوتی برای کەمبووجییەیە و ئێستا پادشای ئێرانە (٥٢٢ی پ.ز). کەموزۆر سەرلەبەری هەرێمەکانی ئیمپراتۆری سەریان وەبەر پادشای تازە هێنا کە باج و پیتاکی سێ ساڵانی پێ بەخشیبوون. خەڵک خۆشیان ویست و کەوتە بەر دڵیان و وەختایەک بەم هەستەی زانی، هەڵسووڕا هەتا ئاڵوگۆڕێک بە سەر دین بێنێ و پەرستگاکان تێکرووخێنێ و

وەکوو دیارە دەبێ سەرکەوتنی خێراشی وەچنگ هێنابێ. لێمان ڕوون نییە کە کەمبووجییە دوای بیستنی باروودۆخەکە تووشی قەیرانی لەناکاوی شێتی هاتووە و بەهەڵکەوت خۆی بریندار کردووە یان بە دەستی ئەنقەست خۆی کوشتووە. دوای نەمانی کەمبووجییە ئەگەرچی پیاوانی گێئۆماتا تێدەگەڕان هەتا هێزە چەکدارەکانی لە خشتە بەرن، بەڵام دیسانیش وەک وەفاداری خانەدانی هەخامەنشی مانەوە و کەوتنە شوێن ئەو حەوت لاوە مەزنەوەجاخەی ئێرانی کە دژی گێئۆماتا ببوونە هاوسوێند. سەرجەلەیان داریووش بوو کە ڕەنگە هەر لە سەرەتاوە هاواڵەکانی ئەویان وەک پادشای داهاتووی خۆیان ناسیبێ. بەپێی ئەفسانەیەک، بڕیار وابوو کەسێک ببێتە خاوەنی تەختی فەرمانڕەوایەتی کە ئەسپەکەی زووتر بحیلێنێ و بە فێڵوفرتی مەیتەری داریووش، ئەسپەکەی ئەو حیلاندنی و بوو بە پادشا. وێکچوونی ئەم بەسەرهاتە لەگەڵ ئەفسانەی هەڵبژاردنی «ڕووسا»ی فەرمانڕەوای ئوورارتوو، نیشانەی پەیوەندیی نێوان ئەم دوو شارستانییەتەیە. داریووش پاش ئەوەی بە پادشا ناسرا، ئەوەندە خێرا جووڵایەوە کە دوو مانگ دوای نەمانی کەمبووجییە، گێئۆماتا گیرا و کوژرا.

**داریووش (٥٢٢-٤٨٦ی پ.ز)**

نەمانی گێئۆماتا [گێئۆماتە = گێئۆمات] لە ڕوانگەی پادشای گەنجەوە، هێشتا بە دابینبوونی تەناهی و سەقامگیریی نێوخۆی وڵات لێکنەدەدرایەوە. نیزیکەی دوو ساڵێک بەناچاری چەکی دانەنا و کەوتە لێدان و ڕۆمرکاندنەوەی ئەو هەرا و ئاژاوانەی ئێروئەوێیان تەنیبۆوە. داریووش کراسی هەرمانی بڕی بە باڵای بیرەوەری و یادی سەرکەوتنەکانی خۆی و دەستووری دا هەتا بەردەتاشێک لەسەر سینگی تیشەشاخ و ڕەوەزێکی سەر ڕێی کرماشان بەرەو هەگمەتانە داتاشن کە چل گەزێک لە ڕێکی عەرزەوە بەرزە. لەم بەردەتاشەدا، پادشا

کەوتۆتە ژێر سێبەری پاراستن و بەسەرکردنەوەی ئەهوورامەزدای گەورە (و٤١). لێرە ئەهوورامەزدا لە چەغزی بازنەیەکی باڵداردا کە هێمای خۆرە خۆی دەنوێنێ و نیوەبەژنی دیارە. پادشا دوو پاسەوانی چەکداری لە دواوە ڕاوەستاون و خۆی پای ناوەتە سەر زگی بەردیای درۆینە و پێخوستی دەکا. دوابەدوای بەردیای درۆینە، هەشت پادشای درۆینەی بەزیو بە دوای یەکتردا ڕست کراون و ڕیزیان بەستووە. لە دەوری ئەم بەردەتاشە، لە چەند ڕیزێکدا، بەسەرهاتی هەڵگەڕانەوە و تێکشکانیان نووسراوەتەوە. بەپێی ئەو دەقەی کە بە سێ زمانی پارسیی کەونارا و بابلی و عیلامی هەڵکەندراوە، دیارە کە داریووش نۆهەمین پادشای هەخامەنشییە. لەم لیزگەی ناوانەدا پادشایانی هەردک بەرەبابی هەخامەنشی ئەژمار کراون کە بریتین لە: هەخامەنش و چیش‌پیش، پاشان کووروشی یەکەم؛ کەمبووجییەی یەکەم؛ کووروشی دووهەم و کەمبووجییەی دووهەم لە بەرەبابێک و ئاریارەمنە و ئارشام [ئارشامە = ئارشامێ] هی بەرەبابەکەی دیکە (و٣٩). ئەم قسەیە لەگەڵ تەواوی ئاسەوارە ناسراوەکانی تا ئەمڕۆ یەکتر دەخوێنێتەوە.[1] داریووش‌شا دەڵێ: «ئەهوورامەزدا و یەزدانەکانی دیکە یاریدەیان دام.» پاتشای تازە داوای یارمەتیی کرد لە خودای گەورە و خۆی بە جێگرەوەی یاسایی کەمبووجییە [کەبووجییە] دانا، کە بە وەجاخ‌کوێری مرد.

وێدەچێ کە ئەم دەقە پەل‌وپۆ هاویشتنی هەرا و ئاژاوەکانی بە هێند نەگرتووە، بەڵام ڕاستەقینە شتێکی دیکەیە. ئاژاوە بەکردەوە تەواوی ئیمپراتۆریی گرتەوە و شێواندی و تەنانەت پارسیش تێوەی گلا. ڕەنگە هاتنەوە ئارای باج و پیتاک، کە

---

١ـ بەو حیسابە دەبێ ویشتاسپی باوکی پادشایەتیی نەکردبێ. ئەگەرچی لە بەردەنووسەکەدا ناوی دێنێ و بە چوار پشتان دەیباتەوە سەر هەخامەنشی باپیرەگەورەیان.و.

بـە دەسـتووری بـەردیای درۆینـە بەخشـرابوون، بارودۆخەکـەی تێکـدابێ و ناڕەزامەنـدیی لـێ کەوتبێتـەوە. هەڵوێسـت و ڕێبـازی گـەلێک ئازادیخوازانـەی کووروش چاکی وڵام نەدابۆوە، چونکە هێشتا هەشت ساڵ بە سەر مـەرگیدا تێنەپەڕیبوو کە پێویست بوو پادشایەتیی ئێران لەسەر بناغەیەکی دیکە و جیاواز دابندرێتەوە.

داریـووش لـەچاو دوژمنـەکانی پیـاوێکی زیـرەک و فێڵـەزان بـوو. شـکانی یەکلەدوای‌یەکی ڕاپەڕینی خـەنیمانی دەگەڕێتـەوە سـەر نـەبوونی گەڵاڵەیـەکی هاوبـەش. هـەر «پادشـایەک» لـە قـازانج و بەرژەوەنـدیی خـۆی دەگـەڕا، بۆیـە هەموویان تاقتاق بە زەبری داریووش تێشکان و بە فەرمانی داریووش کوژران.

ڕاپەڕینی عیلام هەر لەڕێوە سەرکوت کرا؛ بـەڵام لـە بابل بارودۆخەکە بـە شێوەیەکی تر بوو. لەوێ کەسێک بە ناوی نیدینتوو بەعل، کردی بـە هـەرا کـە یەکێکە لە نەوەکانی نەبوونید و بە ناوی بەختونەسری سێهەم داوای تـەختی دەسـەڵاتی بـابلی دەکـرد. دەستڕاگەیشـتن بـە بابـل دژواری دەنوانـد، چونکـە هێزێکـی گـەورەی دەریـایی و سـپایەکی زۆر و زەوەنـد لـە بـاڵی خۆرنشـینی ڕووباری دیجلەوە دەیپاراست. داریووش پاش ئەوەی لەوێ ماوەیەکی پێچوو، لەناکاو بە ڕووباردا تێپەڕی و قۆشـەنی بـابلی بەزاند و شـارەکەی گـەمارۆدا. ڕاست لەم کاتەدا ڕاپەڕینی سـەرلەنوێی سووزیان (شووش) سەری هەڵدایەوە. مـەرتییەی فێڵەبازی پارسی، بەرلەوەی داریووش بگاتە سەری، گیرا و کـوژرا. ئەو ڕووداوانەی کـە لـە بـاکوور، واتـە لـە مـاد و ئەرمەنسـتان دەقـەومان، زۆر سەخت و ناخۆشتر بوون. پیاوێک بە ناوی فرەوەرتیش [فرەوەرتی] کە دەیگوت یەکێکـە لـە پاشـەوارەکانی هووەخشـتەرە، خـۆی وەکـوو پادشـای مـاد ناسـاند. داریـوووش ئەگـەرچی هێزێکـی لاوازی بـە دەسـتەوە بـوو، بـەڵام دیسـانیش

بەناچاری بەشێک لەو چەکدارانەی لە دەوری بابل کردنەوە و لەگەڵ سەرکردەیەک ناردنی بۆ شەڕی فرەوەرتیش. شەڕ و لێکدانی ماد، وەکوو تێکهەڵچوونی ئەرمەنستان ئاکامێکی لێنەکەوتەوە و هەتا دوای گیرانی بابل و نەهاتنی خۆی، ڕووداوەکانی هیچیان لێ شین نەبوو. فرەوەرتیش بەزی و هەتا «ڕەی»ی نیزیکی «تاران» کەوتنە پەیکەردەی و لەوێ گرتیان و [بە فەرمانی داریووش] گوێ و لووت و زمانیان بڕی و چاوێکیان کوڵی و لە دەروازەی شاری هەگمەتانە هەڵیانواسی و چوارمێخەیان کێشا؛ بەڵام ئەم کار و چاوترسێن کرانە، نەبوو بە ڕێگر لەسەر ڕێگای سەرۆکێکی دیکەی ساگارتییەکانی مادی باکووری، کە جەماوەرەکەی نەبزێوێ و دنەیان نەدا. ئەو کابرایەش [کە ناوی چیسنتەخمە] بوو، هەر گیرۆدەی چارەنووسی فرەوەرتیش بووە. گرێ و کۆسپی باڵی ڕۆژهەڵاتی قەڵەمرەوی داریووش لە هی باڵی ڕۆژاوا کەمتر نەبوون. ویشتاسپی باوکی شا و میرهەرێمی پارت و هیرکانی (گورگان)، زۆر ئازایانە بە گژ سەربزێوانەدا چۆوە. میرهەرێمی بەلخ لەگەڵ دژبەرانی مەروی تێکهەڵچوو. لە پارس پیاوێک بە ناوی ڤەهیزداتە گوتی من بەردیام، کەچی تێکشکا و لەگەڵ هاوڕێیانی لە قەنارە درا. تاقمێک لە لایەنگرانی خەڵکی ڕۆخجیان هان دا و هەرایان نایەوە و بەرەنگاربوونەوەیان گەیشتە شاری « کەپیس» (واتە بەگرامی ئێستا) لە باکووری کابول و بناری چیای هیندوکوش. سەرهەڵدانێکی دیکە بابلی گرتەوە و کەسێکی تر گوتی بۆختوننەسرم، کەچی سەردارێکی داریووش بەزاندی.

داریووش نیزیکەی دوو ساڵی سەرەتای حکوومەتەکەی کردە بەختی ئەم تێکهەڵچوونانە. نۆزدە شەڕی کرد و نۆ پادشای بەزاند؛ ئەو زەبرانەی لێی وەشان، ڕەنگدانەوەیان گەیشتە ناوچە دوورەدەستەکانی ئەولاتری باڵی

خۆرنشین. خۆ ڕاستە کەسێکی وەکوو ئاریاند کە کەمبووجییە کردبوویە میرهەرێمی میسر، بەئاشکرا نەیگوت بە پادشا ناڕازییە، بەڵام کردەوەکانی دەریاندەخست کە ئامادەیە لەگەڵ وردەلەرزەی دەسەڵاتی پادشایەتی، سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیەنێ. داریووش خۆی ڕۆیی بۆ میسر و فەرمانی دا بیکووژن و بە مەبەستی هێورکردنەوەی خەڵک هەنگاوی چاکی هەڵێنانەوە و مەزنەکاهینی «سائیس»ی لەسەر کارێکی گرینگ دانا. بارودۆخی ئاسیای بچووک لە شوێنەکانی دیکە چاکتر نەبوو.«ئۆرۆتێس»ی میرهەرێم لەوێ کە دەیزانی پادشا چۆن پێوە بووە، لە جەنگەی خۆیدا هێزی پشتیوانی بۆ نەنارد و هەلەکەی بۆ ڕاگەیاندنی سەربەستی بە گونجاو زانی؛ بەڵام ئەویش گیرا و لە قەنارە درا. تەنانەت یەهوودییەی بچووکیش هەدای نەدا و سەری هەڵدا. لایەنگرانی تۆرەمەی پادشایەتی، پێیان وابوو دەرفەتی چاکە و پێویستە یەکێک لە پاشەوارەکانی داود ـ ڕەنگە زەرووبابێل ـ شیاوی دەسەڵاتی بە میراتگەڕاوی پادشایانی یەهوودییە بێ. گەورەپیاوێکی ئێرانی کە بەرپرسی چاوەدێری بە سەر ئەو هەرێمەدا بوو، دەستی لە نۆژەنکرانەوەی پەرستگا هەڵگرت. جوولەکە باڵوێزێکیان ناردە لای داریووش و ئەویش گوتی لەسەر ئەو ڕێوشوێنەی کە کووررووش دیاریی کردووە، مافی خۆیانە پەرستگاکەیان نۆژەن بکەنەوە. بەپێی ئەو دەقەی کە لە نێو بەڵگەنامەکانی بارگای هەگمەتانەدا دۆزراوەتەوە، داریووش فەرمانی سازکرانەوەی داوە، بەڵام ئەم تەمایە کارێکی وای نەکرد کە زەبروزەنگ دژی باڵی داودییەکان خاو بێتەوە یان کاهینێکی گەورە نەکاتە سەرۆکی کۆمەڵەی جوولەکان. بەم شێوەیە حکوومەتێکی دینی بەدی هات و کەڵتە و نۆژەنکرانەوەی پەرستگا دەستی پێکردەوە و ساڵی ٥١٥ی پ.ز. کۆتایی پێهات. ئا بەم جۆرە تەناهی باڵی بە سەر ڕێگای میسر کێشا.

ئاوا ئیمپراتۆری سەرلەنوێ گیرایەوە و سپای بچووک و وەفاداری داریووش توانی یەکییەتی و ڕێکوپێکی وڵات بەدی بێنێ و لە میسرەوە تا سەیحوون بکەویتە نێو چوارچێوەی قەڵەمڕەوێک. داریووش کە لە دوایین هەڵمەت و پەلاماری کووورووشدا، لاوێکی نێزەدار بوو، لە سەردەمی کەمبووجییە و هێرشەکەیدا بۆ سەر میسر ببوو بە سەرکردەی دەهەزار کەسەی گاردی جاویدان، کە پاسەوانانی پاراستنی پادشا بوون. پاش نەمانی کەمبووجییە، هەلەلا و چەپڵەڕێزانی سەرکردەکانی ئەو هێزە و کۆنە سەربازانی، بوونە پشتیوانی کاتیی بە پادشا هەڵبژێرانی و تێکڕای هاورکێفانی سەریان وەبەر هانی. داریووش چاکەی ئەم سپا هەڵبژاردەیەی لە چاویدا بوو، چونکە هاوڕێیانی ڕێبەری سەرکەوتوو کە یاریدەری پەلامارەکانی بوون، هەتا ئەمڕۆش ناویان لە هێندێک وڵاتی پادشایەتیدا پارێزراوە. داریووش هەر کۆشکێکی تازەی کە سازی دەکرد، جا چ لە شووش بووبا یان تەختیجەمشید، دەستووری دەدا هەتا بە جوانترین شێوە دیمەن و قەڵافەتی ئەم چەکدارانە لەسەر بەردان داتاشرێن (و ٣٦). دیمەن و قەڵافەتی سەربازانی ئەم سپایە لەسەر کاشیی ڕەنگ شین و سینەی دیواری کۆشکان کێشراونەوە و یادیان بۆ داهاتووان وەک یادگاری هەتاهەتایی ماوەتەوە.

### دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی

ئاوری ئەو ئاژاوانەی کە بۆ ماوەی چەند مانگێک، کەموزۆر سەرلەبەری ناوچە و هەرێمە بەربڵاوەکانی ئیمپراتۆریی داریووشی گرتەوە، وەکوو جرینگەی زەنگی مەترسی وابوو. شکستهێنانی هەڵوێست و ڕێبازی یەکجار ئازادبیرانەی کووورووش، پێویستی بە ئاڵوگۆڕ و پێداچوونەوە بوو لە بواری بەڕێوەبردنی وڵاتەوە و بە گوێی پادشای گەنجیدا دەچرپاند کە دەبێ حکوومەت لەسەر

بنەمایەکی پتەوتر دامەزرێنێ. مەیل و تاسەی ئازادیخوازانەی تێکڕای هۆز و نەتەوەکان لە جەنگەی ڕووداوەکانی دواییدا سەلماندوویانە کە پادشا تەنیا دەتوانێ پشت بە هۆزی پارس ببەستێ، کەوایە ئەوان دەبوو بووبانە ئاغا و کوێخا و بەڕێوەبەری سەرتاسەری ناوچە و هەرێمەکانی نێو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆری. هەر بۆیە جگە لە چەند هەڵکەوتێک نەبێ سەرکردەکانی هۆزی پارس، زەویوزارێکی بەربڵاوی بەرێژەویان باربوو دەکرێ و وەکوو عەرەبەکانی سەرەتای ئیسلام، باج و پیتاکیان پێوەنابەسترێ و دەکرێنە کەللا و کەیخودای دامودەزگای تازە کە بە مەبەستی دابینی بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆری وەبەرچاو گیراوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، دەبێ بزانین کە ڕەچاوکرانی ڕێبازێکی بەزەبروزەنگ و ملهوڕانە لە ئارادا نەبوو، چونکە وەدی هاتنی مەبەستێکی ئاوا نەگونجاوی دەنواند، لەبەروەی کە هۆزی باڵادەست لەچاو کۆمەڵانی بەردەست و بەزیو، لەوپەڕی کەمایەتیدا بوو. لەم ڕەوتەدا ڕێبازێکی ئاوەزمەندانە ڕەچاو دەکرێ. هەر نەتەوەیەک زمان، داب و نەریت، ڕێوشوێنی نێوخۆیی، دین و هونەری خۆی دەپارێزرێ و دەبێ نەکەوێتە پێشێل کردنی بەرژەوەندییەکانی ئەو وڵاتەی تێیدا بەشدارە و سەر وەبەر فەرمانی ئەو پیاوە پارسییە بێنێ کە نوێنەری پادشای گەورەیە و حکوومەتی بە سەردا دەکا. بەم شێوەیە قەڵەمڕەوی شاهانشایەتی دەکرێتە بیست هەرێم و هەرکامەی میرهەرێم یان « پارێزەرانی حکوومەت»یان بۆ دیاری دەکرێ (ق ٥٤). زۆربەی ئەم پایەبەرزانە لە نێو مەزنەوەجاخانی پارسی و تەنانەت خزمانی خودی پادشا هەڵدەبژێردران و لە کارەکانیاندا ڕاستەوخۆ وڵامدەرەوەی ویست و ئامانجەکانی پادشا بوون.




ق٥٤- هەرێمەکانی شاهانشایەتی لە سەردەمی داریووشدا

هەڵبەت لە زەمانی کووروش و کەمبووجییەدا، چەند هەرێمێک [ساتراپییەک] بەدی هاتبوون، بەڵام داریووش پەرەی پێدان و سەرانسەری قەڵەمڕەوی حکوومەتی لەم دابەشینە هەڵنەبوارد و بە مەبەستی هەس‌دانەوەی هەر چەشنە هەڵگەڕانەوەیەکی لەناکاو، بنەما و دارولەلەی جیاوازی بۆ دانان. داریووش لە پاڵدەستی هەر میرهەرێمێک، سەرکردەیەکی بۆ تێکڕای هێزە چەکدارەکانی هەرێمەکە دانا، کە ئەویش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرپرسیار بوو لە حاند پادشا. شان‌بەشانی ئەم دوو کەسە پایەبەرزە، کەسێکی دیکەشی دانا و کردنی بە سێ. ئەم پلەدارە بەرپرسی کۆکردنەوەی پیتاک بوو. بەپێی فەرمانەکانی میری، هەر هەرێمێک دەبوو لە پای سامانی خۆی، هەموو ساڵێک بڕێکی دیاری کراو بنێری بۆ خەزێنەی پادشا، کە سەرجەم دەبوو بە ١٤٥٦٠ تالانی زێو[1] و سێ‌یەکی هەرێمی هیند دابینی دەکرد. جگە لەم نەغدینانەی بە زێڕ و زێو دەیاننارد، هەرێمەکان دەبوو شتی دیکەش بکەنە دیاریی دەستی خۆیان کە بریتی بوون لە: ئەسپ و مەڕ و ماڵات و بژیو. ئەوەی دەچوو پێداویستییەکانی هەزاران کەسی بارگای میری پێ دابین دەکرا یان دەکرایە مزەی هێزی هەرێمەکان یان ئەوانەی چووبوونە شەڕ. لێرەدا دەبێ لە بیرمان بێ کە هەرێمی بابل بە تەنیایی ئازووخە و بژیوی سێ‌یەکی ساڵی دابین دەکرد.

هەر میرهەرێمێک قەڵەمدارێکی هەبوو کە گوێی لە هەست‌وخوست و ئاکاری ڕادەگرت و کاری پەیوەندیی نێوان ئەو و دەسەڵاتی ناوەندیی دەکەوتە سەر شانی. چاوەدێریی هەر بەوەندە نەدەبڕایەوە. کۆمەڵێک بەرپرس هەبوون کە پێیان دەگوتن «چاو و گوێی پادشا» و تەواو سەربەخۆ بوون و دەگەڕان و

---

١- تالان بریتییە لە یەکەیەکی کێشان لە نێو یۆنانییەکان‌دا و تالانی ئاتیک نیزیکەی ٢٦ کیلۆیە. هەروەها تالان یەکەی سکەی زێڕ و زێویش بووە.م.

دەکەوتنە پشکنین و ئەگەر پێویست بووبا هێزێکیان دەخراتە بەررکێفی و بە چوار قورنەی قەڵەمڕەوی میری‌دا دەسوورانەوە و لەپڕ خۆیان بە کاربەدەستان نیشان دەدا و بە کاروبارییان‌دا دەچوونەوە. ئەم شێوازەی داریووش دایهێنا، کەوتە بەر تاریفاتی گەورەپادشایانی دنیای کۆن و« شارلێمانی»ش بە مەبەستی دابینی پەیوەندی و لێکدانەبڕانی هەموو جومگەکانی حکوومەتی خۆی، ڕەچاوی کرد. ئیمپراتۆری فەرانسە، هەموو ساڵێک کۆمەڵێک بەرپرسی بە ناوی «نوێنەرانی ئیمپراتۆر» دەناردە گۆشە و کەناری وڵات، هەتا چاوەدێر بن بە سەر کاروباری دامودەزگای خۆجێیی‌دا.

داریووش بۆ بەدی هێنانی حکوومەتێکی نەتەوەیی و کۆدەسەڵات و بەهێز، لە ئیمپراتۆرییەکی بەربڵاوی پێکهاتووی کۆمەڵێک هەرێم و وڵاتی پێکەوە جیاوازدا کە بە سەرکەوتنی جێی سەرسوڕمانی هێزەکانی، هەمووی لە جەغزێک‌دا کۆکردبوونەوە، ئەرکێکی قورسی کەوتبووە سەر شانی. دامەزرانی سیستمی دەرەبەگایەتی [ئاغا و ڕەعیەتی] لە ڕۆژگاری کووروووش‌دا، ئاڵوگۆڕی بە سەر هات و کەوتە سەر ڕەوڕەوەی چەشنێک حکوومەتی ئیداری و دارایی و بەو حاڵەشەوە ڕێزی بۆ هەموو نەتەوەکان دادەنا. لە لایەکی دیکەوە، ئێران تەنیا بە دامەزراندنی دامودەزگایەکی ئاوا توانی یەکییەتیی خۆی دابین بکا. سلۆکییەکان وێنەیان لەم شێوازە هەڵگرتەوە و کاریان پێکرد و خاڵە لاوازەکانیان وەلانا.

بە مەبەستی لێکدانەبڕانی پەیوەندیی نێوان ناوەندەکانی ئیمپراتۆری و پایتەختەکانی، ڕایەڵەیەکی بەربڵاوی ڕێگا و جێوچانی پێویست سازکران و هێندە بەرێوجێ بوون کە بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ لەم وڵاتەدا مانەوە. ڕایەڵەی ڕێگاوبانان کە لە پلەی یەکەم‌دا بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری دەزگای بەڕێوەبەرایەتی بوون و دەپارێزران و چاوەدێری دەکران، بوونە ڕێی هاتوچۆی کاروانی

بازرگانی و گۆڕینەوەی خێرا و بەرچاوی کاڵا و کەلوپەل و پێکەوە بەستنەوەی تـوخم و تۆرەمـەکانی جـەغزی دەسـەڵاتی فەرمانڕەوایـەتی و بـەدی هـاتنی ئاڵوگۆڕێکی تازە. ڕەنگە ئێستاش بکرێ لە چەند شوێنێک، ڕەوگـەی تێپەڕینی ڕێگای شـاهی دەستنیشـان بکرێ. ئـەو شـاڕێیەی کـە لـە شووشـەوە دەسـتی پێدەکرد و پاش تێپەڕین بـە ڕووبـاری دیجلـە و بـەرەوەی ئـەربێل [هـەولێر]دا، ڕووی دەکردە حەرران و لـەوێوە دەچـوو بـۆ «سـارد»، زۆر بەناوبانگ بـوو، چونکـە دەخوشـی و دەگەیشـتە ئێفێسـووس. درێژاییـی ئـەم ڕێگایـە سـەری دەگەیشـتە ٢٦٨٣ کیلـۆمیتر و ١١١ وێسـتگە و جێحەسـانەوەی تێـدا بـوو، کـە هەمیشە ئەسپی تازەپشوویان لێ بوو بۆ نێردراوان و نامەبەرانی حکوومـەتی. بەپێی کۆمەڵێک بەڵگە و شـانیک، کاروانـەکان بـە نـەوەد ڕۆژان ئـەم ڕێگایـەیان دەبڕی و نامەبەرانی میری بە حەوتوویەک دەیانتەقاند.

ڕێگای کـۆنی بـابل بـەرەو میسر کـە بـە «کارکێمیش»دا تێدەپەڕی[1]، نۆژەن کرایەوە و خرایە سەر ڕێگای بابل بۆ حۆلوان و بێستوون و هەگمەتانە (ئیکباتان = هەمەدان). پاش سەرکەوتنی تازەی ئیمپراتۆری لە باڵی ڕۆژهەڵات، ئەم ڕێگایە هەتا شیو و دۆڵی کابولی سەروو ڕۆیی و لـەوێوە بـە شـانـی ڕووبـاردا هـەتا دەرە و دەشتی سیند گیرنەبوو. شانبەشانی ئەم ڕێگا بەربڵاوانەی حکوومەتی، ڕێگایەکی تەسکتر، بەڵام پێوست بۆ هاتوچۆی بارگای میری لێدرا کە هەمیشە لە بزووتن‌دا بـوو. یـەکێک لـەو ڕێگایانـەی باسیان کـرا، ڕێگـای شووشـە بـۆ تەختیجەمشـید کـە چەنـد بەشـێکی سـەنگچن‌کراوی لـە لای «بێهبـەهان» دۆزراوەتەوە. لەسەر ئەم ڕێگایە و نیزیکی « فەهلیان»، هێشتاش ئاسـەواری کاول و هەرەسی جێحەسانەوەیەکی کاتیی میری وەبەرچاو دێ کە لەسـەر

---

1- کەرخێمیش ، کارخێمیش

شێوازی ڕەسەنی شووشی یان تەختیجەمشیدی سازکراوە و کۆڵەکەی بەردی بۆ داتاشراوە. لە نێوان « فەهلیان» و «بیشاپوور»دا[1]، ڕێگاکە بە شانی چەپدا لێدەهاڵاوە و بە «دەروازەکانی پارس»دا دەگەیشتە بانووی ئێران. ڕێگایەکی دیکە بە لوڕستاندا تێدەپەڕی و شووشی بە هەگمەتانەوە دەبەستەوە کە پایتەختی هاوینە [یان هاوینەهەواری بارگا] بوو.

### شەڕ و پەلامارەکانی داریووش

نەبوونی سەرچاوەی دەوڵەمەندی مێژوویی، دەبنە کۆسپی سەر ڕێگامان کە نەتوانین بە شێوەیەکی ورد سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی سەردەمی سەرکەوتنەکانی کووروش دیاری بکەین. زۆربەی توێژەران دەیسەلمێنن کە توانیویەتی هەتا «گەندارە» یان ناوچەی «پێشاوەر» بڕوا، ئەگەرچی وێناچێ کە هەڵمەتی داریووش دژی هەرا و سەرهەڵدانەکان لە ناوچەی کابول واوەتر چووبێ. ئەم پەلامارەی داریووش کە دەگەڕێتەوە سەرەتای دەسەڵاتی، دەبێ ماوەیەک دواتر گیرانی ناوچەی «گەندارە» و تێکڕای هیندی خۆرنشین و دەرە و دەشتی«سێند»ی هەتا ئاورێژگەی، لێکەوتبێتەوە. لەو جێگایەی ڕووباری کابول و سێند تێکەڵ دەبنەوە و دەبێتە نیزیک شاری «کەسپاپیرۆس»، داریووش فەرمانی دا پۆلێک گەمێ ساز بکەن. لەوێ دەریاوانێکی یۆنانی بە ناوی «سیلاکس کاریاند»ی کە دانیشتووی ئاسیای بچووک بوو، کردی بە فەرماندەی گەمییەکان و ناردی هەتا بە ڕووباری «سێند»دا بڕوا و ڕێگای چوونە میسر بدۆزێتەوە. ئەوە گەشت و گەڕانێکی گەورە بوو بۆ دۆزینەوەی ڕێگای دەریایی کە دەیتوانی سنوورەکانی خۆرهەڵاتی ئیمپراتوری بە باڵی خۆرنشینیەوە ببەستێتەوە و هەتا گەیشتە شوێنی مەبەست سی مانگی کێشا. جگە لەم هەنگاوە

---

١ـ بیهشاپوور. واتە شاپووری باش.و.

کە کارێکی سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی بوو، کۆمەڵێک ئامانجی بازرگانیش وەبەرچاو گیرابوون، کە زۆرجاران داریووشیان بۆ هان دەدا. کارێکی دیکەی داریووش بریتی بوو لە لێدانی نوێکەندێک کە دەریای سوور و ڕووباری نیلی بە یەکەوە دەبەستەوە و سەردەقی نوێکەندی سوئێزە؛ بەڵام دەبێ ئەوەندەش بزانین کە داریووش یەکەم کەس نەبوو هەوای ڕاکێشانی ئەم نوێکەندەی چووبوو لە کەللەیەوە. بەرلەوی «نێکائۆ»ی فیرعەونی میسر، کارەکەی دەستپێکردبوو، چونکە دەیهەویست لقی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری نیل بگاتەوە «زرێبارە سوێرەکان» و ئاوا بەم شێوەیە کەشتی بتوانن لە دەریای سوورەوە بچن بۆ دەریای مەدیتەرانە و وەکوو دیارە داریووش درێژەی کاری «نێکائۆ»ی داوە.

لە قۆناخی دەمکوتی ئاژاوەکاندا، داریووش هەلی دەستێوەردانی لە کاروباری ئورووپادا بۆ ڕەخسا. وەکوو باسمان کرد «ئۆرۆتێس»ی میرهەرێم بەرلەوەی دەسەڵاتی لێوەربگیرێتەوە و بە فەرمانی پادشا بکووژرێ، خاشەی «پۆلیکراتێس»ی حوکمداری ملهوڕی «سامۆس»ی کێشابوو. برای پۆلیکراتێس هاواری وەرگرتنەوەی پلە و پێگەی براکەی بردە لای داریووش و ئەویش لێی سەلماند. ئەم یەکەمین دەستێوەردانەی داریووش لە کاروباری یۆناندا، سەردەقی ڕێبازێکی بۆ شکاند کە بتوانێ خۆی لە کاروباری ئورووپا هەڵقوتێنێ. ئەوەی ڕاستی بێ، پادشا لە جەنگەی یەکەم پەلامار و تێکهەڵچوونیدا لە خۆرنشینی گەرووی [بۆسفۆر و داردانێل]، ئامانجی گرتنی یۆنان نەبووە، بەڵکوو ویستوویەتی زەبر لە سەکاییەکانی باڵی باشووری ڕووسیا بوەشێنێ.

دەبێ چ هۆکارێک داریووشی هان دابێ کە خۆی بۆ هێرشێکی وەها سامناک لە ناوچە و مەڵبەندی ئاوادا خۆش بکا، کە هیچ شتێکی هێندەی هێرۆدۆتی

دەربارەی نەدەزانین کە نیوسەدە دواتر کەوتە گێرانەوەی ڕووداوەکانی؟! بێگومان وەکوو هەستی پێدەکرێ پەلاماردرانی دواتری یۆنان لە لایەن هێزەکانی پادشای گەورەوە لە داهاتوودا، دەبێ بە هۆکار دابندرێ. داریووش دەیهەویست لە دواوەڕا هێرش بەرێتە سەر «باڵکان» و کارێکی وا بکا کە تازە یۆنان دەستی بە دار و تەختەی ئەوێ ڕانەگا بۆ داکوتانی گەمێ. داری باڵکان بۆ یۆنان بە کوولەکەی ڕووحی دادەندرا و بێ ئەوان جووڵەی بۆ نەدەکرا و دڵی لێی نەدەدا. وەکوو دیارە یۆنان هەمیشە گەنمی پێویستی خۆی لە میسر و لیبی و بەتایبەت لە لێوارەکانی دەریای ڕەش دابین دەکرد کە ئەو کاتە هەموویان بە دەست ئێرانییەکانەوە بوون و لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە داریووش ویستوویەتی گەرووی دابینی گەنمی یۆنان لە بەستێنەکانی دەریای ڕەشدا ڕێکبکوشێ و زەبرێکی گورچووبڕ لە دوژمنی داهاتووی بوەشێنێ.

ڕەنگە بکرێ ئەم هێرشەی داریووش بۆ سەر سەکاییەکان لەگەڵ فێڵوفەندی ئەسکەندەر بەراورد بکرێ کە پاش سەرکەوتن بە سەر پارسەکاندا، ڕاستەوخۆ ڕووی نەکردە ئێران، بەڵکوو ئەسپی بە مەبەستی گرتنی سووریا، فنیقییە، فەلەستین و میسر، تاودا. ئەسکەندەر هەنگاوێکی لووتبەرزانەی هاویشت بۆ گەمارۆدانی ئابووریی ئێران و نەیهێشت دەستی بە ناوچە هەرە پڕ بەرهەم و دەوڵەمەندەکانی ڕابگا. وێدەچێ داریووش ئامانجێکی دیکەشی لە بەرچاو بووبێ و چونکە زانیویەتی دەشتەکانی باشووری ڕووسیا بە شانی ڕووباری سەیحووندا دەکەونە پاڵەوپاڵی ئیمپراتۆریی ئێران، ئاوا ویستبێتی هەموو دەوارنشینانی سەر سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی کە ئاژاوەیان دەنایەوە، ئابلۆقە بدا. بێجگە لەمەش ئەگەر بێتوو سەرکەوتبا، هەوساری ئەو ناوچانەشی دەکەوتە دەستی کە ڕێگای ڕاگوێزرانی زێڕی کانگاکانی ئوورال و سیبیری بوون. ئەمە

گەلاڵەیەکی بەربڵاوی گەورە بوو کە دەکرا لەگەڵ قەبارەی ئێرانی بەهێزی تەیار بێتەوە. بەگوێرەی گێڕانەوەی سەرچاوەکانی یۆنانی، لە لایەن داریووشەوە نیزیکەی حەوسەدهەزار کەس بۆ ئەم یەکەم تێکهەڵچوونەی نێوان ئاسیا و ئورووپا وەبەرچاو گیران. پێشتریش کۆمەڵێک زانیاری سەبارەت بە ڕێ و ڕەوگەکانی دەریایی کۆکرابوونەوە. «دیمۆکدێس»ی پزیشکی بەناوبانگی داریووش، وێڕای پەلەگەمێیەک نێردرا هەتا هێندێک زانیاریی سەرەتایی سەبارەت بە بەستێنەکانی یۆنانی کۆبکاتەوە و وێدەچێ هەتا «تارانت» چووبێ. هێزێکی دیکە کە بریتی بوو لە سی گەمێ، بەشی خۆرنشینی ئاوەکانی دەریای ڕەشی پشکنی و پێیدا گەڕا. شاری بیزانس سەری وەبەر ئێران هێنا. داریووش پاش گیرانی خێرسۆنیس [تراکییە یان گالیپۆلیی ئەمڕۆ]، دەیتوانی شەڕ هەڵگیرسێنێ.

قۆشەنچییانی داریووش بەو پردەگەمێیەدا پەڕینەوە کە لە گەرووی بۆسفۆر هەڵبەسترابوو. ئاوا تراکییەی ڕۆژهەڵاتی و «گیتا» گیرا و پاشان کەوتنە پەیکەردەی سەکاییەکان و لەو پردە پەڕینەوە کە ئیێۆنییەکان لەسەر ڕووباری دانووب هەڵیانبەستبوو. پادشا پێوە بوو هەتا شەڕ و تێکهەڵچوونی دەریایی و زەمینی شانبەشانی یەکتر درێژە بدرێن، بەڵام لەبەر هەبوونی زۆنگاو و ڕووباران، قۆشەنی ویشکانی خێرایەکی لە هێزەکانی دەریاوانی دابڕا و بە دڵی ناوچەکەدا ڕۆچوو. سپای پیادەی ئێران لە نێو بازنەی گەمارۆی سەکاییەکاندا تێمابوو. هەر تاوەناتاوێک هێزەکانی سەکایی لێیان وەدەردەکەوتن و خۆیان لێ ون دەکردنەوە و ئاوا بە قوونەشەڕ تەنگیان پێهەڵچنیبوون و نەیاندەتوانی پێداویستییەکانی خۆیان لەو ناوچەیەی کە خەنیم بۆخۆی ئاوری تێبەردابوو، دابین بکەن. هێزەکانی ئێرانی کەوتنە تەنگەتاوی و داریووش بڕیاری دا

بگەڕێنەوە. هێرۆدۆت لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەم شەڕەدا، باسی هەڵبەسترانی هیچ پردێکی تازە ناکا لەسەر ڕووباری دانووب؛ جا هەر بۆیە وێدەچێ سپای ئێران بە «دنیستێر»دا تێنەپەڕیبێ.

بەم شێوەیە ئیمپراتۆریی ئێران تامی تاڵی یەکەم تێشکانی چێشت، بەڵام ئەم شکانە چەندەی هەست پێکرا؟ کوژران و تێداچوونی هەشتاهەزار کەس لە مەیدانی شەڕدا بۆ دەسەڵاتێکی کە دەیتوانی هێزێکی دە هێندە کۆبکاتەوە، دەشیا قەرەبوو بکرێتەوە؛ بەتایبەت کە دەسکەوتێکی زۆریشی لێکەوتەوە. پاش گیرانی تراکییە (تراس) و چوونی بۆ نێو جەغزی دەسەڵاتی پادشایەتی و پێمل‌بوونی مەقدوونییە، ئاسیا گەیشتە شانەوشانی ئورووپا. داریووش لە نێو دەقی بەردەنووسەکانی‌دا، کاتێک باسی هۆز و نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی دەکا، ناوی سەکایی‌یەکانی ئەوبەری دەریا دێنێ، کە ڕەنگە مەبەستی هۆز و نەتەوەکانی باشووری ڕووباری دانووب بێ.

ئێرانییەکان سەرلەنوێ بە «داردانێل»دا[1] پەڕینەوە و درێژەیان بە سەرکەوتنەکانی خۆیان دا و ناوچەکانی لێواری دەریایان بە دوای یەکتردا گرتن و بەم شێوەیە بەشێک لە ئامانجی پەلامار بۆ سەر سەکایی‌یەکان وەدی هات. ئاوا جێگاپێیەک بۆ هێرشەکانی دواتر خۆش کرا. داریووش لەم گەرمەی هەرایەدا توانی دەست بە سەر ناوەندی بازرگانیی گەنمی «پێنتی»دا بگرێ و ئەمە بە دەسکەوتێکی گرینگ دادەندرا. داریووش ئێستا ببوو بە فەرمانڕەوای بەشی هەرە زۆری دنیای یۆنانی و بە مەبەستی دابین‌بوونی بەرژەوەندییەکانی و ئەو کارانەی هەتا ئێرە کرابوون، گیرانی سەرتاسەری یۆنانی بە پێویست دەزانی.

---

١ـ هێلێسپۆنت

یۆنانی ئەگەرچی کەوتبوونە بەر شەپۆلی هەڕەشەی دەرەکی، بەڵام دیسانیش یەکیان نەگرت. دوژمنایەتیی کۆنی نێوان ئاتێن (ئەسینا) و ئیسپارت، چاوی باڵی دێموکراتی دەسەڵاتداری ئاتێنی کوێر کردبوو، هەر بۆیە سیاسەتی ئەم وڵاتە هیچ تررووسکەیەکی جووڵە و پێشکەوتی تێدا بەدی نەکرا. ئاتێن کە زۆری ئێران ناخۆش دەویست و دژی بوو، لەبری پێکهاتن لەگەڵ ئیسپارت، پێمل بوون بۆ داریووشی بە باشتر زانی و بۆ ئەم مەبەستەش باڵوێزێکی ناردە شووش. لەم کاتەدا چەند ڕووداوێکی تازە لە یۆنان قەومان و کارێکی وایان کرد کە وتوویژەکان دابېڕێن و دێموکراتەکان و «هیپیاس»ی حوکمدار، لەسەر دەسەڵات نەمێنن و بارزە بن. ئەوەی ڕاستی بێ، هەڵوێست و سیاسەتی ئێران ئەم ڕووداوەی وەڕووی خۆی نەهێنا و میرهەرێمی پارسی لە تەختگای خۆیەوە لە ئاسیای بچووک، هەوڵی دا بارودۆخەکە هێور بکاتەوە و ڕێی گەڕانەوەی هیپیاس بۆ سەری تەختی دەسەڵاتی ئاتێن خۆش بکا. لەم کاتەدا یەکەم بارە زێڕی ئێران گەیشتە یۆنان و سیاسەتوانانی شارەزا و فێڵاویی ئاسیایی داروپەخشیان کرد و ئاوا داریووش توانی دەست بخاتە نێو کاروباری یۆنانەوە، بەڵام ئاتێن دژکردەوەیەکی توندوتیژی نواند، کە ئێران هەرگیز چاوەڕوانی هەڵوێستێکی ئەوتۆ نەبوو. ئاتێن پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئێران تێکدا و چووە نێو ڕیزی دوژمنانی.

ئیۆنییەکان وەختایەک لە یۆنان بە گڕێ و گرفتەکانی ئێرانیان زانی، خۆیان نواند و بە هیوای یاریدەی یۆنان، کە وێدەچوو یەکپارچە و یەکانگیر دژی پادشای گەورە چەقیوە، لێبڕان هەتا نیری ئێران لەسەر ئەستۆی خۆیان لابەرن. ڕاپەڕینی ئیۆنییە پەردەی لە بەر نەما و ملهوڕانی داسەپاوی پارسەکان هەیدێیان لێکرا و دەرپەڕێندران. «یەکییەتیی ئیۆنی» پێکهات و بەڵێنیی

یارمەتییەکانی یۆنانییانی ئورووپاش وەڕاست گەڕا. کەمبوون کەسانێکی وەکوو «هێکاتێئووس»ی مێژوونووس، کە لەبەروەی دەیانزانی ئێران چەندە بەهێزە، دووشک بوون سەبارەت بە سەرکەوتنی یۆنانییەکان. دەنگی ئەمانــە لـە نێو قریوە و چەپڵەڕێزانی هیوادارانی سـەرکەوتندا، بزر دەبوو. ئیسپارت هێزی یارمەتیدەری نارد و یۆنانییەکان «سارد»یان گرت، بەڵام دیسانیش جەرگەقەڵای دەستی نەدا. ئەمە یەکەم هەنگاوی سەرکەوتنێکی کەمخایەن بوو، چونکە هێزەکانی ئێرانی بە پرتاو بەرەو «سارد» جمین و زەبریان لە سەربزێوان وەشاند و لەو شارەیان دەرپەڕاندن. لەم کاتەدا شەڕی نێوان ئاتێن و ئێژینا (ئێگینا) قەوما کە تێکرای یۆنانییەکانی ئورووپا تێیدا بەشدار بوون، چونکە ئێژینا هەمووی دەرپەڕاندبوون و خەڵکی شارە ئورووپایییەکانی کەنار دەریا و قوبروسی لێ بنەگر کردبوون. قەومانی شەڕی سالامیس (٤٩٨ی پ.ز)، لەگەڵ شەڕی مارسیاس (٤٩٧ی پ.ز)، کە مەودایەکی وایان تێنەکەوت، بۆ هاوپەیمانان کارەساتبار بوون. سەرهەڵدان لە کوڵوکۆ کەوت و شارەکانی یۆنانی داگیر کران. لە نێویاندا مێلیت (مەلەتییە)، دوو ساڵی خۆڕاگرت و کاهینی پێشگۆی ئاپۆلۆن تێیدا سووتا و خەزێنەی پەرستگا لەگەڵ پەیکەرەی ئاپۆلۆن و کوتێکی مەفرەقی کە شێوەی یەسکی ڕانی دەدا و بە پیرۆز دادەندرا، بەڕێکران بۆ شووش. پەیکەرەی ئاپۆلۆن بۆ ماوەی دوو سەدە لە شووش مایەوە و سەرەنجام ساڵی ٢٩٤ی پ.ز. بە فەرمانی سلۆکووسی یەکەم نێردرایە میلنێزیان (میلێنزیان) و ئەو کوتە مەفرەقەی باسی کرا لە لایەن شاندی شوێنەوارناسیی فەرانسەوی لەو شارەدا دۆزرایەوە. دانیشتووانی شاری مێلیت بە دیل گیران و نێردرانە شووش و ئاخرییەکەی لە ڕێژاوگەی ڕووباری دیجلە نیشتەجێیان کردن. پەلەگەمێیەکانی ئێران درێژەیان بە سەرکەوتنە بێ گرێ و لەمپەرەکانی

خۆیان دا. خیۆس و لێسبۆس گیران و کوڕانی گەنجیان یەختە کردن بۆ کۆشک و سەرایان و کیژانیان بردن بۆ حەرەمخانان. بیزانس و کیزیکووس (کووزیکووس) سووتێندران و ئییۆنییەکان کە هەتا ئێستا زۆر شتیان بۆ دابین کرابوو، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی میرهەرێمێک. سەرکوتەکە ئەوەندە توند و تیژ بوو کە ئەم وڵاتە بۆ ماوەی دووسەت ساڵ دامان و تاسان. سەرەڕای هەژاری و بێدەرەتانی، دەبوو باج و خەراجێکی وا بدا کە بۆ هەرێمێکی ئاوا کاول، یەکجار قورس بوو؛ بەڵام هەر ئەو دەمەی کە یەکەمین بزووتنەوە و دژکردەوە ڕەنگی دایەوە، ئێرانییەکان زەبروزەنگیان کەم کردەوە.

ڕاپەڕینی ئییۆنییەکان بوو بە جێی پەسند و پێداهەڵدانی یۆنانییەکان و یاریدەدانی بێپسانەوەیان، هەر بۆیە ڕاست جەنگەی ئەوە هاتبوو کە ئێرانی دژی یۆنانییەکان وەخۆکەون؛ بەڵام چونکە باڵی دێموکراتی یۆنان، سەرەڕای هەموو شتێک، ژێردالدەبوونی پادشای گەورەی بە لاوە پەسند بوو، داریووش وای بە باشتر زانی کە سەرەتا ئەم باڵە بەهێز بکا و بۆ وەدی هێنانی ئەم مەبەستەش پایەبەرزترین پیاوانی وڵاتی خۆی ناردن، هەتا دێموکراسی لە یۆناندا خۆی بگرێتەوە. سەرەتا لە ئاسیای بچووکەوە شەشسەت کەشتی ڕوویان کردە یۆنان. ئێرانی هیوادار بوون کە بە هەڕەشەی گرتنی ئاتێن و ئێریتریا (ئێریتری)، یۆنانی خۆیان وەخۆ بکەون و باڵی پارێزگارانی دەسەڵاتدار لابەرن و سەریان وەبەر داریووش بێنن؛ بەڵام هەڵیکردە ڕەشەبا و بۆرانێک کە نیوەی کەشتییەکان لە نیزیک بەستێنی بەردەڵانی ئاتۆس تێکشکان و بیستهەزار کەسێک تێداچوون. سەرلەنوێ پەلامار دەستی پێکردەوە و داتیسی مادی کرایە دەریاسالار. داتیس لە یۆنان دابەزی و دەورەی «ئێریتریا»ی دا. دانیشتووانی ئەم شارە بریتی بوون لە باڵی دێموکرات و پارێزگار و لێبڕان کە بکەونە بەرەنگاری، بەڵام

خەیانەتێک شارەکەی بە گرتن‌دا. دەریاسالاری مادی لەوێ هەڵەیەکی گەورەی کرد و لەبری ئەوەی لە پیاوانی لایەنگری ئێران نیزیک ببێتەوە، پەرستگاکانی ئاورتێبەردان و شارەکەی خاپوور کرد و تێکڕای جەماوەرەکەی وەکوو کۆیلە ناردنە شووش. ئەم هەڵە گەورەیە هەست و بیری هەمووانی بزاوت و ئاگری توورەیی تێکڕای یۆنانییەکانی هەڵگیرساند و کارێکی وای کرد هەتا کێشە و هەرای نێو خۆیان وەلابنێن. یۆنانی کە تێگەیشتن ئەگەر بێتوو بشکێن، بە هیچ چەشنێک لێبووردن و چاوپۆشین نایانگرێتەوە، لێبڕان هەتا بە یەکگرتوویی بەرەوڕووی هێزی پەلاماردەر ڕاوەستن. هەر بۆیە کاتێک داریووش لە نیزیک ماراتۆن [ماراسۆن] لە کەشتی دابەزی، چاوی بە قۆشەنێکی ئاتێنی کەوت کە بێئەوەی لەسەر هاتنی هێزی یاریدەری ئیسپارت ڕاوەستن، لێی وەدەست هاتن و سەرکەوتنێکی جێی سەرسوڕمان و بەناوودەنگیان وەچنگ هێنا. ئێرانی بەزین و حەوت گەمێیان گیران و ئەوانی دیکەیان ڕەوین و پاشەکشەیان کرد (٤٩٠ی پ.ز). داریووش کە هەرا و ئاژاوەکانی میسر خەیاڵیان ئاڵۆزاندبوو، خۆی نەدایە دارشتنەوەی گەڵاڵەی هەڵمەتێکی دیکە بۆ سەر یۆنانییەکان. لە ڕاستی‌دا هەر ماوەیەکی کەم پاش شەڕی ماراتۆن ، میسر کە لە لایەن کۆمەڵێک سەربازگەی بەهێزی بێگانەوە دەپارێزرا و دەبوو باج و پیتاکێکی قورسیش بدا، ڕاپەڕی. داریووش کە ساڵی ٤٨٦ی پ.ز. مرد، نەیتوانی بەشداری تۆڵەی شکستی یۆنان بێ و نەبرانەوەی هەرا و ئاژاوەکانی میسری بە چاوی خۆی نەدیت.

خەڵکی ئێریتریا کە لە پێناو ئازادی یۆنان‌دا تووشی چەرمەسەری و کوێرەوەری ببوونەوە، لە شوێنێکی دەوروبەری شووش بە ناوی «ئاردێریکا»ی تەنیشت کانگا و کانی خوێ و قیل و نەوت، نیشتەجێ کران کە دەبێتە

خووزستان و هێرۆدۆت باسی کردوون. ئەوان لەوێ مانەوە و ڕیشەیان داکوتا و لە سەدەی یەکەمی زایینی‌دا، کاتێک ئاپۆلۆنیووس توانەیی[1] چووە سەردانیان، تەماشای کرد نەوە و نەتیژەکانیان هەر بە زمانی یۆنانی دەدوێن و ڕەسەنایەتیی خۆیان وەلانەناوە.

سەرکەوتنی ماراتۆن بۆ یۆنانییەکان ڕووداوێکی گرینگ و چارەنووس‌ساز بوو. ئەگەر بێتوو لەشکرێکی کەمی پیاوانی لێبڕاو و خوازیاری پاراستنی ئازادیی خۆیان و وڵاتەکەیان، بتوانن بەرەوڕووی سپایەکی زەبەلاحی بەهێزی پادشایەکی گەورە ڕاوەستن و گەمییە شەڕکەرەکانی پاشەکشە پێ بکەن، بێ‌گومان یۆنانێکی یەکگرتوو دەتوانێ هیوادار بێ کە لە داهاتوودا بکەوێتە بەرەنگاربوونەوەیەکی دلێرانەتر، چونکە لەشکرێکی ئاوا، تەماداره دەستی بەرنەداتەوە. لە ڕوانگەی ئێرانییەکانەوە شکستی ماراتۆن پتر بە شکانێکی دەروونی دادەندرا، چونکە نەیتوانی شوێنێکی ئەوتۆ بکاتە سەر سپای زۆر و زەوەند و خەزێنەی پڕ لە زێڕی ئێران. ئەم شکستە توانی گرێ و کۆسپ بخاتە نێو چواربەندەی دەسەڵاتی پادشایەتی و بوو بە نیشانەیەک بۆ میسرییەکان کە هەلەکەی گونجاوە هەتا دژی ئێران ڕاپەڕن. بەگشتی ئەم بەزینە بە هیچ چەشنێک نەیتوانی دەسەڵاتی ئێران بلەرزێنێ و ئەم ڕووداوە کە پاش خولێکی سەرکەوتن قەومابوو، لە ڕوانگەی داریووشەوە تەنیا ڕووداوێکی بێ‌دەرەتان بوو کە لە ماوەی ژیانی بەهێزترین هێز و نەتەوەکان‌دا دەقەوما.

### دەسکەوتە سیاسی و دادوەرییەکانی داریووش

کاتێک ئەسکەندەری گەورە بە پێداهەڵدانی دەسکەوتەکانی کووروش و داریووشەوە ڕووی کردە سەر گۆڕی دامەزرێنەرانی ئیمپراتۆریی ئێران، لەسەر

---

١ـ یەکێک لە فەرزانانی یۆنانی، ناسراو بە پۆلیناس.ب.

گۆڕی داریووش چاوی بە بەردەنووسێک کەوت و فەرمووی هەتا بۆی وەرگێڕن. سترابۆن دەڵێ دەقەکە ئاوا نووسرابوو: «من دۆستی دۆستەکانی خۆم بووم. من [پیاوێکی] هەرە سوارچاک، تیرهاوێژێکی هەرە سێرەڕاست و میری ڕاوکەران بووم. من لە هەموو کارێکم زانیوە.» ئەگەر بێتوو وەرگێڕەکە هەر لەڕێوە دەقەکەی ئاوا بە ناپوختیش وەرگێڕابێ، بەڵام دیسانیش ئەو ئەفسانەیەی کە دەبوو سەبارەت بە داریووش بپارێزرێ تێکینەداوە، چونکە دروشمی «من دۆستی دۆستەکانی خۆم بووم» بۆ داریووش، بۆتە بنەمای پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵک. بەردەنووسی داریووش لە بێستوون کە چەشنێک شایەتنامەیە هەر لەم هەستە پاکەوە هەڵقوڵیوە. بەزێنەری ئەو گشتە پادشا سەربزێوانە، ڕوونی دەکاتەوە کە هەر هۆز و نەتەوەیەکی بەرفەرمانی کە خۆی بە دۆست نیشان دابێ ڕێزێکی زۆری لێ گیراوە. ئەم پادشایەتییەی کە ئاوێتەی سۆزە و نیشانەی بەرزبوونی ڕووحی پێوە دیارە ، بەڵام دیسانیش خاوەن بڕشت و دەسەڵاتە. داریووش لە چەند ڕستەی دواتردا، ناوی تێکڕای هۆز و نەتەوەکان ڕیز دەکا و دەڵێ ئەوەی دەمویست بە ڕۆژ و بە شەو ڕایاندەپەڕاند. لێرەوە وادیارە کە ویستی پادشا وەکوو یاسا وایە و ڕەگەز و دین و داب و نەریتێکی تایبەت وەبەرچاو ناگرێ و هەموو لایەک ـ لە تراکییەوە هەتا سێند و لە قەفقازەوە تا ئوقیانووسی هیند ـ وەک یەک دەخوێنێتەوە. دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەک بەبێ هەبوونی چواربەندەی یاسایی سەر ناگرێ و داریووش لەم بوارەشدا کەمتەرخەمیی نەکرد.

ئەو توێژەرانەی کە توانیویانە گەلێک دەقی بەجێماوی داریووش بخوێننەوە و لە بێستوون، تەختیجەمشید، شووش و نەخشی ڕۆستەم لێیان وردبوونەوە، پێیان وایە کە ئەم دەقانە لەگەڵ «یاسای حەمووڕابی» خاوەنی خاڵی وێکچوون.

یاسای حەمووڕابی سەدان ساڵ لە ڕووی دەنووسرایەوە و ببوویە بنەمای کاری ڕاوێژکارانی داریووش.

دەقی تەواوی ئەم فەرمانانەی میری کە لەسەر بەردەتاش و بەردەنووسان تۆمار کراون، لەسەر تەتەڵە یان پاپیرووسان ڕوونووس دەکرانەوە و دەنێردرانە تەختگای هەرێمەکانی ئیمپراتۆری. بەگوێرەی ڕەوتێکی ئاوایە کە بەشێک لە نووسراوەکەی بێستوون بە زمانی ئارامی لەسەر پاپیرووس نووسراوەتەوە و لە ئێلێفانتێنی شوێنی دامەزرانی سەربازگەی بەکرێگیراوانی جوولەکە دۆزراوەتەوە یان لە بابل بە زمانی بابلی وەچنگ هاتووە. ئەو دەقەی کە داریووش فەرموویووی هەتا لە نەخشی ڕۆستەم لەسەر گۆڕەکەی هەڵکەندرێ، بە هێندێک ئێروئەوێوە لە شووش دۆزراوەتەوە و دەڵێ:

خودایەکی گەورەیە ئەهوورامەزدا کە ئاوی ئافراندن
زەوی و ئادەمیزادی ئافراندن و
چاکەی کردە باربووی ئادەمیزادی ئافراوی خۆی و
[داریووشی کردە پادشا]!
داریووش‌شا، شایەکی تاقانە لە نێو کۆمەڵی بەرچاوی شایان‌دا کە خاوەنی گەلێک فەرمانە.
من داریووشم، شای مەزن، شای شاهان
شای چەند ناوچەیەکی دنیا بە چەند زمانەوە.
شای ئەم هەرێمە بەربڵاوەی دەگاتە دوورەدەستان.
کوڕی ویشتاسب، هەخامەنشی،
پارسی، ڕۆڵەی پارسی.
داریووش‌شا دەڵێ:

**لە سایەی ئەهوورامەزداوە**

**من توانیومە لە دەرەوەی پارس**

**ئەم ناوچە و هەرێمانە بگرم و بە سەریاندا زاڵ بم و**

**ئەمانە هەموویان باجم بۆ دەنێرن و هەرچی داوایان لێ بکەم**

**گوێی بۆ شل دەکەن و دەیکەن و بڕیارەکانم ڕێزیان لێ دەگیرێ؛**

**[ئەمانە بریتین لە:]**

**ماد، عیلام، پارت، هەرات[١]، بەلخ[٢]. سۆغد، خارەزم، زرەنگ[٣]، ڕۆخج[٤]، سەتتەگووش[٥]، قەدوو[٦]، گەندارە[٧]، هیند، گیمریانی ئامیرگی[٨]، گیمریانی تیگرەخوودە[٩]، بابل، ئاشوور، عەرەبستان، میسر، ئەرمەنستان، کاپادۆکییە، سارد، یەمەن[١٠] کە کەوتۆتە تەنیشت... .**

**کە لەوبەری ڕووباری سوێرن، سکوودەرە، کەرسە.**

**داریووش‌شا دەڵێ:**

**هەر خراپەیەکی کرابوو، من بە چاکە وڵام دایەوە**

**ئەو ناوچانەی کە نێوانیان... یەکتریان دەکوشت، بە یاریدەی ئەهوورامەزدا، کارێکی وام کرد کە تازە یەکتر نەکووژن.**

**من هەرکامەیانم لە جێگای خۆی مەرزەم کرد؛**

**ئەوانیش سەریان وەبەر بڕیارەکانی من هێنا.**

**تازە بەهێز هەڕا ناکاتە بێ‌هێز و لێی نادا و تاڵانی ناکا.**

**داریووش‌شا دەڵێ:**

---

١- ئاریە، ئاریان، هەرەوی ٢- باکتەریا ٣- درەنجیان، درەنگی (سیستان) ٤- ئاراخۆزیا، ئاراخۆزی ٥- ساتاگیدی . سەتەگیدن، ساتاژیدی و ساتاجیدی (ئەفغانستانی ناوەندی) ٦- مەکی ٧- قەندەهار ٨- کیمریانی ئامیرگی، سکاییی ئەمیرگی ٩- سەکاییی کڵاوقووچ ١٠- ئییۆنییە

هیوادارم کە ئەهوورامەزدا و تێکڕای یەزدانەکانی دیکە پارێزەری
خۆم و خانەدان و ئەم بەردەنووسە بن.

وادیارە کە داریووش زۆری بایەخ داوە بە دابینبوونی دادپەروەری و ئەو یاسایانەی کە ڕەچاوی کردبوون، تەنانەت ماوەیەکی درێژیش پاش ڕووخانی حکوومەتی هەخامەنشی کاریان پێدەکرا. هێردۆدۆت دەڵێ: «دادوەرانی میری لە نێو پارسەکان هەڵدەبژێردران و هەتا ئەو ڕۆژەی دەمردن ئەرکی خۆیان ڕادەپەڕاند، مەگین لەبەر وەبەرچاونەگیرانی دادپەروەری لەسەر کار لادرابان. دادوەران لە دادگادا دەکەوتنە کاری داوەری و لێکدانەوە و شیکردنەوەی یاسای باو و بڕیاریان لەسەر هەموو تاوانێک دەدا.» بەڵام نەتەوە بەزیوەکان شانبەشانی یاساکانی داریووش، یاسا تایبەتەکانی خۆیان دەپاراست، وەک چۆن لە بابل وا باو بوو.

سەرڕاستی و دادەوانی دەبێ وەک بەرچاوترین تایبەتییەکانی سرشت و کەسایەتی و مەزنایەتیی داریووش دابندرێ کە لە زۆر دەقی خۆیدا خەڵکی بۆ ڕادەسپێرێ. ئەم خاڵانە لەگەڵ هەستی نەتەوایەتی تێکەڵ دەبن و وەکوو دیارە بەرلەوی، لە ئیمپراتۆرییە کۆنەکانی خۆرنشیندا، نموونەی وەبەرچاو نایە.

«ئەهوورامەزدا یاریدەی دام و تێکڕای یەزدانەکانی دیکەش.
هیوادارم ئەهوورامەزدا وڵاتەکەم لە پەلامار و ویشکەساڵی و درۆ بە
دوور بگرێ و قاتیوقڕی و درۆ و پەلامار دژی ئەم وڵاتە نەکەونەڕێ.
هاوارم بۆ دەرگای ئەهوورامەزدا و تێکڕای یەزدانەکانە و
ئەهوورامەزدا و پۆلی یەزدانەکان ئاواتم وەدی دێنن.»

ئەم هەستەی نەتەوایەتی کە ئاوا بە شێوەیەکی خەستوخۆڵ لە ناخ و دەروونی پادشادایە، مەبەستێک نییە هەر تایبەت بە خۆی؛ چونکە پادشا بە دوای

خێروبێری وڵاتێکدا دەڕوا کە چارەنووسی ئەوی خراوەتە بەردەستی و بەپێی ویست و یاریدەی خودای مەزن بەڕێوەی دەبا. تەواوی پارسەکان ئاوا نیشتمانپەروەر بوون. هێرۆدۆت دەڵێ کەسێکی پارسی قەت هەر بۆ چاکەی خۆی لە بەر خودا ناپاڕێتەوە و بەڵکوو «دۆعا دەکا بۆ پادشا و بەختەوەربوونی هەمووان و لەم پاڕانەوەیەدا خۆی بە ئەندامێکی کۆمەڵی خۆی دەزانێ.» ئەم بۆچوونە دەگەڕێتەوە سەر ڕەوشتێکی پەروەردەکراوی نەجیمانە و گەشە دەدا بە ویژدانی نەتەوەیەک کە دەور و ئەرکی نەتەوەی سەروەری وەئەستۆ گرتووە.

**دین**

«یەزدانێکی گەورەیە ئەهوورامەزدا و لە هەموو یەزدانەکان مەزنترە. ئەو زەوی و ئاسمانی ئافراندوون. مرۆڤەکانی ئافراندوون. ئەو مرۆڤی دانیشتووی زەمینی بە سەر کردۆتەوە. ئەوە کە شاداریووشی کردۆتە فەرمانڕەوای ئەم سەرزەمینە بەربڵاوەی کە بریتییە لە چەند وڵاتێکی وەکوو پارس و ماد و نەتەوەکانی دیکە کە هەرکامەی خاوەنی زمانی خۆیانن. پڕە لە چیا و دەشت و لە لایەک سەری دەگاتەوە دەریا و لە لایەکەی دیکەوە هەتا بیابان دەڕوا.»

بەم شێوەیە ئەهوورامەزدا، یەزدانی مەزنە و هەموو شتێکی خوڵقاندووە و چاکەی هەموو بوونەوەرێکی دەوێ و ژیانی دابین دەکا. ئەو پادشایەی کە خۆی هەڵیبژاردووە و دەسەڵاتی پێداوە، بە ویست و مەیلی خۆی دەبێتە ڕێنوێنی. پادشای هەخامەنشی بە ناوی خۆیەوە شمشێری لە ناوچە دوورەدەستەکانیش، نەوەشاندووە، بەڵکوو لە پێناو فەرمانەکانی یەزدانیدا، هەڵسووڕاوە و کردەوەکانی پادشا، جێی پەسند و ڕێپێدراوی یەزدانی گەورەن. ئەم کار و هەنگاوە نیشانەی پێملبوونی بێلاموجوومە. ئێرانی سەردەمی هەخامەنشی لەسەر تەوەرەی دین هەڵدەسووڕا، هەروەک چۆن لە ڕۆژگاری خەلیفەکانی

عەبباسی‌دا وابوو. ئەگەر سەرچاوەی دەسەلاتی داریووش یەزدانە، بەلام مەبەستێک بە شێوەی بڕواداربوون لەسەر پێڕوشوێنی دینێک لە ئارادا نەبووە. هیچ باسێک سەبارەت بە پەسن و پەرستنی پادشا نەهاتۆتە گۆڕ، بەلام هەر ئەوەندەی کە شا بە ویستی ئەهوورامەزدا لەسەر تەختی دەسەلات پالی داوەتەوە، بۆتە هۆی بەدی هاتنی چەشنێک یەکانگیری لە نێو دنیای ئێرانی‌دا.

ئەهوورامەزدا، یەزدانێکی تاقانە نەبووە و داریووش لێکدالێکدا چەندپاتی دەکاتەوە. ئێمە لە ڕووی نووسینەکانی هێرۆدۆتەوە وامان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئێرانییەکان خۆر (میترا = میهر)، مانگ، زەمین (زەم)، ئاگر (ئاتەر)، ئاو (ئاپامنەپات) و با (ڤەهیوو)یان پەرستوون. لە دەقی بەردەنووس و تەتەلەکانی داریووش و دوو کەس لە جێنشینەکانی‌دا، ناوی هیچ یەزدانێک بێجگە لە ئەهوورامەزدا نەهاتووە و ڕەنگە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان‌دا، جیاوازی هەبووبێ لە نێوان دینی ڕەسمی و دینی جەماوەردا. لە ڕۆژگاری ئەردەشێری دووهەم‌دا دینی ڕەسمی، ناوی کۆمەلێک یەزدانی شان‌بەشانی ئەهوورامەزدا برەو پێداوە کە بریتین لە: میترا (مێهر = میسرە)، یەزدانی خۆر، یەزدانی بەلێن و پەیمان، کە یەکێکە لە کۆنترین یەزدانەکانی ئێرانی؛ هەروەها ئاناهیتا، خاتوونەخوای ئاوەکان و بەرهەم و ڕێژەوی زەوی‌وزار، کە مۆرکی بیروباوەڕی نائێرانی بوونی پێوە دیارە.

ئەم دینە فەریکەی ئاریایی کە لەسەر تەوەرەی چەندخودایەتی هەلدەسووڕا و تێکڕای توخمەکانی سروشتی تێدا دەپەرسترا، ناکرێ نەکەوتبێتە ژێر باندۆری خودایانی دانیشتووانی بانووی ئێران. هەروەک چۆن یۆنانییەکان لە یۆنان کەوتنە ژێر کاریگەریی تیرە و هۆزەکانی بە ڕەسەن خۆمالی، ئێرانییەکانیش هەر ئەم ڕێگایەیان بڕی. لەم ڕەوتی لێکدران و ئاوێتەبوونەی تۆرەمە و ڕەگەزان‌دا کە

خەریکبوو پەلوپۆی دادەکوتا، دین و ژیارمەندیش هەر تووشی ئەم چارەنووسە بوون. پارسەکان [ئێرانییەکان] بە سەربڕینی ئاژەڵان دەچوونە پەسن و پەرستنی یەزدانەکانیان. هێرۆدۆت باسێکی تێر و تەسەلی سەبارەت بەم دابودەستووره ساکار و یەکجار کاڵە کە دەچۆوە سەر سەردەمی تۆرەمەی هیندوئێرانی، گێڕاوەتەوە. هەر جێگایەکی کە قوربانیی لێدەکرا، دەبوو موغێکی لێ بێ. زۆر وێدەچێ کە موغەکان بە ڕەسەن «ماد» بووبن و کۆمەڵەکەیان خاوەنی هێندێک شانەبەرزەی سیاسی و بەتایبەت دینی بوو. لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا کار و پلەی موغان بە گرینگ دادەندرا و بەپێی کۆمەڵێک یاسا و ڕێسا و بەڵگەنامە، دەبێ درێژبوونەوەی چینی موغان، میراتی مادەکان بێ و بۆ هەخامەنشییەکان بەجێمابێ. موغان بە مەبەستی بەڕێوەبردنی دابودەستووری قوربانی کردن لەگەڵ قۆشەن دەبزووتن؛ خەونیان لێکدەدانەوە و دەبوونە بەشداری ڕێورەسمی تاج لەسەرنانی پادشای تازە کە لە پاسارگاد بەڕێوە دەچوو. هەروەها بەرپرسی پەروەردە و ڕاهێنانی لاوان و زێوانانی نێژگەی پادشایان بوون، بۆ وێنە نێژگەی کووروش. زانیارییەکی ئەوتۆمان سەبارەت بە سەرچاوەی دینی موغانەوە بە دەستەوە نییە، بەڵام ئەوەندە دەزانین کە دینەکەیان لەگەڵ دینی پارسەکان جیاواز بووە. موغەکان چین و کۆمەڵێکی تایبەت بوون و زەماوەندیان لەگەڵ مەحرەمان بە ڕەوا دەزانی. لە ڕوانگەی موغانەوە دنیا بە سەر دوو کەرتی چاکە و خراپەدا دابەشکراوە و ئەهریمەن و ئەهوورامەزدا بەرەوڕووی یەکتر چەقیون. پارسەکان مردووی خۆیان دەناشتن، بەڵام موغەکان تەرمی مردووانیان لە دەرەوە دادەنان هەتا ببنە خۆراکی دڕندان و باڵندەی گۆشتخۆر.

وەکوو دەزانین، کاتێک ئەسکەندەر چووە سەردانی نێژگەی کووروش، تەماشای کرد تەرمی پادشای گەورە مۆمیایی کراوە و لە نێو تەختێکی زێڕیندا راکێشراوە. لە سەردەمی داریووشەوە، گۆڕی تەواوی پادشایانی دیکەی ئەم خانەدانە لە سینەی ڕەوەز و هەڵدێری نەخشی ڕۆستەمدا هەڵکەندراوە (ق٥٥). تەنیا نموونەیەکی نێژران لە خاکدا کە هەتا ئێستا دەستی پێڕاگەیشتووە، لە لایەن شاندی شوێنەوارناسانی فەرانسەوی دۆزراوەتەوە. تەرمێک کە وێدەچێ هی ژنێک بێ، خراوەتە نێو تابووتێکی مەفرەق و نوقمی زێڕ و زەمبەر کراوە و هەرچییەکی پێداویستی مردووانە خراوەتە پاڵی و بۆ نموونە دەوریی زێڕین و دەفری بەردینی تێدایە (ق ٥٦، ٥٧ و ٥٨). سازکرانی مەیی مەستیهێنی هۆم (هائۆما)[1] دەکەوتە سەر شانی موغان کە لە گیایەک دەگیرا و لە ڕێوڕەسمی دینیدا دەخورایەوە. لە نێو کۆمەڵە بەڵگەنامە دۆزراوەکانی تەختیجەمشیددا، باسی هۆم و قازانجەکانی کراوە.

هێرۆدۆت دەڵێ پارسەکان خاوەنی پەرستگا و قوربانیگا و پەیکەرەی خودایان نەبوون و لە ڕوانگەی کەسێکی یۆنانییەوە وایە و ڕاست دەکا، چونکە پارسەکان خاوەنی پەرستگای بەژاوەژاو و خاوەنی جێقوربانی و ڕووگەی پڕ پەیکەرەی یەزدانەکانی جێی پەسن و پەرستن نەبوون. ئەوان لە ژێر کۆمەڵێک هەیوانی پیرۆزدا، سەکۆیان ساز دەکردن و ڕێوڕەسمی دینی لە جێگای سەرئاواڵە ئەنجام دەدرا و لەبەر ئەو ئاورەی لەسەر سکۆکان دەکرانەوە، بەو شوێنانەیان دەگوت ئاورگا و هێندێکیان بێپسانەوە نەدەکووژانەوە. ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە سێ ئاورگامان پێ شک دێن کە بریتین لە: ئاورگای پاسارگاد کە بە فەرمانی کووروش ساز کراوە؛ ئاورگای نەخشی ڕۆستەم و بەرەوڕووی گۆڕی

---

١ـ ڕەنگە ئارماڵک یان هەمان گەسکەپێفەمبەرە بێ.و.

داریووش، کە ڕەنگە بە دەستووری خۆی سازکرابێ (و ٤٣)؛ ئەوی دیکە لە شووشە و وادیارە سەر بە سەردەمی داریووشی دووهەمە. ئەم ئاورگایانە لەسەر شێوازی چوارپاڵوو دارێژراون و یەکی هۆدەیەکیان هەیە، کە بە ڕیزە پلیکانێکدا دەست وێیڕادەگا و لەوێ موغ ئاوری پیرۆزی دەپاراست. وەکوو باسمان کرد ڕێورەسمی دینی لە جێگایەکی سەرئاواڵە ئەنجام دەدرا، چونکە تەواوی ئەو جێقوربانییانەی ئێمە چاومان پێیان کەوتووە لە جێگایەکی بەرفرەوان و هێندێک دوور لە پەرستگایان بوون. بەگوێرەی گێڕانەوەی گزنفۆن، لەو شوێنانەوە ئاژەڵانی ئامادەی قوربانی و کۆمەڵێک درۆشکە کە ئەسپانی پیرۆزی ئێزەدی خۆر ڕایاندەکێشان، وەڕێ دەکەوتن و دەچوونە هەوێڵی پادشا و لەوێ گۆشتی قوربانی دابەش دەکرا و دەخورا.

پارسەکانیش پەیکەری ئێزەدانی خۆیان دادەتاشین. ئەردەشێری دووهەم پەیکەرەی ناهید، واتە «ئاناهیتا»ی لە شووش، هەگمەتانە (هەمەدان)، بابل و تەواوی ناوەندەکانی دەسەڵاتی حکوومەتی خۆی داناوە.

تەواوی بەردەتاشەکانی سەر ڕووکاری گۆڕی فەرمانڕەوایانی هەخامەنشی، دیمەن و قەڵافەتی پادشایەک دەخەنەڕوو کە بەرەوڕووی ئاگردانێکی ئاوری پیرۆز ڕاوەستا و نەزرینەی پێیە و سەرقاڵی بەڕێوەبردنی دابودەستوورێکە. لە لای سەرەوەی بازنەیەکی باڵدار دیارە کە بەژنی ئەهوورامەزدای تێڕاچووە (ق٥٩)[1]. هەر ئەم دیمەنە لەسەر بەردەتاشی بێستوون و چەند جێگایەکی تەختیجەمشید وەبەرچاو دێ کە باڵی ئەنگاوتووە. ئەمە یەکێکە لە کۆنترین هێماکانی پەیکەرتاشینی میسرییەکان و سەر بە سەردەمی دامەزرانی یەکەمین

---

١ـ تاقمێک لە توێژەران لایان وایە ئەمە دیمەنی «فرەوەهەر»ە کە فریشتەیەکی پاسەوانە و لە جیهانی نادیوە یان لە ئاسمانەوە نێردراوە.و.



ق٥٥ـ نەخشی ڕۆستەم: گۆڕەبەردینەی پادشایانی هەخامەنشی و ئاورگایەک

حکوومه‌تی پادشایه‌تییه له‌و ناوچه‌یه‌دا. لێره هۆرووس، یه‌زدانی مه‌زن، یه‌زدانی ئاسمان و هێما و سه‌مبولی ئاسمان، باڵی ڕاده‌نگاوت. دنیا کراوه‌ته دوو به‌ش: ئه‌هوورامه‌زدای «سه‌روه‌ری زانا» یان «زانایی» له ئاسمان فه‌رمانڕه‌وایه و «باڵی به سه‌ر زه‌وی و پادشاکه‌ی‌دا ڕائه‌نگاوتووه و ده‌یانپارێزێ». پادشای هه‌خامه‌نشی له‌بری وی فه‌رمانڕه‌وایه له‌سه‌ر زه‌وی. ئه‌هوورامه‌زدا یه‌زدانی



ق٥٦- شووش: گۆڕێکی سه‌رده‌می هه‌خامه‌نشی



ق٥٧- شووش: خشڵی زێڕینی نێو گۆڕێکی سەردەمی هەخامەنشی



ق٥٨- شووش: دەوریی زیوینی نێو گۆڕێکی سەردەمی هەخامەنشی

ق٥٩ـ ئەهوورامەزدا [یان فرەوەهەر]

پایەبەرزە و دەکەوێتە سەرووی تێکڕای یەزدانانەوە؛ بەڵام دیسانیش دینی هەخامەنشی لەسەر تەوەرەی تاقانەپەرستی هەڵنەدەسووڕا، گەرچی خەریک بوو ڕچەی ئەم ڕێبازە بشکێنێ.

لە سەردەمی هەخامەنشی‌دا، دینی مەزدایی کە زەردەشت ئاڵوگۆڕی بە سەر هێنابوو، لە سەرتاسەری ئیمپراتۆری‌دا پەرەی ئەستاند و تەشەنەی کرد. مێژووی ژیانی ئەم پێغەمبەرە هێشتاش قسەی لەسەرە. [دەستەیەک لە زانایان] پێیان وایە کە زەردەشت بە ڕەسەن خەڵکی «ماد»ە و بەناچاری پەرەوازە بووە و چۆتە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران و لەوێ بانگەوازی خۆی بڵاو کردۆتەوە و جەماوەرێکی لێهاڵاوە. ئەوێ میرێکی لێ بووە بە ناوی ویشتاسپ کە تاقمێک لە توێژەران پێیان وایە دەبێ ویشتاسپی باوکی داریووش و میرهەرێمی پارت [دامغان] و هیرکانی [گورگان] بووبێ. هەر چۆنێک بووبێ، ئەم دینە تازەیە لە باڵی ڕۆژهەڵاتەوە وردەوردە پەرەی ئەستاندووە و تەواوی ئێرانی گرتۆتەوە.

توێژەران وای بۆ دەچن کە هەلومەرج و بارودۆخی ژیانی خەڵکی نیشتەجێبووی ڕۆژهەڵاتی ئێران کە هەمیشە دەکەوتنە بەر پەلاماری

دەوارنشینانی مالّویرانکەر، گەرای ئەم بیرەی لە ناخی زەردەشتدا گووراندبێ کە دوو ماکەی چاکە و خراپە جیهان هەڵدەسوورێنن. چاکە سەمبولی سرشتی ئەهوورامەزدایە و خراپە سەمبولی سرشتی ئەهریمەنە. کۆمەڵێک فریشتە لە دەوری ئەهوورامەزدا هالاون کە ویدەچێ هیندێکیان ئیزەدانی لەمێژین بن و لەسەر شێوەی هێزەکانی سروشت خۆیان دەنواند و دەپەرستران. کێشە و هەرای نێوان ئەم دووە چەشنێکە لە بەرەنگاربوونەوەی بیر و هۆش و لە کۆتایی‌دا سرشتی چاکە یان هەمان ڕووحی خێرخواز سەردەکەوێ؛ کەوایە لەم ڕەوتەدا دووانەپەرستی شتێکی ڕواڵەتییە و دینی زەردەشتی بە شێوەیەکی ناتەواو لەسەر «تاقانەپەرستی» دەڕوا.

مرۆڤ ناتوانێ خۆی کەنار بگرێ و نەبێتە بەشداری ئەم کێشە و هەرایە، چونکە لایەکی کۆمەڵ بریتییە لە مرۆڤی چاک و بەدین و ئاکارباش و قسەڕاست و لایەکەی دیکە دەبێتە مرۆڤی چەپەڵ و چەوت و بێ‌دین. تاقمی یەکەم دەکەونە شوێن ئەهوورامەزدا و تاقمی دووەم بە دوای ئەهریمەن‌دا دەڕۆن. پاش مردن چاکە و خراپەی هەر مرۆڤێک لێپرسینەوەی هەیە و ئەوەی ئاکارباشە دەچێتە بەهەشت و ئەوەی تاوانبارە بۆ ماوەیەکی درێژ سزا دەدرێ. جگە لەم ڕێ‌وشوێنەی کە بۆ هەموو کەسێک وەبەرچاو گیراوە، پێداچوونەوە و داوەرییەکی گشتیش هەیە و ئەویش دەبێتە تاقیکرانەوە بە ئاگر. مرۆڤ دەبێ خۆی لە باوەڕی پووچەڵ بپارێزێ و بەرەنگاری ڕابوەستێ. دەبێ لەگەڵ گیانلەبەران دلۆوان بێ و بیانپارێزێ و جوانیان لەگەڵ بجووڵێتەوە. دادوەری چەوتەکار و جووتیاری بێ‌نەچاراو بە زەوی‌وزار و ئادەمیزادی مەردمئازار، هەموویان دەبنە تاوانبار. پادشایەکی چاک لە پێناو دینەکەی‌دا دەجەنگێ و گەلی خۆی دەپارێزێ؛ بژیوی هەژاران دابین دەکا و باڵ بە سەر بێ‌دەسەلاتان‌دا

دەکێشێ. ئاکار و ڕەوشتی دینی زەردەشتی لەسەر ئەم سێ کۆڵەکەیە ڕاوەستاوە: بیری باش، وتاری باش و ئاکاری باش.

ئەم ڕێوشوێنەی دینی زەردەشتی بەپێی یاسا و ڕێسایەکی توندوتۆڵ ڕێکخراوە. هەر نەزرێک سەربڕینی ئاژەڵانی تێدابێ قەدەغەیە، چونکە ئەو ئاژەڵانەی بەرهەمیان دەبێتە بژێوی مرۆڤ و کاری بۆ دەکەن، دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێ. مەیی مەستیهێنی هۆمیش وەلانرا. مردوو نەدەبوو بنێژرێ، بسووتێندرێ یان بنئاو بکرێ، چونکە ترسی ئەوە هەبوو کە سێ توخمەی پیرۆزی زەوی و ئاو و ئاگر تووشی لەوتان بن. دەبوو تەرمی مردوو بەرن بۆ سەر کێوان یان بیخەنە سەر ئەو کلاوقووچانەی کە بۆ ئەم مەبەستە ساز دەکران. پاشان یەسقانی مردوویان کۆ دەکردەوە و دەیانخستە «ئۆستۆدان» واتە یەسکدانەوە و ئەوسا لە گۆڕێکی هەڵکەندراو یان یەکێکی داتاشراوی نێو بەردەڵاندا، دەیانناشت.

دینی زەردەشتی لەگەڵ دینی بوودایی، کە لە هیندووستان سەری هەڵداوە، بە ڕادەیەکی زۆروکەم هاوچەرخ و خاوەنی خاڵی هاوبەشە. هەردک دینەکە دژی ئاکار و کرداری دڵڕەقانە و دابودەستووری تێکەڵ بە خوێنی باوی دینەکانی پێشووی ئارییایین؛ بەڵام ئەم دووە ناچنەوە سەر پنجێک و چۆنیەتیی گوورانیان جیاوازە. دینی زەردەشتی دەسکەوت و هەوێنکراوی چینی مەزنەوەجاخانە، بەڵام دینی بوودایی نوێنەری ئاوات و داخوازی هەرەمەی خەڵک و چینی بێبەشانە و ڕەنگە یەکێک لە هۆکارەکانی پەرەی بەرچاوی بوودابیسم ئەمە بێ. ئێستاش دینی بوودایی خاوەنی سەدان میلیۆن شوێنکەوتەیە، کەچی پەیڕەوانی ئەمڕۆی دینی زەردەشتی بریتین لە کۆمەڵ و کەمینەیەکی بچووک کە بە زەحمەت دەتوانن داکۆکیی لێ بکەن.

## زمان و خەت

زۆر وێدەچێ کە داهێنانی خەتی بزماری بۆ نووسینەوەی زمانی پارسیی کەونارا بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی چیشپیش، چونکە تەتەڵەیەکی زێڕینی ئاریارەمنەی کوڕیمان بە دەستەوەیە. ڕەنگە نووسینەوەی پارسەکان لەسەر تەتەڵەی قوڕین لە سەردەمی دەسەڵاتداریی خۆیاندا لە پارس، لە ڕووی دۆزرانەوەی تاقانە تەتەڵەیەکی بەردەستمان بسەلمێندرێ. ئەم بەڵگەیە لە شووش دۆزراوەتەوە و دەقەکەی بریتییە لە فەرمانی داریووش سەبارەت بە سازکرانی کۆشک و بە زمانی پارسیی کەونارایە. زەمانێکی کە ئەم قوڵەپادشایەتییە بوو بە شاهانشایەتی، ئەم زمان و خەتە تەنیا دەستی کەمینەیەکی چینی دەسەڵاتداری پێڕادەگەیشت. وای بۆ دەچن کە پایەبەرزان و میرانی ناپارسی ئەم زمانەیان نەزانیبێ. تەشەنە و گەشەی خێرای شاهانشایەتیی هەخامەنشی، هەلی ئەوەی نەڕەخساند کە تاقمێک وەرگێڕی شارەزا کۆ بکاتەوە هەتا بتوانن دەقەکان لە پارسیڕا وەرگێڕنە سەر تێکڕای زمانەکانی دیکە. لە لایەکی ترەوە، زمانی ئارامی هەر لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێشزایینەوە زۆری پەرە گرتبوو. ئارامییەکان کە چەند حکوومەتێکی بچووکیان لە دەمیشق و حەما و سەمعەل[1] دامەزراندبوون و جەماوەریان لە سەرتاسەری ئاسیای خۆرنشینەوە هەتا خۆرنشینی ئێران بڵاو ببوونەوە، پێشتریش لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا، خەت و زمانیان وەکوو پێویستییەکی بازرگانی و تەنانەت ئاخاوتنی توخم و تۆرەمە فرە ڕەگەزەکانیش، برەوی پەیدا کردبوو. هێندێک بەردەتاشی ئاشووری دیمەن و قەڵافەتی دوو نووسندە دەخەنە بەرچاو کە یەکیان تەتەڵە و قەڵەمێکی بە دەستەوەیە هەتا بە خەتی بزماری بنووسێتەوە و ئەویتریان پاپیرووس و

---

١ـ ساوال

مەرەکەبی پێیە بۆ نووسینەوە بە ئارامی. زمانی ئارامی لە زەمانی هەخامەنشییەکاندا لە ئاسیا و بەتایبەت لە میسرەوە هەتا هیند زمانێکی نێونەتەوەیی بووە و لەو شوێنانە کۆمەڵێک بەڵگە بەم زمانە دیتراونەوە. وەکوو دیارە خۆ ڕاستە لە عیلام بە عیلامی و لە بابل بە بابلی دەیاننووسی، بەڵام سەرپاکی دیواندارانی ئێرانی کاریان بە زمانی ئارامی دەکرد.

سەرەڕای تەواوی ئەمانەش، پارسەکان دەبوو بە زمانی خۆشیان نووسیبا. کارپێکرانی خەتی بزماری تایبەتی هەڵکەندرانی سەر بەرد و کۆڵەکەی کۆشک و تەلاران بوو کە وردەوردە لە بیر دەچۆوە. بەرەبەرە لە ژمارەی ئەو نووسندە و قەڵەمدارانە کەم بۆوە کە لێیان دەزانی. توێژەران بۆیان دەرکەوتووە کە زۆرێک لەو بەردەنووس و تەتەڵانەی بە زمانی پارسیی کەونارا [ئاریایی = ئاریە] نووسراون و سەر بە سەردەمی دوایین پادشایانی هەخامەنشین، هەڵەی زۆر زەقیان تێدایە. بەپێی تەواوی نیشانەکان دەردەکەوێ کە پارسەکان بۆ تۆماری زمانی خۆیان، خەتی ئارامییان پەژراندووە. وێدەچێ یەکێک لە بەردەنووسەکانی نێژگەی داریووش، کە بەداخەوە زۆریش هەڵوەریوە، بە زمانی پارسی و بە پیتی ئارامی نووسرابێتەوە و هیچ بەڵگەیەکی دیکەش لەسەر چەرم یان پاپیرووس نەدۆزراوەتەوە. لە خەتی بزماریی پارسیی کەونارادا چەند نیشانەیەک (ئیدیۆگرامێک) لە ئارامی وەرگیراوە و دەبێ بۆ نووسرانەوەی پارسیی کەونارا کار بەم پیت ـ یان نیشانانەی ـ ئارامی کرابێ. لێرەوە خەتی پەهلەوی کە کاری بە نیشانەکانی (ئیدیۆگرامەکانی) سامی دەکرد، پەرەی ئەستاندووە.

لە نێو هەزاران تەتەڵەی دۆزراوەی گەنجینەکانی میریدا لە تەختیجەمشید، تەنانەت یەک دەنکیش بە پارسیی کەونارا نەنووسراوە و هێندێکیان بە ئارامی و

زۆربەیان بە عیلامی نووسراون. ئەم بەڵگە سەلمێنەر و پتەوش پاڵپشتی ئەم بۆچوونەیە کە دەڵێ زمانی پارسیی کەونارا بە خەتی ئارامی نووسراوەتەوە.

هەڵێنانەوەی نەهێنی و دۆزرانەوەی شێوەی خوێندرانەوەی دەقەکانی عیلامی، قۆناخەکانی نووسرانەوەیان بۆ ڕوون کردووینەوە. وادیارە فەرمان بە زمانی پارسی لە لایەن پایەبەرزێکی بارگاوە ڕادەگەیەندرا و قەڵەمدار وەریدەگێڕایە سەر ئارامی و لەسەر پاپیرووس دەینووسی. پاشان دەقەکەیان دەدایە دەست قەڵەمدارێکی دیکە و ئەویش دەیکردە عیلامی و لەسەر تەتەڵەیەک دەینووسییەوە. تەتەڵەکان پسوولە یان هەمان بەڵگەنامەی خەرج و تێچووی کاران بوون و زۆربەیان باسی مزەی ئەو سەنعەتکار و کرێکارانە دەخەنەڕوو کە بەشداری سازکرانی کۆشکی تەختیجەمشید بوون.

**هونەر**

لە سەرتاسەری گۆشە و کەناری دنیاوە لێشاوی زێڕ بەرەو خەزنەخانەی میری دەچوو. تازە تێپەڕیبوو ئەو زەمانەی کە پادشای هەخامەنشی ژیانێکی تاڵ و ناخۆشی سەربازییانەی ڕادەبوارد و لە خانووبەرەیەکدا دەحاواوە کە وێنەی گەورەکراوەی خانوولەی جەماوەری بەرفەرمانی بوو. ئێستا پادشا پێویستی بە چەند پایتەخت و کۆشکی شکۆمەند و بەربڵاوتر هەبوو لەچاو کۆشکی پادشایانی بەدەسەڵاتی بابل و ئاشوور. ترووسکانەوەی شان و شەوکەتی بنکەی دەسەڵاتی پادشا بە مەبەستی واقوڕمانی تەواوی ئەو کەسانە بوو کە لە دوور و نیزیکەوە بۆ پێشکەش کردنی دیاری یان سەروەبەرهێنان، تێوەی دەچوون. شێوازی داندران و ڕازانەوەی کۆشکی میری بە پێوەری هێز و دەسەڵاتی پادشا دادەندرا.

**داریووش پاش مانەوەیەکی کەموکورت لە بابل، ڕەنگە ساڵی ٥٢١ی پ.ز. شووشی کردبێتە پایتەختی خۆی، داریووش دەستووری دا هەتا لەسەر کاول و هەرەسی کۆشک و پەرستگاکانی عیلامی، کە لووزەوی هێرشی ئاشوور بانیپاڵ وێرانی کردبوون، قەڵایەکی پتەوی شوورەدار لە جێی ئاکرۆپۆلیس ساز بکرێ[1]. هەروەها فەرمووی کە لەسەر گردێکی تەنیشتی، کۆشکی ئاپادانا (ئاپادانێ) وەکوو تالاری دیداران دابڕێژن. هێندێک بە شانی ڕۆژهەڵاتدا، شەقامێکی بەرپان دەکەوتە نێوان کۆشک و شار بە واتای تایبەت، کە خانووبەرە و سەرسەرای مەزنانی بارگا و گەورەگەوران و بازرگانانی لێ سازکرابوو. ئەم شوێنە شوورەیەکی خشتی کاڵ بە دەوریدا لێهاڵابۆوە و لێرولەوێی باڵەکانی کڵاوقووچە تێهەڵچووبوون کە هێشتاش لە کۆی گەڵاڵەی شوورەکەدا جێگایان دیارە. داریووش دەستووری دا هەتا بە دەوری ئەم دیوارەدا خەندەکێکی بەرپان لێبدرێ و ئاوی ڕووباری «شاهوور»ی تێبکرێ کە بۆ ئەم مەبەستە هەڵیانگێڕابوویەوە و گەمارۆی شارەکەی دەدا و دەیکردە دورگەیەکی لەگیراننەهاتوو. شووشی پایتەختی دنیا کە بە ڕێگای چوار چۆماندا بە دەریاوە گرێ دەدرا و پادشایان، شازادان، باڵوێزان، پزیشکان، وێژەوانان و هونەرمەندان ڕوویان تێدەکرد، دەبوو شیاوی ئەو دەور و جێگە و پێگەیە بووبا کە شای شاهان بۆی دیاری کردبوو(و٤٤).**

**شاندی شوێنەوارناسیی فەرانسەوی، لە نێو کاول و هەرەسەکانی کۆشکدا دەقێکیان دۆزیوەتەوە کە داریووش تێیدا باسی چۆنیەتیی سازکرانی ئەو کۆشکە دەکا. چونکە ئەم دەقە یەکێکە لە جوانترین دەقە ئەدەبییەکانی هەخامەنشی،**

---

١ـ ئاکرۆپۆلیس دەبێتە بەرزترین شوێن لە شارەکانی یۆنانیدا. م.

لێرەدا بەشە سەرەکییەکەی دەگێڕینەوە. داریووش پاش پاڕانەوە لەبەر ئەهوورامەزدای مەزن دەڵێ:

«ئەم کۆشکەی کە لە شووش سازم کردووە، کەرەسە و ڕازێنەرەوەی لە دوورانەوە هاتووە. ئێرە قووڵ هەڵکەندراوە هەتا گەیوەتە خار. پاش ئەم کارە بناغەی بە شفتەی خیز و ورکەبەردان داڕێژراوە. لایەکی ٢٠ گەز و لایەکی ١٠ گەز بە شفتە پڕ کرایەوە. هەڵکەندنی زەوی و پڕکرانەوەی بە خیز و خڕکەبەردان و پێژرانی خشتان کەوتۆتە سەر شانی بابلییەکان.

داری سیدر لە کێوەکانی جەبەل لوبنانەوە هێندراون. خەڵکی ئاشوور هەتا بابلیان ڕاگواستوون و کارینەکان و ئیۆنییەکان لە بابلەوە هێناویانن بۆ شووش. داری میش‌مەکەن [یاکا] لە قەندەهار و کرمانەوە هێندراون. ئەو زێڕانەی لێرە دەکار کراون لە سارد و بەلخەوە نێردراون. بەردی لاژوەرد و یاقیقی گرانبایی لە سۆغدەوە هێندراون و بەردی پیرۆزە لە خارەزمەوە. ئەوەندە مس و زێوەی لێرە دەکار کراون لە میسرەوە هێندراون. ئەو شفرە فیلانەی [کۆشکیان پێ نەخشاندوون] لە حەبەشە و هیند و ئاراخۆزیاوە هێندراون. ئەو کۆڵەکانەی لێرە چەقێندراون، لە شارێکەوە ڕاگوێزراون بە ناوی ئابیرادووش لە عیلام.

ئەو هونەرمەندانەی بەردەکانیان تاشیوە و نەخشاندوویانن، جەماوەری ئیۆنی و ساردی بوون. ئەو زێڕینگەرانەی لێرە بە زێڕ [کۆشکیان] ڕازاندۆتەوە، مادی و میسری بوون. وەستاکارانی گەوهەربەندی ڕازێنەوەی داران ساردی و میسری بوون. ئەوانەی خشتەی نەخشینیان بڕیوە، بابلی بوون، ئەو پیاوانەی دیوارەکانیان ڕازاندوونەوە مادی و میسری بوون. لێرە لە شووش، دەستووری سازکرانی کۆشکێکی شکۆمەند

درا و بە شێوەیەکی هەرە بەرز کۆتایی پێهات. ئەهوورامەزدا، خۆم و ویشتاسبی باوکم و وڵاتەکەم بپارێزێ.»

نێوەرۆکی ئەم دەقە، لە جەغزی مەبەستی شاهانشادا یەکجار پتر پەلوپۆ داوێ و ئاوێنەیەکی باڵانوێنە سەبارەت بە بارودۆخی ئیمپراتۆری و نیشاندەری داخوازەکانی پادشای بەدەسەڵاتە کە هۆزان و نەتەوەکانی بەرفەرمانی دەبوو سێودووی لێ نەکەن: بژین بۆ وی، کار بکەن بۆ وی، بچووکترین داواکانی وەدی بێنن و بمرن بۆ وی.

نژیاروانیی کۆشکی پادشا هەتا ڕادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە سەر بنەماکانی نژیاروانیی عیلامی کە هەڵومەرجی کەشوهەوای هەرێمی بە سەریدا سەپاندووە. ئەم کۆشکە خاوەنی چەند حەوشەیەکە لە نێوخۆدا و کۆمەڵێک تالار و ژووریان بە دەورەیدا لێهاڵاوەتەوە و هەموویان دەچنەوە سەر ئەو داڵانە درێژانەی کە پاسەوانان توانیویانە لێیانەوە بچووکترین جووڵە و هاتوچۆ بخەنە ژێر چاوەدێریی خۆیانەوە. ئەو دیوارانەی کە بە خشتی کاڵیش دانراون شەقڵی هونەری بابلییان پێوەیە و بە خشتەی لینجاودراو، کە قەڵافەتی پاسەوانانی گیانبازی گاردی جاویدانیان لەسەر نەخشێندراوە، یان شێر و گا و چەند بوونەوەرێکی خەیاڵیی دیکە، ڕازێندراونەوە (و٤٩، ق٦٠)؛ بەڵام شێوازی کاری سازکرانی تالاری دیدار وێنەی لە جێگایەکی دیکە هەڵگیراوەتەوە و ئەویش پەرستگایەکی میسرییە و دەڵێی لێرەواری کۆڵەکەی بەردینە و تەختی پادشا کەوتۆتە پشتەوەیان. پادشا دەکەوتە شوێنێکی نیمچەتاریکی وەکوو زارکی پەرستگای «سێلا»ی یۆنانی، هەتاکوو زۆر بە زەحمەت وەبەرچاو بێ. ئەم مەیل و مەبەستە دواتر پتر ڕەنگ دەگرێ و خەستوخۆڵتر دەبێتەوە و وای لێ دێ کە لە سەردەمی ساسانیدا، پەردەیەکی درێژ و ڕازاوە بە زێڕ و زێو و

گەوهەر دەکەوێتە نێوان پادشا و ئەوانەی دەچوونە دیداری، هەتا هیچکەس بەڕوونی چاوی بەوبەری پەردەکە نەکەوێ.



ق٦٠- شووش: گای باڵداری نەخشێندراو لەسەر خشتەی لینجاودراو (ڕووکەشکراو)

بیناکە بریتییە لە سەرسەرایەک کە شەش ڕیزە شەش کۆڵەکەی بیست گەزی سەریان وەبەر میچەکەی هێناوە و سەرەکۆڵەکەکان لەسەر شێوەی گا داتاشراون. ژووری سەرسەرا لە قۆڵی باکوور و خۆرنشین و خۆرهەڵاتەوە، سێ بەرهەیوانی دوازدە کۆڵەکەیی دەورەیان داوە و بنەکۆڵەکە و سەرەکۆڵەکەکان لەسەر شێوەی جیاوازی سەرسەرا داتاشراون و سێ پلیکانی پانیش چۆتەوە سەریان کە ئەمڕۆ نەماون. هێندێک لە کۆترە یان سەرەکۆڵەکەکان

وەکوو ئەوانەی پاسارگاد ساکارن و گووپیان داوە و هێندێکی دیکەیان لەو جێیەی کە سەرەکۆڵەکە و میخ تێکدەبەزن، پێچ و گەوەیان لەسەر داتاشراوە.

کاری کۆشکی شووش تازە تەواو ببوو کە داریووش بڕیاری دا، تەختگایەکی دیکە لە خاکی خانە و لانەی سەرەکیی خۆی، واتە تەختیجەمشیدی پارس ساز بکا. هەر بۆیە پاسارگادی چۆل کرد، کە یادگاری پادشایانی پێشووتری بەرەبابێکی دیکەی هەخامەنشی بوو. لەم ڕەوتەدا تەنیا پەرستگەی پاسارگاد وەکوو خاڵی هاوبەشی نێوانیان دەمێنێ کە هەتا برانەوەی دەسەلاتی فەرمانرەوایانی هەخامەنشی، بینەری شکۆ و پرشنگی ڕێورەسمی تاج لەسەرنانی تێکرای پادشایانی ئەم خانەدانە دەبێ.

تەختیجەمشید بریتییە لە ڕووبەرێکی کە پاڵی بە چیاوە داوە و لایەکی بەردەلانی چیای بۆ تەخت کراوە و لایەکەی دیکە بە دیواری پانی بەردین هەڵچندراوە و نێوانی بەردەکان قورقوشمی قاڵ و گیروگازی وەکوو کلکە پەڕەسێلکە بە یەکییەوە بەستوونەوە (و٣٧، ق٦١). باب‌وکاڵی داریووش ئاوایان جێگایەک تەخت و ڕێک دەکرد و بناغەی کۆشکەڵی خۆیان لێ دادەڕشت.

شوورەیەک بە خشتی کاڵ و ڕێک‌وپێک لەگەڵ هەوراز و لێژی چیا بە دەوری ئەم ڕووبەرە نالێکەدا لێهاڵاوە و لە قۆڵی پشتەوەڕا دەیپارێزێ. پێپلکەیەکی پان و دووباڵ بەرەو پێگۆڕکەیەک دەچێ و لەوێشەوە دوو ڕیزە پلیکان هەڵچندراوە و دەگاتە ئاپادانا. ئاپادانای تەختیجەمشید هاوشێوەی ئاپادانای شووشە و تەتەڵەکانی ئارشیوخانەی تەختیجەمشید بەڵگەی ئەم کارە دەسەلمێنن: هونەرمەندان و نژیاروانان و وەستاکارانی شووش، پاش ئەوەی لەوێ دەستیان لە کار دەبێتەوە، دەیانبەنە تەختیجەمشید هەتا درێژە بە کارێکی تازە بدەن. لێرەش هەروەک شووش ٧٢ کۆڵەکە هەن کە ڕووکاریان کووزکووز

کراوە و بەژنیان بیست گەزێک پێهەڵچووە و سەرەکۆڵەکەکان لەسەر شێوەی گا یان شێری شاخدار داتاشراون و سەریان وەبەر کاریتە و دارەڕای داری سیدر هێناوە (و٥٢، ق٦٢).



ق٦١- ڕووبەری تەختیجەمشید



ق٦٢ـ چەند کۆڵەکەیەکی تەختیجەمشید

لێرەش سەربازانی پاسەوانی جاویدان جەللەیان بەستووە و لەوبەرەوبەری دیوارەی پلیکانان داتاشراون (و٣٦). دوابەدوای ئەوان پیاوانی دەرک و دیوانی میری کە مادی و پارسن، ڕیز بوون. پاشان لە دوو ڕیزاندا، تاقمێکی هۆز و

نەتەوەکانی بەرفەرمان دێنە بەرچاو کە هەر کامەی دیاریی تایبەتیی خۆیان هێناوە بۆ پادشا. هێندێکیان ئاژەڵی گرانبایی و کەموێنەیان پێیە و دەستەیەکی دیکە ئەو بەرهەمەیان هێناوە کە وڵاتەکەیانی پێوە ناسراوە و بریتین لە: گەواهێرات، هەورەهاڵ و کووتاڵ (و ٥٦).

لە هونەری هەخامەنشیدا زۆر کەم ئاوڕ لە ژیانی ئاسایی و ڕاستەقینە دراوەتەوە؛ بەڵام جەللەی درێژی ئەو کەسانەی هاتوون و باج و پیتاکیان هێناوە و دیمەن و قەڵافەتیان لەسەر دیوارەی پلیکانەکانی تەختیجەمشید هەڵکەندراوە، هەنگاوێکە بەرەو ڕاستەقینە. ئامانجی سەرەکی لەو دیمەنەدا دەرخستنی دەسەڵاتی پادشا و نیشاندانی فرەچەشنبوونی ئەو نەتەوانەیە کە دەبوونە تانوپۆی پێکهاتەی ئیمپراتۆری. ئەم هونەرە کەوتۆتە خزمەت کردنی دەسەڵات و لەوپەڕی خۆیدایە و هونەرمەندانی سەردەمەکە لە بواری داتاشینی بوونەوەراندا یەکجار سەرکەوتوون و ئامانجیان پێکاوە (و ٤٥). ئەم هونەرە لە سەردەمی داریووشدا ڕاشکاوی و پارسەنگ و پتەویی پێوە دیارە و لەسەر ڕووکاری بەرد دەکەوێتە نواندن و نیشاندانی سەنگ و بایەخی ڕاستەقینەی ڕۆژگاری خۆی.

کۆشکی داریووش دەکەوتە نیزیک ئاپادانا و لە ڕووبەردا چەند پلیکانێک پتر هەڵدەکشا و وەکوو جێگاکانی دیکە، دیوارەکانی بە خشتی کاڵ داندرابوون و ئێستا تێداچوون و نەماون؛ بەڵام دەرگا و پەنجەرەکانی چوارچێوەی بەردیان بۆ داتاشراوە و سەردەرانە بەردینەکانی هەر ماون و دەچنەوە سەر شێوازی میسری. ئەم تەختگایەی میری وەکوو ئەوەی شووش ناچێ و زۆر چکۆلەترە و بریتییە لە تالارێکی کۆڵەکەدار کە چەند هۆدەیەکی بە شانی ڕاست و چەپییەوە سازکراوە و چۆتەوە بەرهەیوانێکی کە کۆڵەکەی دار سەری وەبەر میچەکەی

هێناوە. ئەمە شێوازی کۆشک و تالاری نۆردیکە[١] کە وێنەی لێهەڵگیراوەتەوە و جوانترین نژیارەکانی ئێرانی لە ڕووی ساز کراون. لە تەنیشت کۆشکی میری، تالارێکی بچووکی سێدەرگانە سازکراوە و کۆڵەکەی بەردین سەریان وەبەر هێناوە و سەرەکۆڵەکەکان لەسەر شێوەی سەری مرۆڤ داتاشراون (ق٦٣). خەزنەخانەی میری کەوتۆتە بەرپاڵی ئەو کێوەی تەنیشت تەختیجەمشید و



ق٦٣ـ تەختیجەمشید: سەرەکۆڵەکە لەسەر شێوەی سەری مرۆڤ

١ـ باکوورییەکان یان ئووراتووەکان.ب.

لەسەر ڕووکاری دیواری خەزنەخانە دوو دیمەنی هاوشێوە داتاشراون کە پایەبەرزێکی بارگا نێردراوانی چەند گەل و نەتەوەیەک دەباتە خزمەت داریووش (و٤٢).

هێندێک کەس لایان وایە کە هونەری تەلارسازیی هەخامەنشییەکان لە سەردەمی حکومەتی داریووشدا گەیوەتە پەرپەرۆچکەی خۆی و تازە نەیتوانیوە لەوەی تێپەڕێنێ. ئەم بۆچوونە تەنیا جاری وایە ڕاستە، چونکە وەکوو دیارە لە زەمانی خەشایارشادا گۆڕانی بە سەردا هاتووە. خەشایارشای کوڕی فەرمانڕەوای شاهانشایەتی کە بە زیندیسەری باوکی وەک جێنشینی دیاری کرابوو، سەرلەبەری شانازییەکانی دەسەلاتی خۆی، کە تەنیا میراتگری بوو نەک بەدیهێنەری، لەسەر سینەی بەرد داتاشیوە. مەیل و ئارەزووی پادشا لەم بوارەدا شێوەی کاری پادشایانی ئاشووری دەدا و دانانی «دەروازەی گەلان»ی تەختیجەمشید و دوو گای باڵداری زلحۆل کە سەریان مرۆڤە و لەو شانەوشانی نۆیارێکی بەرز و بەرچاو دیارن، وێنەیان لەو بوونەوەرە گاحۆلانەی پاسەوانی دەروازەکانی ئاشووری هەڵگیراوەتەوە (ق ٦٤). هەروەک چۆن لە سەردەمی جێنشینانی «ئووگوست»دا، هونەر بە لای بەدیهێنان و داتاشینی دەسکردی قەبە و زلەدا لادەدا و داژوێ، لە سەردەمی دەسەلاتی خەشایارشاشدا هەر ئەو ڕێبازە دەگرێ و پێیدا دەڕوا و دەگاتە لووتکە، بەلام لەگەڵ پێشکەوتنی شارەزایی و چێشکەی جوانیناسانەی خۆنوێن کەمتر تێکەلاوە و پتر بە لای خەیاڵاتی ناڕێکوپێکی پادشادا دەشکێتەوە.

لە تالارێکی گەورەتری ئەو لای دەروازە، تالاری «سەتکۆڵەکە» ساز دەکرێ و بە دەستووری خەشایارشا لە گۆشەی پەنجەرەکان دیمەنی پادشا وەکوو بەزێنەری دێوەزمان داتاشراوە (و ٤٨). ئەم بەردەتاشراوانە یەکجار

جێگای سەرنجن و ئاوێنەی هونەرێکن کە هێز و دەسەڵاتی [فەرمانڕەوا] دەخەنە بەرچاو.

لە سەردەمی دواتردا کە جەنگەی پادشایەتیی ئەردەشێری یەکەمە، تەنیا چەند شوێنەوارێک وەبەرچاو دێن. تالارە گەورەکەی خەشایارشا لە ڕۆژگاری خۆیدا تەواو نابێ و کورەکەی دەرگای باڵی باشووری خۆرهەڵاتیی بۆ ساز دەکا. کۆشکی داریووش لە شووش، لە زەمانی ئەردەشێری یەکەمدا دەسووتێ. پادشا کە هەروەک باوک و باپیرانی زۆری دڵ بە «شووش»ەوە دەبێ و دەشزانێ لەڕێوە کۆشکە سووتاوەکەی بۆ نۆژەن ناکرێتەوە، دەستوور دەدا لە باشووری شار، کۆشکەڵێکی بۆ ساز بکەن، کە لە زۆر دەور و زەمانان‌دا کەڵتە کراوەتەوە. ئەو ئاسەوارە داتاشراوانەی کە لە نێو کاول و هەرەسی ئەوێدا دۆزراونەوە، بە باری شێوازدا زۆر وەکوو ئەوانەی تەختیجەمشید دەچن.

ئەردەشێر هاوسەردەمی «فیدیاس»ە[١] کە لە ئاتێن (ئەسینا)، پەیکەرەی خودایانی دادەتاشی. زۆر وەک ڕاست دەچێ کە بڵێین هونەری یۆنانی هێندێکی ڕێگا بۆ خۆش کراوە هەتا بگاتە بانووی ئێران، ئەگەرچی ئێرانی لەمێژ بوو زۆر چاکیان بە کەلێن و قوژبنی هونەری یۆنانی دەزانی. بەپێی وردبوونەوە لە ئاسەوارە دەگمەنەکانی هەخامەنشی لە نیوەی دووهەمی سەدەی پێنجەمی پێش‌زایین‌دا، ڕوون دەبێتەوە کە هونەری بەردتاشین لێک و لووستر کراوە و بە هەوێنی وردەکاری دەستاو دراوەتەوە و بارستی ئاسەوارە تاشراوەکان ڕەچاو کراوە. دیمەنەکان لە برشتی خۆسەپێنی خۆیان کەوتوون، بەڵام باشتر نموودیان

---

١ـ فیدیاس بەردبڕ و پەیکەرتاشی گەورەی یۆنانی، کە دەوروبەری ساڵی ٤٣١ی پ.ز. لە ئاتێن پێی ناوەتە جەغزی ژیان.م.

پەیدا کردووە و پاش گەمەی تاسەبارانەی خەشایارشا، پەیکەرەکان زیاتر دێنەوە سەر دیمەن و قەڵافەتی زەمینی و هەستپێکراو.

دوای ئەردەشێری یەکەم، هونەری تڵیاروانیی هەخامەنشی شتێکی تازەی دانەهێناوە؛ بەڵام دیسانیش پادشایانی دواتر خۆیان بە جوانکاری و ڕازاندنەوەی پایتەختەکانەوە خەریک کردووە. چەند کەسێکیان درێژەی کارە ناتەواوەکانیان داوە و بە سەرەنجامیان گەیاندوون و چەندێکی دیکەیان وەکوو ئەردەشێری یەکەم لە شووش، ئەوەی ڕووخابوون، چاکی کردنەوە و دەستی بە سەر و ڕوویدا کێشان و یەکێکیش وەک ئەردەشێری سێهەم لە تەختیجەمشید کۆشکی نوێی ساز کردن (ق٦٥). ئەوەی ڕاستی بێ گەڕان بە شوێن دۆزینەوەی بچووکترین بەڵگە و نیشانەدا کە بتوانێ ڕوونی بکاتەوە ئەم هونەرە درێژەی بە ژیان و مانی خۆی داوە، کارێکی بێهوودەیە و لە ماوەی سەدەیەکدا بێئەوەی هیچ چارەیەکی هەبێ، بنەبڕ دەبێ.



ق٦٤ـ تەختیجەمشید: گای باڵدار لەسەر لادیواری دەروازەی خەشایارشا

هەخامەنشییەکان پەیکەرتاشینی یۆنانییەکانیان خستۆتە بەر سەرنجی خۆیان. تۆبڵێی خەشایارشا گەلێک پەیکەرەی لە یۆنانەوە نەهێنابن بۆ ئێران؟ شاندی شوێنەوارناسانی ناوەندی ڕۆژهەڵاتناسیی شیکاگۆ، لە جەنگەی کەندەوکۆژەکانی خۆیاندا لە تەختیجەمشید، تووشی شاکارێکی بەرزی هونەری سەدەی پێنجەمی پێشزایینی یۆنان بوون کە پەیکەرەی «پینێلۆپ»ە (و٤٦)[1]. پلووتارک[2] جەخت لەسەر ئەم مەبەستە دەکاتەوە کە تەختیجەمشید پەیکەرەیەکی گەورەی خەشایارشای لێ بووە و سەربازانی ئەسکەندەر سەرنخوونیان کردووە. لە شووش پەیکەرەی سەرپەڕیوی داریووش دۆزراوەتەوە کە وادیارە دەبێ کاری هونەرمەندانی میسری بووبێ.

ئێرانی نەیاندەتوانی خۆیان بدزنەوە لە دزەی هونەری یۆنانی و ئیێۆنی کە ماوەیەکی ئاغا بوون بە سەریانەوە و بەرلە قەومانی شەڕەکانی مادی [مێدیک] پرشنگی هونەریان تەنانەت یۆنانیشی گرتبۆوە. ترووسکەی پەنجەی نەخشینی وەستاکارانی ئیێۆنی، برست و برشتی لە دوورەدەستان ڕەنگی دابۆوە. ئەوان کە هەڵگری هونەری زێد و نیشتمانی خۆیان بوون، ڕووداوە سیاسییەکانی ڕۆژگار هەڵیکەندبوون و بۆ ناوچە و مەڵبەندی دیکەی پەرەوازە کردبوون. داریووش لە دەقێکی خۆیدا پێی لێ دەنێ زۆر شت لە یۆنانییەکانی پێملکراوی خۆی فێر بووە.

ئێمە شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە پەیکەرسازیی ئێران نازانین، بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە نەیتوانیوە ڕقە لەگەڵ پەیکەرسازیی یۆنانی بکا. هونەری یۆنان

---

١- پینێلۆپ دەبێتە ژنی «ئۆولیس» و دایکی «تیلیماک». لە ئەفسانەی یۆنانیدا.م.

٢- مێژوونووسێکی یۆنانی کە لە نێوان ساڵانی ٤٥ تا ٥٠ی زایینیدا لە دایک بووە و دەوروبەری ساڵی ١٢٥ مردووە.م.




ق٦٥- ڕووبەری تەختی‌جەمشید

لەسەر تەوەرەی ڕێبازێکی ئایینی هەڵدەسووڕا کە پتر لە هەموو شتێک «بەدیهێنەری وێنەی جوان و چیرۆک و نەزیلەی دڵگر» بوو. ئایینی ئێرانی زۆر لەوە ڕەقتر بوو کە بتوانێ کۆمەڵێک شاکاری وەکوو شکۆمەندیی زێئووس[1] و مەندی و مەتینیی ئاتێنا[2] و جوانچاکیی ئافرۆدیت[3]، بخاتە بەر خەیاڵی داهێنان. ئەگەر بێتوو تەرازووی هەڵسەنگاندمان ئەو چەند پەیکەرۆکە زێڕانەی ئەو سەردەمە یان سەری میرێکی لاو بن کە لە هەویر و هەڵشێلدراوی بەردی لاژوەرد سازکراوە و تازە لە نێو هەرەسەکانی تەختیجەمشیددا دۆزراوەتەوە (و٤٧)، بۆمان دەردەکەوێ کە پەیکەرسازیی هەخامەنشی تەنیا تایبەت دراوە بە شاهانشا یان چەند پایەبەرزێکی هەرە بە دەسەڵاتی ئیمپراتۆری.

هونەری هەخامەنشی لەبەروەی بەندکراوی بارگای میری بوو، نەیدەتوانی بە خۆیدا بێ و باڵی بنگێوێ و لێکدانەوەی نوێ بێنێتە ئاراوە؛ بەڵام دیسانیش بۆی دەکرا بە هێنانی دیمەنی فرەچەشن و تێوەدانی گەواهێرات و نواندنی کەندەکاری، پرشنگداربوونی ئەو سەردەمە بخاتە بەرچاو (و٥٠). دەروازەکانی کۆشک و کەلوپەلی گرانبایی هەموویان پەڕە و پەلکەی زێڕی نەخشێندراوی بوونەوەری ئەفسانەیی یان ڕاستینەی چەکوشکاریکراویان بە سەر کشابوو (و٢٢،٢٣).

جاری وایە زێڕیان بە سەر مەفرەقدا دەتواندەوە و بە مکارە برشتیان لێدەدا و شکڵ و شێوەیەکیان لێ ساز دەکرد (ق٦٦). لەسەر هەرکام لەم شتانە هونەرمەندانی سەردەمی هەخامەنشی خۆیان وەکوو مامۆستای شارەزای نەخشاندنی بوونەوەرانی زلە ناساندووە. ئەم تێبینییە لە بواری کاری بەردتاشان و مەفرەقگەرانیشدا ڕاستە کە شتی جوانی وەکوو سێپێچکەیان

---

١ـ زێئووس، خودای خودایانی یۆنان.م.

٢ـ ئاتێنا، خاتوونەخوای فرەزانی و کچی زێئووس.م.

٣ـ ئافرۆدیت، ئافرۆدیتی، خاتوونەخوای ئەوین و جوانچاکی.م.



پەیکەرەی نیوەبەژنی پیاوێکی پارتی کە لە بەردی لاژوەرد ساز کراوە.



ق٦٦ـ تەختیجەمشید: پەلکە مەفرەقێک بۆ جوانکاری

**لەسەر قەڵافەتی سێ شێری نەڕڕەکێش (ق٦٧) یان گۆزە ساز دەکرد کە هەنگڵەکانی بزنەکێوی بوون[1]. ئەم شێوە دیمەنانە لەسەر ڕووکاری بەردەتاشراوەکانی تەختیجەمشیدیش وەبەرچاو دێن (و٥٣). هونەری زێڕینگەری بە وردەکارییەکی شایانی دەسخۆشانە وەدەردەکەوێ و جاری وایە لە دنیای بوونەوەراندا خۆی دەنوێنێ و لاسای دەسکاری هونەرمەندانی دووچۆمانی دەکاتەوە و دوو شێری ڕاستوچەپ تێکبەزیو لەسەر**



ق٦٧ـ تەختیجەمشید: سێپێچکەی مەفرەق (مزقەلایی)

**گەردنئاوێزێک دەنەخشێنێ (و٣٠). هەلی وایە بە چاوێکی ڕوون و ڕاستینەبینەوە دەڕوانێ و دیمەنی ئاسکێک لەسەر ڕووپەڕی گژنیژەداری جەواهێربەندی دەسکی هەسانێک دەنەخشێنێ (و ٥٧). هونەرمەندی زێڕینگەر بە دنیای خۆرسکاندا ڕۆدەچێ و گوڵ و گەڵا دێنێ و دەیانکاتە تاجەگوڵینە (و٥١).**

---

١ـ موعین نووسیویەتی گریفۆن (Griffon)، یانی بوونەوەرێکی ئەفسانەیی کە سەری داڵە و لەشی شێرە؛ شێرەداڵ. شێرەسیسارک یا سیسارکەشێر؛ بەڵام بەپێی دەقەکە بزنەکێوی دروستە.و.

یان وەک باو بوو، دیمەن و قەڵافەتی دوو بوونەوەریان تێکەڵی یەکتر دەکرد و شتێکی تازەیان دادێنا، هەروەک چۆن دوو سەری دەسبەندی زێڕیان ڕازاندۆتەوە (و ٥٤).

لە جەنگەی کەندەوکۆڕەی کاول و هەرەسەکانی «تەختیجەمشید»دا، هەزاران دەفری بەردین دۆزراونەوە کە هێندێکیان بە سەری «مراوی» یان «قوو» ڕازێندراونەوە (ق٦٨). وەکوو دیارە ئەم دەسکارانە لە نێو کڕیارانی سەکاییدا یەکجار دڵخواز و جێگای سەرنج بوون. کەندەکاران (کەندۆخان) لەسەر بەردی جوان و گرانبایی مۆری گردەڵە و تەختیان هەڵدەکەندن و تێکهەڵچوونی پادشا لەگەڵ دێوەزمان یان چوونە ڕاویان دەنەخشاندن؛ وەک ئەوەی کە لەسەر مۆری گردەڵەی بەناوبانگی داریووش شەقڵێندراوە (ق٦٩). هەروەها دەبێ باسی ئەو سکە برەودارانە بکرێ کە تایبەت بۆ دەرەوە لێدەدران و وەستاکاران هەمیشە پادشایان لە جەنگەی کێشانەوەی ژێی کەوانیدا دەخستە بەرچاوان. کۆمەڵێک سکەی دیکەش هەبوو کە میرهەرێمەکان بۆخۆیان لێیان دەدان و جاریوایە دەکەونە ڕێزەی شاکارانەوە (و٥٨).



ق٦٨ـ تەختیجەمشید: کەشەفی بەردین



ق٦٩- مۆری گردەڵەی داریووش

سازکرانی چەکوچۆڵ، بەتایبەت ئەوانەی کە گەوهەربەند و ڕازاوەن، هەم بە باری وردکاریی هونەرمەندانەوە و هەم لە سیلەچاوی هەڵبژاردنی مەبەستەکانەوە، دەکەونە ڕیزی پێشپێشەوەی چەکوچۆڵەکانی دەسکاری سەکایی کە لە نێو گۆڕخانەی خانەدانی پادشاکانیاندا لە باشووری ڕووسیا دۆزراونەوە. کالانی نەخشێندراوی قوڵەشیرێک کە وێدەچێ لە کانزایەکی گرانبایی سازکرابێ، بە لاقەدی سەرکردەیەکی مادیەوە دیارە و لەسەر بەردەتاشراوەکانی تەختیجەمشید خۆی دەنوێنێ. وەکوو ئاشکرایە ئەم کالانە وێنەی لە هونەری کۆنباوی سەکایی هەڵگیراوەتەوە کە بە یەکێک لە توخمەکانی پێکهێنەری هونەری مادی دادەندرێ (ق٧٠). هەروەها لە تەختیجەمشید



ق٧٠ـ تەختیجەمشید: شمشێری سەرکردەیەکی مادی

تەورێکی تایبەتی شەڕکردن و لغاوێکی شکاو، کە بۆ ڕاهێنانی ئەسپانی نەگیراوی دەستەمۆنەکراو دەکار کراوە، دۆزراونەوە. بێگومان ئەم لغاوە ئاڵقەڕێزدارە دەبێ هی یەختەرمەخانی میری بێ (ق ٧١).



ق٧١ـ تەختیجەمشید: تەوری تایبەتی شەڕ و لغاوێکی مەفرەق

نووسراوەکەی داریووش سەبارەت بە سازکرانی کۆشکی شووش، هەر سەبارەت نییە بەو شوێنە، بەڵکوو کارەکانی تەختیجەمشید و هەگمەتانەش دەگرێتەوە و سەرلەبەری هونەری ڕەسمیی هەخامەنشیی تێدا وێنا کراوە. ئەم هونەرە کە شوێنکەوتەی چارەنووسی ئیمپراتۆرییە، کەوتبووە ڕیزەی پایەختە

جیهانییەکانی پادشایانی گەورەوە. لە ڕاستیدا ئەگەر بێتوو پادشاهان نەکەوتبانە خواستنەوەی سەرپاکی ئەو داهێنان و تازەگەرییانەی کە شارستانییەتە کۆنەکانی ڕۆژهەلاتی کەونارا، بەدییان هێنابوون، ئێرانییەکان نەیاندەتوانی ئاوا خێرا لە کۆخانەوە تەشریفیان لە کۆشکان دابەزێ. داخوا ئەوانیش لەم بوارەدا هەر ئەو کارەیان نەکردووە کە زۆرێک لە نەتەوەکانی پێش ئەوان ئەنجامیان داوە؟ داخوا ئوورارتووەکان گەلێکیان لە ئاشوورییەکان و شارستانییەتەکانی ئاسیای بچووک یان دووچۆمان نەخواستۆتەوە؟ یان داخوا ئاشوورییەکان خۆیان بە جێنشینی هونەری سۆمێری ـ ئەکەدی، هووری و هیتی دانەناوە؟ [با]، بەلام هیچیان شانیان لە شانی هەخامەنشییەکان نەداوە و دەستیان بەو شکۆمەندی و گرشە و ورشەیە ڕانەگەیشتووە؛ کەچی هونەری هەخامەنشی وا نییە کە بلێی تەواو و بێکەم و کورتییە، چونکە نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان کۆلەکە بەردە بەرزەکان و قەلافەتی وردەلەی ئەو کەسانەی لەسەر لادیواران ڕیزیان بەستووە، بەئاشکرا دیارە. هەلبەت دەبێ لە بیرمان بێ کە ئەو کۆلەکانە بەرزترین دەسکاری ناسراوی سەر بە جیهانی کەوناران.

پارسەکان نەیاندەتوانی تەمەنێک چاوەڕێ بن هەتا وردەوردە هونەرەکەیان خۆی داڕێژێ و پێبگا. ئەوان بە خواستنەوەی هونەری گەلانی دیکە دەیانتوانی بگەنە بەرزایەتی و شکۆمەندی؛ بەلام هونەری ئەوان لە سرشتی خۆیدا، هەلگری توخمەی تلاسان و تێداچوون بوو. ئەم هونەرە لە سەردەمی کووروشدا خۆی داڕشت و گەیشتە مەزنایەتی و لە زەمانی داریووشدا هەتا پەرپەرۆچکەی خۆی ڕۆیی، بەلام تووشی قەتیسمان و داوەستانێکی درێژخایەن بۆوە. ئەگەر ڕووداوەکانی سەردەمی خەشایارشا و ئەردەشێر وەلا بنێین، ئەم هونەرە هەتا بڕانەوەی سەردەمی دەسەلاتی هەخامەنشی هیچ گۆڕانێکی

بە سەردا نەهات و هێشتا هەر لەوپەڕی جوانی و شکۆداریی خۆیدا بوو کە ئەسکەندەر ئاوری کاولاندنی پێوەنا.

## بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی

یەکترگیربوونی سەرتاسەری ئاسیای خۆرنشین، لە ژێر ئاڵای دەسەڵاتی پادشایەتیی هەخامەنشیدا؛ دابەشبوونی ئەم خاکە بەربڵاوە بۆ چەند هەرێمێکی ژێرچاوەدێری و سەر بە حکوومەتێکی ناوەندی؛ دامەزراندن و بەدی هێنانی رایەڵەی پەیوەندیی نێوان هەموو بەشەکانی ئیمپراتۆری بە رێگای ویشکانی و دەریاییدا و پێکهێنانی دامودەزگایەکی بەپارسەنگی وەرگرتنی پیتاک و سەرەولێژبوونی لێشاوی زێڕ بۆ خەزنەخانەی حکوومەتی، کۆمەڵێک هۆکاری بەهێز بوون کە ژیانی ئابووریی ئێرانیان بووژاندەوە. هاتنی پێوەر و سەنگ و تەرازوو و بڵاوبوونەوەیان بە تەواوی خاکی پادشایەتیدا و بەتایبەت لێدرانی سکە، برەوی بە بواری کاروباری بازرگانیی دەرەکی دا کە لە سایەسەری ئابووری نیشتمانییەوە، گەلێکی گەشە کردبوو.

سکەی وردەڵەی زێو، پێشتر لە سەدەی حەوتەمی پێشزایینیدا، لێدرابوو؛ بەڵام برەو پێدرانی رێکاری راستەقینەی سکەی زێڕ و زێو، کاری کرێسووس [کراسووس]ە لە لیدییە کە خێرایەکی تەنەوەی کرد بۆ ئاسیای بچووک و داریووش خواستییەوە و لە وڵاتەکەیدا کردی بە باو. تەتەڵەکانی تەختیجەمشید کە بەشێکیان سەبارەتن بە دانی مووچە و مانگانەی وەستا و کرێکارانی سازکردنی کۆشکی میری، دیمەنێکی یەکجار روونی سەردەمی تێپەڕین و گوێزرانەوەیە بۆ قۆناخی وەبرەکەوتنی دراو لە ئێراندا. پێشتر هەقدەست بریتی بوو لە گۆشت، جۆ، گەنم، شەراب و پێداویستیی ئاوا. لە برگەیەکی سەردەمی خەشایارشادا، درانی هەقدەست هێشتا لە سێ بەشان دوو بەشی بژیو و

بەشێکی دراو بوو، بەڵام دواتر ڕەوتەکەی پێچەوانە کردەوە و بوو بە دوو بەش دراو و بەشێک کەلوپەل. کەوایە نیو سەدەیەکی پێویست بوو هەتا دراو جێی بژیو و بەروبوو بگرێتەوە و باوی تازە ڕەسەرکەوێ، ئەگەرچی هێندێک سەودا و مامەڵە لە سەرەتاوە هەر بە دراو دەکران.

لە تێکرای ناوچە و هەرێمەکاندا دەستیان دەکرد بە کاروباری ئاوەدانی بۆ ڕەچاوکرانی قازانج و بەرژەوەندیی هەمووانی، کە بڕشتی بەرهەمهێنانی پێهەڵادەبرد. لێدانی کارێز کە لە بانووی ئێران و هێندێک ناوچەی کەمئاودا بە کارێکی بنەڕەتی و گرینگ دادەندرا، لە زەمانی پادشایانی هەخامەنشیدا گەیشتۆتە سەرەنجام. دەبێ بیسەلمێنین کە ئەو زەمانی لە خاکی ئیمپراتۆریدا، کەوتبوونە وشکاندنی زۆنگاوان و وێنەیان لە یۆنانییەکان هەڵگرتبۆوە کە هەر لەو ڕۆژگاریدا زنەکێشیان لێدەدان. کشتوکاڵ پەرەی ئەستاند و لە سایەی شەڕ و تێکهەڵچوونەکانەوە، خەڵکی غەوارە شارەزای گیاوگۆڵ و ڕووەکی چاک و خوشخوارشت بوون و تۆویان بردنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و چاندیانن. وێنجە دەکەوتە پلەی یەکەم کە لە دەرە و دەشتەکانی [هەرێمی] مادا بە بەربڵاوی دەچێندرا و تفاقێکی هەرە چاک بوو بۆ یەکسمان. شەڕەکانی مادی [مێدیک] وێنجەیەکی زۆری بۆ تفاقی سوارەی پارسی [ئێرانی] بردە یۆنان و خەڵکی ئەوێش لێیان خواستنەوە و فێری چاندن و ڕەنێوهێنانی بوون. هەر لە ئاکامی ئەم شەڕانەدا کەڵەشێر، کۆتری سپی و تاوس کە بە ڕەسەن ئاسیایین، بردرانە ئورووپا.

خودی داریووش هۆگری ناشتنی نەمام و هێنانی داری تازە بوو. نامەیەکی بەرچاوی بە دەستەوەیە کە بۆ «گاداتیس»ی[1] میرهەرێمی ناردووە و

---

١ـ گاداتاس

دەستووری پێداوە کە لە ئاسیای بچووک و سووریا، نەمام و ڕووەکی ڕۆژهەڵاتی بنێژن و بچێنن. شا دەنووسێ: «من دەزانم دەتهەوێ وڵاتەکەم بە هێنانی داری بەری و چەقاندیان لەوبەری فورات و ئاسیای خۆرنشین ببووژێتەوە، بۆیە دەسخۆشیت لێدەکەم... .» ئەم کارە تەنیا هەنگاو هەڵێنانەوەی میرهەرێمێک نییە لەبەر دڵی پادشا، بەڵکوو ڕەچاوکردنی ڕەوتێکی ئابوورییە کە حکوومەتی ئێران دایڕشتبوو هەتا وێڕای گەشە و پەرەی داروبار و گژوگیای پێبژیو، بارودۆخی ژیانی خەڵک بەرەو خۆشی و تەسەلی بڕوا. بەم شێوەیە دەبینین کە ئێرانی هەوڵیان داوە لە دەمیشق جۆرە ترێیەک ڕەنێو بێنن کە لە بارگای میری زۆری حەز لێکراوە و هەر ئەوانیش بۆ یەکەم جار داری پستەیان بردۆتە حەلەب و چەقاندوویانە. هەر لەو سەروبەند و ڕۆژگارەدایە کە لە یۆنان کەلووز (فندق) پەیدا و شین دەبێ و پێی دەڵێن «بۆنت». هەر هەخامەنشی بوون کە کونجەیان بردە میسر و برینجیان گەیاندە دووچۆمان و ئەگەر پادشایانی یۆنان بە شێوەیەکی بەربڵاو کارێکی ئاوایان ڕەچاو دەکرد، لە ڕاستیدا وێنەیان لە پادشایانی ئێرانی هەڵگرتبۆوە.

ئێرانی کە ئاوا بە تامەزرۆیی هۆگری ناشتنی نەمام و پێڕاگەیشتنی داروباران بوون، نەدەکرا سەرنجیان نەخەنە سەر لێڕەواران و چاو لە حاند بەهرەی بایەخداریان بقووچێنن. بێگومان ناکرێ لێرەدا باسی کەلک وەرگیرانی زانستی بێتە گۆڕ، بەڵام دەبێ بڵێین کە شێوەیەک ڕێوشوێنی بۆ وەبەرچاو گیراوە. ئێمە بۆمان دەرکەوتووە کە داری سیدری لوبنان و داری لێڕەواران دەبوونە کەرەسەی پێویستی بارگای میری. داریان هەم بۆ کۆشک و خانووبەران دەکار دەکرد و هەم بۆ سازکردنی کەشتی، گەردوونەی شەڕ، عارەبانەی گەیاندن و

گواستنەوە و چەکوچۆڵ و ئامرازی شەڕ. ئاسیای بچووک، کریت، دوورگەی قوبرووس، لوبنان و هیند، ناوەندی گرینگی ڕابرینی داران بوون.

لە ئیمپراتۆری‌دا، بێجگە لە دار، کانزایەکی زۆریشیان لە کانگایان بەرهەم دێنا. قوبرووس زێو و مز و ئاسن و ئاسیای بچووک مز و زێو لە کانگاکانیان هەڵدەگیرا. ئەم کانزایانە لە «فەلەستین»یش هەبوون. هەروەها مز و ئاسن لە لوبنان و دەرە و دەشتەکانی لای سەرووی دیجلە و فورات دەردەهێندران و دەنێردرانە دەرەوە. ناوچەی کرمان خاوەنی بەرهەمی زێڕ و زێو بوو. سیستان بۆ قەڵایی بەناوبانگ بوو. باشووری قەفقاز ناوی بۆ ئاسن و زێو دەنگی دابۆوە و ئەم دوو کانزایە لە کانگاکانی باشووری دەریای ڕەشیش بەرهەم دەهاتن.

لەبەر هاویشتنی هەنگاوی گەورەی پادشایان بە مەبەستی جوانکردنی پایتەختەکانیان، کار و پیشە بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکەن و دەستووری سازکرانی کۆشکی شووش ئەو مەبەستەمان پێ دەسەلمێنێ. ئەو کۆشکەی کە خۆی ئاوێنەیەکە بۆ نیشاندانی بەردی چیاکانی عیلام، بەردەپیرۆزە و یاقیقی کانگاکانی خوراسان و ڕەنگە بەردی لاژوەردی بەدەخشان.

لە سەردەمی کەونارادا، ڕاو کردن، بەتایبەت ڕاوەماسی، پتر لەم ڕۆژگارەی ئێمە دەوری لە ژیانی خەڵکدا گێڕاوە. بەشێکی گەورە و بەرچاوی دنیای کۆن، بە دەوڵەمەند و هەژارەوە، بە نان و ماسی و ڕۆن و شەراب بەرێدەچوون. ماسیگرانی کەنداوی فارس و ڕووبارەکانی دیجلە و فورات، هەموو چەشنێکیان خوێ دەکردن، جا یان بە ویشکی یان لە سوێراوکدا دەیانخستنە کووپان و دەیانناردن بۆ شوێنی دوورەدەست. بەپێی گێڕانەوەی هێرۆدۆت بۆمان ڕوون

دەبێتەوە کە بەشێک لە پیتاکی مڵکانەی میسر بریتی بووە لە بەرهەمی ڕاوەماسی.

لە سەردەمی هەخامەنشیدا، زەوی‌وزاری بەربڵاو، سەرچاوەی بەرهەم و داهاتی کشتوکاڵ بوون و کۆمەڵێک جووتیار و ڕەنجبەری تێبەستەی مووچە و مەزرا کە پێیەوە دەفرۆشران، کاریان لەسەر دەکردن و کۆیلەی دەسکەوتی شەڕانیشیان تێوەدەدران. کشتوکاڵ بە پیشەی سەرەکیی ئێران دادەندرا و کارێکی سروشتی بوو بۆ پیاوانی ئازاد و بێ کۆت و بەند. مەزرای بچووک هەبوون، بەڵام وادیارە لەچاو ملکوماشی گەورە کە ڕێوشوێنێکی تایبەتیان بۆ دیاری کرابوو، هێندە وەبەرچاو نەدەهاتن. هۆزی خاوەن دەسەڵاتی پارس کە لە هەرێمی جێژیانی خۆی مڵکانە و سەرانەی نەدەدا، مەزرای بچووک هی خودی ئەو جووتیارە ئازادانە بوون کە کاریان لەسەر دەکردن. جووتیاران گەنم و جۆیان دەچاند و ڕەز و زەیتوونیان ڕەنێو دێنا و گاوگۆل و مەڕ و بزن و ڕەوەی ئەسپ و یەستر و گوێدرێژیان بەخێو دەکردن. هەنگەوانی زۆری برەو هەبوو کە لەو سەردەمیدا هەنگوین لەبری شەکر دەخورا.

لە شارەکاندا گەشە درا بە سەنعەتگەری، بێئەوەی دەرەبەگان واز لە دەسکاری وەستاکارانی خۆدێیی خۆیان بێنن. ئەم دەسکردانە لە پلەی یەکەمدا بریتی بوون لە جلوبەرگ، ڕانک و چۆغە و پێڵاو و لە پلەی دووهەمدا کەلوپەلی نێوماڵ کە جاری وایە ئەوەندە جوان و ڕازاوەیان ساز دەکردن کە هەر تایبەتی ئەو دەوڵەمەندانە بوو کە دەفر و ئامانی سەر سفرەیان لە زێڕ و زێو و مزقەڵایی بوو. ئەم کەلوپەلانە کە لە کانزای گرانبایی ساز دەکران، بۆ ئەوان دەبوو بە چەشنێک پاشەکەوت. ژنان خۆیان بە زێڕوزەمبەران دەڕازاندەوە و دەستیان دەبرد بۆ هەر شتێکی کە شیاوی خۆ تاس‌وللووس کردن

بووایە. لەماڵی هەژاراندا، لەبری کەلوپەلی کانزا، هەر کاریـان بـە کووپـە و دیزە و گۆزەی سوور دەکرد (ق٧٢). هەروەها پێویستـە وەبیری بێنینـەوە کـە شانبەشانی پەرەگرتنی بازرگانەتیی جیهانی، ئاستی ژیان لە ئێرانی سەردەمی هەخامەنشیدا، تینێکی بەرچاوی تێکەڕا و کۆمەڵ بەرەو گەشەی بژیو و داهات ڕۆیی؛ بەتایبەت بەپێی بۆچوونی ئابووریناسان ژیان و بەرێچوونی بابل لەچاو یۆنان گەشاوەتر بوو.



ق٧٢ـ تەختیجەمشید: دیزە و گۆزەی سەردەمی هەخامەنشی

لـە زەمـانی دامەزرانـدنی ئیمپراتـۆریی هەخامەنشـییەوە، دنیـا پێـی نابوویـە سەردەمێکی یەکجار لەبار و گونجاوی ئابووری. ئەو ناوچە و هەرێمانەی کە لە پێشوودا پێکەوە نەکەوتبوونە ئاڵوگۆڕی بازرگانی، بۆ وێنە جێگایـەکی وەکـوو بابل و یۆنان، توانییان پردی پەیوەندی هەڵبەسـتن و پـەرە بـە ڕەوتـی کارەکـە بدەن. هاوکات لەگەڵ زیاد بوونی کڕیاری بەرهەم، نرخ و قازانجی کەلوپەلەکان هەڵکشان، بەڵام زیندەماڵی وەکوو گاوگۆل کە ڕاگواستنیان دژوار بوو، نرخیان ئاڵوگۆڕی بە سەردا نەهات، کەچی نرخی زەوی لە ئێرانیش وەک یۆنان دابەزی.

باشووری ئورووپا پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و پەرەگری لەگەڵ خۆرنشینی ئاسیا دامەزراند. پێشووتر بازرگانیی ڕاستەوخۆ، بەهەڵکەوت لەو جەغزەی تێدەپەڕاند کە لە هەزارەی دووهەمی پێش‌زایین‌دا، کاری تێدا دەکرا. هاتن و تێوەدرانی دراوی سکە لە سەردەمی هەخامەنشی‌دا، بوو بە هۆی پەرەگرتن و پەل‌هاویشتنی کاروباری بازرگانی لە دەریا و ویشکانی‌دا. ئەم ڕۆژگارە بە لانی زنجیرەیەک گەشتوگەڕانی بەربڵاو و بە مەبەستی دۆزینەوەی شوێن و ڕێگا و ڕەوگەی تازەدا شایانی سەرنجە. وەکوو دیتمان «سکیلاکس» کاریاندایی، بە دەستووری داریووش لە ماوەی دوو ساڵ و نیودا، مەودای نێوان ڕێژاوگەی ڕووباری سێند هەتا میسری بە سواری کەشتی بڕی. «سەتاسپێ»ی سەرکردەی ئێرانی، لە سەدەی پێنجەمی پێش‌زایین‌دا، بە سواری کەشتی هەتا ئەوبەری کۆڵەکەکانی هێرکوول (واتە جەبەلی تاریق) ڕۆیی. لۆتکەوانانی یۆنانی و فنیقی و عەرەب، ڕایەڵەی پەیوەندیی نێوان هیند، کەنداوی فارس، بابل، میسر و لەنگەرگاکانی دەریای مەدیتەرانەیان، پێکەوە گرێ دا. بازرگانیی جیهانی زیاتر لە پێشوو پەلی داویشتە ناوچە دوورەدەستەکان و گەیشتبوویە لای «دانووب» و «ڕاین» و سکەی دۆزراوەی نێو خەزێنە شاردراوەکان، نیشاندەری چۆنیەتیی بەربڵاوبوونیەتی. تەنانەت هیندووستان و سەیلان (سەرەندیب) لەم دەورانەدا، هەزوێڵەی توێکڵی دار و ڕووەکی بۆنخۆش و بیباریان دەناردە دەرەوە. یەکێک لە نیشانەکانی گەشە و پەرەی کاروباری بازرگانی، دۆزرانەوەی ئەو گەلە کووپە و شاکووپانەن کە لە ئێرانی ئێستادا دۆزراونەوە و ڕۆژی خۆی شەراب، ڕۆن زەیتوون، داودەرمان و هەنگوینیان تێدا ڕاگوێزراوە. کەل‌وپەلی مەفرەق و هەورەهاڵ و شتی خۆڕازاندنەوەی وەکوو گوڵەسەر، بە قۆڵێکی دیکەی ئەم بازرگانییە دادەندران و لەم ڕەوتەدا

بەرهەمەکانی ڕۆژهەلات، بوونە جێگرەوەی کارگەکانی ئورووپا. گەلێک دەسکاری جوان و پڕ وردەکاری ساز دەکران کە بریتی بوون لە: مووروووی گزمووڵەی شووشەی میسر، ئەنگوستیلەی بلوور و یاقیقی باکوور، پارچە و کووتاڵی کۆرینت و میلێت و کارتاژ، قەڵغانی ئاتیکی و شمشێری بۆنتی. هێنانە بەرکاری هونەرمەندان و سەنعەتگەران بە شێوەیەکی بەرچاو پێویست بووە و ئێمە لە ڕووی دەقی سەبارەت بە سازکرانی کۆشکی پادشاوە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم خەڵکە بۆ ماوەی چەند ساڵان بەشداری دانانی کۆشکی شووش و تەختیجەمشید بوون، هەتا توانیویانە ئەرکی گرینگی سەر شانی خۆیان ڕاپەڕێنن.

ڕادەی ئاڵوگۆڕی بازرگانیی کەرەسەی خاو لە سەدەی شەشەم و پێنجەمی پێش‌زایین‌دا، لە کۆی تەواوی ئەو ئەندازەیە تێپەڕی کە هەتا ئەو زەمانی لە ڕۆژهەلاتی کۆن مامەڵەی پێکرابوو؛ بەڵام بەوە چاک بوو کە لەبری کەل‌وپەلی زریقەوبریقەداری پێشوو، پێداویستییەکانی ڕۆژانەی وەکوو شت‌ومەکی ماڵ و ئازووخە و جل‌وبەرگی هەرزانبایی، کەوتنە نێو بەستێنی کڕین و فرۆشتن. بەم شێوەیە، پیشە و دەسکاری فەریکە کە تازە بە خۆی‌دا دەهات، پتر لە پێشوو کەوتە بەردەستی تێکڕای چین و توێژەکانی کۆمەڵی ئیمپراتۆری. ئەوەی ڕاستی بێ کڕینی کانزای خاو، ڕمێنی پەیدا نەکرد و وێدەچێ کە دەسکاری خۆماڵی زۆری پەرە گرتبێ.

وادیارە دەبێ لە سایەسەری برەوی سکەوە، بازرگانیی نێوخۆ لەچاو بازرگانیی دەرەوە خێراتری پەرە ئەستاندبێ، ئەگەرچی ئابووریی داخراوی گەورەدەرەبەگانی هەرێمەکان و حکوومەتانی تێبەستەی ئیمپراتۆری، کۆسپێک بوون لەسەر ڕێگای. هەروەها سکە چالاکی و هەڵسووڕانی بانکەکانی پەرە پێدا.

لە دووچۆمان ئەم کار و هەڵسووڕانە، زیاتر دەگەڕایەوە بۆ هەزارەی دووهەمی پێش‌زایین، بەڵام شەڕ و پەلامارە گەورەکانی دەسپێکی چاخی ئاسن، نەبوونی هێمنایەتیی نێو ڕێگاوبانان و هەبوونی ئاژاوەی نێوخۆ، ڕەوتەکەی خاو کردبۆوە. ئیمپراتۆریی ئێران هەل و دەرفەتێکی وا چاکی بۆ ڕەخساندن کە هەرگیز لە پێشوودا نەبوو. کاروباری بانکی هەتا ئەو زەمانە تەنیا بە دەست مەزنەپیاوان و موغانەوە هەڵدەسووڕا و کەسانی ئاسایی بەهەڵکەوت دەیانتوانی بیکەن. لە سەردەمی هەخامەنشییەکان‌دا کۆمەڵێک بانکی کەرتی تایبەت دامەزراون و بەڵگەنامەکانیان بە دەستەوەیە؛ بۆ نموونە بەڵگەنامەکانی بانکی «ئیژیبی» لە بابل. دەستەیەک لە توێژەران پێیان‌وایە ئەمە ناوی «یاقووب»ە جوویە، کە لەگەڵ کۆمەڵی هاوڕەگەزانی خۆی لە خانە و لانەی دوورخرابوویەوە. دامەزرانی ئەم بانکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی پێش‌زایین و کاروباری لە گرێونانی شوێن و کرانەوە حیسابی بڕواپێکراو و هەڵگرتنی ئامانەتی خەڵکی دەکەوتە سەرشانی. ئەم بانکە دەسمایەی خۆی لە بواری کڕین و فرۆشتنی خانووبەرە، مڵک‌وماش، کۆیلە، یەکسم و گەمێی بارهەڵگردا، دەنایەوە و لە ڕێ‌وشوێنی دانانی حیسابی دەستاودەستکەری دراو و هێنانە بەرکاری «چەک»ی دەزانی. بانکێکی تر کە هی پیاوێکی نیپووری بوو بە ناوی کوڕی«مووراشی» و لەوەی پێشوو ساواتر بوو، پارەی کاڵای بازرگانیی وەردەگرت و کەرێزەی لێدەدان و ئاوی بە وەرزێران دەفرۆشت و بەرهەم‌هێنان و فرۆشتنی ئاوەجۆ و کاری ڕاوەماسیی کردبوویە پاوانی خۆی و بە قازانجی زیاتر دەستاودەستی پێدەکردن. کۆمەڵێک دامەزراوەی هاوشێوە بە هەڵگرتنەوەی وێنە لە رووی بانکەکانی ڕۆژهەڵاتی لە یۆنان، بەتایبەت لە پەرستگاکانی دێلۆس، ئۆلیمفیا و دێلفێس دامەزرێندران.

لێدرانی ڕێگاوبان و بەتایبەت پارێزرانی هێمنایەتیی ڕەوگان دەبوو بە هۆی هاتوچۆ و گەیاندن و گواستنەوەی خێرا. لەم سەردەمەدا شێوەیەک ڕێگالێدان پەرەی ئەستاند و ئەویش بریتی بوو لە سەنگچنکردنی ئەو بەشانەی ڕۆدەچوون و دەچمین و دەتلیسانەوە؛ تەنانەت لە هێندێک شوێنان لێدرانی شەقڵی وەکوو جۆگەلە بۆ ئامرازی هاتوچۆی تەگەردار بوو بە داب. لە سەدەی چوارەمی پێشزایین‌دا، بە مەبەستی پارێزرانی سمی یەکسمان لە ڕێگاوبانی ڕەقەن و ناخۆش‌دا، پاپۆشێکی سازکراو لە مز و کەوڵ یان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دووهەم یان یەکەمی پێشزایین. کەشتی‌سازان، دەسکاری تازەی وا دادێنن کە لە ڕۆژێکدا توانیویەتی ٦٠ تا ٨٠ میلی دەریایی[1] ببڕێ. لەو زەمانی‌دا کەشتیی وا هەبوون کە ٢٠٠ تا ٣٠٠ بۆشکەیان بار هەڵگرتووە. ئەوانەی کە بە ڕووباری گەورەی وەکوو نیل و دیجلە و فوراتدا هاتوچۆیان دەکرد، دەیانتوانی ١٠٠ هەتا ٢٠٠ بۆشکە(بەرمیل) بار هەڵگرن و بیگوێزنەوە. هەر لەو سەردەمەدا لە لەنگەرگایان ئەسکەلەیان ساز دەکردن و کۆمەڵێک هێمای دەریایی کەوتنە بەر توێژینەوە و وردەوردە کەشتی بوونە خاوەنی ناسنامە و بەڵگەنامە و لە کاروباری دەریایی‌دا شارەزایی و پسپۆڕایەتی وەبەرچاو گیران.

لە سەردەمی هەخامەنشی‌دا یەکەمین هەنگاوەکانی بەرەو ئابووریی نیشتمانی هاویژران. حکوومەت پیتاک دەخاتە سەر زەوی‌وزار و باخ و ماڵات و کانگایان. پیتاک یان ملکانەی زەوی‌وزار ڕاست وەکوو پیتاکی دیاری‌کراوی بەرهەمی دەسکرد وابوو. چەشنێک پیتاکیان هاویشتبوویە سەر ئەسکەلەی لەنگەرگایان کە وەک پیتاکی بازرگانیی نێوخۆ و دەیەکی بازاڕەکان دەهاتەوە. ئەو برە پیتاکەی کە کارگێڕان کۆیان دەکردنەوە دەنێردرانە خەزێنەی میرهەرێمەکان و لەوێشەوە

---

١ـ هەر میلێک دەبێتە ١٨٥٢ – ١٨٥٣ میتر.

به‌رێده‌کرانه خه‌زنه‌خانه‌ی میری. ئه‌م داهاتانه ده‌کرانه خه‌رجی بارگا، داموده‌زگای به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی و سه‌ربازی؛ به‌ڵام ڕێبه‌ران ته‌نیا سه‌رنجیان ده‌دایه سه‌ر کاروباری سه‌باره‌ت به لێدانی ڕێگاوبان و ئه‌و کارێزانه‌ی که بۆ ئامانجی سه‌ربازی و ئیداری وه‌به‌رچاو ده‌گیران و خۆیان له باس و ده‌مه‌ته‌قه و نیازه‌کانی دیکه‌ی ئابووری ده‌شارده‌وه. له نێوخۆی ئیمپراتۆری‌دا حکوومه‌تانی بچووک و په‌رستاگاکان وه‌کوو ناوه‌ندی ئابووری درێژه به کاری خۆیان ده‌ده‌ن، به‌ڵام چونکه پاوانی زۆر شتیان له ده‌ست ده‌رچووبوو، ده‌سه‌ڵاتیان هێنده‌ی بڕ نه‌ده‌کرد. له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ش‌دا حکوومه‌ت هۆگر بوو به چینی کرێکاره‌وه و ئه‌وه‌نده‌ی ڕێسای سه‌رده‌م ڕێده‌ستی دابا، ڕێوشوێنی دابینی هه‌قده‌ستی بۆ ڕێکده‌خستن. بێگومان نابێ لامان وابی که یاسای کار بۆ کرێکاران په‌سند کراوه، به‌ڵام کۆمه‌ڵێک نیشانه سه‌باره‌ت به تێکۆشانی ڕێکخستنی کاروباری کۆمه‌ڵایه‌تی له ته‌ته‌ڵه‌کانی خه‌زنه‌خانه‌ی ته‌ختی‌جه‌مشیددا ڕه‌نگی داوه‌ته‌وه. له‌وێ مانگانه‌ی هه‌ر توێژه‌ی کرێکاران به‌وردی دیاری کراوه؛ یانی مانگانه‌ی منداڵێک، ژنێک، کرێکارێکی ساکار یان پسپۆڕ دیاره. له‌مه‌ش پتر هه‌نگاویان ناوه و به مه‌به‌ستی ڕێگرتن له فێڵ و ته‌ڵه‌که، بارته‌قای ئه‌و پووڵه‌ی که ده‌بوو له‌بری پێداویستی و بژیوێک بدرێ، دیاری ده‌کرا. ئێمه ئاوا بۆمان ڕوون ده‌بێته‌وه که نرخی کووپه‌یه‌ک شه‌راب بۆته یه‌ک «شێکێل» و مه‌ڕێک بایی سێ شێکێل بووه. ته‌نانه‌ت مووچه‌ی موغانی خزمه‌تکاری دینیش دیاری کراوه؛ بۆ نموونه مووچه‌ی ساڵانه‌ی موغێک که به‌رپرسی دابینی هووم (هائۆما) و خواردنه‌وه‌ی پیرۆز بوو، ده‌بوو به دوازده کووپه شه‌راب.

بێگومان ده‌بێ له‌و سه‌رده‌مه‌دا جێگایه‌ک بۆ گردبوونه‌وه و حاوانه‌وه‌ی وه‌ستاکاران و کرێکاران وه‌به‌رچاو گیرابێ، چونکه به‌پێی ده‌قی ته‌ته‌ڵه‌کانی

تەختیجەمشید ئەو کەسانە لە هەموو ناوچە و هەرێمێکی ئیمپراتۆریڕا گەیشتوونە پایتەخت. ئەم بەڵگانەی کە دەبنە تەواوکەری دەقی گێڕانەوەکەی [داریووش] سەبارەت بە سازکرانی کۆشکی شووش، ڕوونی دەکەنەوە کە ڕێکخراوێکی میری بۆ ڕێکوپێک کردنی ئەم کاروبارانە لە ئارادا بووە. لەبەر زۆر بوونی ئەم کارانە، دەبێ ئەم ڕێکخراوەیە، لە هەموو شوێنێکی ئیمپراتۆری لقێکی بووبێ. سازکرانی شاران، داندرانی کۆشک و تەلاری فەرمانڕەوایەتی و بەتایبەت گەشەی خێرای بازرگانیی نێوخۆ و دەرەکی، جەماوەرێکی بەرچاوی خەڵکی بێگانەی ڕادەکێشایە هەموو ناوچە و هەرێمەکانی ئیمپراتۆری. ئێرانیش ناکەونە دەرەوەی جەغزی ئەم ئاڵوگۆڕە و دەقی بەڵگەنامەکانی بابلیش کە هەرگیز بەرلە ساڵی ٥٢١ی پ.ز. ناوی ئێرانییەکانی نیشتەجێی بابل ناهێنن، لەوەی بەولاوە ڕۆژبەڕۆژ پتر ناوی ئێرانی دێننە ئارا و دەکرێ ئەم ڕەوتە بە هرووژمێکی ڕاستەقینەی گەلی باڵادەست لێکبدرێتەوە. ئیمپراتۆری بە ویست و بە قۆشەنی خۆی تینی بۆ ئێرانییەکان هێنا کە لەو دوورەپەرێزی و قاوغەی نێوخۆی بانووی ئێران دەرباز بن و لە سەرانسەری ئاسیای خۆرنشیندا بڵاو ببنەوە.

### جێنشینەکانی داریووش

سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی داریووش، چڵەپۆپەی هێز و دەسەڵاتی ئیمپراتۆری و لووتکەی شارستانییەتی هەخامەنشی بوو. ئیمپراتۆری بۆ ماوەی سەدە و نیوێک هەر لەسەر ئەم ڕەوتە دەڕۆیی کە کووروش دایمەزراند و داریووش گەشەی پێدا. وەکوو دیارە ڕەوتەکە دانەکووژاوە، بەڵام قەتیسمانی ژیانی هەر گەلێک، هاوسەنگە لەگەڵ نەمانی. برانەوەی پێشکەوت و جاری وایە نەبوونی پێداویستییەکانی پاراستنی ئەوەی کە ئەم دوو بناغەدانەرە، کۆیان

کردبوونەوە سەر یەکتر، وڵات بەرەو تێداچوون دەبا. گومانی تێدا نییە کە ئیمپراتۆری هێشتا خەریکی برینی قۆناخەکانی بەختەوەری و تەنانەت هێندێک پێشکەوتنیش بوو، کە لەم بابەتەوە قەرزداریاری چەند گەورەپیاوێکی دەگمەنە. ئەمانە کاتێک جێگای داریووشیان گرتەوە، زۆر بە وریایی و شارەزایانە نەیانهێشت ڕێوشوێنی هەڵوێست و ڕێبازی کوێر ببێتەوە؛ بەڵام ئەم دەسکەوتە کاتی و زووتێپەڕانە بۆیە وەدی دێن، هەتا تێکهەڵگلان و نەمانی خێراتر بێ. دوای شکانی خەشایارشا لە یۆنان و بۆ ماوەی پتر لە سەدەیەک، هیچکام لە پادشایان چەشنی کووروش و داریووش، خۆیان لەگەڵ هێزەکانیان نەدەبزووتن. ملبەملە و پیلانگێران و گێرە و کێشەی پیاوانی بارگای پادشایەتی و کوشتاری ئەندامانی بنەماڵەی فەرمانڕەوا لەسەر تەختی دەسەڵات، وای هێز و بڕست لەو خانەدانە بڕی، کە بۆ وێنە ئەردەشێری سێهەم کوڕێکی لە پاش بەجێنامێنێ هەتا جێی بگرێتەوە؛ جا بۆیە وەک پێویستییەک خزمێکی دووری ئەردەشێر دەکەن بە پادشا و بە داریووشی سێهەمی [ناودێر دەکەن][1]، هەتا نەهێڵێ وەجاخی ئەم خانەدانە بکووژێتەوە. هەخامەنشی ئەو بنەماڵەیە بوون کە ئێرانیان لە شانی گەلانی دیکەی دنیا تێپەڕاند.

سەرکەوتنی بەدەنگ و هەرای ئەسکەندەر هەموویان ناگەڕێنەوە سەر لێهاتوویی شەڕکەرانەی خۆی یان ئازایەتیی سەربازانی مەقدوونی یان تەنانەت تامەزرۆیی و ئەوینی گەرموگوڕی دەربازبوونی یۆنانییەکان لە ژێر نیری جەماوەری ئێرانی. پادشایانی هەخامەنشی و جێنشینانی داریووش، زیاتر خۆیان بوونە ڕێکخۆشکەری سەرکەوتنی ئەسکەندەری مەقدوونی و گرتنی دنیا. ئەوان لەسەر خۆبەزلزانی و بەرچاوتەسکی و نەبوونی تێگەیشتنی سیاسی و

---

١ـ داریووشی سێهەم، ناسراو بە کۆدۆمان، دوایین پادشای هەخامەنشییە.و.

نەتەوایەتی، هەتا ئەندازەیەک ڕێگای گلان و ژێرەوژووربوون و نەمانی خۆیان تەخت کرد. گەلی ئێران وای لە چارەی نووسرابوو، کە هەرکات یەکێک لە شازادەکانی لەچاو ئەوانی دیکە بەجەرگ و هەڵکەوتووتر بێ ـ وەک چۆن کووروشی گچکە وابوو ـ لێی وەخۆ کەون و ڕاسان و هەستانی لەجێوە داکووژێنن. هیچکام لەو کەسانەی کە دوای خەشایارشا لە شووش چوونە سەر تەختی دەسەلات، نەیاندەتوانی وێنە لە ڕێبازی جوامێرانەی کووروووش یان هەڵوێست و سیاسەتی توندوتۆڵی دووربینانەی داریووش، هەڵبگرنەوە. ئەوان هیچ هەنگاوێکیان لە پێناو دابین بوونی پەیوەندیی نێوان گەلی سەردەسەلات و هۆز و نەتەوە بەرفەرمانەکانی ئیمپراتۆری‌دا هەڵنەهێناوەتەوە و هەر لە بیری پێهەلاچوونی دەسەلاتی خۆیان‌دا بوون و زێڕەکانیان لە ڕێی گێڕانی پیلان و کاری چەپەڵ‌دا بەخت دەکرد. ئاوا بوو کە بەردی بناغەی پادشایەتی هەڵتەکا و ئامانجەکانی بە لاڕێ‌دا چوون. شاهانشایەتی قیت و قۆز دەهاتە بەرچاو و دەتگوت لە هەموو کاتێکی تەمەنی پتەوترە، بەلام لە نێوکی‌دا گەرای کرمی گەندەڵی هارووژابوو. هەتا زەمانێکی کە نەکەوتە بەر هەڕەشەی بەگوڕمی دەرەکی و هەتا ئەو کاتەی کە توانی لە جەنگەی تەنگەژان‌دا، بە زێڕ و ماڵ خۆی بپەڕێنێتەوە، درێژەی دا بە ژیان. حکوومەت وای نواند کە خاوەنی هەمان هێز و دەسەلاتەی سەرەتای دامەزرانی خۆیەتی؛ بەلام لە پێش چاوی بە مۆلەق‌وەستاوی خەڵکی سەرسوڕماوی جیهان، نەیتوانی خۆی لە ئاست زەبری بەراییی پەلاماردەرێکی تەمادار بگرێ و ڕووخا. گەلی ئێران کە بە تامەزرۆیی بە شوێن دوو پێشەوای سەرەتادا ڕۆیی، هێشتاش تین و گوڕی لاوەتیی هەر مابوو. هێشتاش دەیتوانی خۆی لە قەرەی کاری ئازایانە و سەرکەوتووانە بدا، بەلام جڵەودارێکی لێوەشاوەی بۆ نەدۆزرایەوە، هەتا بەرەو

چارەنووسێکی تازەی بەرێ. ڕمانی حکوومەتی هەخامەنشی خەسارێکی گەورە بوو بۆ گەلی ئێران، بەڵام دیسانیش توانی خۆی بگرێتەوە و بەبێ لێکدابڕان، وردەوردە سەری بەرز بکاتەوە و ببووژێتەوە و خێرایەکی بیسەلمێنێ کە چۆن گەلێکی بەزیو دەتوانێ بە ڕەچاو کردنی ڕێبازی ئاشتی، بە سەر بەزێنەری خۆیدا زاڵ بێ.

## خەشایارشا (٤٨٦ - ٤٦٥ی پ.ز)

خەشایارشا کە داریووش بە جێگرەوەی خۆی دانابوو، پاش دوازدە ساڵ حکوومەت لە بابل، لەسەر تەختی پادشایەتیی ئێران پاڵی دایەوە. یەکێک لە یەکەمین گرێ و کۆسپەکانی سەر ڕێگای، دەمکوتی سەرهەڵدانی میسر بوو کە لە زەمانی باوکییەوە دەستی پێکردبوو. لەبەر زەبروزەنگی خەشایارشا، خەڵکی میسر، ڕقی خۆی خواردەوە و چاوەڕوانی دەرفەتی تۆڵە مایەوە. هەر بەو گوڕ و تینەوە دژی بابلی ڕاپەڕیویش وەخۆ کەوت و فەرمانی ڕووخاندنی شوورەی ئەو شارە و کاولاندنی پەرستگا و تواندنەوەی پەیکەرەی زێڕینی خودای «بەعل»ی دا. لەو کاتەوە بەرەودوا تازە سەرناوی «پادشای بابل»ی لەسەر خۆی لابرد و قنیاتی کرد بە «پادشای پارسان و مادان». لەوەی بەولاوە پادشا تەنیا بڕوای بە نەتەوەی سەردەسەڵات بوو.

پاش ئەوەی ئارامی باڵی بە سەر ئیمپراتۆریدا کێشا، خەشایارشا کە هۆگری ژیانی شکۆمەند و بە زریقە و بریقەی بارگای ببوو، خۆی بە سازاندنی کۆشک و تەلارانەوە سەرقاڵ کرد و وازی لە درێژەی شەڕ هێنا، بەڵام شتێکی دیکەی لە چارەی نووسرابوو. ئەم پادشا ڕاڕایە، خێرا کەوتە ژێر باندۆری باڵی شەڕخوازی ئیمپراتۆری و دوورخراوەکانی ئاتێنی و بەپێچەوانەی ویستی دەروونیی خۆی، بڕیاری دا بکەوێتە شوێنپێی کارەکانی باوکی و لێبڕا هەتا

دامودەزگـای قۆشـەنی سـامناکی سـازکراوی بـاوکی بخاتـە گـەڕ. قۆشـەنی خەشایارشا پێکهاتبوو لە چەکدارانی ٤٦ هۆز و نەتـەوە کـە ٢٩ فەرمانـدەی بـە ڕەسەن پارسی، سەرکردایەتییان دەکردن. مادەکـان و بابلییـەکان تـەنیا کـاری لادەستەیان پێ ئەسپێردرابوو. هێزە چەکدارەکانی خەشایارشا بە سەرکردایەتیی خۆی بەرەو یۆنان بزووتن و تەمای وابوو کە لە ویشکانیڕا پەلامار بەرێ، نەک بە دەریادا. فنیقییەکان لە گەرووڵەی [داردانێل] پردەگەمێیان هەڵبەست و سپای ئێران لە ماوەی حەوت شەووڕۆژی بێپسانەوەدا پێیدا پەڕینەوە. پادشای مەزن خـۆی دایـە ژێـر داڵـدەی بـەغان (خودایـان) و بـە شـوکرانەی دەربازبوونیـان، شەرابیان پرژاند و پیاڵەیەکی زێڕ و شمشێرێک و کەوانێکیان بە دەم ئاو دادا. تێسالی و مەقدوونییە هەر دەستیان نەکردەوە و باکووری یۆنان سەری وەبەر پادشا هێنا. ئێستا بـە تێهێنـانی ئاسـیا و ئـەفریقا، پتر لـە نیـوەی دنیـای یۆنـانی کەوتبوونە ژێر ڕکێفی پادشاوە. زووتر دیموکراتەکانی ئاتێن (ئەسینا) تەمایان گرتبوو لەگەڵ ئێرانییەکان پێکبێن و ببنە هاوپەیمان، بەڵام نیشتمانپەرستان دژی ئەم بیرۆکەیە ڕاوەستان و بە سەرۆکایەتیی ئیسپارت، یەکییەتییەکیان پێکهێنا و لێبڕان هەتا لە بازگە و گەرووی تێرمۆپیل چاوەڕوانی دوژمن بن. لـەم کاتـەدا هێزی دەریاوانیی ئێران کە پشتیوانی پەلامارەکە بوو، ڕەشەبا گێژی پێدا، بەڵام هێـزی زەمینـی هێرشـی کـرد و لەسـەر گـرد و لاباسـکان بـەرەوڕووی بەرەنگاربوونـەوەی ئازایانـەی تاقمێـک یۆنـانی بـۆوە. شـەڕێکی خوێنـاوی کـە هیچکەس نەیدەزانی بە کێها لادا دەکەوێ و ئاکامەکەی دەبێتە چی، هەڵگیرسا و هێندەی نەمابوو کە ئێرانی بشکێن، بەڵام خەیانەتی کابرایەکی یۆنانی، بۆیان بوو بە پەیژەی سەرکەوتن. ئاتیکی چۆڵکراو و ئاتێن گیران. بەربەرەکانیی بوێرانەی تاقمێک نیشتمانپەرست لـە ئـاکرۆپۆل، سـووتمانێکی گـەورەی لێدەکەوێتـەوە و

خەڵک و خانە و لانە و پەرستگاکانیان دەبنە دەستەچیلە و خاک و خۆڵەمێش؛ بەڵام یۆنانی دەستیان بەرنەدایەوە. گەمییە شەرکەرەکانیان لە سالامیس کۆبوونەوە و لێبڕان هەتا ئەو قەپۆزەیە بپارێزن. لەوێ بە بەرچاوی خەشایارشاوە کە لە گردێکەوە دەیڕوانی و لەسەر تەختێک پاڵی دابۆوە، هێزی دەریاوانیی یۆنانی، گەمییەکانی پادشای گەورەیان تێکشکاندن و ئاوا سێیەکی هێزەکانی تێداچوون (٤٨٠ی پ.ز)، بەڵام دیسانیش ئەم شکستە شتێکی وا نەبوو بۆ ئێران. قۆشەنی هەروەک خۆی مابۆوە و هەموو ناوچەکانی لە ژێر دەسەڵاتیدا بوون و ئەوەندە دوژمنەی کە بە هەزار کوێرەوەری و دەردەسەری بەرەوڕووی ڕاوەستابوو، گرێ و کۆسپێکی ئەوتۆ نەبوو؛ بەڵام خوو و سرشتی توند و تیژ و گەرمەتاوی خەشایارشا، کە بە چاوی خۆی شکانی هێزی دەریایی دەبینێ، زوو هەڵدەچێ و بڕیاری گەڕانەوە دەدا. پادشای هەڵچوو، بەرچاوی تاریک دەبێ و ناتوانێ ددان بە سەر جەرگی خۆیدا بگرێ و لەڕێوە فەرمانی کوژرانی دەریاسالاری فنیقی دەدا. ئەم کارە وا دەکا کە تەواوی هاونیشتمانانی کابرای دەریاسالار بتۆرێن و لە هێزە دەریاییەکانی هەڵبڕێن و میسرییەکانیش بکەونە شوێنیان و بگەڕێنەوە. خەشایارشا «مەردۆنیووس»ی[1] دەریاسالاری تازەی ئێران، کە پیاوێکی یۆنانی بوو، لەوێ دادەنێ و خۆی دەگەڕێتەوە ئاسیا.

مەردۆنیووس بڕیاری گۆڕینی شێوازی ملانەکانی دا و لەگەڵ ئاتێن کەوتە گوفتوگۆ و پێشنیاری پێکهێنانی هاوپەیمانی و قەرەبووی زیانەکان و خودموختاریی پێکردن. هەوڵەکان هیچیان لێ شین نەبوو، هەر بۆیە بەناچاری شەڕی هەڵگیرساندەوە و هێرشی بردەوە سەر ئاتیک و ئاتێن و ئەوەی پارەکە بە ساغی دەرچووبوو، ئاوری تێبەردا و گەڕایەوە. سەرەنجام هاوپەیمانان

---

١ـ ماردۆنیووس

توانییان قۆشەنێک پێک بێنن کە بە مەندی بەرەو دوژمن بزووت و هێزەکان لە پلاتە (پلاتێ) تووشی یەکتر هاتن (٤٧٩ی پ.ز)، بەڵام مەردۆنیووس بە سەر هەڵەیەکی گەورەدا کەوت و خودی خۆی چووە مەیدان و کوژرا. قۆشەن بە تێداچوونی سەرکردەکەی تیر و شیری نەهاویشت و نەوەشاند. لە ڕوانگەی یۆنانییەکانەوە ئەمە سەرکەوتنێکی بێ کەموکورت بوو، بەڵام دوای شەڕی سالامیس، ئەم سەرکەوتنە نەیدەتوانی یەکلاکەرەوە بێ و بۆ ئێرانییەکان خواربێتەوە، چونکە هێشتا دوو بەش لە سێ بەشی قۆشەنەکەیان لە ئاسیا بە دەقنەشکاوی مابۆوە. ئەوەی ڕاستی بێ واوێدەچێ کە نەگبەتی داوێنی پادشای ئێرانی گرتبێ، چونکە هەر لەو ڕۆژەی شەڕی «پلاتە»دا، پەلێک گەمێی تازەی یۆنانی پەلاماری گەمییە لەنگەرگرتووەکانی ئێرانی دەدا لە «میکال»ی نیزیک «سامۆس» و هەموویان دەسووتێنێ و قۆشەنی ئێران شکستی بە سەر شانیدا دێ و دەبەزێ.

پاش ئەم سەرکەوتنە، بەشێک لە ئیۆنییەکان چوونە پاڵ یەکییەتیی یۆنانەوە، کە ڕەوتی بەرەنگابوونەوەی گۆڕیبوو بۆ ڕەوتی پەلامار و چەند سەرکەوتنێکی وەدەست هێنابوو. ئاتێن دەبێتە سەرجەلەی هاوپەیمانی (یان یەکییەتیی) دێلۆس، کە هەرکام لە ئەندامەکانی دەبوو بۆ دابینی چەکوچۆڵ و پێداویستییەکانی شەڕ، بڕە دراوێک بدەن. سەرەنجام یۆنانی لە بەستێنەکانی «ئووریمێدۆن»، سەرکەوتنێکی تازە وەدەست دێنن و ئێرانییەکان لە نێو شوورە و قەڵاتی سازکراوی داریووش، لەولای ئاسیای بچووک، دەردەپەڕێنن (٤٧٠ی پ.ز). بێهێزی و شکستی خەشایارشا لەسەر ئیمپراتۆری گران دەکەوێ و ئورووپا بە یەکجاری ئاسیا بۆ ئەو دیوی گەرولەی [بۆسفۆر و داردانێل.ب] پاشەکشە پێدەکا.

له نیگای یه‌که‌م‌دا، زاڵبوونی یۆنانی بچووک به سه‌ر قۆشه‌نی گه‌وره و گرانی ئیمپراتۆریی ئێران‌دا جێی سه‌رسوڕمانه، به‌ڵام به وردبوونه‌وه‌ی زیاتر هۆکاره‌کانی ڕوون ده‌بنه‌وه. هیچ گومانێک له بایه‌خ و توانستی ده‌سکه‌ره‌وه‌بوونی چه‌کدارانی یۆنانی‌دا نییه، به‌ڵام زۆربه‌ی سه‌رکرده‌کانیان لێنه‌وه‌شاوه و هه‌رده‌بیر بوون. شکستی ئێرانییه‌کان ده‌گه‌ڕێته‌وه سه‌ر هه‌ڵه‌ی سه‌ربازی و سیاسیی خۆیان. ڕێ‌وشوێنی ڕێکخستنی قۆشه‌نی ئێران به هیچ بارێک‌دا له‌بار نه‌بوو. ئه‌و سه‌دان هه‌زار که‌سه‌ی که‌وتبوونه نێو ڕیزه‌کانی قۆشه‌نی ئێرانه‌وه، به‌گوێره‌ی چه‌ک‌وچۆڵی ئێرانی له یه‌کتر کۆنه‌کرابوونه‌وه، به‌ڵکوو به‌پێی بنه‌مای ڕه‌گه‌زی خۆیان ته‌یار کرابوون. هیچ خواردن و خۆراکێک له ئارادا نه‌بوو. له‌شکرچییه‌کانی میری ده‌بوو بژیوی خۆیان له ناوچه داگیرکراوه‌کان دابین کردبا و ئه‌مه‌ش بۆ قۆشه‌نێکی ئاوا گه‌وره ده‌ستی نه‌ده‌دا و نه‌ده‌گونجا. له لایه‌کی دیکه‌وه به‌شێکی به‌رچاوی هێزه ده‌ریایی‌یه‌کانی ئێران، ئییۆنیایی و یۆنانییه‌کانی نیشته‌جێی ئاسیا بوون و ده‌بوو تێبینیی ئه‌وه کرابا که له شه‌ڕێکی ئه‌تۆدا ڕه‌نگه لایه‌نی برایانی ئوورووپاییی خۆیان بگرن. ئه‌مانه هه‌موو له لایه‌ک و لێنه‌زانیی سه‌رکردایه‌تیی هه‌ره باڵا و دڵنیابوونی خه‌ست‌وخۆڵی ڕاوێژکارانی میری و فی‌فی‌بوونی خودی پادشاش له لایه‌کی دیکه‌وه، جێگای سه‌رسوڕمانن.

ئه‌م نه‌هامه‌تی و به‌زینانه، به‌گشتی پادشای ژێروژوور کرد و هه‌ر چه‌شنه هه‌ستێکی تۆڵه‌ی له ناخ و ده‌روونی‌دا ڕاماڵی و تازه له پایته‌خته‌کانی خۆی وه‌ده‌رنه‌که‌وت. له ته‌ختی‌جه‌مشید و شووش درێژه‌ی به کاره ناته‌واوه‌کانی باوکی دا و کۆتاییی پێ‌هێنان و خۆی به سازکردنی کۆشک و ته‌لاری تازه‌وه خافڵاند. فیز و ده‌ماری ملهوڕانه‌ی پادشا له‌وپه‌ڕی خۆی‌دا له‌و شوێنانه ڕه‌نگی ده‌دایه‌وه و ئه‌ویش دڵی پێیان خۆش بوو.

مێژووی تازە دەیهەوێ هورم و ئابڕوو بگێڕێتەوە بۆ کوڕی داریووش. دەکرێ قبووڵی بکەین ژێدەرانی یۆنانی، کە تەنیا سەرچاوەی ئێمەن لەم بابەتەدا، بە شێوەیەکی خۆنەپارێزانە، ڕوخساری کاولکەری ئاتێنیان شێواندووە و پێیان لێهەڵێناوە. زۆر وێدەچێ کە تێشکانەکانی خەشایارشا لە ڕوانگەی هاوچەرخانییەوە هێندەی داهاتووان بایەخی پێنەدرابێ، ئەگەرچی بەڵگەی ڕوون بە دەستەوەن کە دەریدەخەن ئەم شەڕانە، زەبرێکی قورسیان لە وڵاتەکەی وەشاندووە؛ چونکە بۆ ماوەی دە ساڵان تەواوی کارەکانی تەختیجەمشید و شووش ڕاگیران و ئەم کۆشک و تەلارسازە پایەبەرزە دەستی کێشایەوە. ئەو دەقانەی خەشایارشا کە لەم دواییانەدا لە تەختیجەمشید دۆزراونەوە، دەڵێن نەک تەنیا هەر پارێزەری دینی ڕەسمی بووە، بەڵکوو بانگەوازی بۆ کردووە و پەرەشی پێداوە و بەرپەرچی پەرستنی دێوانی داوەتەوە و پەرستگاکانی لە ماد وێران کردوون. بێگومان خەشایارشا میسر و بابلی گرتن و بە هەموو هێز و دەسەڵاتی سامناکی خۆییەوە تینی بۆ ئەم نەتەوە لەمێژینانە هێنا؛ بەڵام نەیدەزانی کە ئێستا جەنگەی گۆڕینی شێوازی هەڵسوکەوتە لەگەڵ نەتەوە ژێردەستە و بەزیوەکان و دەبێ دەست لە دروشمی خۆهەڵکێشانی نەتەوەی مەزنەوەجاخ و بێبەرگێڕەوە، لابدا. ئێرانی کە تازە لە تافی لاوی پەڕیبوونەوە و ببوونە فەرمانڕەوای گەلێک شارستانییەتی کۆن، دەبوو ئەوانیان پتر لە کاروباری بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆریدا بەشدار کردبا، بەڵام لەتەرکێن کارێکی ئاوایان نەکرد. ژیانی خەشایارشا لە نێو جەغزی پیاوانی بارگا و خواجەکانی حەرەمخانەدا کە ڕۆژبەڕۆژ پتریان کارتێدەکرد، بە شێوەیەکی کارەساتبار کۆتایی پێهات و لە نێو کۆشکی شکۆمەندی خۆیدا کوژرا (٤٦٥ی پ.ز).

### ئەردەشێری یەکەم (۴۶۵ - ۴۲۴ی پ.ز)

کاتێک کوڕێکی بێبڕست و بڕشتی خەشایارشا جێگای باوکی گرتەوە، برایەکی کە میرهەرێمی بەلخ بوو، لێیڕاپەڕی. ئەم هەڵگەڕانەوەیە خێرایەکی سەرکوت کرا و کوژرانی تێکڕای براکانی دیکەی پادشای تازەی بە شوێندا هات. میسریش ڕاپەڕی، بەڵام ئەمجارەیان کەوتە بەر هەڵمەتی ئاتێن کە چاوی بڕیبوویە گەنمی میسر و زۆر بە زەحمەت بە گەروولاندا بۆی ڕادەگوێزرا. یەکەم پەلاماری ئێرانییەکان بۆ سەر میسر بەرەورووی تێشکان بۆوە، بەڵام هێزی بەرچاوی پشتیوان گەیشتنە یاریدەیان و سەریان خستن و ئێرانی تەنانەت گەمییە لەنگەرگرتووەکانی ئاتێنیشیان لە ئاوڕێژگەی ڕووباری نیلدا سووتاندن. هەر لەم ڕۆژگارەدا، زێڕی ئێرانی، ئیسپارتی دژی ئاتێن هەڵخراند. ئاتێن لە پۆپەی دەسەڵاتیدا، زەبرێکی گورچووبڕی وێکەوت، بەڵام خێرایەکی بە گۆڕینی هەڵوێست و سیاسەتی، قەرەبووی کردەوە. بە هەوڵ و تێکۆشانی شێلگیرانەی «سیمۆن»، ئاتێن لە ئیسپارت نیزیک بۆوە و بە یاریدەی ئەو حکوومەتە خۆی لە شەڕی ئێرانییەکان هەڵکرد و چەند دەسکەوتێکی وەکوو سەرکەوتنی «سالامیس»ی وەدەست هێنا. لە ئاکامی ئاشتی و پێکهاتنی دوای ئەم تێکهەڵچوونە، پادشای گەورە ناچار کرا هەتا دەست لە شارە یۆنانییەکانی ئیۆنییە، کە ئەندامی یەکییەتییەکە بوون، هەڵبگرێ. ئیتر سەربازانی ئێرانی نەیاندەتوانی لە ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق) واوەتر بڕۆن. ئەمە خۆی نیشانەی پاشەکشەیەکی تازە و لەزەبری ئیمپراتۆری بوو، بەڵام بە تەخشانپەخشانی زێڕ، توانی دیسان هەرای نێوان ئیسپارت و ئاتێن هەڵگیرسێنێتەوە و هەوساری کاران بگرێتەوە دەستی خۆی.

هاتنە سەر دەسەڵاتی پێریکلێس لە نێوەڕاستەکانی سەدەی پێنجەمی پێشزایینیدا، بە یەکێک لە پڕشنگدارترین چاخەکانی مێژووی ئاتێن دادەندرێ.

ئەم وڵاتە بچووکە، دامەزرێنەر و ڕێبەری خاوەن برشتی یەکییەتی دیلۆس بوو. گەشەی کاروباری بازرگانی و ئەو بەشەی کە ئەندامانی یەکییەتی بە مەبەستی پارێزران دەیاندایە، کردبوویە دەوڵەمەند و کەوتبوویە سەر ڕچە و ڕێبازی ئاڵوگۆڕی سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەرکەوتنی بیروڕای گەلسالارانە. بە مەبەستی خوڵقاندنی کار بۆ چینی کرێکاران، چەند هەنگاوێکی گەورەی هاویشتن کە بریتی بوون لە: سازکردنی دیوار و شوورەی درێژ، قۆرخانە، پەرستگا، شەپۆلشکێن، لەنگەرگا و جێی بار و بەتاڵکردنی گەمییان. ناکۆکی و دژایەتیی نێوان ئەم وڵاتە و ئیمپراتۆریی ئێران، ڕوون و ئاشکرایە. لە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریدا، خەرجوبەرجی کاران قورسایی دەخستە سەر شانی نەتەوە بەزیوەکان و ئەو شارانەی وەک بابل کە پێشتر تێر و تەسەل و ئاوەدان بوون، لەم سەردەمەدا بە سەر ویرانیدا کەوتبوون و لە وڵاتێکی وەکوو میسر، چەند شارێک کەوتبوونە بەر شاڵاوی سووتان و خاپوور ببوون.

ئەردەشێر لە بابل ڕاستەوڕاست کەوتە شوێن ڕێبازی باوکی و ئەگەرچی کاهینانی بەعل ـ مەردووک، ڕێگا درابوون هەتا ڕێوڕەسمی دینیی خۆیان بەڕێوەبەرن، بەڵام بەڕێوەچوونی هەرێمەکە بە دەست ئێرانییەکان زۆر بە توندوتۆڵی پەیڕەو دەکرا. پادشا زەمینی بابلی بە سەر کەسانی ئێرانیدا دابەش کرد. تەواوی دادوەرەکان تەنیا پارسی بوون، هەروەک چۆن هەموو دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتیش هەر بە دەست ئەوانەوە بوو. کۆمەڵی موغانیش لەوێ پلە و پایەخێکیان پەیدا کرد. خەڵکی خۆوڵاتیی بابل لە ژێر باری قورسی پیتاکاندا وردوخاش ببوون و لە هەلێک دەگەڕان بۆ ڕاپەڕین. ئەو کاتەی کە میرهەرێمی سووریا هەڵگەڕایەوە و گیرا و خێرایەکی کەوتە بەر سیلەچاوی بەخشینی پادشا، بارودۆخەکە پتر ئاڵۆزکا. ئێرانییەکان جگە لەوەی ناوچەکانی

باڵی خۆرنشینیان لە چنگی دەرچوو، بەشێکی باڵی خۆرهەڵاتیشیان بە دەستەوە نەما. یەکەمین نیشانە نەهێنییەکانی داڕووخانی دەسەڵات لە ژێرەوە چاوی بز کردبوون و هەستی مەترسیی دەورووژاند و ڕەنگی دەدایەوە. ئیمپراتۆری پاش کۆمەڵێک سەرکەوتنی هاوپەیمانان، لە پێش چاوی یۆنانییەکان تازە بە دوژمنێکی بەسام و بەهێز دانەدەندرا. نووسەرێکی وەکوو «ئوورپیپیدێس» کە ئاوێنەی بۆچوون و لێکدانەوەی زەمانی خۆیەتی، دەڵێ: «ئاسیا بۆتە کۆیلەی ئورووپا». لە ماوەی پەنجا ساڵدا بارودۆخ بەجارێک گۆڕابوو.

ئەردەشێر بە ڕەچاوکردنی ڕێبازی کووروش و داریووش، ئیزنی دا بە «عەزرا» کە بڕواتە بەیتولموقەددەس و ١٥٠٠ بنەماڵەی دوورخراوەی کۆنی جوولەکان لەگەڵ خۆی بەریتەوە؛ بەڵام ئەم لێکدابڕان و ناکۆکییەی کەوتە نێوان ئەوان و هاودینانی دیکەیان کە هەرگیز لە فەلەستین دەرنەچووبوون، کارێکی وای کرد هەتا پادشا بە پارێز هەنگاو هەڵێنێتەوە. تەنانەت «نەحەمیا»ی مەیگێڕ و باوەڕپێکراوی خۆشی نارد هەتا کۆتایی بە کێشەکانیان بێنێ. ئەردەشێر بە چاوی نیازپاکانەوە دەیڕوانییە کۆمەڵی جوولەکان، بەڵام بەو مەرجەی کە ڕێبەرانیان وەفاداری دەسەڵاتی میری بن. عەزرا وەکوو یەکێک لە دامەزرێنەرانی گەورەی جوولەکایەتی، چەند یاسایەکی بۆ کۆمەڵی خۆی داڕشت. سیاسەتی ژیرانەی عەزرا کە بریتی بوو لە سەربانەدان لە حاند دەسەڵاتی حکوومەتی ئێران، هەلی بۆ گەلی جوولەکە ڕەخساند کە بە خۆیدا بێ و ژیانی تێهەڵێنێتەوە. لە ساڵی ٤٤٥ی پێشزایینیدا، پەرستگا و دیوارەکانی بەیتولموقەددەس نۆژەن کرانەوە و ماڵی گەورە کرایە حوکمداری بەیتولموقەددەس و یەهوودییە.

ئەردەشێر هەرگیز خۆی نەبوو بە پێشەنگی هێزەکانی و لە ئاخری ژیانیدا تەنانەت سەرنجێکی ئەوتۆی نەدەدایە کاروباری یۆنان کە بۆ پارێزرانی هورم و

ئابووری ئیمپراتۆری، خاوەنی بایەخی تایبەت بوو. ئەو کۆشک و قەڵاتەی دەسەڵات کە داریووش دایڕشتبوون، وردەوردە و بە شێوەیەکی نابەرهەست قەڵشتیان دەبرد.

سەرەڕای ئەمەش، سەردەمی پادشایەتیی ئەردەشێر، نیزیکایەتییەکی ڕاستەقینەی فەرهەنگی دەکەوێتە نێوان ئێران و یۆنانەوە. ئەم نیزیکایەتییە بوو بە هۆی بەدی هاتنی هێندێک ئاڵوگۆڕ لە دەسکارە هونەرییەکانی زەمانی ویدا. مێژوونووسان و زانایانی یۆنانی بە میسر و بابل و ئێراندا دەگەڕان و فێری دیرۆک و دین و زانستەکانی ڕۆژهەڵاتی دەبوون و دەیانناساندن. هێرۆدۆت لەم ڕۆژگارەدا کتێبی «گەڕانی جیهان»ی نووسی و وێدەچێ ئەگەر بێتوو ئاشنا نەبووبا لەگەڵ «دێمۆکریتووس»ی زانای بابلی، نەیتوانیبا گریمانەی هەبوونی «گەردیلە» بەدی بێنێ.

دوو دنیای خۆرهەڵات و خۆرنشین، پێوە بوون کە زانیاری پێکەوە بگۆڕنەوە و ئورووپای چەقیو لە حاند ئاسیادا، خەریک بوو ئەو سامانەی لەوێوە دەردەکێشا کە لە ماوەی هەزاران ساڵدا، سەرەڕای قەومانی شەڕ و ئاژاوە و تەنینەوەی نەخۆشیی کوشندە کە هەردک لای بەبێ جیاوازی دەهاڕی، لێی پاشەکەوت کرابوو.

## داریووشی دووهەم (٤٢٤ - ٤٠٥ی پ.ز)

سەرتاسەری سەردەمی حکوومەتی ئەم پادشایە بەختی پیلانگێڕان و گەندەڵی و چەپەڵی کرا و تروسکەی زێڕەکانی ڕێی ئەم ڕەوتەی تەخت دەکرد و لە شەڕەکانی «پێلۆپۆنێز»دا، ئاتێنی لە خشتە برد و بە گژ ئیسپارتیدا کرد. ئەم کارە بۆ ئیمپراتۆری هەتا ئەندازەیەک بە چەشنێک سەرکەوتنی سیاسی و تۆڵەی شەڕەکانی مادی [مێدیک] لێکدەدرایەوە. ڕاپەڕینی میرهەرێمی

سارد کە ئاتێن پشتیوانیی لێدەکرد، هەلێکی وای ڕەخساند کە ئیسپارت لایەنی پادشای گەورە بگرێ. تیسافرێن کە لە نێو سیاسەتمەدارانی ئێرانیدا لە هەمووان لێوەشاوەتر و بەهەڵوێستتر بوو، پادشا ڕایسپارد هەتا ئاوری ئەو ئاژاوەیە ڕۆمرکێنێ. تیسافرێن بە یاریدەی چەکدارانی بەکرێگیراوی یۆنانی، خاشەی ئاژاوەکەی کێشا، بەڵام کوڕی میرهەرێمی هەڵگەڕاوە، شەڕەکەی باوکی درێژە دا. پادشا پاش ئەوەی پەیماننامەیەکی لەگەڵ ئیسپارت مۆر کرد، لەگەڵ ئاتێن کەوتە شەڕ و سەرلەنوێ چەند شارێکی یۆنانینشینی گرتەوە و دانیشتووانی ناچار کردن کە ئامێز بۆ سەربازگەکانی ئێرانی بکەنەوە و هەرچی پیتاکی دواکەوتوویە بیدەن. پاش ماوەیەکی کەمخایەن، بە بەستنی پەیماننامەیەکی نوێ، یۆنانییەکانی ئاسیا سەریان وەبەر حکوومەتی پادشای گەورە هێنا. ئیسپارت لە جێی جارانی ترازا و بایەخی پێشووی نەما، بەڵام ئەم سووکایەتییە بە زێڕ قەرەبوو کرایەوە.

ڕاپەڕینی ماد، سەرهەڵدانی میسرییەکانی بە شوێندا هات. کەنیسەی جوولەکانیان کاول کرد و هێزەکانی ئێران نەیانوێرا چورتە بکەن و دژی هەستی هارووژاوی خەڵکی خۆولاتی بکەونە خۆ. گەمیە شەڕکەرەکانی ئێران لە پێلۆپۆنێز چەند شکستێکیان بە سەر شانیدا هات و ئەگەرچی پادشا بۆ تێهەڵێنانەوەی شکستەکەیان گەمێی تازە و دراوی بۆ ناردن، بەڵام نەیانتوانی ببنە کەند و کۆسپ لەسەر ڕێگای سەرکەوتنەکانی ئاتێن. هەر چۆنێک بێ، سەرلەنوێ ئیسپارت توانی بە یاریدەی ئێران، گەروولەی [بۆسفۆر و داردانێل] گەمارۆ بدا و ئاتێن کە ڕێی هاتنی گەنمی لێ گیرابوو، بەناچاری دەستی دا و هەمدیسان زێڕ توانی سەرکەوتووبێ.

پیلانگێڕانی نێو کۆشک و سەرای میری کە توانیبووی بنەماڵەی پادشایەتی لەبەریەک بەرێ، دیمەنێکی ڕوونی سیاسەتی دەرەوەی دەخستەڕوو. مەلەکە پاریساتیس بۆ ئەوەی بتوانێ کووررووشی کوڕی بکاتە پادشا و میراتگری ڕەسمیی پادشایەتی وەلابنێ، توانی پشتیوانی و سەرنجی هەرێمەکانی لیدییە، فەریجییە، کاپادۆکییە و تێکڕای سەرکردەکانی سپا لە ئاسیای بچووک ڕابکێشێ. شازادەی لاو بە هێزێکی ئەوتۆوە دەیتوانی بۆ جێگرتنەوەی باوکی، چاو سوور بکاتەوە و شیر بوەشێنێ.

داریووشی دووهەمیش، هەرگیز لە جەنگەی شەڕدا وێڕای قۆشەنی نەبزووت و پشتی لە پایتەختەکانی نەکردەوە و تەنیا جارێک لە ئاخری تەمەنیدا، بۆ تێکهەڵچوون لەگەڵ کادووسییەکان بوو بە پێشەنگ و هێندەشی پێنەچوو کە مرد و تاجی دەسەڵاتی بۆ ئەردەشێری دووهەمی کوڕە گەورەی بە میرات بەجێهێشت.

## ئەردەشێری دووهەم (٤٠٥ - ٣٥٩ی پ.ز)

ئەو ڕۆژەی کە ئەردەشێر دەیهەویست لە پەرستگای پاسارگاد تاجی پادشایەتی لە سەر بنێ، کەوتە بەر پەلاماری خەنجەری کووررووشی برای، بەڵام برینێکی وای نەهێنا و لە مەرگ خەلەست. پاریساتیسی دایکی کەوتە نێوان و نەیهێشت تۆڵەی لێ بکاتەوە و تەنانەت ئیزنیشی دا کە بگەڕێتەوە هەرێمی خۆی لە ئاسیای بچووک و بچێتەوە سەر دۆخی جارانی و قۆشەنی هەروا لە ژێر ڕکێفیدا بێ. هێندەی پێنەچوو کە کووررووش دژی ئەردەشێر ڕاپەڕی و هێزی بە مەبەستی وەچنگهێنانی تاج و تەخت دەنگ دا و لە نیزیک بابل سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی وەدەست هێنا، بەڵام لەبەر فیز و دەماری تافی لاوی و چاونەترسانی، ڕاست لەو کاتەدا کە دەیهەویست زەبرێک لە براکەی بوەشێنێ،

کوژرا. تەواوی سەرچاوەکان کەوتوونە پەسن و پێداهەڵدانی ئازایەتیی بێسنووری کووروش کە ئەردەشێر فەرمانی دا تەرمەکەی لەتوپەت بکەن. ئەگەر بێتوو کووروش بووبا بە پادشا، ڕەنگە توانیبای بەر بە داڕووخانی دەسەڵاتی بنەماڵەی بگرێ.

ئەردەشێر ئیزنی گەڕانەوەی دا بە سپای دەهەزار کەسەی یۆنانی کە لەگەڵ قۆشەنی برای کوژراوی بوون و بە فێڵوفرت سەرکردەکانی کوشتن، بەڵام نەیتوانی نەهێڵێ هەتا بە خاکی ئەرمەنستان‌دا بەرەو نیشتمانیان بڕۆنەوە.

سەربازی ئێرانی، تازە وەک زەمانی کووروش و داریووش، ئەو نرخ و بایەخەی لە سیاسەتی ئیمپراتۆری‌دا نەمابوو، بەڵکوو زێڕ دەوری سەرەکی دەگێڕا، کە سیاسەتوانانی شارەزا و بە سامی پادشای گەورە دەیانزانی چۆن خەرجی بکەن. ئەوان بە لێشاو زێڕیان دەدا بە ئاتێنی و ئیسپارتی یان هەر تاقمێکی دیکە کە توانیبای بە فێڵ و تەڵەکە دوژمنێک لاواز بکا یا بە لایەنی پادشای‌دا بشکێنێتەوە. لە جەنگەی دەسپێکی حکوومەتی ئەردەشێردا، میسر ڕاپەڕی و سەربەستیی ڕاگەیاند. پادشا هێز و دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو کە لێی وەخۆ کەوێ و بیگرێتەوە، هەرچەند دەشیزانی ئەگەر بێتوو میسر لە دەست بچێ، هێندەی دیکەی پێناچێ کە هەرێمەکانی باڵی خۆرنشین لێی دادەبڕێن. ئاتێن کە بە تێشکاوی تێن و گوڕێکی وای لەبەردا نەمابوو، تازە بە مەترسی دانەدەندرا، بەڵام ئیسپارت بە پاڵپشتی ئەو دەهەزار سەربازەی کە شای گەورە نەیتوانیبوو لە جەرگەی ئیمپراتۆری‌دا، ڕێگر بێ لەسەر ڕێی گەڕانەوەی، دژی ئێران کەوتەخۆ. ئاگێسیلاسی سەرکردەی گەورەی ئیسپارتی، هەڵمەتی بردە سەر ئاسیای بچووک و لەبەروەی میرهەرێمەکانی ئێرانی پێکەوە ناکۆک و ناتەبا بوون، نەیانتوانی بەرپەرچی بدەنەوە. لەم کاتەدا دیسانیش ئاتێن بە لای پادشای

ئێراندا شکایەوە و ئاگێسیلاس لە گەرمەی سەرکەوتنەکانیدا، بانگ کرایەوە ئیسپارت. ئەم سەرکردەیە ڕۆژێکی بە لاتاوێکی تاڵ قسەی کرد و گوتی: «من لە حاند دەهەزار کەوانداری پارسی تێنەشکام، بەڵکوو وێنەی سەربازی کەوانداری سەر پشتی سکەی پادشای گەورە، پاشەکشەیان پێکردم.»[1] ئەم هەڵوێستە بوودەڵانە سیاسییە، ماوەیەک دواتر شکانی قورسی بۆ ئیسپارت بە شوێندا هات و ئیۆنییەی لە ژێر دەسەڵاتیدا نەما.

کاتێک دوو گەورەشاری یۆنان کە دوژمنی قەستەسەری یەکتر بوون، بە خەڵەتانی زێڕی ئێران، کەوتنە گیانی یەکتر و برستیان لێبڕا، شاهانشا لە جەرگەی ئێرانەوە کە هەرگیز لێی دوور نەدەکەوتەوە، ئاشتیی شاهانەی ڕاگەیاند[2]. لەو بانگەوازەدا نووسرابوو هەموو شارەکانی ئیۆنییە لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا دەبن و هەرکەس لەگەڵی ناتەبا بێ لە دەریا و وشکانیدا دەکەونە گیانی. باڵوێزانی یۆنانی کە ئەم بڕیارەی پادشایان بە ڕوودا خوێندرایەوە، کرنۆشیان برد. ئەو ئامانجانەی کە داریووش و خەشایارشا بە قۆشەنی سامناکی خۆیان پێینەگەیبوون، سیاسەتی ئەردەشێری دووهەم بە تەخشانپەخشانی بەلێشاوی زێڕ، توانی وەدیی بێنێ.

یۆنانییەکانی ئیۆنییە جارێکی تر بوونەوە ڕعیتی پادشای گەورە. دەسەڵاتی ئاتێن کە بە ناوی پارێزەری یەکییەتییەکەیانەوە، خەرج و پیتاکێکی بەرچاوی کۆدەکردەوە، کۆتایی پێهات. ئەو پیتاکە قورسەی کە ئیسپارت بە بیانووی پاراستنەوە لە ئیۆنییەی دەستاند و دەیگوت پێوەیە هەتا برایانی ئاسیایی خۆی ڕزگار بکا، بنەی بڕا. ئێرانی سەرلەنوێ ئەو پیتاکانەی پێشووی خۆیان

---

١ـ بڕ: وێنەی ٥٨، ١ـ٤.

٢ـ زۆربەی سەرچاوەکان بە «ئاشتی شاهانە»یان وەرگێراوە، بەڵام لە ڕاستیدا «ئاشتیی پادشا»یە.و.

پێوەبەستنەوە، بەڵام زۆر کەمتر بوو لەوەی ئاتێن و ئیسپارت لێیان وەردەگرتن. شـارەکانی ئییۆنییـه کـه سـەرلەنوێ کەوتبوونـەوە نێـو بازنـەی بازرگـانیی ئیمپراتـۆری، گەڕانـەوە سـەر دۆخـی چـالاکی و گەشـەی ڕابردوویـان. بەرژەوەندییەکانی پادشا هەر بەم هێندەوە نەوێستا و هەڵوێستی زیانیدەرانەی بێپسانەوە نەیدەهێشت هەرا و کێشەی نێوان ئاتێن و ئیسپارت داکووژێ. ئەو پێکهاتنەی که نێوانی هێور کردبوونەوە، لەسەر دەمەقرەیەک هەڵوەشایەوە و شەڕ دەستی پێکردەوە و هەردووک لای تێدا بردن. پاش ئەوەی دوو خەنیمەکە دەسـتیان لـە یەخـەی یـەکتر بـەردا و پێکهاتنـەوە، «تێبـێس»ی بەرپشـتیوانی ئەردەشێر، خۆی لەو دوو خەنیمە هاوئامانجەی ئێستای هەڵکرد و تێکیشکاندن. هـێلاد (واتـە یۆنـانی کـۆن)، بـە فـەرمانی پادشـا شـیرازەی لێکهەڵدەوەشـێ و کوتکـوت دەکـرێ، چونکـە هیچکـام لـە شـارەکانی، خـاوەنی هێـز و بڕسـتی یەکانگیربوونەوە و ئاشتی و پێکهاتن نەبوون.

له زەمانێکدا که وێدەچوو دەسەڵاتی ئەردەشێر لـە گەروولـەی [بۆسـفۆر و داردانێل] تێپـەڕیوە و بارگای شـووش دەیتـوانی فەرمانـەکانی خـۆی بـە سـەر یۆنانییانی ئورووپادا بسەپێنێ، له هەرێمەکانی خۆرنشینی ئیمپراتۆریدا، کوانی سەرهەڵدانی میرهەرێمەکان دڕا. له سەردەمی دوایین پادشاکانی هەخامەنشیدا، ئەرکی ئەوانەی که بـە «چاو و گوێ»ی پـادشـا دادەنـدران و لـە زەمـانـی داریووشەوە چاوەدێری کاروباری حوکمداران بوون، بە یەکجاری کاڵ ببۆوە. پلەی میرهەرێمەکان بە میرات گەڕا و هێندێکیان ئەوەندە بەهێز بوون که تازە شا نەیدەتوانی چاوەدێرییان به سەردا بکا و بـە کارەکانیـاندا بچێتـەوە یـان لێیـان وەدەست بێ. کۆماری ڕژێمیش لەگەڵ پیاوانی ڕاسپێردراوی ئەنجومەنی پیران که ئەرکیان چاوەدێری و پشکنینی کار و هەنگاوی سەرکردەکانی سپا بوو، تووشی

گیر و گرفتێکی ئەوتۆ ببۆوە. فەرمان و پەسندکراوەکانی پێشوو دەسەڵاتێکی وای بۆ سەرکردەکان وەبەرچاو گرتبوو، کە تازە چاوەدێرییان بە سەردا نەدەکرا و سەرەنجام وای لێهات کە خۆیان بە نوێنەری ئەنجومەنی پیران دادەنا و بەم شێوەیە بێدەسەڵاتیی ئەنجومەنەکەیان سەلماند.

بارودۆخی نێوخۆی ئیمپراتۆری دەبوو بە هۆی بەدیهاتنی ڕەشبینی و ناهومێدی. بەرداشی پیتاک جەماوەری خۆجێیی دەهاڕین و تینی ڕاپەڕینی بۆ دێنان. میسر لە زەمانی دەسپێکی حکوومەتی ئەردەشێرەوە سەربەست دەژیا و هێرش و پەلامارە نەپساوەکان هەموو تێکشکان و تازە ئەم وڵاتە داگیر نەکرایەوە.

خاکی شاهانشایەتی وردەوردە لێکدادەبڕا. پاش میسر، بەشێک لە قوبروس، فنیقییە و سووریا، یەکبەدوای‌یەکدا، سەربەستییان ڕاگەیاند. میرهەرێمانی سەربزێو کە بە چاوی خۆیان دارمانی حکوومەتیان دەبینی، وڵاتیان دادەڕووتاند و دەیانکاولاند. کرێکارانی برسی کەوتنە هەڵگیرساندنی شەڕی چینایەتی و بەوپەڕی زەبروزەنگەوە سەرکوت کرا، بەڵام بارودۆخەکەی پتر شێواند. ئاسیا کوتکوت کرا: بیسینە و کاریا دوابەدوای یەکتر سەربەستییان وەدەست هێنا. پاشان لیدییە، میسیا، لیکیا، پیسیدیا، پامفیلیا و کیلکییە، شوێنیان هەڵگرتن و ئەم ڕچەیەیان بڕی. بەکورتی تەواوی ناوچە و هەرێمەکانی خۆرنشینی فورات هارووژابوون و بارودۆخی ئیمپراتۆری لەچاو ڕابردوو ئەوەندەی دیکە پتر شێوا و سەرپاکی کاروبارەکانی، بۆ نموونە یەکپارچەیی وڵات و ژیانی خودی پادشاش کەوتبووە مەترسی. میرهەرێمانی سەربزێوی هاوپەیمان، سکەی زێڕیان لێدەدا، کە هەتا ئەو زەمانە تەنیا تایبەتی پادشای گەورە بوو. دابڕانی میسر و هەرا و ئاژاوەی هەرێمەکانی باڵی خۆرنشین،

داهاتی پادشایان هەتا نیوه دابەزاند. ئەردەشێر که ئەو گشته سەرکەوتنه سیاسییەی له یۆنان وەدەست هێنابوو، هەستی به تێداچوونی تاج و تەختی دەکرد. ئەگەر ماوەیەک پێشتر وێدەچوو که ئیمپراتۆری چواربەندەی قایم و پتەو بووه، ئەم رەوته تەنیا هەڵکەوتێکی کاتی بوو. نەبوونی هاوهەنگاوی و یەکگرتوویی، وڵاتی بەرەو لێکدابڕان پاڵ پێوه دەنا. میسر که لەگەڵ ئیسپارت و میرهەرێمانی یاغی ببوو به هاوپەیمان، دژی پادشا هەنگاوی هەڵێنایەوه و هێزەکانی به سەرکردایەتیی تاخۆسی فیرعەون، بەرەو سووریا بزووتن و هەر لەم جەنگەیەدا داماتێسی میرهەرێمی سەربزێو له رووباری فورات پەڕیبۆوه. بارودۆخەکە ئەوەنده گرژ و تاڵ بوو که خودی ئەردەشێر بوو به سەرکردەی مەزنی قۆشەنی، چونکه «ئۆخۆس»ی کوڕی ئەوەنده لێوەشاوه نەبوو که بتوانێ بەرەنگاری بەکرێگیراوانی یۆنانیی بەرڕکێفی راپەڕیوان راوەستێ. وێدەچوو تەمەنی ئیمپراتۆری بەرەو برانەوه گلی دابێ؛ بەڵام وڵاتی ئێران لەبەر تێکچوون و هاڵۆزکانی بارودۆخی میسر و تەنینەوەی شەپۆلی دژی تاخۆس، لەو قەیرانه رزگار بوو. فیرعەون هاوپەیمانەکانی بەرەڵڵا کرد و گەڕایەوه. پاشان «ئارۆئاندر»ی میرهەرێمی یاغی دەستی دا، بەڵام پادشا بەخشی و له جێگای خۆی نەبزاوت و ئەمەش بێدەسەڵاتیی حکوومەتی ناوەندی دەسەلمێنێ. هاوکات لەگەڵ خەیانەتی میرهەرێمەکان، کۆمەڵێک دەسته و تاقمی چەکدار پەیدا بوون که شارەکانیان دادەڕووتاند و دەمچەورانەیان لێوەردەگرتن. شارەکانی دیکه لەبەر کێشەی نێوان دەوڵەمەند و هەژاران دابەش بوون. «ئاریووبەرزەن»ی میرهەرێمی سەربزێو، کوڕەکەی خۆی خەیانەتی پێکرد و چوارمێخەی کێشرا. داماتێس له سەردەمی یەکانگیربوونی میرهەرێمانی سەربزێودا، کوژرا. ئەو مەترسییەی که هەڕەشەی له بوونی ئیمپراتۆری دەکرد، وەک چۆن خێرا هاتبوو،

هەر ئاواش تیژ تێپەڕی؛ بەڵام لە کاتی مردنی ئەردەشێردا، دیسان سەری هەڵدایەوە. دەستەیەک لە مێژوونووسان ئەردەشێری دووهەم بە پادشایەکی دڵاوا و جوامێر و دادپەروەر دەزانن و هێندێکی دیکەش پێیان وایە کابرایەکی هەردەبیر و خوێنڕێژ بووە و زۆر کەوتۆتە ژێر باندۆری دایکی. ئەردەشێر لە تەواوی پەنجا ساڵەی حکوومەتی‌دا تەنیا بە شوێن پاراستنی تێکڕای کەوشەنەکانی ئیمپراتۆری‌دا هەنگاوی نا و ئەم ئامانجە لە جەغزی دەسەڵاتی وی بەدەربوو.

## ئەردەشێری سێهەم (٣٥٩ - ٣٣٨ی پ.ز)

دەڵێی دەستی چارەنووس دەیویست بە هێنانە سەر کاری فەرمانڕەوایەکی بێبەزە و خوێنڕێژ و دڕندە، بەڵام پیاوێکی لێبڕاوی بڕواپێکراوی کارامە و بەمشووری بواری سیاسی، دوایین هەل و دەرفەتی دەرباز‌بوون بخاتە بەر دەستی ئێران. نەمامی دەسەڵاتی ئەردەشێر بە خوێنی تێکڕای برایان و خوشکانی پاراو بوو. داخوا بۆ یەکپارچەبوونی ئیمپراتۆرییەکی گەورە و بەربڵاوی وەک ئێران کە بە شنەبایەک دەلەرزی و دەکەوتە سەرەولێژی نەمان و تەنیا بە هەڵکەوتی چاوەڕوان‌نەکراو و شانس و بەخت نەبووایە قوتار نەدەبوو، ئەم گشتە کوشت و کوشتارە شتێکی زیادی نەبوو؟ ئەردەشێر زۆر بە لێبڕاوی کادووسییەکان و میرهەرێمە سەربزێوەکانی سەرکوت کردن. ئاتێن کە پشتیوانی هێندێک لەو میرهەرێمە سەربزێوانە بوو، کەوتە بەر هەڕەشەی توندوتیژی پادشا و ئەویش لە ترسی تێوەگلانی لە شەڕ، هێزەکانی خۆی کێشایەوە. شا خۆی هەڵکرد کە میسر بگرێتەوە، بەڵام یەکەم هەنگاوەکانی شکستیان هێنا. سیدۆنی هاوپەیمانی میسر، ڕاپەڕی و پادشا ئەو ناوچەیەی بە هەزاران کەسی دانیشتوویەوە سووتاند و خاپووری کرد. پەلاماریکی تازە بۆ

سەر میسر دەستی پێکرد و بە پاڵپشتی هێزە بەکرێگیراوەکانی یۆنانی، سەرکەوتن یەکلایی بۆوە. فیرعەون هەڵاتە حەبەشە و شارەکان گیران و شوورە و دیواریان تێکوپێک دران. پەرستگاکان تاڵان کران و پێشەوایانی دینی بە دانی دراوێکی زۆر، ئازادیی خۆیان کڕییەوە. سەقامگیری باڵی بە سەر تەواوی گۆشە و کەناری ئیمپراتۆری‌دا کێشا و دەتکوت ئێستا لە هەموو زەمانێکی دوای داریووش پتر هێزی وەبەر هاتووە.

یۆنان ئەم هێز وەبەرهاتنەوەی ئێرانی پێناخۆش بوو. ماوەیەکی درێژ بوو کە نیشتمانپەروەرانی وەکوو «ئیزۆکراتیس»، بانگاوازی هێلێنییەکانیان (یۆنانییەکان) دەکرد کە بێن و لێک کۆببنەوە و دژی ئێران بکەونە شەڕ. دەنگ و دروشمێکی نوێ لە وتاری ئەو پیاوانەدا دەهاتە بەرگوێ و دەیانگوت: «هێلێنییەکان هەر تەنیا باب و کاڵی یۆنانییان نین، بەڵکوو تەواوی ئەوانەی کە شەریک و هاوبەشی شارستانییەتی ئەوانن، هێلێنین.» ئەو شەڕەی کە ئەوان بانگەشەیان بۆ دەکرد، سنووری نەتەوایەتی و ئیمپراتۆریی هەڵبوارد و بوو بە ملانە و تێکهەڵچوونی نێوان کولتوورەکان و بنەمای شارستانییەکان. ئەوەی ڕاستی بێ یۆنان ئەوەندەی شەڕ و کێشەی درێژخایەن بە سەر شانی‌دا سەپابوو کە هێزێکی وای لە بەردا نەمابوو کە بتوانێ هاوپشتی و هاوپەیمانیی ڕاستەقینە بەدی بێنێ بۆ شەڕێکی پیرۆزی نەتەوەیی؛ بەڵام دیسانیش ئەم ئامانجە ڕووی وەڕاستگەڕان بە خۆیەوە دەبینێ و پێداگریی خەڵکی مەقدوونییە کە نەتەوەیەکی بەهێزی ناهێلێنی، بەڵام خاوەنی کولتوورێکی یۆنانی بوو، هەلەکەی ڕەخساند. لە ساڵی ٣٦٠ی پێش‌زایینەوە، فیلیپی مەقدوونی هەوڵی دەدا کە ناوچەکانی باکووری یۆنان، یانی تراکییە و تێسالی (تێسالیە) بخاتە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی. فیلیپ لە نێو یۆنانییەکان‌دا بە پیاوێکی سوار بە سەر کاران‌دا دەناسرا و هەموو

لایەک پێیان وابوو کە تەنیا پێشەنگی شەڕەکانی دژی ئاسیایە، کە بەختەوەرترە لە ئورووپا و «بەربەرەکان»ی وێ دەوڵەمەندترن لە یۆنانییەکان[١]. فیلیپ کە مرۆیەکی بەپارێز بوو، کاتێک دیتی ئەوە ئەردەشێر میسری گرتۆتەوە، وای بە باشتر زانی کە دوژمنی هەڵفریوێنێ و لەگەڵی پێک بێ، چونکە لەو هەمووە هەرا و ئاژاوانەدا، سەرهەڵدانی قوبروسیش سەرکوت کرابوو. لە ئاتێن «دیمۆستێنێس» زۆر بەتوندی دژی سیاسەتی لایەنگری لە مەقدوونییەکان ڕاوەستا و بەرژەوەندیی نیشتمانی خۆی وەبەرچاو گرت کە بریتی بوو لە هاوپەیمانی لەگەڵ پادشای گەورە. کاتێک کە سەرکۆنەیان کرد ئەوە خەریکە خەیانەت بە یۆنانییەکانی دانیشتووی ئاسیا دەکا، تاڵایی ڕاستەقینەی بە زمانیدا هات و پرسی: «ئەرێ داخوا هیچکەس لە بیری یۆنانییەکانی ئاسیادایە؟ داخوا هەتا ئێستا تێکڕای سەردارانی ئاتێنی مووچەی خێرخوازانەیان بە سەردا نەسەپاندوون؟» فیلیپ باڵوێزێکی نارده شووش و پەیمانێکی بەست. کاتێک هێوری و هێمنایەتی باڵیان بە سەر سنوورەکانی ئاتێن کێشا، شا قۆشەنێکی گاڵ دا هەتا فیلیپ بۆ دەرەوەی پێرینووس دەرپەڕێنێ؛ کەوایە هاوپەیمانی لەگەڵ یۆنان، تەنیا بۆ مەقدوونییە مەترسی بە شوێنەوە بوو. فیلیپ تەمای گرت ئەگەر بە زۆرەملیش بێ، خۆی لەگەڵ یۆنانییەکان یەکلایی بکاتەوە و لەم ڕەوتەدا بە یاریدەی ئەسکەندەری کوڕی، ئاتێن و هاوپەیمانەکانی شکاندن و تەفروتونای کردن و بنەی بە سەربەستیی یۆنان هێنا (٣٣٨ی پ.ز). هەر لەو ساڵەدا ئەردەشێر دەرمانداو کرا و پیاوکوژەکە بەم کارەی زەبرێکی کوشندەی لە ئیمپراتۆری وەشاند و تەمەنێکی وای بە بەرەوە نەما.

---

١ـ لە کولتووری یۆنانیدا، هەر هۆز و نەتەوەیەکی کە بە باری شارستانیدا لەچاو ئەوان بە خواردەستەتر دادەندران، پێیان دەگوترا «بەربەر».م.

**

ئەگەر بێتوو پێمان وابێ کە ئێرانییەکانی سەردەمی هەخامەنشی، سەرکەوتووانی خۆسەپێن بوون بە سەر نەتەوە بەزیوەکاندا و تینیان بۆ دێنان هەتا کوێرانە بکەونە شوێنیان و بێدەنگ بن و وستە نەکەن، لێکدانەوەیەکی هەڵە و نادادپەروەرانەیە. هەڵبەت ڕاستە کە هەڵوێست و سیاسەتی داگیرکەرانەیان مەیلی باڵادەستی و پێملبوونی نەتەوەکانی بەرفەرمانی تێدا بوو، بەڵام دەبێ بزانین کە لە زەمانی ئەواندا، جیهان بە سەر دوو باڵی یەکجار جیاوازدا دابەش کرابوو، واتە پادشایەتیی ئێران و یۆنان. هەرکامەیان خاوەنی پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووریی بەپارسەنگ و شێوەی ژیان و شارستانییەتی خۆیان بوون و دەیانهەویست ئەم شێوەیە لە هەرێمەکانی دیکەی دنیادا پەرە بگرێ و ڕەچاو بکرێ. بۆ یەکەم جار هەخامەنشییەکان توانییان یەکییەتی لە ئێراندا بەدی بێنن. ئەوە پادشاهانی هەخامەنشی بوون کە یەکانگیربوونی دنیای ڕۆژهەڵاتی ژیارمەندیان دابین کرد، یانی توانییان ئەو هەمووە توخمە فرەڕەنگانە بخەنە ژێر باڵی دەسەڵاتێکی سیاسی کە پێشتر پێشینەی نەبوو. گەلی ئێران سەرەڕای فرەچەشنبوونی پێکهاتەی ڕەگەزی، توانی بێتە مەیدان و خۆی بنوێنێ و لە کێشە و هەرای کۆمەڵێک زمان و شارستانییەت بە سەرکەوتوویی دەربازبێ. ئێرانی هەر تەنیا دامەزرێنەری یەکەم ئیمپراتۆریی جیهانی نەبوون، بەڵکوو توانییان شارستانییەتێکی جیهانیش بەدی بێنن کە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی بەربڵاو بوو.

پێکهاتەی لێکدراوی ئەم ئیمپراتۆرییە نابێ بۆی بە سووکایەتی دابندرێ، چونکە شارستانییەتە گەورەکانی وەکوو ڕۆمیش ڕەوگەیەکی ئاوایان بڕی. ئێرانی هەروەک لە بەڕێوەبردنی خاک و هەرێمەکاندا سەرکەوتوو بوون، هەر ئاواش لە

بواری سیاسەت و ئابووری‌دا درەوشانەوە. لێکۆڵینەوە تازەکان دەیسەلمێنن کە ئەو وڵاتە دوورەدەستانەی لەبەر پەرەئەستاندنی دەسەڵات کەوتبوونە نێو جەغزی قەڵەمڕەوی هەخامەنشی، لەبەر هەنگاوی نیازپاکانەی ئەوان، زۆر قووڵ تووشی ئاڵوگۆڕ بوون، بۆ وێنە خارەزم و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی بۆ ماوەی سێ سەدە و نیو، ئاشتی و ئارامی باڵی بە سەر کێشان و ئەمەش ڕووداوێکی دەگمەن و ناوازەیە لە مێژووی ناوچەکانی باڵی ڕۆژهەڵاتیی ئەو سەردەمانەدا. لەو ماوەیەدا ئەم ناوچانە بە باری ئاوەدانی و کشتوکاڵدا بەڕاستی گەشەیان کردبوو. هەر لەو ڕۆژگاری‌دا، شێوەی ئاوداشتن بە ڕاکێشانی ئاوی کارێزان، بۆ وێنە لە ئاوەدانییەکانی باشووری میسردا، بوو بە باو. هونەری هەخامەنشی سنوورەکانی ئیمپراتۆریی هەڵبوارد و گەیشتە ناوچە یەکجار دوورەدەستەکان و نیشانەی ئەم پەرهەڵدانە لە میسر، قوبروس، کەناراوەکانی دەریای ڕەش و بەتایبەت لە نێو سەکایی‌یەکان‌دا وەبەرچاو دێ. هەخامەنشی توانییان کەشێکی لەبار بۆ گەشەی زانست بەدی بێنن و وەکوو دیارە لە ڕۆژگاری داریووش‌دا بوو کە ئەستێرەناسێکی گەورەی بابلی بە ناوی «نەبووریماننوو»، سەبارەت بە مانگگیران کەوتە لێکۆڵینەوە و توانی لە «بەتلیمووس» و «کۆپێرنیکووس» چاکتری تاوتوێ بکا. هەروەها ئەستێرەناسێکی دیکە بە ناوی «کیدینوو»ی «سیپار»ی، لە ڕۆژگاری بەرەو داکووژانی سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی هەخامەنشی‌دا توانی جەنگەی ڕۆژگەڕانەوەی بەهاری و شەوگەڕانەوەی پاییزی بدۆزێتەوە و بەوردی ئەندازەی ماوەی ساڵی هەتاوی وەدەست بێنێ، بە چەشنێک کە تەنیا حەوت خولەک و شازدە چرکەی هەڵە تێدا بەدی دەکرێ.

هەخامەنشی خۆیان لە نیشتمانپەرستیی توند و تۆخ پاراست و بەپێی بەرژەوەندیی ئیمپراتۆری جووڵانەوە و ڕێگایان بۆ برەوی زمانی ئارامی وەک

**زمانی باوی دەسەڵات خۆش کرد و «ئەلفوبێ»یەکەشیان وەدوا نەدا. هەروەها ئەم زمانەی باڵی خۆرنشینیان هەتا هیند برد و پەرەیان پێدا و لەوێش ئەلفوبێی ئارامی توانی کار بکاتە سەر ئەلفوبێی کۆنی «خارۆشتی»ی هیندی و گەشەی پێ بکا. لە هیند هونەر و نژیاروانیی هەخامەنشی کۆمەڵێک ئاسەواری لە پاش بەجێماوە. بەپێی کەندەوکۆژەکانی «پانتا»، دەرکەوتووە کە کۆشکەکانی سەردەمی پادشایانی خانەدانی «موورِیا»، وێنەیان لە کۆشکەکانی تەختیجەمشید هەڵگیراوەتەوە. داب و نەریتی هیندی توانیویانە یادگاری نژیارانی ئێرانی بپارێزن کە لە خەیاڵی هەرەمەی خەڵکدا وەکوو شێوازی «تیتان»ەکانن[1]. هەر ئەم ڕەوتەی هەخامەنشی توانیویەتی لە هونەری «موورِیا» و «گەندارە»دا ڕەنگ بداتەوە.[2]**

**هەخامەنشییەکان بە چاوێکی بەرینەوە دەیانروانییە دینەکان و بۆخۆیان بە لای تاقانەپەرستیدا شکابوونەوە و بەکردەوە لایان لە تاقانەپەرستان دەکردەوە کە جوولەکە لە ڕیزی پێشەوەدا خۆیان دەنواند. ئەگەر دین و کۆمەڵ و تەنانەت حکوومەتی جوولەکە توانی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ و بمێنێ و دواتر ببێتە پێشەنگی مەسیحایەتی، هەتا ڕادەیەکی زۆر قەرزداری هەڵوێست و سیاسەتی نەرم و نیانی ئێرانی دەورانی هەخامەنشییە. دینی هەخامەنشی لە دەرەوەی**

---

١ـ لە ئەفسانەکانی یونانیدا تیتانەکان کورانی ئاسمان و زەوین. ئەوان دژی خودایان ڕاپەڕین و ویستیان بە هەڵچنینی چیاکان لەسەر یەکتر. پەلاماری ئاسمان بدەن. بەڵام ژووپیتێر بە هەورەبرووسکە لێیدان و سووتاندنی. لە بواری ئەدەبیدا تیتانەکان وەک مەسەل بۆ کەسانێک دێنەوە کە خۆیان دەدەنە کارێکی کەسنەکردەی هەرگیز نەلواو.م.

٢ـ «توێژەران لایان وایە کە وێککەوتنی زمانی پارسی و زمانی هۆز و نەتەوەکانی دۆڵی سیند، بۆ ئاخاوتنی سەرکەوتووان و بەزیوان. شێوەزارێکی تێکەڵەی وەک زمانی ئۆردووی بەدی هێنا.» ئەم ڕستەیە خوابەخشیو محەممەدی موعین لە دەقەکەی زیاد کردبوو. دەمتوانی دەریهاوێم. بەڵام ڕامگواست بۆ پەراوێز.و.

ئێرانیش شوێنی خۆی داناوە. توێژەران لایان وایە کە ئەردەشێری دووهەم ئایینی ئاناهیتای هێناوە و پەرەی پێداوە. پەرستنی پەیکەرەی ئاناهیتا(ناهید) لە پەرستگاکانی شووش، تەختیجەمشید، هەگمەتانە، بابل، دەمیشق، سارد و بەلخ، دەبێ بووبێتە هۆی یەکییەتی و یەکگرتوویی تێکڕای نەتەوەکانی نێو جەغزی قەڵەمرەوی ئیمپراتۆری کە شوێنپێی هەتا ماوەیەکی درێژ لە نێو گەلانی ئاسیای بچووکدا مایەوە. لە لایەکی دیکەوە دینی هەخامەنشی توانی لە کەوشەنەکانی باڵی باکووری خۆرنشین تێپەڕێ بۆ کاپادۆکییە و پاشان بگاتە کلیکییە، واتە ئەو شوێنەی کە دزانی دەریایی سەریان وەبەر ئایینی میترایی (مێهر) هێنابوو.

میترایی زۆر دواتر لە نێو قۆشەنچییانی ڕۆمیدا بە دینی سەرەکی دادەندرا. هەروەها باوەڕی کۆنی «سامی»ش کە چەشنێک ژیانی دوای نەمانی پێوە دیار بوو، ئێرانی گەشەیان پێدا و هەتا سنووری هەرمان بردیان و دینی جوولەکان شوێنی تێکرد و دینی زەردەشتی پاش ئەم پاڵێودرانە پەلی هاویشتە نێو فەلسەفەی خوداناسینی مەسیحایەتی.

هەخامەنشییەکان بە باری فەرهەنگی ماکی و میناکی و باوەڕی دینیدا، یەکەمینی ئەو کەسانە بوون کە بیر و خەیاڵی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوایان گۆڕینەوە و پێکەوەیان ئاوێتە کردن و ئەم دوو جیهانەیان لەگەڵ شارستانییەتەکانیان بەدی هێنان و بەم شێوەیە ئەو ڕێگایەیان تەخت کرد کە دەبوو دنیای ئێرانی لە داهاتوودا پێیدا تێپەڕێ.

***

بەشی ٤

# خۆرنشین دژی خۆرهەڵات

## ڕووخانەوەی ئیمپراتۆریی هەخامەنشی

### ئەسکەندەری گەورە

کـوژرانی ئەردەشـێری سـێهەم، ڕووپـەڕی شـەترەنجی سیاسـیی دنیـای ژێروژوور کرد و هێزێکی نوێ بە ناوی مەقدوونییە کایەی دامەزراند. فیلیپی مەقدوونی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ پادشای لاوی ئێران کە بۆتە بووکەڵەی دەست خواجەکانی خاوەنبڕشتی بارگا، یەکییەتییەکی بە ناوی یۆنانی یەکگرتوو بەدی هێنا و قۆشەنی بەهێزی مەقدوونی بە پاڵپشتی دەریاوانانی یۆنـانـی ڕیـزیان بەست و تەیار کران. ئەوەی ڕاستی بێ هێندەی پێنەچوو کە شافیلیپ بە زەبری خەنجەری سەربزێوان، کە دەستی دنەی بارگای شووشی تێدابوو، کوژرا و ئەسـکەندەری کـوڕی جێـی گرتـەوە و بـە چاونەترسـانی تـافی لاوی، کەوتـە پەیکەردەی کارەکانی باوکی.

کوڕی ئەردەشێر لەسەر تەختی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریی ئێران ژارکوژ کرا و خزمێکی بە ناوی داریووشی سێهەم (کۆدۆمان) بوو بە جێگرەوەی. ئەم پیاوە ئازایە ئەگەر بۆ یەکـەم جار لـە مێژووی وڵاتەکـەی خـۆیدا، ڕقەبـەرێکی وەک یۆنانی یەکپارچەی یەکگرتووی نەبووبا، ڕەنگە توانیبای نیشتمانی ڕزگار بکا.

گومانی تێدا نییە کە یۆنان بەناچاری توانیبووی یەکترگیر بێ و شەڕزانێکی بلیمەتی وەکوو [ئەسکەندەری] سەرکردەی هێزەکانی مەقدوونی، پێشەنگی بوو. هەڵەی گەورەی داریووشی سێهەم بە کەمگرتنی ئەسکەندەری لاو بوو. ڕەنگە فیز و دەماری هێز و بڕستی پادشایەتی بەرچاوی تاریک کردبێ و بایەخی بۆ قۆشەنی خەنیمی دانەنابێ.

شەڕی نێوان لایەنەکان، سێ قۆڵی بەربڵاو دەگرێتەوە کە بریتین لە ئیمپراتۆریی ئێران، یۆنانی پێکهاتوو لە چەند شارێک و حکوومەتی فەریکەی مەقدوونی. ئێران هێشتاش تەواوی سەرچاوەکانی خۆی بە دەستەوەیە و گومانی تێدا نییە کە زۆر جاران سستی و لاوازبوونی لە بەر چاوی دنیادا ڕەنگی داوەتەوە؛ بۆ نموونە فەرماندەکانی نەیانتوانی ببنە کۆسپ و لەمپەر لەسەر ڕێگای گەڕانەوەی گزنفۆن و دەهەزار کەسەی یۆنانی، یان هێزەکانی بەری «ئاگێسیلاس»یان بۆ نەگیرا کە زۆروکەم سەرلەبەری ئاسیای بچووک تا ڕووباری «هالیس»ی گرت. ئەو چارەڕەشییانەی کە لە شەڕەکانی میسر بە سەر شانیدا هاتن و شکستەکانی لە قوبروس، سامی قۆشەنەکەیان لە لای دوژمنانی، شکاند. جاری وابوو هەڵدەکەوت کە ئیمپراتۆری تینوتاوی تێدەزا و هێزی وەبەر دەهات، بەڵام نەیدەزانی لەشکری چۆن بێنێوبەرێ. بڕیارەکانی پادشا خاو بوون و بەڕێوەچوونی فەرمانەکانی تووشی ئاستەنگ دەبوون. سەرکەوتنی ڕابردووی ئیمپراتۆری لە تێکهەڵچوونەکانی یۆناندا بەشی زۆری دەگەڕێتەوە سەر دووبەرەکایەتیی نێوان خودی یۆنانییەکان. هەر لە کۆنەوە، ئازایەتیی بەکرێگیراوانی یۆنانی و ئەزموونی سەرکردەکانیان، دەورێکی گرینگی لە سەرکەوتنەکاندا دەگێڕا. هەرکام لەم سەرکردانە، مەزنەوەجاخێکی پارسی دەبوو بە سەرۆکیان، کە زۆربەیان ناپسپۆڕ بوون و ئەمەش دەبوو بە هۆی

ناکۆکی و بێپێزیی هەڵمەت و هەنگاوەکان. سەرۆکایەتیی پارسەکان لە زۆر شوێنی ئیمپراتۆری شانی بۆ نەوی دەکرا و ڕێبازی حکوومەت بریتی بوو لە «نواندنی دەسەڵات و نیازپاکی». زۆر کەم وێدەچوو کە ئێران ڕۆژاپەک بتوانێ یۆنان بگرێ. لە لایەکی دیکەوە ئێران زۆربەی دەور و زەمانان بۆ پاراستنی خۆی، خاوەنی پێداویستییەکی بێسنوور بوو کە بەدی هاتنی ئاواتی ئەسکەندەر و گرتنی هێندە ساکاری نەدەنواند.

وەکوو ئاشکرایە دوو بۆچوون لە یۆناندا سەبارەت بە دەسەڵاتی ئێران هەبوو: بەپێی بڕوا و بۆچوونی هێندێکان، پێمل‌بوونی یۆنانییەکانی ئاسیا بۆ پادشای گەورە بە سووکایەتی دادەندرا، چونکە ئەوان ڕەگەزێکی مەزن و ماقووڵتر بوون. کەوایە ئەگەر خودی هێلێنییەکان ناتوانن بەدیهێنی یەکییەتییەک بن کە دەبێ هێز و بڕستی پێویست بۆ ئازادکرانی براکانیان لە کۆت و بەندی دیلی بێ، چ بایەخێکی هەیە ئەگەر مەقدوونییەی بە یۆنانیکراو، ئەم ئامانجەی وەدی بێنێ؟ چونکە دەبێ ئاسیای بچووک هەتا هێڵی کلیکیە بەرەو «سینۆپ» لە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆری دابڕێ. ئەگەر بێتوو ئەو ناوچەیە ڕزگار بکرێ، شەپۆلی بەگوڕمی بەکرێگیراوان کە توخمەی نانەوەی هەرا و ئاژاوەن، بەرەو هێوربوونەوە دەڕوا؛ لە لایەکی دیکەوە ئەوان لەگەڵ باڵی خۆرنشینی ناوەندەکانی بازرگانی پێکەوە دەبەسترێنەوە و کۆمەڵێک بازاڕی نوێ بۆ گەشەی ئابووریی یۆنان بەدی دێ.[1]

بە بڕوای بەشەکەی دیکە، نیری دەسەڵاتی ئێرانییەکان هێندەش سامناک نەبوو؛ چونکە شارە یۆنانییەکانی ئاسیای بچووک، بە سەر بەختەوەری و ئاوەدانیدا کەوتبوون و کەمتر لە قۆناخی کورتی ئازاد بوون بە دەست هێزەکانی

---

١ـ ئەم بڕگەیە لە وەرگێڕانەکەی بەڕێز «بێهفرووزی»دا لە قەڵەم کەوتووە.و.

یۆنانەوە، تووشی کوێرەوەری ببوون. پادشای گەورە بنەی لە جێگایەکی دوورەدەستە و تاقەتهێنان لە حاند دەسەڵاتی وی، ساکارترە لە پێملبوونی دەسەڵاتی مەقدوونییانی تووڕە و ترسن. بەپێی ئەم بۆچوونە قەومانی شەڕی تۆڵە دژی ئێران بە لای مەقدوونییەکاندا دەشکایەوە و بۆیان دەبوو بە دەسخۆشانە و ئاوا ڕەنگبوو یەکییەتیی یۆنان لە ژێر دەسەڵاتێکی دەرەکیدا وەدی هاتبا، بەڵام قێزەوەنتر بوو لە ژێردەستەبوونی ئێران. ئێران لەمێژ ساڵ بوو کە بەکردەوە خۆی ناساندبوو بە کەیخودای دانیشتووانی خەڵکی یۆنان و پێداهەڵدانی حکوومەتێکی خاوەندەسەڵات لە ئاست هێزی لەرزۆک و خۆنەگری گەلەجاڕان، تەنانەت لە نێو قوتابخانە فەلسەفییە گەورەکانی ئەو سەردەمەشدا ڕەنگی دابۆوە.

مەقدوونییە کە بە باری کشتوکاڵدا لەوپەڕی گەشەی خۆیدا بوو، خاوەنی خاڵی هاوبەش بوو لەگەڵ ئێران و بەتایبەت پارس کە بە ناوەندی سیاسی و بڕبڕەی پشتی سپا دادەندرا. جەماوەری مەقدوونییە وەکوو ئێران بە سەر تیرە و هۆزاندا دابەش کرابوون و کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی مەزنەوەجاخان و دەرەبەگانی خاوەنی ملکوماشی بەربڵاو. چینی جووتیاران ئازاد بوون و پادشا کەوتبووە سەرووی هەموو لایەک و دەسەڵاتی دینی و دادوەری و لەشکری بە دەست خۆیەوە بوو.

فیلیپ توانی سەرلەنوێ دامودەزگای وڵاتەکەی دامەزرێنێتەوە و گەل لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و هێز وەبەر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتیی بنێ. داهێنانی ڕێکخستنی بەربڵاوی ڕێکوپێکی بریتی بوو لە پێکهێنانی سپایەک کە مەقدوونییە ئازادەکان تانوپۆی بوون و بێئەوەی پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ هۆز و خێڵاتیان هەڵپسێنن، ببنە سەربازانی قورسەچەکی فالانژ و هێزی سوارەی بەناوبانگی

مەزنــەوەجاخان دامــەزرێنن. لــە جەنگــەی شــەڕاندا، ئیتــر وەکــوو پێشــوو مەزنەوەجاخان ڕاستەوخۆ تێوەنەدەچوون، بەڵکوو ئەوە قۆشەنی پادشا بوو کە بە سەرکردایەتیی پلەدارانی هەڵبژاردەی خۆی، دەچوونە مەیدان. ئەو زەمانەی کە ئەسکەندەر جێگای فیلیپی باوکی گرتەوە، سەرلەبەری گەل و بەتایبەت مەزنانی وڵات کە هەمان کەڵەپیاوانی هەڵبژاردە بوون، بۆ سەروەبەرهێنانی فەرمانی لاوی قارەمانی خۆیان و وەدیهێنانی سەرکەوتنە مەزنەکانی، لە کڵ دەرچووبوون.

زۆربەی ئەوانەی ڕووداوەکانیان نووسیونەوە، بزووتنی ئەسکەندەر بە مەبەستی تێکهەڵچوون لەگەڵ ئێران بە شەڕی پیرۆز [جیهاد] ناودێر دەکەن. لە ڕاستیدا هێندێک وێکچوون هەیە لە نێوان هرووژمی یۆنانییەکان بۆ سەر ئاسیا بە سەرکردایەتیی ئەسکەندەر و بڵاوبوونەوەی ئورووپاییەکان لە سەدەکانی نێوەڕاستدا؛ ئەم بزووتن و هەستانەی کە لەسەر بنەمای ئاواتێکی مەزنیخوازانەی وەک ئازادیی شوێنە پیرۆزەکان هەڵدەسوورا، بەڵام هێز و وزەی کاولکەری بە باری دنیاییدا شکابۆوە و سەرچاوەی دەگەڕایەوە سەر بیروبۆچوونی «بارۆن»ەکانی فەرانسەوی و داگیرکردنی خاک و پاراستنی قازانج و بەرژەوەندیی بازرگانیی کۆمارەکانی کەناراوی ئیتالیا. ئەسکەندەر کە ڕەنگە لە سەردەمی خۆیدا تاقەسوارەی مەیدانی وەدیهێنانی ئاواتی یەکانگیربوونی هەموو یۆنانییەکان بووبێ، هەنگاوی جیهانگیرانەی خۆی بە ناوی ڕزگارکردنی یۆنانییەکان لە ژێر نیری ئێرانییەکاندا دەست پێکرد؛ بەڵام مەزن و ماقووڵانی مەقدوونی خەون و خەیاڵی سەرکەوتن لە پێناو دەسکەوت و شانازیدا دەبیزاوتن و تاقمێک لە یۆنانییەکانیش لە بیری گەشە و پەرەی

بازرگانیی خۆیاندا بوون و دەیانهەویست پەلوپۆیان بگاتە بازاڕە قەوغا و دەوڵەمەندەکانی خۆرهەڵات.

پادشای لاو زۆر بە باشی ئاگای لە کشیمەکێش و دووبەرەکایەتیی نێوخۆی یۆنانییەکان و لە یەکتر ترازانیان بوو؛ بەڵام دیسانیش دەبوو بکەوێتە شوێن وەدیهێنان و پێکەیاندنی ئاوات و ئامانجەکانی باوکی. چەند کارێکی پڕشنگدار چاوەڕوانی بوون و وەک تۆڵەکەرەوەی یۆنان ـ ئەگەرچی ئەوانیش پێی ڕازی نەبوون ـ سینگی ڕەپێش دا، کەچی بەرلە هەموو شتێک بەرژەوەندیی مەقدوونییەی لەبەرچاو بوو. سەرەتا بانگاوازێکی زۆر توندی دژی ئەو یۆنانییانە بڵاوکردەوە کە پیاو و سیخوڕی ئێران بوون و بە مەبەستی ناچار کردنیان بۆ وەفادار بوون سەبارەت بەو یەکییەتییەی کە ئەوی کردبوو بە سەرکردەی شەڕی پیرۆز، هەڕەشەی لێکردن. ئەسکەندەر بۆ ئەوەی لە پشتەوەی بەرەی دڵنیا بێ، دەستووری سووتاندنی شاری «تێبێس»ی دا کە خەڵکەکەی کەوتبوونە بەر قەڵتوبڕی چەکداران و تێدابردنی سەربازگەی مەقدوونی. پاش کاولاندنی شارەکە، هەر کەسێکی بە زیندووی مابوو، بە کۆیلە فرۆشرا. بە هاوپەیمانی لەگەڵ یۆنان، تەنیا حەوتهەزار سەرباز و پەلەگەمییەکی لاوازی ئاتێنی چوونە یاریدەی و لەبەر نەبوونی پارەی پێویست خێرایەکی هەڵیوەشاندنەوە. بۆ ئەو پاڵەوانەی کە بڕیار وابوو ئاڵای بزووتنەوەی پیرۆزی یۆنان بخاتە سەر شانی، یارمەتی و پشتیوانیی دنیای یۆنانی یەکجار کەموکورت و چرووکانە بوو. ئەسکەندەر بە خۆی و قۆشەنی بچووکییەوە کە دەکرێ بڵێی زۆربەی هەرە زۆریان هەر مەقدوونی بوون، لەگەڵ ناوەندی سەرکردایەتی بزووت. ئەم ناوەندە پێکهاتبوو لە زانایان، ڕووداونووسەوان، جوغرافیزانان و گیاناسان کە وێڕای هێزی ئەسکەندەر بە سواری گەمێ لەو جێگایەی داردانێل پەڕینەوە کە پێشتر

خەشایارشا پێیدا تێپەڕیبوو. یەکێک لەو شارانەی کە گیرا و دەکرێ باسی بکرێ «ترۆوا»یە. ئەسکەندەر لەم شارەدا چەند سەر ئاژەڵێکی بۆ ڕووحی قارەمانانی یۆنانی کردە قوربانی و ئاوا شەڕێکی تازەی دژی ئاسیا ڕاگەیاند.

داریووش ئەم هەنگاوەی ـ کە تەنانەت لاوازتر لە هەڕەشەی فیلیپ دەهاتە بەرچاو ـ بە هێند نەگرت و ئەوەندە لە سەرکەوتنی خۆی دڵنیا بوو کە دەستووری دا، ئەسکەندەر بگرن و بینێرنە شووش. قۆشەنێکی پێکهاتوو لە خەڵکی خۆولاتی، سوارەی پارسی و بەکرێگیراوانی یۆنانی کە هێندێک لە لەشکرەکەی ئەسکەندەر بەهێزتر بوو، بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی گاڵ درا. سەرکردەی یۆنانی کە هەڵبژاردەی پادشا و پیاوێکی بەپارێزتر بوو، پێشنیاری کرد کە لێیگەڕێن ئەسکەندەر تێپەڕێ و قۆشەنی ئێران بکشێتەوە و پشتەسەری خۆی بکاتە زەوییەسووتاو و خاپووری بکا، بەڵام لێیان نەسەلماند و قسەکەی چۆوە پاش. لە ڕاستیدا میرهەرێمەکان بوونە ڕێخکۆشکەری گەڵاڵە داڕێژراوەکانی ئەسکەندەر. یەکەم تێکهەڵچوون لە گرانیکووس ڕووی دا. سپای ئێران بەزی، بەڵام شەڕێکی وا نەبوو، کەچی هێندەی نەمابوو پادشای گەنجی مەقدوونی سەری تێدا بچێ. پاشماوەی سوارەی ئێرانی کەس نەکەوتە پەیکەردەیان، بەڵام بەکرێگیراوانی یۆنانی گەمارۆدران و هێزەکانی مەقدوونی بە تاوانی خەیانەت بە ئامانجی هێلێنییەکان کەموزۆر هەموویان کوشتن. بەم شێوەیە ڕێگای بزووتن بەرەو ئاسیای بچووک کرابۆوە.

شارەکانی یۆنانینشین، دوابەدوای یەکتر گیران و ئازادبوونیان ڕاگەیاندرا؛ بەڵام شاری وەکوو «هالیکارناسووس» هەبوون کە ویستیان هەر سەبارەت بە پادشای گەورە وەفادار بمێننەوە و ئاوا سەلماندیان کە نیری دەسەڵاتی ئێرانی قورسایییەکی وای نەخستۆتە سەر ملیان. هالیکارناسووس لە کاتی گەمارۆدا

ئاوری تێبەردرا و جموجووڵی گەمییەکانی پادشای گەورە بۆ هەڵبڕینی رایەڵەی پەیوەندیی ئەسکەندەر لەگەڵ بنکەکانی ئورووپایی شکستی هێنا. ئەسکەندەر پاش تێپەڕبوون بە ئاسیای بچووکدا و ڕێکخستنەوەی دووبارەی ناوچەکە لەسەر بنەمای سێ تەوەرەی دەسەڵات کە ئێرانی دایاننابوو، واتە میرهەرێم، سەرکردەی سپا و سەرۆکی دارایی، گەیشتە مەڵبەندی کلیکییە و شانبەشانی لێواری دەریا بزووت و لە «ئیسووس»ی نیزیک دەروازەکانی کلیکییە، تووشی هێزەکانی داریووش هات[1]. جارێکی دیکە ئێرانی بە باری دامەزراندنی شێوازی شەڕاندا، هەڵەیان کرد و خلیسکان و قورسیان لەسەر کەوت. شاهانشا لەبری ئەوەی تێبینی و ڕاسپاردەی ڕاکردوویەکی مەقدوونی وەبەرچاو بگرێ و چاوەڕوانی هاتنی سپای ئەسکەندەر بێ، خۆی بەرەڕووی ڕۆیی. لەشکری ئێران خۆی لە حاند زەبری مەقدوونییەکان بۆ ڕانەگیرا و کاتێک داریووش ورەی دۆڕاوی هێزەکانی بە چاو ئەنگاوت، دەستی لە شەڕ هەڵگرت و هەڵات (و٥٩). پارمێنیۆن وەک هەورەبرووسکە ڕۆیی و خۆی گەیاندە شاری دەمیشق و گرتی و دەستی بە سەر بارگە و بنەی بنەماڵەی میریدا گرت. دایک و ژن و منداڵەکانی داریووش کەوتنە بەردەستی ئەسکەندەر و ئەویش بە شێوەی شیاوی خۆیان لەگەڵیان جووڵایەوە. سپای مەقدوونیش خەنیمەتێکی زۆری گرت و نێردراوانی ئیسپارت و ئاتێن و تێبێس کە بە مەبەستی بەستنی پەیمان گەیشتبوونە لای پادشای ئێران، بە دیل گیران. ئەمەش دەیسەلمێنێ کە لە ڕوانگەی خەڵکی یۆنانەوە، دەسپێکردنی هەڵمەتێک بە ناوی شەڕی پیرۆز بایەخێکی ئەوتۆی نەبووە.

---

١ـ ساڵی ٣٣٣ی پ.ز.م.

ئەسکەندەر توانی ئامانجی فیلیپ وەدی بێنێ و یۆنانییەکانی ئاسیای بچووک ئازاد کران و باڵی خۆرنشینی ئیمپراتۆری کەوتە بەردەستی سەرکەوتەی لاو کە چەند کارێکی بەرچاوی دیکە چاوەڕوانی بوون. ئەسکەندەر نەکەوتە پەیکەردەی داریووش و چونکە دەیهەویست پشتەوەی بەرەی خۆی قایم و پتەو بکا، بڕیاری دا کە گرتنی باڵی خۆرهەلاتی ئیمپراتۆری وەدوا بدا. ئەسکەندەر مەچەکەی لە دەورەی شارەکانی فنیقییە ئەنگاوت و ئەوانیش دەستیان بەردایەوە و لەو کاتەدا کە «ماراتۆس»ی گرت، یەکەم نامەی داریووشی گەیشتە دەستی. داریووش لەو نامەیەدا نووسیبووی با پێکەوە ببنە دۆست و هاوپەیمان و لە پێناو ئازاد کردنی بنەماڵەکەی‌دا ئامادەیە پارەیەکی قورس بدا. ئەسکەندەر ئەم داوایەی داریووشی بردەوە پاش کە دەرگای وتوویژی سیاسیی خستبوویە سەرپشت و گوتی وا باشە سەری وەبەربێنێ و بە پادشای خۆی بزانێ و ئاوا چارەنووسی پادشای خاوەن‌دەسەلات درایە دەست سپاسالاری هێزەکانی کۆرینت.

لە نێو تەواوی شارەکانی فنیقییەدا، تەنیا «سوور» کەوتە بەرەنگاربوونەوەیەکی چڕ و لاسارانە و حەوت مانگ کاری ئەسکەندەری وەدوادا. لە جەنگەی گەمارۆدا نامەی دووهەمی داریووشی پێگەیشت کە تێیدا نووسرابوو، ئامادەیە پارەیەکی یەکجار بەرچاو بدا بۆ ئازادکرانی بنەماڵەی و هەروەها هەتا دەگاتە ڕووباری هالیس (قزڵ ئیرماق) دەست لە خاکی قەڵەمڕەوی هەڵدەگرێ و کچێکی خۆشی دەدا بە ئەسکەندەر. لە نێو کۆڕی ئەنجومەنی «هاوڕێیان»ی ئەسکەندەردا چەند کەسێک بەم پێشنیارانە ڕازی بوون، بەڵام لە ڕوانگەی سەرکردەی باڵادەستەوە، ئامانجی شەڕ پێکهێنانی حکوومەتی جیهانی بوو کە دوو پادشای وێکرا تێدا نەدەحاوانەوە؛ جا بۆیە داوای داریووش ئەم جارەشیان چۆوە پاش.

شاری سوور گیرا و ئەم تێکشکانە بوو بە هۆی تێداچوونی دەسەڵاتی دەریایی و بازرگانیی فنیقییە. ئەسکەندەر شارێکی تازەی بنیات نا بە ناوی ئەسکەندەرییە و ئەویش بوو بە جێگرەوەی «سوور» و هێزی دەریاییی یۆنانیش جێی هێزی دەریاییی ئاسیای گرتەوە.

ئەسکەندەر دیسان بۆ ماوەی دوو مانگان لە پەنا شوورەی شاری «غەززە»، کە لێشی زامدار بوو، سینگی داکوتا. قۆشەنچییانی مەقدوونی گەیشتنە میسر و نەک تەنیا هیچکەس لێیان وەدەست نەهات، بەڵکوو خەڵکی خۆماڵی هاواریان لێکردن بێن، چونکە لە سەردەمی «ئۆخۆس»دا ئەوەندەیان تین بۆ هێنابوون و وایان ڕق لە ئێران هەڵگرتبوو، کە لەگەڵ ئەسکەندەر دەیکردنە هاوپشت و هاوپەیمان. ئەسکەندەر چووە دیداری پەرستگەی ئاممۆن. لەوێ خودای گەورەی میسرییەکان بە کوڕی خۆی دانا و غەیبزانی پەرستگە پێیگوت کە ڕۆژایەکی هەموو دنیا دەگرێ. ئەسکەندەر وەکوو فیرعەونی یاسایی، لە پەرستگەی «کەرنەک» ڕێورەسمی تایبەتیی بەجێهێنا. پاشان کەوتە ڕێکخستنەوەی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتیی وڵات و چەند شانەبەرزەیەکی بۆ میسرییەکان وەبەرچاو گرت. ئەوسا بەرەو دووچۆمان بزووت و بەبێ گرێ و کۆسپ لە ڕووباری دیجلە و فورات تێپەڕی و ڕوون نەبۆتەوە کە داریووش بۆچی لێی وەدەست نەهات.

داریووش کشایەوە و پشتی بە کێوەکانی ئێرانەوە دا و ئەوەندەی توانی هێزی کۆکردەوە و بۆ دوایین جار لەشکری لە ساندا، بەڵام بەرلەوەی هێزی خۆی و دوژمن پێکەوە هەڵسەنگێنێ، ویستی کە لە ڕێگای وتووێژ و سیاسەتەوە ئیمپراتۆری ڕزگار بکا. پادشا کە لە گێژاوی مەرگی ژنەکەیدا خولی دەدا و ئەسکەندەر فەرمانی دابوو هەتا بە شێوەیەکی شایانی شاهانە بینێژن، هێندەی

دیکە بە مانەوەی بنەماڵەی لە داوی دیلی‌دا دەناڵێ. بەم شێوەیە ژاکانی ڕووح و چەند تێشکانی وایان لێکرد کە بۆ ئەسکەندەر بنووسێ با ڕووباری فورات سنووری نێوانمان بێ و ئەوەش هەمووی دەکەمە گیازی کچەکەم و با کوڕێکم وەکوو بارمتە لاتان بێ و سی‌هەزار تالانیش لە پێناو ئازادبوونی دایکم و دوو کیژمدا دەنێرم. بەم شێوەیە دەسەڵاتی داریووش لەگەڵ ئەسکەندەر کە دەبوو بە زاوای دابەش دەکرا و دەبوو بە شەریکەدەسەڵاتی خەزووری. بۆ سەری سێجارە پێشنیارەکانی داریووش چوونەوە پاش و هیچ ڕێگاچارەیەک نەما. قۆشەنی داریووش و ئەسکەندەر لە گۆگامل، واتە «لەوەرگەی وشتران»ی نیزیک ئەربێلا (هەولێر) لە بناری چیاکانی ئاشوور پێکداهاتن[1].

بۆ جارێکی دیکە، ڕاست وەکوو زەمانی خەشایارشا، هێزەکانی ئێران لەسەر بنەمای هەرێمەکان ڕێکخرابوون. شێوازی سەرکردایەتی و باری شەڕزانین لە سەردەمی فیلیپەوە بەرەودوا تووشی هیچ ئاڵوگۆڕ و پێشکەوتێک نەبیوو. داریووش کەوتبووە نێو جەرگەی پاسەوانانی سپای جاویدان و بەکرێگیراوانی یۆنانی بە دەورەیان‌دا لێهاڵابوونەوە.

سەرچاوەکانی مێژوویی باسی ناوی گەورەترین پیاوماقووڵانی ئێرانی دەکەن کە بۆ بەجەرگی و ئازایەتی هاوشانی باوکیان دەهاتنەوە، بەڵام هەموویان بە فەند و فێڵی تازەی شەڕانیان نەدەزانی. گەردوونە و فیلەکانیان دەورێکی وایان نەدەگێڕا و لە ئاکامدا داریووش شکا و بەرەو هەگمەتانە (هەمەدان) ڕەوی، بەڵام شەڕەکە نەبڕایەوە. قۆشەنچییانی باڵی ڕۆژهەڵاتی ئێران هەتا شەودرەنگانێک کەوتنە بەرخۆدانێکی بوێرانە، بەڵام سەرەنجام شەڕ بڕایەوە. بێگومان

---

١ـ گۆگامله. گائووگامێلا و گائووگاملا. وادیارە شەڕەکە دەگەڕێتەوە بۆ مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ٣٣١ی پ.ز. ئەو پێدەشتەی شەڕەکەی تێدا قەوماوە سەت کیلۆمیترێکی لەگەڵ هەولێر نێوانە و دەبێتە باکووری چیای مەغلووبی داسنییان.و.

ئەسکەندەر چەندساڵێکی دیکەی پێدەچوو هەتا تەواوی ناوچە و مەڵبەندەکانی ئیمپراتۆری دەستەمۆ بکا، ئەگەرچی لێرە بەولاوە بەشێکی جەماوەر کەوتبوونە بەرفەرمانی و بە شاهانشایان دەناسی. بەزینی داریووش زۆری کار تێکرد، چونکە بڵاوەکردنی هێزەکانی یەکسان بوو لەگەڵ نەمانی تاج و تەختی دەسەڵاتی.

کاتێک ئەسکەندەر گەیشتە بابل، گوڵباران کرا و ئەوەش بۆخۆی بە سەرکەوتنێک دادەندرا. لەوێ دەستی لە میرهەرێمی ئێرانی نەبزاوت و لەسەر کاری لانەبرد و فەرمانی دا هەتا پەرستگای بەعل نۆژن بکەنەوە کە بە دەستووری خەشایارشا کاول کرابوو. شووش بەبێ شەڕ دەستی دا و لەو شارە ئەسکەندەر بە سەر خەزێنەیەکی دەوڵەمەندی میریدا کەوت. بنەماڵەی داریووش کە دوابەدوای هێزەکانی یۆنانی دەبزووتن لە کۆشکی میری دابەزین و بنەیان داکوتا. میرهەرێمی شووشیش لەسەر کار لانەدرا، بەڵام دوو کەسی مەقدوونی کرانە قەڵاوان و خەزێنەدار. پادشای لاوی مەقدوونی لەمێژبوو لە دڵی خۆیدا دەیزانی کە وێڕای کۆمەڵێک چەکداری مەقدوونی ناتوانێ حکوومەت بە سەر ئیمپراتۆرییەکی ئاوا بەربڵاودا بکا کە تا ئێستا توانیبووی بەشێکی بگرێ. بۆیە لێبڕابوو کە هەر کەسێکی ئێرانی شیاوی هەر پلەیەک بێ، لێی لە چاو نەبێ. تێکەڵکردنی توخم و تۆرەمان لە ریزی قۆشەنیدا، سەرەتای بەدیهێنانی گەلاڵەی دزە کردن بوو بۆ نێو ئیمپراتۆری. جا هەر بۆیە فەرمانی دا کە سپایەکی سێهەزار کەسەی لاوانی ئێرانی پێک بێ هەتا بە دابی رۆژاوایی مەشقیان پێبکرێ.

لە دەرەوەی شووش ئێرانییەکانی چیانشین بەرەورووی ئەسکەندەر راوەستان و جەماوەری نەتەوەی باڵادەست دەیتوانی بە پێچەقاندنی چڕوپڕ

لێی وەخۆ کەوێ، بەڵام بەرەنگاربوونەوەیەکی نایەکانگیر ڕەنگی دایەوە و دواتریش وای لێهات کە بە مەترسی دانەندران. ئەسکەندەر بە وەبەرچاوگرتنی ڕێباز و هەڵسوکەوتی شیاو و تێهێنانی کەسایەتی خۆی، خێرایەکی توانی زۆربەی ئێرانییەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. لە ڕاستی‌دا ئەسکەندەر وەکوو جێگرەوەی داریووش پێی نایە بانووی ئێران. وەکوو دیارە بەربەرەکانی و تێکهەڵچوونی هێزەکانی بەرفەرمانی میرهەرێمێک لە «دەروازەکانی پارس» لەگەڵ سپای ئەسکەندەر، شەڕێکی لادەستە و ناسەرەکی بوو[1]. ئەسکەندەر گەیشتە تەختی‌جەمشید و بە سەر خەزنەخانەیەکی دیکەدا کەوت. تازە پرسی شەڕی پیرۆز باوی نەمابوو. ئەسکەندەر چوار مانگێک لەوێ بنەی داکوتا و چەند جارێک بە مەبەستی لێدانی چیانشینان پەلاماری برد و چووە دیداری نێژگەی کووروش و دەستووری دا کە هیچکەس دەستی بۆ نەبا. لە دوایین ڕۆژانی نیشتەجێبوونی‌دا، کارەساتێکی گەورە قەوما و شاری پادشایەتی ئاوری گرت. تۆبڵێی ئەم کارە بڕیاری پتەوی ئەسکەندەر بووبێ بە تۆڵەی ئاتێن کە خەشایارشا کاولی کردبوو، هەروەک چۆن هێندێک لایان وایە؟ داخوا کردەوەیەکی سیاسی بووە و بەم شێوەیە پادشای گەنجی مەقدوونی ویستوویەتی خرمانەی ترووسکە و تریفەی شانازییەکانی هەخامەنشییان داکووژێنێ؟ یان وەک تاقمێکی دیکە پێیان وایە ئاورێکی بێ‌ئانقەست بووە کە تەشەنەی کردووە و دەگەڕێتەوە بۆ کۆڕی بادەنۆشانە و شێتانەی پادشای لاو و هاوڕێیان و ژنانی دەوروبەری و دەبێ مەشخەڵێک لە دەستی لەرزۆکی خزمەتکارێک داکەوتبێ یان گڕێک لە سەرەسووڕکێی بادەنۆشانەی عارفانەوە خۆی گەیاندبێتە پەردە شازەکانی کۆشکی میری. ئەمە لانی‌کەم ئەو پاساوەیە کە

---

١ـ مەبەست شەڕی «ئاریووبەرزەن»ە.م.

هونەری ویژەیی لە چاخی کەونارادا پێی‌خۆش بوو سووتمانی تەختی‌جەمشید ئاوا بگێڕێتەوە.

ئەگەر بێتوو تۆڵەیەکی سیاسی لە ئارادا بووبا، شووش پتر لە تەختی‌جەمشید هەقی خۆی بوو کە تۆڵەی لێوەربگیرێتەوە، چونکە پایتەختی جیهان بوو. نوێنەرانی سیاسیی یۆنان لەوێ دەچوونە خزمەت پادشا و سەریان وەبەردێنا، کە بریتی بوون لە باڵوێزان، پادشایانی لێخراو و کۆمەڵێک سیاسەتمەدار کە بەرەورووی مەترسی ببوونەوە. وێدەچێ کە یۆنانی هەر بە بوونی تەختی‌جەمشیدیان نەزانیبێ، چونکە بەرلە ئەسکەندەر بۆ جارێکیش لە سەرچاوەکانی خۆراواییدا ناوی نەهاتووە. باشە ئەسکەندەر بۆ دەبێ جێگایەک بسووتێنێ کە لەو سەردەمەدا تازە هی خۆی بووە؟ کاتێک پێی نایە تەختی‌جەمشید، خۆ تازە وەک دوژمن یان سەرکەوتە چاوی لێ‌نەدەکرا، بەڵکوو بە زاوای داهاتووی داریووش و جێنشینی دوایین پادشای هەخامەنشی و تۆڵەوەرگرەوەی مەرگی کەسەربارانەی خەزووری و چزاندنی بکوژەکەی دادەندرا. جووڵانەوەی ئەسکەندەر لەگەڵ خانەدانی میری و گەلی ئێران هیچ گرێ‌وگۆڵێکی تێدا نییە. ئەسکەندەر لە شەڕەکانی خۆیدا هەرگیز ناوچە گیراوەکانی نەکردن بە بیابان و چۆڵەوار و جەماوەرەکەی لە خوێن نەگەوزاندن و شارەکانی نەکاولاندن، ئەگەرچی ئێران لە جەنگەی پەلامارەکانی خۆیدا بۆ سەر خاکی دەرەوە، دەستی لە کاری ئاوا نەپاراستبوو.

ڤۆڵتێر هەقی بوو کە دەیگوت، ئەسکەندەر پتر لەو شارانەی کە داگیرکەرانی پێشووی ئاسیا وێرانیان کردبوون، شاری سازکردن. پیاوان و کارگێرانی دام‌ودەزگای بەڕێوەبەرایەتیی ئێرانی لەسەر کار لانەبردن و لاوانی وڵاتی بۆ لای خۆی ڕاکێشان و بوونە شەریکی شانازییەکانی داهاتووی و لەگەڵ

مەقدوونییەکان بە هاوبەشی چارەنووسی ئیمپراتۆری کەوتە دەستیان. نە تەنیا هەرگیز نەکەوتە خاشەکێشانی شارستانییەتی ئێران، بەڵکوو بەپێچەوانە جووڵایەوە و ویستی کە دوو دنیای ئێرانی و یۆنانی پێکەوە هەوێن بکا. ئەم هەنگاوەی ئەسکەندەر کارێکی ئەوپەڕ دڵخواز بوو کە هێشتاش بە بۆچوونی رووناکبیرترین کەسانی زەمانەی ئێمە هەر ئاواتێکی تەڕ و پاراوە. ئەو دەمەی ئەسکەندەر لە تەختیجەمشید بنەی داکوتاوە، داریووش هیچ هێزێکی بەرەنگاربوونەوەی لە بەردا نەماوە و ئێران و سەرلەبەری ئیمپراتۆری هی خۆی بوون، جا بۆیە ناکرێ هاتبێ و بناغەی دنیای ئاوات و خەیاڵاتی شیرینی لەسەر خۆڵەمێش دانابێ. ئەسکەندەر بە خوندکاری ئێران و دوایین پادشای هەخامەنشی دادەندرا.

ئەسکەندەر کاتێک بیستی کە «بێسۆس»ی میرهەرێمی بەلخ داریووشی گرتووە و بەرەو خۆرهەڵاتی دەبا، کەوتە پەیکەردەی. لە دامغان گەیشتە سەر لەشکری ڕاکردووان و داریووش لەوێ بە زەبری خەنجەری میرهەرێمی بەرفەرمانی خۆی کوژرا. بەپێی سەرچاوەکان، ئەسکەندەر باڵاپۆشی ئەرخەوانڕەنگی دەسەڵاتی بە سەر تەرمی داریووش هەڵکێشا و ناردییەوە شووش بۆ لای دایکی و خۆی بەرەو ڕۆژهەڵات ئەسپی لینگدا. کۆنە سەربازەکانی پاش چوار ساڵ و نیو شەڕ و پەلامار، لایان وابوو پادشا بە ئاوات و ئامانجی گەیشتووە، بۆیە داوایان لێکرد سەری جڵەوی بەرەو نیشتمان وەرسووڕێنێ، بەڵام وتاری ئەسکەندەر لەو کاتەدا وای کارتێکردن کە هەموویان سەریان وەبەرهێنا. لەوە بەدوا ئەسکەندەر وردەوردە بوو بە دڵبەستەی ترووسکەترووسک و شکۆی بارگای خۆرهەڵاتی و باڵاپۆشی ئەرخەوانڕەنگی

**پادشایانی هەخامەنشیی بە شانی دادا. کەوایە لەو کاتەدا خۆرهەڵات توانیبووی بەزێنەری خۆی ببەزێنێ!**

**داگیرکرانی ڕۆژهەڵاتی ئێران درێژەی کێشا و چەند میرهەرێمێکی سەربزێو سزا دران و گەلێک لە حوکمداران هەر لە شوێنی خۆیان داندرانەوە. لە هەموو شوێنێک ئەسکەندەر شارێکی بە ناوی خۆیەوە ساز کرد؛ بۆ وێنە لە هەرات، درەنگ[1]، ڕۆخج، بەرپاڵی باشووری هیندوکوش و قەفقاز کە زستانی ساڵی ۳۳۰ ـ ۳۲۹ی پێش‌زایینی لێ تێپەڕ کرد. هێورکردنەوەی سنوورەکانی باڵی باکووری ئیمپراتۆری ماوەیەکی پێچوو. سەرکوتی ڕاپەڕین و هەرای سۆغدییەکان دوو ساڵێکی کێشا و لەو ماوەیەدا هاوڕێیانی تووشی ئێرەیی ببوون سەبارەت بەو خۆرهەڵاتییانەی ڕۆژبەڕۆژ لە دەوری ئەسکەندەر ژمارەیان زیاتر دەبوو؛ جا بۆیە گرێ و کۆسپێکی خرایە سەر ڕێگای. ڕەنگە زەماوەندی ئەسکەندەر لەگەڵ «ڕۆکسانا»ی[2] کچی میرهەرێمی بەلخ، مەبەستێکی سیاسیی لە پشتەوە بووبێ و بریتی بێ لە پێکهاتن لەگەڵ سەربزێوترین کەسانی ناوچەکە. ئەسکەندەر بە دەم شەڕەوە تا ڕووباری سەیحوون (سیردەریا)، کە بە دوایین خاڵی سنووری دنیای ئێرانییەکانی نیشتەجێ دادەندرا، ڕۆیی و لەوێ فەرمووی کە شارێکی بەشوورە و قەڵای دیکە بە ناوی ئەسکەندەرییە ساز بکەن[3].**

**وەرزی بەهاری ساڵی ۳۲۷ی پ.ز. ئەسکەندەر سەرلەنوێ بە هیندوکوش‌دا تێپەڕی و بەرەو هیند شۆڕ بۆوە. ئورووپا کە هەتا بەرلە ئەسکەندەر هەر دەگەیشتە گەروولەی [بۆسفۆر و داردانێل]، سنوورەکانی خۆی هەتا سێند پەرەپێدا. ئەسکەندەر لەو ڕووبارە تێپەڕی کە بە سنووری باڵی ڕۆژهەڵاتی**

---

۱ـ زەرەنگ، زرەنگ، درەنگیان، دەرەنگیانا، سەکێستان، سەجێستان یان سیستان.و.

۲ـ ڕۆخشانا یان ڕۆخشانێ.

۳ـ ئەم شارە ئێستا ناوی «خوجەند»ە.

ئیمپراتۆریی ئێران دادەندرا و قۆشەنی سەرکەوتوو پێی نایە هیفاسیس (بیاس). لەو کاتەدا سەربازانی مەقدوونی بە پادشای خۆیان ڕاگەیاند کە تازە چی دیکەی بە گوێی ناکەن و ناکەونە شوێنی. ئەسکەندەر جاری وایە بە شەڕ و هەلی وایە بە پێکهاتن بە بەستێنەکانی «سیند»دا بزووت و هێزێکی دەریایی بە سەرکردایەتیی دەریاسالار نێئارخووس ڕاسپێردرا کە هەتا کەنداوی فارس گەمێی باژوێ. لێرەدا لەشکرەکەی کردە دوو بەش؛ یەکیان دەبوو بە ڕێگای «ڕۆخج»دا بگەڕێتەوە و ئەوی دیکەیان بە سەرکردایەتیی خۆی دەبوو پەیوەندیی لەگەڵ هێزی دەریایی هەڵنەبڕێ و بەستێناوبەستێن بڕوا. ئەسکەندەر فەرمانی گەڕانەوەی دا و پاش چەند مانگی پڕ کوێرەوەری و ڕێکوتانی سەخت و دژوار و تێداچوونی چەکدارێکی زۆر، هێزەکانی لە «بەندەرعەبباس»ی ئێستا، یەکتریان گرتەوە. لەوێوە بەرەو پاسارگاد بزووتن، هەتا بتوانن بۆ بەهاری ساڵی ٣٢٤ی پ.ز. بگەنە شاری شووش.

دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ بە سەر یەکەم نیشتەجێبوونی ئەسکەندەردا لە پایتەختی گەورەی ئێران، سەرکردەی مەقدوونی بۆ وەدی هێنانی یەکییەتیی نێوان دوو دنیای خۆرهەڵات و خۆرنشین، ڕۆژبەڕۆژ تەمادارتر دەبوو. سەرپێچیی چەکدارەکانی لە هیند و کەتن و پیلانی نیزیکترین هاوڕێیانی کە بەرزەئاواتی ڕێبەری بلیمەتی خۆیان بۆ قووت نەدەچوو، پاڵی بە پادشای گەنجەوە دەنا کە بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی هەنگاوی خێراتر هەڵێنێتەوە و پەلە بکا. ئەسکەندەر لە کۆڕی مەزنەوەجاخانی ئێرانیدا کە بەرەبەرە پەرەی دەستاند، ئاڵوگۆڕی بەدی هێنا و کەوتە پێداچوونەوەی. خۆی

لەگەڵ «ستاتیرا»ی[1] کچی داریووش زەوجی و «هێفاستیۆن»ی کردە ئاواڵزاوای و کچەکەی دیکەی داریووشی لەو مارە کرد. پاشان دنەی هەشتا کەس لە سەرکردەکان و دەهەزار سەربازی خۆی دا هەتا زەماوەند بکەن لەگەڵ کیژانی ئێرانی و بە بۆنەی ئەم زەماوەندانەوە پێنج شەووڕۆژی کردە شایی و هەڵپەرکێ.

ئەسکەندەر لە شووش وەدەرکەوت و ملی ڕێی کۆنە ڕێگای پادشاهیی گرت کە بەرەو هەگمەتانە [هەگمادانە] دەڕۆیی و لەوێوە بەرەو بابل جمی. ئەمە دوایین گەشت و گەڕانی پادشای جێگرەوەی پادشایانی هەخامەنشی بوو. هێندەی پێنەچوو کە نەخۆش کەوت و لە پایتەختی کۆنی ڕۆژهەڵات مرد (٣٢٣ی پ.ز). ئەسکەندەر لە جەنگەیەکدا مرد لە وێدەچوو هەموو شتێک بۆ گرتنی کارتاژ تەیار و ئامادە بووبێ.

ئەسکەندەر دوایین مانگەکانی تەمەنی لە پێناو ڕێکخستنەوەی کاروباری ئیمپراتۆریی خۆیدا بەخت کرد. زۆر بە قووڵی کەوتە ژێر باندۆری بیروبۆچوونی پادشایانی گەورەی هەخامەنشی و داب و ڕێسای تازەتر و بەربڵاوتر و مرۆڤانەتری ئاوێتە کردن. دابەشبوونی وڵاتی بە سەر هەرێمەکاندا سەلماند و چەند کەسێک لە میرهەرێمەکانی لەسەر کار لانەبردن؛ بۆ وێنە میرهەرێمەکانی بابل، شووش، پارەتاکێن، هەرات و ماد.

ئاترۆپات میرهەرێمی ماد بوو کە ناوی خۆی بە باڵای ناوچەکە بڕی و بوو بە ئاترۆپاتکان، واتە «ئازەربایجان»ی ئێستا. پادشای مەقدوونی دەیزانی دەسەڵاتی ناوەندی لە ڕابردوودا زۆر جاران نەیتوانیوە دەست وەبەر سەربەخۆبوونی

---

١ـ ئەم شادۆتە تووشی چارەنووسێکی تاڵ بزوە، چونکە دوای ئەسکەندەر بە فەرمانی ڕۆکسانا و پێردیکاس خنکێندرا.ب.

میرهەرێمەکان بێنێ، جا هەر بۆیە دەسەڵاتی کردە دوو بەش، یانی بێجگە لە میرهەرێمی ئێرانی سەرکردەیەکی مەقدوونیشی لە پاڵ دەستی دادەنا. ئەسکەندەر بە تەواوی ئەو ڕێوشوێنانەی دەزانی کە هەخامەنشی بۆ یەکخستنی ئاسیا وەبەرچاویان گرتبوون و هەتا زیاتر بەرەو پێش هەنگاوی دەنا، هەستی دەکرد کە پتر پێویستی بە گەلی بندەستە و کاتی خۆی هەخامەنشی زۆر بە ناسەرسەنگی ئەم ڕێبازەیان ڕەچاو دەکرد. یۆنانی و مەقدوونی تێنەدەگەیشتن کە بۆچی پادشاکەیان ئاوا دەیانخاتە ڕیزەی ئێرانییەکان کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕووراستی و چاونەترسانیان زیاتر سەرنجی ئەسکەندەری ڕادەکێشا. لاساری و پێچەقاندنی یاران و سەربازانی مەقدوونی لە ئاست فەرمانەکانی ئەسکەندەر، ڕەنگە پتر لە پێشوو بەرەو جەماوەری بندەستەی تازەی پاڵ پێوەنابێ. ئەو دەیهەویست حکوومەت بە سەر ئەم کۆمەڵەدا بکا، هەروەک چۆن پێیخۆش بوو فەرمانڕەوای مەقدوونی و یۆنانییەکانیش بێ. ئەسکەندەر پاش گرتنی میسر کە جەماوەرەکەی سەریان وەبەر کەسێک نەدێنا ئەگەر هەوێنی خوداوەندیی تێدا نەبا و هەروەها ئێرانیش کە دەبوو پادشاکەی گرشەیەک بێ لە پەروەردگارەوە، دوای ئەوەی «زێئووس ـ ئاممۆن» بە کوڕی خۆی دانا، گوتی من خودام. ئەم بانگەوازەی بۆیە نەبوو کە بە شێوەیەکی ڕەسمی و وەک بابەتێکی دینی بکەوێتە بەر پەرستن، بەڵکوو مەبەستێکی سیاسی بەرەو ئەم هەڵوێستەی دنە دا هەتا جەماوەری شارەکانی یۆنانی، هێز و دەسەڵاتی هەست پێبکەن. ڕێوڕەسمی «پرۆسکینۆس»یان بە سوژدەداکەوتنی بە سەر شانی جەماوەرەکەیدا سەپاند. ئەم کارە وێنەی لە دابی بارگای پادشایانی هەخامەنشی هەڵگیرابۆوە کە دەبوو هەموو کەسێک لە هەوێڵ فەرمانڕەوادا بە چۆکدا کەوتبا، بەتایبەت خەڵکانی باڵی خۆرهەڵاتی قەڵەمڕەوی.

ئەو دەمەی کە قۆشەنی ئەسکەندەر گەیشتە رووباری سێند، تەنیا چواریەکی سـەربازەکانی مەقـدوونی و ئـەوانی دیکـە ئێرانـی بـوون. دامودەزگـای بەڕێوەبەرایەتی وەکوو کاروباری لەشکری، پێویستی بە تێوەدرانی پیاوانی ئێرانـی بـوو کـە ئەسـکەندەر لـە شـتێکی وا دەگـەڕا. ئـەم پلـە و پایانـەی کـە سەرکردەی مەقدوونی وەبەرچاوی دەگرت، بە شێوەیەکی یەکسان بـوو، نـەک وەکوو هەخامەنشییەکان کە بەزیویان دەکردە ژێرچەپۆکەی بەزێنەر. هۆکاری هەڵسوکەوت و ئاکاری ئێرانییەکان لەگەڵ پادشای تازەیان، دەگەڕێتەوە سـەر ئەم تێڕوانینەی ئەسکەندەر. ئەوان پێیان وا نەبوو کە گـەلێکی ژێرچەپۆکـەن و کەسێکی غەوارە حکوومەتیان بە سەردا دەکا، بەڵکوو هەروەک ڕابردوو خۆیان بە سەروەری هەرێمەکانی پێشوو دەزانی. ئەسکەندەر بۆ ئـەوەی زۆر چاکیـان دڵنیا بکاتەوە کە بە ڕاستی و بە دڵەوە لەگەڵیان تێکەوتووە، دەرگای چوونە نێو مـەکۆی یـارانی خـۆی بـۆ خسـتنە سـەر گـازەرای پشـت و ڕێگـای بـۆ برایـەکی داریووش و چەند مەزنێکی دیکەی ئێرانی تەخت کرد. سیهەزار لاوی بنەماڵـە ڕەسەنەکانی ئێرانی خرانە بەردەستی مامۆستایانی یۆنانی هەتا وێڕای مەشـقی سەربازی، فێری زمـانی یۆنانیشـیان بکـەن. سـەربازانی ڕاهـاتوو خرانـە ڕیزی فالانژەکانی ئەسکەندەر.

ئەگەر گرشە و ورشە و شکۆی ڕۆژهەڵاتییانەی دڵخوازی ئەسکەندەر، دڵی مەقدوونییەکانی ڕێکدەکوشی، لاواندنـەوە و بەسـەرکردنەوەی ئـەوان، هەسـتی بەخیلایەتیی دەبزاوتن، چونکە لایان وابوو بە زەرەدیان دەبڕێتەوە. سەربزێوی و پێچەقاندنەکان لێرەوە دەستیان پێکرد: سـاڵی ٣٣٠ی پ.ز. لـە درەنـگ؛ سـاڵی ٣٢٨ی پ.ز. لـە مەرکەنـد (سـەمەرقەند)؛ سـاڵی ٣٢٧ی پ.ز. لـە بـەلخ و سـاڵی ٣٢٤ی پ.ز. لە ئۆپیس. تێکەڵبوونی توخم و تۆرەمە و شارستانییەتەکان، تەنیا

لە ژێر دەسەڵاتێکی تاق و تاقانەدا بووزی دەخوارد و وەکردەوە دەگەڕا. تێکڕای ئەم کێشە و بزووتنەوانە کە پادشای لاو بە هیچی نەدەگرتن، لە ماوەی هەڵمەت و پەلامارەکانی‌دا نەیتوانی ئەو ئامانجەی کە پێداگرانە و پتەو هەوڵی بۆ دەدا، بخاتە مەترسییەوە. فەرمانڕەوای تازە پێی‌وابوو ڕێز و پلە و پایەی ئێرانییەکان نابێ لەچاو مەقدوونی و یۆنانییەکان بەرەژێرتر بێ. سازکرانی شارەکان تەنیا بە مەبەستی دانانی سەربازگە و هێورکردنەوەی تیرە و هۆزە ئاژاوەگێڕ و سەرکێشەکان نەبوو، بەڵکوو زیاتر بۆ بەدی‌هێنانی شارستانییەتێکی تێکەڵاو بوو کە هەردک نەتەوە بە شێوەیەکی یەکسان تێیدا بەشداربوون.

داڕشتنەوەی ئیمپراتۆرییەکی بەربڵاو کە لە «باڵکان»ەوە هەتا «سێند» پەڕی هەڵدابوو، هەر لەسەر تەوەرەی سیاسی و ئیداری، کە تەواو تێبەستەی پرسی ڕەگەزی ببوو، هەڵنەدەسووڕا. پاشان گەورەی تازە مشوور و تەگبیری خۆی ڕەچاو دەکرد و بیروبۆچوونی کۆنی دەسەڵاتی وەلادەنا. ئەسکەندەر گەوی زنجیری خۆرنشین و خۆرهەڵاتی تێکخستن و ئاواتی ئەو یەکبوونەی هەخامەنشییەکانی وەدی هێنا کە بە شوێنییەوە بوون و ئاوا گەشەیەکی لەناکاوی خستە نێو ژیانی ئابووریی جیهان کە لە بەند و داوی دابەش‌بوونی فرەچەشن دەرباز ببوو. لەم بوارەدا کەمتر وێدەچێ کە ڕێبازێکی خاوەن گەڵاڵە و دیاری‌کراو، لە ماوەی تەمەنی زۆر کورتی ئەسکەندەردا وەبەرچاو گیرابێ و خرابێتە قۆناخی جێبەجێ کردن. ئەسکەندەر دەکەوێتە شوێن فەرمانڕەوایانی پێش خۆی و چەشنی ئەوان شان‌بەشانی پەیکەردەی ئامانجی لەشکری و سیاسی، سەرنجێکی باشی دەدایە سەر ڕێوبانەکان بەتایبەت ڕێ و ڕەوگەی دەریایی کە بریتی بوون لە نەوکەند و ڕووباران و هەر چوار قوڕنەی دنیایان پێکەوە گرێ دەدان. گەڕانی نێئارخووسی دەریاسالاری ئەسکەندەر

لاساکردنەوەی هەنگاوی بوێرانەی «سکیلاکس»ە کە بە فەرمانی داریووش کەوتە پشکنین و دۆزینەوەی ڕەوگەی ئاوان. گەڵاڵەی دۆزرانەوەی کەناراوەکانی عەرەبستان و دەریای خەزەر کە ئەو پێیوابوو دەگاتەوە سەر دەریای ڕەش، بەڵگەیەکی پتەوە لەسەر ئەم بابەتە. سازکرانی گۆلی حەبانییە کە لە سەردەمی ئێمەدا کارەکانی تەواو بوو، ئەسکەندەر دایڕشتبوو هەتا هەستانی ئاوی ڕووباری فوراتی تێدا کۆبکاتەوە و بتوانێ بە شێوەیەکی ئاسایی ئاوی شەقەجۆگان دابین بکا.

ئەسکەندەر وەکوو پادشاهانی هەخامەنشی، زێڕ و گەنجی وەسەریەک نەدەنا. ئەو خەزێنانەی کە لە پایتەختەکانی ئیمپراتۆری کەوتنە بەردەستی، کردنی بە دراو و سکەی یەکچەشنی پێ‌لێدان. بەم شێوەیە کۆتایی هێنا بە سکەی هەرێمان و میرهەرێمان و چونکە هەر یەکچەشنە دراو لە قەڵەمڕەوی بەربڵاوی ئیمپراتۆریی ئەسکەندەردا کڕین و فرۆشتنی پێدەکرا، دەیتوانی پەیوەندیی ئابووریی هەموو بەشەکانی وڵات دابین بکا. ئەسکەندەر بە پشوودرێژی دیاری و پاداشتەکانی دادەبەشین و لەشکرچییەکانی خۆی بە سەر دەوڵەمەندی‌دا دەخستن و لە ئاکامدا تەواوی هەرێمەکانی خۆی، بۆ وێنە یۆنانی خەنی کرد. لە قەڵەمڕەوی پادشایەتی‌دا، ڕێگایەکی دیکە بۆ دانیشتووانی یۆنان کرایەوە، یانی ئەم وڵاتە کە لەبەر شەڕ و لێکدانی درێژخایەن تووشی هەژاری ببوو، هەلی بۆ ڕەخسا کە جەماوەرەکەی بۆ کار و کاسپی بنێرێتە دەرەوە و کراسی چەکداری بەکرێ‌گیراوی میرییان لە بەردا بزنێ. زۆربەی شارە کۆنەکانی سووریا و فەلەستین لە ڕۆژگاری ئەسکەندەردا بە سەر تازەبوونەوە و بەختەوەری‌دا کەوتن، بەڵام زۆربەی ئەو یۆنانییانەی کە لە زێد و نیشتمانی خۆیان تلاسا ببوون ، لە نێو شار و کۆچەرنشینەکانی سازکراوی پادشای مەقدوونی‌دا بنەگر

بوون و لە بەشێکیاندا سەربازانی کۆن و خانەنشین، بە شێوەیەکی یەکسان جێگایان بۆ کرایەوە و نیشتەجێ بوون. دامەزراندنی چەند ناوەندێکی بازرگانی لە شوێنی بارناسکی سەربازی و ئابووری، تاقمێک لە بازرگانانی یۆنانییان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا. لەو شوێنانە بازرگانان گەلێکیان مشتەریی قۆشەنچی و کاربەدەستانی خۆرهەلاتی دەدۆزییەوە و هێندەی پێنەچوو جەماوەری ئێرانیش کە تامەزرۆی ژیانی یۆنانی و مەقدوونییەکان ببوون، تێرژان و چوونە پاڵ کۆمەڵی کڕیارانەوە و لەگەڵ گەشەی کاروباری بازرگانی، ناوەندە کۆنەکان ئاڵوگۆڕیان بە سەردا هات. هاتوچۆی ڕێوبان و ڕووباران و پەیوەندیی نیزیکی نێوان شارەکان، ڕێی بۆ بازرگانان خۆش دەکرد کە بتوانن پەلوپۆ بۆ ناوچە و هەرێمی بەربلاوتر باوێن و هەتا دوورەدەستان بڕۆن و باری ئابووریی ناوچەکان تووشی ئاڵوگۆڕ بکەن. بە هۆی بەدیهاتنی دڵنیایی سەبارەت بە ئاشتی و تەناهی، وێدەچوو کە یەکییەتی سیاسی و ئابووری «ئێرانی ـ یۆنانی» کە لەسەر بنەمایەکی پتەو داڕێژرابوو، لە داهاتووشدا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بمێنێ، بەڵام مردنی ئەو بناغەدانەرە بلیمەتەی کە قۆناخێکی وەها ڕووناکی لە زنجیرەی ڕووداوەکانی مێژوویىدا بەدی هێنابوو، دابڕانێکی ئاشکرای لێکەوتەوە و دنیای بەرەو چارەنووسێکی دیکە پاڵپێوەنا.

### سلۆکییەکان[1]

ئەو ئیمپراتۆرییەی کە ئەسکەندەری گەورە بنیاتی نا، پاش وی چی وا خۆی ڕانەگرت. بیری یەکییەتی و یەکبوون خێرایەکی بنەی بڕا و لە ماوەی چل ساڵەی پاش نەمانیدا، دنیا لە نێوان یارانی ئەسکەندەردا بوو بە گۆمی خوێن. تەواوی سەرکردەکانی سپا یان میرهەرێمە گەورەکان کە لە قوتابخانەی دژواری

---

١ـ سێلۆکییەکان

فیلیپ یان ئەسکەندەردا پەروەردە کرابوون و بە ئازایەتی و چاونەترسان، کەوڵی شانازی دەخرایە سەر شانی پیاوان، بە ئاواتەوە بوون کە نەک تەنیا هەر سەرکردەی سپا بن، بەڵکوو ببنە فەرمانڕەوای تێکڕای هۆزان و گەلان. ئەسکەندەر ئاواتەخواز بوو کە نەتەوە و گەلان پێکەوە کۆبکاتەوە و ڕایانبێنێ هەتا هەستی نەتەوایەتی وەلابنێن، تاکوو کۆمەڵێکی یەکگرتوو بەدی بێ، بەڵام خرایە پشت گوێ. دوای شەڕی ئیپسووس (٣٠١ی پ.ز)، پێکهاتەی سیاسیی دنیا لەسەر بنەمای سێ پادشایەتی دامەزرا: پادشایەتی مەقدوونی لە ئورووپا؛ پادشایەتیی لاژید (بەتالیسە) لە میسر و پادشایەتیی سلۆکییەکان لە ئاسیا.

لە نێو تێکڕای جێنشینەکانی ئەسکەندەردا، سلۆکووس (سیلۆکووس) زیاتر لە هەموان ئاشنای بیروبۆچوونی سەرکەوتەی مەقدوونی بوو، هەر بۆیە واوێدەچوو کە بۆ ناسین و تێگەیشتنی دنیای ئێرانی و تێکەڵاوبوونی، لە هاوشانەکانی شیاوتر بوو. هەر لەو کاتەوە کە شووش گیرا، ئەویش کرایە فەرماندەی مەزن و ماقووڵانی سوارەی ئێرانی و کردنی بە چەندین هێزی دەهەزار کەسەی شەڕکەری وەکوو یەک. پاشان لەگەڵ «ئاپامێ»ی مەزنەوەجاخی ئێرانی زەماوەندی کرد و زنجیرەیەکی میرانی دامەزراند کە خوێنی ئێرانی و مەقدوونی بە یەکسانی لە دەمارەکانیدا دەگەڕا. سلۆکووس بوو بە میرهەرێمی بابل و سەرەنجام میراتی ئیمپراتۆریی هەخامەنشیی پێبڕا کە هەڵبەت میسر و کلکەی سەراولێژی، یانی فەلەستین و باشووری سووریای دەگرتەوە و چەند ناوچەیەکی بەستێنەکانی ئاسیای بچووکیشی لەخۆ دەگرت. خودی ئەویش بێجگە لە چەند مەڵبەندێکی بەرتەسکی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی نەبێ لە ڕۆخج و گێدرۆزیا، هیچ خاکێکی نەدۆڕاند. ئەو مەڵبەندانەشی لەبری ئەو ڕەوە فیلانە دا بە «چاندراگووپتا»ی پادشای هیند کە بە مەبەستی پاراستنی

کەوشەنەکانی باڵی خۆرنشین پێویستی بوون. سلۆکووس قەڵەمڕەوێکی پانوبەرین و پڕ جەماوەری بۆ کوڕەکەی بە میرات بەجێهێشت کە بەپێی دەقە کۆنەکان ڕێژەیان بە سی ملیۆن کەس قەبڵێندراوە؛ بەڵام هەر دوای نەمانی، لەڕێوە دابەشکران و بچووکبوونەوەی پادشایەتیی سلۆکی دەستی پێکرد و هەتا برانەوەی دەسەڵاتی ئەم خانەدانە درێژەی کێشا. سلۆکووس بناغەدانەری دوو پایتەختە: سلۆکییە [سێلۆکییە] لە بەستێنی ڕووباری دیجلە کە ڕمێنیی بابلی بڕی و ئانتیئۆس [ئەنتاکییە] لە لێواری «چۆمی ئۆرۆنت»ی سووریا. پادشا بنەمای دامودەزگای رامیاری و بەڕێوەبەرایەتی و ئابووریی ئیمپراتۆریی خۆی لەسەر تەوەرەی ئەم دوو پایتەختە دامەزراند کە ڕێگایەکی پادشایەتی بە یەکییەوە دەبەستنەوە. هەتا وەختایەکی کە جێنشینەکانی سلۆکووس خاوەنی پایتەختی ڕۆژهەڵاتی بوون، حکوومەتەکەیان سەبارەت بە داهاتوو هیوادار بوو. دوای سەدە و نیوێک کە سلۆکییە کەوتە چنگ پارتەکان، پادشایەتیی سلۆکی بریتی بوو لە حکوومەتێکی گردبۆوە لە سووریا و هێندەی پێنەچوو کە ڕۆژ خاشەی کێشا.

سلۆکییەکان کە بوونە جێگرەوەی پادشایانی هەخەمانشی، زۆروکەم تێکڕای قەڵەمڕەوی ئەوانیان کەوتە بەردەستی و بەشی هەرە زۆری تانوپۆی پێکهاتەی دامودەزگای پێشوویان لێوەرگرتن و ناچار بوون بکەونە شوێن ئامانجێک کە شاهانی ڕابردوو دەستیان پێی ڕانەگەیشتبوو؛ ئەویش بریتی بوو لە پاراستنی یەکییەتی و یەکپارچەیەتیی ئیمپراتۆری کە سەرزەمینێکی فرەنەتەوە و فرەشارستانییەت بوو، کەچی بۆیان وەدی نەهات. تەواوی ئەو هۆکارانەی کە وردەوردە بوونە بۆنەی لاوازبوونی ئیمپراتۆریی هەخامەنشی و سەرەنجام برانەوەی کەسەرباری ئەو زنجیرەیان بەدی هێنا، داوێنی سلۆکییەکانیشیان

گرتەوە و بریتی بوون لە: تێکهەڵچوون لەگەڵ خانەدان و حکوومەتەکانی دیکەی وەک مەقدوونییە و میسر و پاشان پارتەکان و ڕۆمییەکان؛ شەڕ لەگەڵ ئەو هەرێمانەی نێو جەغزی قەڵەمڕەویان کە دەیانهەویست جویێ ببنەوە؛ هەوڵ و هەڵسووڕان بۆ پێملکردنی حوکمداران و میرهەرێمەکان و تووش بوون لەگەڵ کەتن و پیلانەکانی نێو کۆشک و بارگای میری و ئەوانەی کە خوازیاری پادشایەتی بوون و زۆر جار خوێنی دەکەوتە نێوان. پادشایانی سلۆکی لە سەدەی دووهەمی پێش‌زایین‌دا، دەستیان لە خەرج کردنی زێڕ نەدەپاراست کە ڕێگای گەندەڵی و فیتنەگێڕانی خۆش کرد. ئەوان بە مەبەستی خۆتێوەردانی قۆشەنی ڕۆم دژی دوژمنەکانیان بەرتیلیان دەدا بە سەناتۆرەکانی ڕۆمی، بەڵام هەر کات سەردەکەوتن، لەو شوێنە وەدەرنەدەکەوتن کە گرتبوویان. سلۆکییەکان زۆر بە درەنگەوە تێگەیشتن کە بە دەستی خۆیان ڕۆژهەڵاتیان داوەتە دەست ڕۆمییەکان. گومانی تێدا نییە کە چەند پادشایەکی سلۆکی، هەروەک ژمارەیەک فەرمانڕەوای هەخامەنشی، بە مەبەستی پینەوپەڕۆی ئیمپراتۆریی خۆیان کەوتنە چالاکی و هەوڵ و هەڵسووڕانی بەرچاو، کە یەکیان ئانتیۆخووسی سێهەمە. ئەوەی ڕاستی بێ سلۆکی نەیاندەتوانی بەر بە دوو هێزان بگرن کە دەرفەتیان لە لاوازی و کەمدەسەڵاتیی ئەوان دێنا و بریتی بوون لە: هێزی بەرەبەرە و بە ساوەساوی نەبڕاوەی ئێرانییەکان و هێزی ڕۆم کە پێشتر و لە سەرەتای سەدەی دووهەمدا، زەبرێکی بێ‌قەرەبووی لە ئیمپراتۆریی سلۆکی وەشاندبوو.

سلۆکووسی یەکەم، ئانتیۆخووسی یەکەمی کوڕی لەگەڵ خۆی کردە شەریکەدەسەڵات و ئیمپراتۆرییەکەی دابەش کرد و هەرێمەکانی باڵی ڕۆژهەڵاتی پێ‌ئەسپارد و سلۆکییەی بەستێنی ڕووباری دیجلە بوو بە پایتەختی؛ بەڵام لە زەمانی ئانتیۆخووسی یەکەمدا (٢٨٠_٢٦١ی پ.ز)، یەکەم نیشانەکانی بێ‌هێزی

دەرکەوتن و تێکرای توێژەران لایان وایە کە پارس سەربەخۆیی ڕاگەیاندووە. لە سەردەمی حکوومەتی ئانتیۆخووسی دووهەمدا (٢٦١– ٢٤٦ی پ.ز) چەند بەشێکی گرینگی ئیمپراتۆری دابڕان و دەتوانین ئاماژە بکەینە بەلخ (دەوروبەری ساڵی ٢٣٩ی پ.ز)، لەگەڵ هەرێمی پارت و هیرکانی (گورگان) لە ساڵی دواتردا.

پادشای گیرۆدەی شەڕەکانی باڵی خۆرنشین، نەیدەتوانی ڕێز و دەسەڵاتی خۆی لە قوڵی خۆرهەڵات داسەپێنێ. هەرێمی بەلخ بریتی بوو لە دەشتی باکووری ئەفغانستانی ئێستا و سنووری باکووری هەتا ڕووباری جەیحوون (ئامووده‌ریا) پەڕی هەڵدابوو. ئەم هەرێمە ناوچەیەکی سنووری بوو کە بۆ بەرپەرچدانەوەی پەلاماری بێبڕانەوەی بیابانگەردانی ئێرانی پێکهاتبوو. وەکوو دیارە نیزیکەی بیستهەزار سەربازی شەلوکوت و نەخۆشی ئەسکەندەر لە شوێنە تازەسازەکانی نیشتەجێ کران. پاش نەمانی پادشای مەقدوونی، ئەم سەربازانە کردیانە هەرا و گوتیان دەیانهەوێ بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان. بەشێکیان کوژران، بەڵام ئەوانەی مابوون، دەکرا هێزێکی چەکدار لە وڵاتدا پێکبێنن. «دیۆدۆتووس»ی میرهەرێمی یۆنانی لە لایەکەوە پاڵی بە یۆنانەوە دابوو و لە لایەکی دیکەوە پشتی بە پیاوانی ئێرانی گەرم بوو. ئەو دژی پادشای سلۆکیی خۆی بە شێوەیەکی ڕاکشاوانە ڕانەپەڕی، بەڵام کاتێک بێدەسەڵاتیی حکوومەتی چاو پێکەوت، هەوڵی دا هەتا بە یاریدەی جەماوەری خۆوڵاتی، حکوومەتێکی تۆزێک بەدەسەڵات بۆخۆی دامەزرێنێ، تاکوو بتوانێ بەرپەرچی پەلاماردەرانی ڕەوەندی دەشتەکی بداتەوە.

وادیارە لە هیچ جێگایەکی دیکەی وەکوو هەرێمی بەلخ دوو ڕەگەزی یۆنانی و ئێرانی، سەرەڕای ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیی جیاواز، ئاوا بە چاکی و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن پێکەوە نەحاواونەوە. ڕەنگە دوورەدەستبوونی یۆنان و

**هەرەشەی دەرەکی لە ناوەندی ئاسیاوە هەلومەرجێکی ئەوتۆی رەخساندبێ. بەلخ کە ناوچەیەکی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بوو، لە لایەکەوە خۆرنشینی بە «چین»ەوە دەبەستەوە و لە لایەکی دیکەوە بە «سیبێریا»ی کانگای زێڕ و باشووری ڕووسیاوەی گرێ دەدا. دارایی و سامانی بەلخ قەرزداری باری تێپەڕبوونی کەلوپەلی بازرگانی بوو بەو هەرێمەدا و بازاڕە بەرمێن و قەوغاکانی، دەورێکی هێژایان لە بازرگانیی جیهانیدا دەگێڕا. بەلخ ناوچەیەکی ئێران و لەسەر بنەمای کۆمەڵی دەرەبەگی دامەزرابوو. مەزن و ماقووڵانی خاوەن مڵکوماشی لە کۆشک و قەڵای سەخت و قایمدا دەژیان و بە کاروباری زەویوزاری خۆیان ڕادەگەیشتن و وەرزێرانیش لە دێهاتی بەشوورە و دیواری پتەودا نیشتەجێ ببوون. ئەم هەرێمە لە ڕۆژگاری هاتنی یۆنانییەکانەوە ئاڵوگۆڕێکی بە خۆیەوە نەدیبوو، واتە ئەو یۆنانییانەی کە ڕێوشوێنی شەرکەرانەیان دەستەبەرێکی باش بوو بۆ پاراستنی سنوورەکانی. مەزنانی تازە دەستیان لە پێکهاتەی ئابووریی وڵات نەدا، بەڵام بە سازکردنی کۆمەڵێک شار و کۆچەرنشین، توانییان جەماوەرێکی بازرگان و سەنعەتکار ڕابکێشن و نیشتەجێیان بکەن و ناوچەکە بەرەو دەوڵەمەندی بەرن و ئێرانیش قازانجی چاکی لێ هەڵگرن. لە ڕەوتێکی ئاوادا بوو کە یۆنانییەکانی دانیشتووی بەلخ، هاوهەنگاو لەگەڵ ئێرانییەکانی خۆماڵی و دابڕاو لە ئیمپراتۆری، وێڕای پارتە ڕاپەڕیوەکان، کۆمەڵێکیان پێکهێنا کە ماوەی دوو سەدە و نیو، پەرەپێدەری شارستانییەتی یۆنانی بوو لە هیند و ئاسیای ناوەندیدا و تەنیا شەپۆلی هرووژمێکی نوێ و سامناکی ڕەوەندەکانی ئێرانی، لە بنەبانی سەدەی دووهەمی پێشزایندا، تەفروتونای کرد و لێکیهەڵوەشاند.**

دابڕانی خاکی پارت و هیرکانی، یانی ناوچەکانی باشووری خۆرهەڵاتی و خۆرهەڵاتی دەریای خەزەر، کە یەکدوو ساڵێک پاش دابڕانی بەلخ ڕووی دا، کەمتر دەگەڕێتەوە سەر هێز و بڕشتی ئەم جەماوەرە نیمچەکۆچەرە و زیاتر سەبارەتە بە لاوازی و بێدەسەلاتیی پادشایەتیی سلۆکییەکان. ئەم هەنگاوە هێشتا بە دژکردەوەی دنیای ئێرانی دژی خەڵکی بێگانەی دانیشتووی وڵاتەکە، دانەدەندرا، بەڵام زۆر دواتر کە ئێران لە ئاست هەڕەشەدا ڕاست بۆوە و ویژدانی نەتەوەییی وەخەبەرهات، توانی ڕووحی تازەی خۆی بنوێنێ. پارتەکان ئاڵای دەسپێکی ئەم جووڵانەوەیان هەڵکرد، بەڵام پتر لە سەت ساڵی کێشا هەتا توانییان ئێران لە چنگ یۆنانییەکان دەرکێشنەوە و سنوورەکانی باڵی خۆرنشینی خۆیان هەتا لێواری ڕووباری فورات بەربڵاو بکەنەوە و ئەم قەڵەمڕەوە هەتا زەمانی هێرشی عەرەبان دەستی لێنەدرا و هەر بە دەست ئێرانییەکانەوە مایەوە. سلۆکووسی دووهەم (٢٤٦ – ٢٢٦ی پ.ز) هەوڵی دا هەتا بارودۆخی ئیمپراتۆری لە باڵی ڕۆژهەڵات سەقامگیر بکا. پارتەکان خۆیان لە ئاست هەڵمەتی هێزەکانی پێنەگیرا کە ڕوویان دەکردە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی. لەم کاتەدا ئاژاوەیەک ئەنتاکییەی گرتەوە و پادشای ناچار کرد هەموو ئاواتەکانی وەلابنێ و بگەڕێتەوە سووریا. پارتەکان کە هێزێکی بزۆک و بەپارێز بوون، گەڕانەوە و بە سووک و هاسانی سەرکەوتنیان وەدەست هێنا. پاش نەمانی سلۆکووسی دووهەم، سەرەڕای ئەم هەرێمانەی ڕۆژهەڵاتی، ئاسیای بچووکیش لە ژێر دەسەڵاتی سلۆکییەکان دەرکێشرا. پەنجا ساڵ دوای مەرگی بناغەدانەری پادشایەتیی سلۆکی، قەڵەمڕەوی حکوومەت لە باڵی خۆرنشینەوە هەتا چیای تووروووس و لە باڵی خۆرهەڵاتەوە هەتا هەرێمی ماد دەڕژیی.

لەم هەلومەرجە بارناسکەدا، تەختی دەسەڵاتی ئەنتاکییە کەوتە دەست ئانتیۆخووسی سێهەم (٢٢٣ – ١٨٧ی پ.ز)، کە پادشایەکی دڕ و پیتۆڵی سیاسی بوو. کاتێک لەسەر تەختی دەسەڵات پاڵی دایەوە، بانووی ئێران ڕاپەڕینی میرانی ماد و پارسی بە خۆیەوە بینی. پارتەکان و بەلخییەکان پێکەوە بوونە هاوپەیمان و هەڕەشە بۆ سەر ماد. ئانتیۆخووس ئەو میرانەی تێکوپێک شکاندن و بە مەبەستی گەڕانێکی چەکدارانە بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتەڕێ کە پتر لە هەشت ساڵی کێشا. ئەو بە کاپادۆکییەدا ڕۆیی بۆ ئەرمەنستان و خەشایارشای پادشای ئەوێ دانی بە حکوومەتەکەیدا هێنا و خوشکی پادشای سلۆکی خواست و بوو بە زاوای. پاشان پادشای سلۆکی لە باکوورەوە بەرەو باشووری ئێران شۆڕ بۆوە و چوو بۆ شووش و لەوێوە ڕۆیی بۆ هەگمەتانە (هەمەدان) هەتا درێژە بە شەڕی پارتەکان بدا. ئەرشەکی سێهەم[1]، خۆی لە بەر هێزەکانی نەگرت و کشایەوە و سەرەنجام سەری وەبەر دەسەڵاتی هێنا و پیتاکی ملکانەی دایە. ئانتیۆخووس گەیشتە کەوشەنەکانی بەلخ کە لەوێ ئووتیدیمووس زنجیرەیەکی تازەی لە جێگای میرانی دیۆدۆتووس دامەزراندبوو. دیۆدۆتووس زۆر بەگوڕ بەرەنگاری پادشای سلۆکی ڕاوەستا، بەڵام هێندەی پێنەچوو کە هەردک لا پێکەوە ڕێککەوتن و کچی ئانتیۆخووسی بۆ دیمیتریووسی کوڕی خواست. پادشای سلۆکی پاش تێپەڕین بە هیندوکوشدا، لە دەرەی کابول چاوی بە پادشای «مووریا»کانی هیند کەوت و پەیمانی دۆستایەتیی لەگەڵ نوێ کردەوە. دواتر بە ڕێگای ڕۆخج و زرەنگ و کرماندا گەڕایەوە پارس. چووە دیداری باڵی خۆرنشینی بەستێنەکانی کەنداوی فارس و ناوەندە بازرگانییەکانی

---

١ـ ئەشک

کوندر[1] و بەو دورگانەدا تێپەڕی کە بۆ ڕاوی مرواری بەناوبانگ بوون و سەرەنجام گەڕایەوە سلۆکییەی قەراخ ڕووباری دیجلە. لە ڕووی کۆمەڵێک نیشانەوە واوێدەچێ کە ئەم گەشت و گەڕانەی پادشا بە مەبەستی گەشەی کاروباری بازرگانی بووبێ لە دەریا و ویشکانی‌دا و بۆیە هێندەشی پێچووە. ئانتیۆخووس کە بە شەرابی سەرکەوتنەکانی خۆی سەرمەست ببوو، تەمای گرت مەقدوونییەش بخاتە سەر خاکی قەڵەمڕەوی خۆی. بەبێ هیچ مەبەستێک بە گەرووڵەی [بۆسفۆر و داردانێل‌دا] تێپەڕی، بەڵام ڕۆم زەبرێکی گورچووبڕی لێوەشاند و لە شەڕی «مەغنیسیا»دا بەزی. ئاشتی و پێکهاتنی ئاپامێ (١٨٨ی پ.ز)، نەک تەنیا بەش‌بڕاوی کرد لە خاکی ئاسیای بچووک، بەڵکوو باج و پیتاکێکی قورسیشی بە سەر شانی‌دا سەپاند.

ئاخرین پادشای گەورەی سلۆکی ئانتیۆخووسی چوارەم (١٧٥ ـ ١٦٤ی پ.ز) بوو کە چەند هەنگاوێکی ئازایانەی بە مەبەستی نۆژەن‌کردنەوەی ئیمپراتۆری و دەربازبوونی لە چنگ لێکدابڕان هاویشت. سەرکەوتنی هێزە چەکدارەکانی لە میسر، بەداخەوە هیچ قازانجێکیان پێنەگەیاند و هەوڵ و هەڵسووڕانەکانی بۆ پتەوبوونی پەیوەندیی نێوان نەتەوەکانی وڵاتەکەی لە ڕێگای تێزاندنی کولتووری یۆنانییانە، هیچی لێ شین نەبوو. هەر ماوەیەک دوای نەمانی ئەم پادشایە، سلۆکییەکان ناوچەی دووچۆمانیان لە چنگ دەرهات و پارتەکان بە سەری‌دا زاڵ بوون. داڕووخانێکی بەپەلە و خێرای سیاسی دەستی پێکرد کە نیشانەی پاشەکشەی هێلێنسیم بوو لە ڕۆژهەڵات. میرهەرێمان سەربەخۆ بوون و قوڵەپادشایەتی و خان‌خانی باڵیان بە سەر وڵات کێشا. ئیمپراتۆریی سلۆکی

---

١ـ دارێکە لە تیرەی قەزوان و بێ‌بەرە و بریندار دەکرێ و شیلەکەی دەگرن و ویشکی دەکەن و بۆنخۆشە وەکوو داری عوود و دەیسووتێنن هەتا بۆنی بێ. مووروونچە(؟)و.

لەوەی بەو لاوە تەنیا بریتی بوو لە خاکی سووریا و کۆمەڵە هەرێمێکی ئازاد کە ئامادەی ئەوە بوون بچنە کۆشی ڕۆمییەکانەوە، کە بۆ گرتنی دنیای یۆنانی دەستیان لە کاروباری ڕۆژهەڵات وەردەدا. وەکوو ئاشکرایە حکوومەتەکانی یۆنانی دوابەدوای یەکتر سەربەخۆ نەمان و بوونە ژێرچەپۆکەی ڕۆم. ڕۆم ویست و داخوازی خۆی بە سەردا دەسەپاندن و شێوازی حکوومەتی فێڵەبازانەی خۆی سەقامگیر کرد کە لەسەر تەوەرەی داگیرکەری، خۆبەزلزانی، گەندەڵی، زەبروزەنگ و بێئاکامی هەڵدەسووڕا.

**

ئیمپراتۆریی سلۆکی کە بریتی بوو لە دنیای ئێرانی، بابلی کۆن، شارەکانی فنیقیە و باژێرەکانی ئاسیای بچووک، وەکوو ئیمپراتۆریی هەخامەنشییەکان بە حکوومەتێکی تێکەڵاوی فرەنەتەوە دادەندرا. یەکەمین پادشایانی ئەم خانەدانە زۆریان هەوڵ دا کە یەکییەتیی سەرتاسەری بپارێزن. هەخامەنشییەکان پشتئەستوور بوون بە نەتەوەی ئێرانی کە ڕۆژبەڕۆژ زیاتر لە بانووی ئێراندا بڵاو دەبوونەوە و لە دەرەوەش دەبوونە چواربەندەی هێزی چەکدار و هەڵسووڕێنەری دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی. ئەسکەندەری گەورە لە ماوەی کورتی دەسەڵاتی خۆیدا دەیتوانی پشتی بە قۆشەنچییانی مەقدوونی ببەستێ. سلۆکییەکان خانەدانێکی ئەوتۆی نەتەوەیی نەبوون کە لە نێو جەرگەی نەتەوە هەڵقوڵیبن و جێگای مەترسی بوو ئەگەر هاتبا و پشتیان بە توخمەی ئێرانی بەستبا کە ڕایەڵوپۆی بەشی هەرە زۆری ئیمپراتۆری بوون. ئەوان تازە نەکەوتنە شوێن ڕچە و ڕێبازی ئەسکەندەر کە بریتی بوو لە تێکەڵکردنی توخم و تۆرەمان و لە هەر ناوچە و هەرێمێک تاقمێکیان پەروەردە کردن کە لێیان نیزیک و پێیان وەفادار بن. سلۆکییەکان بەپێچەوانەی بۆچوونی

هەخامەنشییەکان جووڵانەوە و یۆنانی و مەقدوونییان لە بەشێکی بەربڵاوی قەڵەمڕەوی خۆیاندا نیشتەجێ کردن. دانیشتووانی تازە بە چواربەندەی ئیمپراتۆری دادەندران و دەوری ئاڵقەی پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و خەڵکی خۆوڵاتییان دەگێڕا. ئەوان دەبوو هەم بچنە نێو ڕیزەکانی قۆشەن و هەم بەشداری کاروباری ئیداری بن و لە شار و شارەدێیان بنە دابکوتن و سەرقاڵی کار بن و شان بدەنە بەر کشتوکاڵ. ئەمە گەڵاڵەیەکی بەربڵاو بوو کە لەبەر بارودۆخێکی لەباری تایبەت کە ئیمپراتۆریی سلۆکی لە یۆنانی پڕ جەماوەر و چارەڕەشدا دۆزیبوویەوە، ڕێگای پەرەئەستاندنی بۆ خۆش کرا. لە سەرتاسەری سەدەی سێهەمی پێش‌زایین‌دا، ڕەوتێکی بێ‌نێوبڕ، دانیشتووانی ئورووپای باشووری ڕۆژهەڵاتی وەکوو سێڵاو بەرەو سووریا و بابل و ئێران سەراوژێر کرد و ئەوانەی کە لە ئاسیای بچووک و تەنانەت سووریاوە هەڵکەندرابوون، پێیانەوە دەلکان. بە مەبەستی سەقامگیربوونیان، گەڵاڵەیەکی بەربڵاوی شارسازی دەستی پێکرد و کەوتە بواری جێبەجێ کران. کۆمەڵێک کۆچەرنشینی لەشکری و نالەشکری دامەزران. بەم شێوەیە لە بواری شارسازی‌دا، سلۆکی کەوتنە شوێن هەڵوێست و ڕێبازی ئەسکەندەر و پێیان‌گەیاند و هەموو هەرێمەکان، بەتایبەت ئێرانیان ئاوەدان کردەوە کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان‌دا تەنیا بناغەی شارەکانیان دانابوون و هێشتا تەواو نەکرابوون. ئەم شوێنانە بە مەبەستی پاراستنی وڵات لە پەلاماری ڕەوەندان یان لەبەر هەس‌دانەوەی خۆوڵاتییانی ئاژاوەگێڕ، بەتایبەت جەماوەری «ماد» ساز دەکران. گەلێک لەو جێگایانە لە مەودای شارێی لەشکری، واتە شادەماری سەرەکیی ئیمپراتۆری کە سلۆکییەی سەر لێواری ڕووباری دیجلەی بە بەلخەوە دەبەستەوە ساز کران و بەشێکیان لەسەر ڕێگای هەزار ساڵەی

«کرماشـان ـ هەمـەدان» قـوت کرانـەوە. لـە لایـەکی دیکـەوە سـازکرانی چەنـد لەنگەرگایەک لە بەستێنی دەریا بۆیان پێویست بوو، بۆیە سلۆکییەکان لە ڕەخی کەنداوی فارس کەمتر لە نۆ شاریان ساز نەکرد و یەکیان دەبێتە ئەنتاکییـە لـە هەرێمی پارس، واتە بووشێهری ئێستا کە جێی کۆنەشارێکی عیلامیی گرتەوە. ناوچە بەپیت و ڕێژەوەکانیش سەرنجی ڕاکێشان، بەتایبەت ئەو سێگۆشەیەی کە کەوتۆتە نێوان کرماشان و هەمەدان و برووجێرد و سـەرلەبەری بـەراو بـوو. لـە پێدەشـتی ناوچـەی کرماشـان (کرمانشـا) ـ کـە سـەربازانی ئەسـکەندەر بـە «نیسا»ی زێدی «دیۆنیسۆس»یان دەزانی ـ چەند بنکەیەکی یۆنانی لە دینەوەر و کەنگاوەر ساز کران. هەگمەتانە (ئیکباتان = هەمەدان) نۆژەن کرایەوە. لە بەشی باشـووریتر، لائۆدیسـە واتـە نەهاوەنـدی ئێسـتاکە سـازکرا. شـارێکی دیکـە لـە «کەورهـە»ی نیزیـک «ئـەراک» بینـا کـرا. ڕێگـا (ڕەی)ی کـۆن کـە ئێسـتا لـە دەوروبـەری «تـاران»ە، بـە «ئۆورۆپـووس» نـاودێر بـوو. لـە هـەرێمی پـارت بازێرێـک سـازکرا بـە نـاوی «نێسـا ـ ئەلێکسـاندرۆپۆلیس» کـە بەرلـە شـاری سەتدەروازە (هێکاتۆپیلۆس) یەکێک بوو لە پایتەختەکانی پارتـەکان. شـاری سەتدەروازە شارێکی یۆنانی بوو و بۆیە پێیان دەگوت سەتدەروازە، چونکە پتر لە چوار دەروازەی هەبوو. سەرەنجام لە کلکەی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتیی ئیمپراتۆریی ئێران، لە بناری پامیر و لێواری «سیێند»، شـاری «ئایخـانوم» سازکرا کە ئاگامان لە ناوە یۆنانییەکەی نییە.

شارە تازەکان و شارە نۆژەنکراوەکان خەڵکی تێکەڵـەیان تێڕژا و ئاوەدان کرانەوە، هەروەک بەشی زۆری جەماوەری بابل لـە سـلۆکییەی سـەر لێواری ڕووباری دیجلە نیشتەجێ کران. ڕوون نەبوو کە ئەم پێکەوەژیانە چلۆنی ڕەنگ دەدایەوە، بەڵام هەموو شوێنەکان خاوەنی هەمان داموودەزگای کۆنباو، هەمان

کۆمەلانی نەتەوەیی، هەمان ئەنجومەنەکان و هەمان کاربەدەستانی دیاریکراوی سالانە بوون. داب و نەریتی خۆجێیی پارێزران، بەلام لەگەل کۆمەلێک دیاردەی یۆنانی تێکەل بوون. لە پێناو ڕەچاوکردنی خۆپاراستنەوە، چەرگەقەلای سوار بە سەر شاردا، بنکەیەکی سەربازیی یۆنانی لێ سەقامگیر کرا کە یۆنانی لە جەنگەی مەترسیدا دەیانتوانی پەنای بۆ بەرن. هەر شارەی کۆمەلێک زەویوزاری کشتوکالیی دیاریکراوی پێ تایبەت درا کە جووتیارانی گوندەکی کاریان لەسەر دەکردن و لێیان نیشتەجێ ببوون. جەماوەری گوندەکی جاری وابوو کە دەرفەتیان لە پشوودرێژیی کۆمەلانی شارنشین دینا، پەرەیان بە کۆمەلانی خۆیان دەدا و بە چەشنێک ئازاد و سەربەخۆ دەژیان. هەتا زەمانێکی کە ڕێچکەی کۆچەران درێژەی هەبوو، شارەکان ئاوەدان و بەختیار بوون. لەبەروەی ڕەوتی کۆچەرنشینی بەرەبەرە بەرەو لاوازی دەڕۆیی و سەرەنجام لە دەوروبەری نیوەی سەدەی دووهەمی پێشزاییندا، ویشکاوی هات، سیسهەلگەڕان و نەمانی هێندێک لە شارەکان دەستیان پێکرد و لە ئاخریدا بەرگی یۆنانیی خۆیان لێداماڵدرا.

زۆربەی توێژەران لایان وایە کە کۆچەرنشینانی یۆنانی بەشی زۆریان هەر پیاوانی چەکدار و شەڕکەریان لێ نیشتەجێ کراوە و هەرکات پێویستیان پێیان بووبێ و هەست بە مەترسی کرابێ، بانگیان کردوون و ئەوانیش سەر لە پێناوی خزمەت بوون. کۆمەلانی کۆچەر لە گوندان نیشتەجێ دەکران یان لە نیزیک ئەوانەوە زەویوزاریان بۆ دابین دەکرا. جاری واش بوو کە جەماوەری یۆنانی لەگەل خەلکی خۆمالی بە مەبەستی ئەنجامدانی سەربازی لە شاران کۆدەکرانەوە. هەر کەسێک پەلەیەک زەوی، خانووبەرەیەک، تۆو و مەڕ و مالاتی دەدرایە. سەربازەکانی دەیانتوانی لەو شوێنانە کۆ ببنەوە و تەنانەت چەند

شارێک ساز بکەن کە هەمیشە خەڵکی چەندتۆوەی تێدا دەژیا، بەڵام بە داب‌ودەستووری یۆنانی هەڵدەسوورا. بێجگە لە یۆنانییەکان و مەقدوونییەکان، بەکرێ‌گیراوانی میسیا و کاپادۆکییە و تەنانەت تراکییەش هاتنە ئێران. تەواوی ئەوانەی تازە دەهاتن و بە شێوەی ژیان و بیرۆکەی یۆنانی گۆچ کرابوون وا دەبوونە دڵبەستەی خانە و لانە و شارەکانیان کە بە پاڵپشتی ئەو پادشایانە دادەندران کە دەیانتوانی تێری و تەسەلی و تەناهی و داهاتوویان دەستەبەر بکەن.

بێ‌گومان ئەم توخم و تۆرەمە تێکەڵاوانەی پێکهاتەی جەماوەری ئیمپراتۆری بە چاوێک نەیاندەڕوانییە پادشای دەسەڵاتداری بێ‌بەرگێرەوە کە فەرمانەکانی هاوسەنگی یاسا بوون. ئێرانی پادشای تازەیان بە جێنشینی هەخامەنشییەکان دادەنا، بەڵام لە ڕوانگەی مەقدوونییەکانەوە جێنشینی ئەسکەندەر بوو، کەچی یۆنانی تەنیا وەک پارێزەری بەرژەوەندییەکانی خۆیان لێیان دەڕوانی. پاش ئانتیۆخووسی دووهەم، سلۆکی بوونە خاوەنی دینێکی ڕەسمی. پێشتر ئانتیۆخووسی یەکەم دینی باوکی نەماوی هەڵوەشاندبۆوە. بەپێی دینی ڕەسمی هەر پادشایەک کە حکوومەتی دەکرد لەگەڵ ژنەکەی دەگەیشتنە پلەی خودایەتی. لە پەرستگای شارە گەورەکانی هەرێمەکان‌دا پێشەوایانی نێر و مێی دینی، لەسەر ئەم ڕێ‌وشوێنە دەڕۆیشتن. ئانتیۆخووسی سێهەم بەپێی دەقی بەردەنووسێکی کە ساڵی ١٩٣ی پ.ز. هەڵکەندراوە و لەم ئاخرییانەدا لە نەهاوەند (لائۆدیسەی پێشوو) دۆزراوەتەوە، فەرمانی داوە کە «لائۆدیسە»ی هاوسەری بپەرستن.

سلۆکییەکان لە بواری سیاسی‌دا، ڕێبازی داریووشیان ڕەچاو کرد و گوتیان با نەتەوەکان هەروەکوو خۆیان بمێننەوە، بەڵام دەبێ بکەونە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری. هێندەی پێنەچوو کە بەناچاری چوونە سەر ڕێ و ڕچەی

کووررووش و حاوانەوە و لێبووردەیی کرایە ڕێبازی حکوومەت. وەکوو زۆربەی توێژەران لایان وایە سلۆکی بنەمای پێکهاتەی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتیی هەرێمەکانیان دووهێندە پاراست و هەر میرهەرێمێک کاروباری هەرێمەکەی بە شێوەیەکی سەربەستانە بەڕێوەدەبرد و ناوەند هێندەی خۆ تێهەڵنەدەقوتاند. بێبڕشتیی ئەم شێوازە حکوومەتە هەر خێرایەکی لە ڕێکخستنی دامودەزگای ئیمپراتۆریدا ڕەنگی دایەوە و مەیلی جودابوونەوەی میرهەرێمەکان، کە پێشتریش لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا ببوو بە نەخۆشییەکی بێچارەسەر، هێز و بڕستی سلۆکییەکانی تێدابرد. سەرەنجام ئیمپراتۆریی سلۆکی بوو بە کۆمەڵێک میرنشین و قوڵەپادشایەتی بە میرات بۆ پارتەکان بەجێما و نەیانتوانی هیچی لەگەڵ بکەن و ئاوا پاراستیان، چونکە حکوومەتی ناوەندی لە سەردەمی سلۆکییەکاندا نەیدەتوانی دەسەڵاتی خۆیان بە سەردا بسەپێنێ و تەنیا شارەکانی یۆنانی بوونە چەند شێوەدوڕگەیەک.

سەرەڕای ئەم بارودۆخەش، بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆری بۆ سلۆکییەکان بە سەرکەوتنێکی گەورە دادەندرێ. کاربەدەستانی شارەزا و چاک ڕاهاتووی حکوومەت، توانییان دامودەزگایەک دامەزرێنن کە خەزێنەکانی وڵات پڕ بکاتەوە. مڵکانەی میری، پیتاکی شاران و پەرستگایان، سەرانەی سەربازان و هۆزان و کەسان، لە لایەن کۆمەڵێک کاربەدەستی حکوومەتەوە کۆدەکرانەوە و یۆنانی لەم ڕەوتەدا پلەدار و لێپرسراو بوون، ئەگەرچی ئێرانیش لەم کارانە بێبەش نەکرابوون. دەزگای بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی کە یەکجار بەپارسەنگ بوو، بەشی هەرە زۆری میراتی بەجێماوی هەخامەنشییەکان بوو، بەڵام شێوەی کاری ڕوونتر و ڕێکوپێکتر هەڵدەسووڕا و داهاتێکی بەرچاوی بۆ پادشایان دابین دەکرد.

تەواوی زەوی‌وزاری ئیمپراتۆری بەپێی ڕێ‌وشوێنی خەنیمەت و دەسکەوتی شەڕان، هی پادشا بوون. پەرستگاکانیش خاوەنی ملک‌وماش بوون، ئەگەرچی ئێمە نازانین لە ئێران چەندەیان زەوی بۆ بڕ دراوە. ئەوەی ڕاستی بێ دەبێ بیسەلمێنین کە کۆمەڵێک پەرستگای گرینگی وەکوو هەگمەتانە، کەنگاوەر و نەهاوەند، خاوەنی زەوی‌وزاری بەربڵاو و گوندان بوون کە جووتیاران یان کۆیلان بە مەبەستی دابینی بژیوی جەماوەری بەرچاوی ژنان و پیاوانی جڵەوداری دینی، گۆرانیبێژانی نێر و مێ، ژەنیاران، کەنیزان و خزمەتکاران، کاریان لەسەر دەکردن. پەرستگاکان یەکجار دەوڵەمەند بوون و پادشایانی سلۆکی وەکوو ئانتیۆخووسی سێهەم و چوارەم لە جەنگەی تەنگەژەی دارایی‌دا بە بیانووی ئەوەی کە بەپێی ڕێ‌وشوێنی دەسەڵات تەواوی ئەم سەروەتانەی پادشان، دایاندەرووتاندن و تاڵانیان دەکردن. لەو شوێنانەی کە پەرستگای «ئاناهیتا» یان «ئانایا»ی لێ‌بوو، پادشا وەکوو زێئووس و شووی خاتوونەخوایان داوای گیازی بووکانەی لێدەکردن.

بەشێک زەویش درابوون بە ئەندامانی خانەدانی میری، پیاوماقووڵانی بارگا، پایەبەرزان و بە شاران و بەشێکیش فرۆشرابوون. ئەو زەوی‌وزارانە وەکوو سەردەمی هەخامەنشییەکان بە دەست زلەدەرەبەگانی ئێرانی یان یۆنانییەوە بوون، بەڵام جووتیارەکان کە بە بەشێکی دانەبڕاوی ئەو ملکانە دادەندران، خاوەنی چەشنێک ئازادی بوون. ئەو دەرەبەگانە دەبوو لە جەنگەی پێویست‌دا، هێزی سوارەیان تەیار بکەن کە پادشا بەهەڵکەوت کاری پێیان دەبوو، چونکە هێزی چەکداری ڕێک‌وپێک زۆربەیان فیل‌سوار بوون. پادشا خاوەنی ئەو زەوی‌وزارانە بوو کە سەرکار و پاکار و بەرپرسانی دام‌ودەزگای دارایی میری بە سەریان ڕادەگەیشتن. لە نێو جەماوەری لادێیی‌دا، بێ‌گومان ئەوانەی کە

لەسەر مووچە و مەزرای شاران کاریان دەکرد، قازانجی پتریان بۆ وەبەرچاو دەگیرا.

بەم شێوەیە لە خاکی ئێراندا کۆمەڵێکی تازە پێکهات و ملی نایە بەرکار و ژیان. تانوپۆی ڕەنگاورەنگی ئەم کۆمەڵە کەموزۆر پاڵەوپاڵ لە شار و شارۆچکە و شارەدێ و دێهاتاندا نیشتەجێ بوون و زۆرینەیان ئێرانی و کەمینەیان یۆنانی بوون. داهاتووی ئیمپراتۆریی سلۆکی ڕاستەوخۆ بەسترابۆوە بە سەرکەوتنی گەڵاڵەی نیشتەجێبوونی جەماوەری «یۆنانی ـ مەقدوونی» لە وڵاتدا. ئەم حەشیمەتە بەرلە هەموو شتێک خاوەنی تایبەتمەندیی سیاسی و لەشکری بوون و بێونەبێ دەبوو تێکەڵاوی کاروباری کۆمەڵایەتی و ئابووری بووبان و خۆیان گونجاندبا. ئەم هەڵوێست و سیاسەتە کە وەک تانوپۆیەک وابوو کە دەبوو نەخش و کری یەکییەتی وڵاتی پێ تەندرابا، نەیدەویست ئێرانییەکان وەسەر ڕەنگی یۆنانی بگێڕێ یان ناچاریان بکا هەتا وەکوو ئەوان بژین و کولتووریان ڕەچاو بکەن. زانایان لە ڕووی کۆمەڵێک بەڵگەوە سەلماندوویانە و پێداگرن کە پرسی وە یۆنانیگێران، زاراوە و بۆچوونێکی تازەیە و یۆنانی بۆخۆیان بە مەبەستێکی ئەوتۆیان نەدەزانی. وە یۆنانیگەڕانی ئێرانییەکان تەواو ڕەوتێکی سروشتیی بڕیوە، هەروەک چۆن وە ئێرانیگێرانی یۆنانییەکانیش هەروا بووە و ئەم ڕەوتە بۆ دوو ڕەگەزی دراوسێ، هیچ لەمپەرێک نەیدەتوانی بەری پێبگرێ. کارەکە وەکردەوە گەڕا بێئەوەی سلۆکی پێوە بووبن پەرەی پێبدەن یان بەری پێبگرن، چونکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەم پرسە کۆمەڵایەتییانە بایەخێکی نەبوو. سلۆکی نەیاندەویست بە نیشتەجێکردنی هاونیشتمانانی خۆیان حکوومەتێکی یۆنانی یان مەقدوونی دامەزرێنن.

ڕایەڵەی ئەو شارانەی کە سلۆکییەکان سازیان کرد، دەبوو ئیمپراتۆری پێکەوە بکاتـە یـەک و یەکپارچـە. کۆمـەڵی شارنشـینی نـوێ دەکەوتـە لای سـەرەوەی ئێرانییـەکان و دەبـوو بـە دابینکـەری پەیوەنـدیی پادشـا و جـەماوەری ئێرانـی. هـەروەها ئـەم کۆمەڵـە بریتـی بـوو لـە تـاقمێکی پایەبـەرزانی حکوومـەتی، گەورەپیاوانی دەوروبەری پادشا و بارگا و یاران و هاودەمانی. کاربەدەستانی میری و بازرگانان دەکەوتنە پلەیەک بەرەژێرتر. هەروابێتەوە پێویستە باسـی قۆشەنیش بکرێ کە لە هەموو شوێنێک بەتایبەت لە پایتەخت و قەڵاکان بنکەیان دامەزراندبوو. هـەر ئـەم پێکهاتـە کۆمەڵایەتییـە لـە گوندانیش‌دا وەبـەرچاو دێ. شانبەشـانی زەوی‌وزاری بـەربڵاوی دەرەبـەگانی ئێرانـی، مووچـە و مـەزرای دەرەبەگانی یۆنانی یان مەقدوونی هەبوون. دانیشتووانی ئەم کۆچەرنشینانە لە نیزیک گوندەکانی ئێرانی بنـەیان داکوتـابوو. جەماوەری کۆن، چینێکـی تـازەی مەزن و ماقووڵان و توێژێکی سەرمایەدارانیان پێوە زیاد کرا کە بریتی بوون لە کۆچـەرانی یۆنـانی و مەقـدوونی، مامۆسـتایان، فەیلەسـووفان و بازرگانـانی خوازیاری کار. بەپێی تەواوی ئەم نیشانانە دەردەکەوێ کە سلۆکییەکان نێوانیان لەگەڵ چینی مەزنانی ئێرانـی خـۆش بـووە و تاقمێکیـان بـۆ ئـەوەی پێمل‌بوونی خۆیان سەبارەت بـە پادشـا بسـەلمێنن، شـانیان دایـە بـەر پلـەی گرینـگ. دەبـێ قبـووڵی بکـەین کـە ئـەم چینـەی کۆمـەڵی ئێرانـی، زیـاتر لـە جـەماوەری دیکـە کەوتبوونە سەر ڕەنگی فەرهەنگی یۆنانی.

لە زەمانی ئەسکەندەرەوە کە هەزاران لاوی وەجاخزادەی ئێرانی چوونە نێو ڕیزی سپای سوارە و سەربازانی ئێرانـی خۆیـان لـە ڕیزەکـانی سـپای فـالانژدا دیتەوە، زمانی یۆنانی لە ئێران‌دا پەرەی گرت. زەماوەندی بەربڵاوی جەماوەری مەقدوونی و یۆنانی لەگەڵ ئێرانییەکان، کە زۆربەیان لەم وڵاتە مانەوە، وێڕای

سازکرانی کۆمەڵێک شاری کۆچەرنشین، گەشەی ئابووری، ڕێکخرانەوەی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و لەشکری و داندرانی دەزگای دادەوانی، سەرپاکیان بوونە هۆی ئەوەی زمانی ئارامی کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا زمانی ڕەسمی بوو، جێی پێ لێژ بێ و کوێر بێتەوە و زمانی یۆنانی جێی بگرێتەوە. زمانی یۆنانی کە وەکوو زمانێکی نێونەتەوەیی لێهاتبوو، تەنانەت سەردەمی پارتەکان لە شارەکاندا دەخوێندرا. ئەم ڕەوتە کارێکی وای کرد بەشێکی بەرچاوی دانیشتووانی بانووی ئێران بوونە دووزمانە، هەروەک چۆن ئێستاکە خەڵکی کوردستان، ئازەربایجان و خێڵاتی بەلووچ و قەشقایی بە دوو زمان دەدوێن. جەماوەری شارنشینی ئێران و بەشێک لە دەوروبەری شاران، تەنانەت سەدان ساڵ دوای ڕووخانی حکوومەتی سلۆکی، زمانی یۆنانییان پاراست. نووسراوەی سەر میدالیاکانی پادشایانی پارت و کەوڵە دۆزراوەکانی هەورامان لە کوردستان، کە سەبارەتن بە پێڕاگەیشتنی کێشە و سکاڵای کەسانی ئێرانی و بە زمانی یۆنانی نووسراون، بە باشی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن. دوو دەقی سەر بەردەتاشەکانی دۆزراوەی پارتی بە زمانی یۆنانی نووسراون و بەردەنووسی پادشایانی ساسانی، لە پاڵدەستی پەهلەویی پارتی و پەهلەویی ساسانیدا، خەت و زمانی یۆنانیشیان پێوە دیارە. تەواوی ئاڵوگۆڕەکانی بازرگانی لە یۆنانەوە هەتا بەلخ بە زمانی یۆنانی ئەنجام دەدران و تەواوی گێرە و کێشەی نێوان ئێرانییان و یۆنانییان دەکەوتنە بەردەستی دادوەرانی یۆنانی و بەپێی یاسای یۆنانی چارەسەر دەکران. خەڵکی خۆوڵاتیی ئێران یاساکانی یۆنانیان خواستنەوە و لە نێو خۆیاندا کاریان پێکردن.

بەم شێوەیە، بەبێ هیچ زۆرەملی و ڕەچاوکرانی ڕێبازێکی تایبەت، فەرهەنگی یۆنانی ڕەنگی دایەوە و شەقڵی هاویشتە سەر جەماوەری ئێران، بەتایبەت

شارنشینان و لە نێو تێکرای چینی باڵا و نێوەڕاستدا بڵاو بۆوە و تەنانەت دزەی کردە نێو ڕیزی کرێکارانی ئازادی شاران، بەڵام کارێکی وای نەکردە سەر خەڵکی گوندەکی. پەرەئەستاندنی فەرهەنگی یۆنانی دەگەڕێتەوە سەر چوونی پیاوانی ئێرانی بۆ نێو ژیانی سیاسی و ئیداریی ئیمپراتۆری و بەم شێوەیە کۆمەڵێکی تێکەڵاوە بەدی هات و ئەگەر ئەم بەرگە داماڵدرابا، ئێران بە وڵاتێکی ئاسیایی دادەندرا کە یۆنانی لێی نیشتەجێ ببوون. بەشداربوونی چینی باڵا و نێوەڕاستی ئێرانی لە ژیانی حکوومەتی‌دا، سیاسەتێکی بەپارسەنگ بوو کە دەیهەویست حەساری نێوان نەتەوەکان بڕووخێنێ و توانی چەشنێک هاوکاری لە نێوان ئەو کەسانەدا بەدی بێنێ کە بە زمانی یۆنانی دەدوان. وە یۆنانی‌گەڕانی ئێرانییەکان و پێچەوانەکەی، ڕەوتێکی دووسەرە بوو کە خۆی لێ حەشار نەدەدرا و زەماوەندەکان ڕێگایان زیاتر بۆ خۆش دەکردن. هەروەها خاڵە پرشنگدار و سەرنجڕاکێشەکانی بیروباوەڕی ڕۆژهەڵاتی و ڕێورەسمەکانی دینیش هاتنە مەیدان و گونجاندنی دینی یۆنانی هەلێکی لەباری خۆنواندنی لەو بوارە بەرینەدا بۆ ڕەخسا؛ بەڵام یۆنانی بە شێوەیەکی بەربڵاو کەوتنە ژێر باندۆری دین و بۆچوونی ڕۆژهەڵاتی. بەشێک لە یۆنانییەکان بێئەوەی دەست لە زمان و ڕێسای خۆیان هەڵبگرن، کەوتنە ژێر باندۆری چەشنی دین و ژیانی ئێرانییەکان و بەمجۆرە قازانج و بەرژەوەندیی ڕووحی و کار و پیشەیان بە سەر لاوازی‌دا کەوت.

وەکوو دیارە کۆمەڵانی بەربڵاوی گوندەکی و شارۆچکەنشینی ئێرانی، نەکەوتنە بەر شەپۆلی کارتێکردنی کولتووری یۆنانی. جیاوازیی نێوان کۆمەڵانی شارەکی و گوندەکی، دابڕانێکی خستە نێوانیان و هەر لەو ڕۆژگارەوە بناغەی ناکۆکی و دوژمنایەتیی داهاتوو داندرا. لە ڕوانگەی گەلەوە گۆڕانی زنجیرەی

میران تەنیا بریتی بوو لە گۆڕانی مەزنان، چونکە هەموویان باج و پیتاکیان دادەسەپاند و خەڵکیان بە بێگار دەبرد. بە بڕوای زانایان، کۆمەلانی خەڵک پێیان وابووە کە کاربەدەستانی دامودەزگای میری وەکوو ئەوانەی چووبوونە سەر سرشتی بورژوازییانەی یۆنانی، ملهوڕ نەبوون. گەل بە دیتنی خەڵکی بێگانە لە وڵاتی خۆیدا ڕاهاتبوو، بەڵام دژی ئەو چینەی دەسەڵاتداران بوون کە ژیانێکی جیاوازیان دابین کردبوو بۆ خۆیان و لەبری یەزدانی ئێرانی، یەزدانی دیکەیان دەپەرستن.

بە باری هەل و هەڵکەوتی جوغرافیاییدا، ڕەوتی وە یۆنانیگەڕان هەموو ئێرانی وەکوو یەک نەگرتەوە. ڕاستە کە لە خاکی ماد گەلێک شار و کۆچەرنشینی یۆنانی سازکران، بەڵام واوێدەچێ کە ناوچەکانی دەرەوەی ئەم جەغزە کەمتر کەوتنە ژێر باندۆری بنەگربوونی یۆنانییەکان یان هەر کاریان تێنەکرا. «لە هەر ناوچەیەکدا کە یۆنانی بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە یەکتر کۆنەبوونەوە و لەگەڵ ئێرانییەکان تێکەڵاو بوون، وردەوردە کولتووری یۆنانیبوونیان کاڵ دەبۆوە.» وادیارە کە پارس یەکێک لەو شوێنانە بوو کە وەک دورگەیەکی لێهات و داب و نەریتی ڕابردووی چاکتر تێدا پارێزرا. سەرچاوەکانی ئێمە لەم ناوچەیەدا ئاماژەیەکی وا بە هیچ شارێکی سازکراوی یۆنانی ناکەن و وێدەچێ کەندەوکۆژەکانی تا ئێستای شوێنەوارناسیش ئەم بۆچوونە بسەلمێنن. هەرێمی ڕاستەقینەی پارس کە دوور بوو لە شارێیانی لەشکری و ئابووری، بە شێوەیەکی باش کەوتە دەرەوەی ناوچەی تێکەڵبوونی توخم و تۆرەمە و زمانەکان کە لە سەردەمی ئەسکەندەری گەورەوە دەستی پێکردبوو. بەم شێوەیە هەرێمی پارس توانی دین و زمان و فەرهەنگی خۆی بپارێزێ. ماوەیەک دواتر لە ناوچەیەکی نە هێندە دووری کاول و هەرەسەکانی تەختیجەمشید، شارێک بە

ناوی «ئیستەخر» یان «قەڵا» ساز دەکرێ کە وردەوردە بوو بە ناوەندی ڕاستەقینەی دینی و سیاسیی پارس و خانەدانێکی نەتەوەیی بوونە پێشەنگی. لە لای بەرەوەی تەختیجەمشید، پەرستگایەک لەسەر شێوازی نژیاروانیی ئێرانی سازکراوە. هێندێک بە شانی خۆرنشیندا، پەرستگایەکی دیکە لە «نوورا‌باد» داندراوە کە تەواو وێنەی لەو پەرستگایە هەڵگیراوەتەوە کە پادشایانی هەخامەنشی لە نەخشی ڕۆستەم ڕووبەڕووی گۆڕەکانی خۆیان سازیان کردووە. ئەم پەرستگایانە شانبەشانی ئەوانەی کە لەسەر شێوازی یۆنانیی ئەو سەردەمەدا لە ماد، کەنگاوەر، کورهە و نەهاوەند سازکراون، نیشانەی خۆڕاگری و مانەوەی فەرهەنگی ئێرانین. «یۆنانییەکان کوانوویەکی یەکبوونیان پێکهێنا کە گەلی ئێرانی تێدا نەتوایەوە. گەلی ئێران لە چوارچێوەی ژیانی نەتەوایەتی، کۆمەڵایەتی، دینی و فەرهەنگیدا، لەگەڵیان ناتەبا مایەوە و هەتا سەر هەمووی پاراستن.»

### هونەر

هونەری ئەو چاخەی کە دەکەوێتە نێوان بڕانەوەی زنجیرەی فەرمانڕەوایانی هەخامەنشی و وەرگیرانەوەی ئێران لە لایەن پارتەکانەوە و دوو سەدەیەکی پێچوو، هێشتاش بە چاکی تیشکی ڕوونبوونەوەی نەخراوەتە سەر. کەلوپەلی سەر بەو سەردەمە دەگمەن و بیناکانی کەمە. هونەری گەلێک هەرگیز ناتوانێ لە حاند لاوازیی سیاسی کە هەژاریشی بە شوێندا دێ، خۆی ڕابگرێ. هونەری ئێرانیش لەو ڕۆژگارەدا تووشی بارودۆخێکی ئاوا ببوو. هەر دوابەدوای ئەم ڕۆژگارەش بۆشایی و کەلێنێک داوێنی ئەم هونەرەی گرتەوە و نەیتوانی لێی دەرباز بێ. ئەوەندەی ئێمە دەزانین هونەری هەخامەنشی گیرۆدەی ڕۆژگیرانی تەمەنی بوو، چونکە بەبێ پشتیوانیی پادشا و بارگا نەیدەتوانی خۆی

ڕابگرێ. ئەو برە زانیارییەی کە سەبارەت بە بووژانەوە و ژیانەوەی هەمانە، نیشاندەری ڕەوتێکی بەرەوپاش گەڕانەوەی جێی ڕامانە.

ئەوەی کە دەکەوتە بەر سەرنجی پادشا و بارگای سلۆکی و کۆمەڵانی تازەهاتوو بۆ خاکی ئێران، بە هەوێنی هونەری ئێرانی دەستاو نەدرابۆوە. ئەو هونەرمەندانەی کە لە یۆنان یان ناوچە و مەڵبەندەکانی دیکەی دنیاوە دەهاتن، دەبوو بە تەواوی ڕەزامەندیی مشتەری و کڕیارانی خۆیان وەدەست بێنن. هەروەها ئەو ئێرانییانەی کە چووبوونە سەر سرشتی یۆنانی و بەرزترین و دەوڵەمەندترین توێژی کۆمەڵانی خەڵکی خۆماڵی بوون، لەسەر ئەو داب‌ودەستووره دەڕۆیشتن. ئەم تاقمە لە ژێر باندۆری کولتووری یۆنانی‌دا، سەلیقەی خۆیان لەگەڵ شێوەی ژیانی ئەوان ڕێک دەکرد. هونەرمەندانی خۆولاتیش کە کاریان بۆ دەکردن، کەوتنە ژێر باندۆری شەپۆلی هونەری خۆرهەلاتی. ئەم وەستاکارانە شتی وایان ساز دەکردن کە نە یۆنانی بوون و نە ئێرانی و لاساکرانەوەی دووسەرەیان پێوە دیار بوو. ڕوخسار و ڕواڵەت پارێزرابوو، بەڵام گیانی تێدا نەبوو. بەم شێوەیە هونەری «یۆنانی ـ ئێرانی» کە یەکێک لە دەسکەوتەکانی سەرکەوتنی مەقدوونییەکان بوو، بەدی هات. ئەم ڕەوتە دوابەدوای هونەری «یۆنانی ـ سووری» و «یۆنانی ـ دووچۆمانی»، پێش هونەری «هیندی» یان «یۆنانی ـ بوودایی»، بەدی هاتووە.

بەپێی ئەوەندە زانیارییە کەمەی کە دەربارەی شوێنەوارە هونەرییەکانی ئەو سەردەمەوە بە دەستەوەیە، وادیارە هەر تەنیا هونەرێک لە ئارادا نەبووە و چەندێکی دیکەش هەبوون. دەسکارە هونەرییەکانیش وەکوو خودی وڵاتەکە نایەکانگیر و لێکدابڕاو خۆی دەنواند و دەریدەخست کە شۆڕش و ئاڵوگۆڕێکی قووڵ لە شارستانییەتی ئێرانی‌دا ڕووی داوە. دەکرێ ئاسەوارە هونەرییەکانی

ئەو سەردەمە بکرێتە سێ دەستە: ١ـ هونەری ڕەسەنی ئێرانی ٢ـ هونەری یۆنانی ـ ئێرانی ٣ـ هونەری یۆنانی.

دیاردە و نیشانەی دەستەی یەکەم لە پەرستگای «نوورابـاد»دا خـۆی دەنوێنێ و باسمان کرد کە وێنەی لە پەرستگاکانی هەخامەنشیی تەختیجەمشید و نەخشی ڕۆستەم هەڵگیراوەتەوە، هەڵبەت لە چوارچێوەیەکی بچووکتردا کە چەند ئاڵوگۆڕێکی سەبارەت بە هەنگاوی نوێباوی دینیی تێدا ڕەچاو کرابوو. گەڵاڵەی پەرستگای بەرەوە و دەرەوەی حەوشە و دەرکوبانی «تەختیجەمشید»یش ئێرانییە و بایەخی دەگەڕێتەوە سەر نەخشێندرانی لادەرانەکانی. بەپێی دابی تەختیجەمشید، دیمەن و قەڵافەتی دوو کەسایەتی داتاشراون کە یەکیان چەپکێک بەرسوم [یان گیاپیرۆزە]ی بە دەستەوەیە و هونەری ئێرە کاڵ و پێنەگەیشتوویە. کۆڵدرانی ساکار و قووڵ داتاشرانی تەختی بەردەتاشەکە و جوان دەرنەهێنانی دیمەنەکان و وەبەرچاو نەگیرانی چۆنیەتیی خستنەڕوویان و ویشک و ڕەقبوونی خەت و کووزەکان، سەرلەبەریان ناشارەزایی و بێئەزموونییان لێ دەبارێ. ئەم هونەر تێداناچێ و شوێنەواری لە هونەری پارتی و ساسانیدا ڕەنگ دەداتەوە.

لە ئێستادا، تەنیا پاشماوەی سێ شوێنەوار کە لانیکەم دوویان پەرستگا بوون، دەکرێ بدرێنە پاڵ دەستەی دووهەم. لە ئیستەخر کاول و هەرەسی شوێنەوارێکی گرینگی پێناسەنەکراو دۆزراوەتەوە. سەرەکۆڵەی ئەو جێگایە وێنەیان لە شێوازی کۆرێنتی هەڵگیراوەتەوە، بەڵام بەشی لای سەرەوەی سەرەکۆڵەکەکان جیاوازن و ئەمەش نیشانەی تێکەڵاویی کۆڵەکەی ئێرانییە لەگەڵ سەرەکۆڵەکەی یۆنانی (ق٧٣).

پەرستگای کەنگاوەر (دەوروبەری ٢٠٠ی پ.ز) لەسەر پێوشوێنی گەلالەیەکی خۆرنشینی سازکراوە (ق٧٤). دیوارەکانی بە گابەردی وەکوو تەختەسەکۆی رووبەری تەختیجەمشید هەلچندراوە، بەلام سەرەکۆلەکەی شێوازی «دۆری»[1] لەسەر کۆلەکەکانی دیارن و تەختەبەردێک بە شێوەی دەسکاری کۆرێنتی کەوتۆتە لای سەرەوەیان (ق٧٥). لە «کورهە»ش پەرستگایەک هەیە کە بەپێی شێوازی خۆرنشینی ساز کراوە. لە لای سەرەوەی دوو بنەکۆلەکەی ناسک، گەچبڕیی ئەستوورەی گووپن وەبەرچاو دێ. کۆلەکەی ئێرە، لەچاو ئەوانەی کۆن کە بالا و کۆتەرەیان دەبوو بە چەشنێک یەکتر بگریتەوە، زۆر واوەتر چووە و ئەمەش نیشانەی ڕەنگدانەوەی چێشکەی ئێرانییە کە پێشتر لە تەختیجەمشید خۆی نواندبوو. سەرەکۆلەکەکانی پەرستگا وێنە هەلگیرانەوەیەکی ناشیانانەن لە شێوازی ئیۆنی (ق٧٦). ئاکام لە هەموو شوێنێک وەکوو یەک وایە و هونەرمەندی ئێرانی خۆی بە وێکچوون ڕازی دەکا و بە شوێن دۆزینەوەی بەلگە یان یەکتر خوێندنەوەی شوێنەوارەکاندا ناڕوا.

وەکوو دیارە بەشی زۆری زانیارییەکانی ئێمە سەبارەتە بە ئاسەوارە هونەرییە بەربلاوەکانی دەستەی سێهەم. بەلام روون نەکراوەتەوە کە ئەو کەلوپەلانە دەسکاری نێوخۆی ولاتن یان لە دەرەوەڕا هێندراون، کەچی هەموویان هاوار دەکەن کە لەسەر شێوە و شێوازی هونەری یۆنانین. لە جەنگەی کەندەوکۆژەی ئەم دواییانەدا چوار پەیکەرۆکەی مەفرەق لە پەرستگەی نەهاوەند (لائۆدیسە) دۆزراونەوە (و٦٥). هەر لەم شوێنە بوو کە بەردەنووسی

---

١ـ خەلکی ناوچەیەکی کۆنی باشووری تیسالی و یەکێک لە خێلاتی بەرایی یۆنانی کە بە گرتنی پیلۆپۆنێز، حکوومەتی ئیسپارتیان دامەزراند.ب.



ق٧٣ـ ئیستەخر: سەرەکۆڵەکە یان کۆترەی بەردین



ق٧٤ـ کەلالەی پەرستگای کەنگاوەر



ق٧٥- هەرەسەکانی پەرستگای کەنگاوەر



ق٧٦- کۆڵەکەکانی پەرستگای کورهە

فەرمانی ئانتیۆخووسی سێهەم و سەر بە ساڵی ١٩٣ی پ.ز. دیترایەوە. سەرێکی زۆر جوانی پەیکەرێکی مەفرەق کە بەدبەختانە هەڵپریواوە و گۆیا دەبێ ئانتیۆخووسی چوارەم بێ، لە پەرستگەی «شەمی»ی نیزیک «ماڵەمیر»ی چیاکانی بەختیاری دۆزراوەتەوە (و٧١). دەبێ وای بۆ بچین کە چێشکە و سەلیقەی هونەری لەو سەردەمەدا، زیاتر سەرنجی داوەتە سەر دەسکاری مەفرەقی و ئەم شێوازە لە ڕۆژگاری پارتەکانیش‌دا درێژە درا و لە ڕاستی‌دا دەکرێ بە بووژاندنەوەی باوێکی کۆنی عیلامی دابندرێ. لە شووش کۆشکەڵی پاسەوانیی سەر بە سەردەمی هەخامەنشی، لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی سلۆکییەکان‌دا تەواو نۆژەن کرایەوە. جەنگەی کەندەوکۆژە لەو شوێنە، لانی‌کەم دە پایەی بەردینی پەیکەرە مەفرەقییەکان دۆزراونەوە کە هێندێکیان بە یۆنانی لەسەریان نووسراوە. یەکێک لەو دەقانە سەبارەتە بە پیاوێک کە ناوی «فیساغۆرەس»ە و فەرماندەی سەربازگەی یۆنانیی شووش بووە و «لۆفتووس» ساڵی ١٨٥٢ی زایینی دۆزیویەتەوە و ئاوا پێناسەی شوێنەکەمان لێ ڕوون بۆتەوە. هەروەها نیوەبەژنی لە مەڕمەڕ تاشراوی ژنێکی یۆنانی و چەند کوتێکی دیکەی پەیکەرەی بەردینی هاوردەی دەرەوە لە شووش دۆزراونەوە (و٧٢).

لە «دینەوەر»ی نیزیک کرماشان، کوتولەتی حەوزۆکەیەکی بەردینی نەخشێندراو بە پەیکەرەی نیوەبەژنی «سیلێنووس»ەکان و «ساتیر»ەکانی یارانی دیۆنیسۆس [دیۆنیزۆس] دۆزراوەتەوە (و٦٢ـ ٦٣). پێدەشتی کاکی‌بەکاکی و بەرپانی کرماشان لە سەردەمی کەونارادا بۆ ئەسپانی خۆشبەزی بەناوبانگ بوو، کە پێی دەگوترا نێسا و ناوێکی جوغرافیایی کۆنباوی نێو نەقڵ و نەزیلانە کە لەگەڵ ئایینی دیۆنیسۆس گوێزراوەتەوە و یۆنانی زۆر جێگایان لە

یۆنانەوە تا هیند پێ ناودێر کردووە. دەشتی نێسا ئەوەندەی کانی و چۆمەڵ تێدایە کە بۆتە سەرچاوەی درێژترین ڕووباری ئێران و پێیەوە ناسراوە. بەکورتی هێندێک وای بۆچوون کە دیۆنیسۆس لە جێگایەکی تەڕەزن پێی ناوەتە جەغزی ژیان و وشەی «نیسیۆس»ی یۆنانی بە واتەی «لەدایکبووی نێو زۆنگاوان»ە. ئەو بەرلە هەموو شتێک خودای شەرابە و دیارە کە ناوچەی بەرباس بۆ باغیمێوان یەکجار بەناوبانگ بووە. ئەسپیش دەکەوێتە نێو زنجیرەی دیاردە و سەمبولەکانی دیۆنیسۆس. دیۆنیسۆس و پۆزئیدۆن هەردک خاوەنی خاڵی هاوبەشن و لەگەڵ تەڕەزنی و کانیاوان تێکەڵن. وێدەچێ کە یۆنانییەکان ئەم ناوچەیان بە زێدی خودای خۆشەویستی خۆیان دانابێ و ئەو پەرستگایەی بۆ سازکرابێ کە حەوزیلەکەی لێ دۆزراوەتەوە. بەپێی دەقی چیرۆک و ئەفسانەکانی یۆنانی، دیۆنیسۆس یەکەم کەس بووە کە خاکی هیندی گرتووە.

### بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی

دامەزرانی ئیمپراتۆریی ئەسکەندەر و گۆڕانی بۆ سێ پادشایەتیی هێلێنی، بە باری ئابووریدا، گۆڕان و شۆڕشێکی ڕاستەقینە بوو لە دنیای ئەو سەردەمەدا. بۆ یەکەم جار بوو کە دوورترین ناوچەکانی دنیا وا پێکەوە دەبەسترانەوە کە بچووکترین گرمە و هەرا لە ناوچەیەک تەشەنەی دەکرد بۆ ناوچەکانی دیکە. باری ئابووری هەرگیز هەتا ئەو ئەندازەیە نەبیوو بە تێبەستەی ئاڵوگۆڕی سیاسی و ئاوا نەکەوتبوویە ژێر باندۆری ڕەوتی ئەم ڕووداوانەوە. سەنگ و بایەخی سکە کە لەو مەیدانە بەربڵاودا برووزی ئەستاندبوو، زۆر گرینگی دەنواند. بارستاییی ئەو سامان و دەسکەوتەی شوێنهاتی سەرکەوتنەکان بوون و بەرەو بازاڕەکانی دنیا لووزەویان بەستبوو، ئەوەندە بەرچاو بوو کە بایەخی

زێڕ و زێو هەتا نیوهێندە دابەزین و ئێمە لە مێژووی دنیادا ئەم ڕووداوەمان تەنیا لە سەردەمی کەمخایەنی «کۆنکیستادۆرە»کاندا پێ شک دێ و ئیللەڵلا.[1]

سەردەمی حکوومەتی سلۆکووسی یەکەم و یەکەمین جێنشینەکانی، وڵات لەوپەڕی گەشە و نەشەدا بوو. هاوسەنگییەک کەوتە نێوان هەقدەست و نرخی بەرهەم و کەلوپەلان، کە پێشتر قەت ڕەوتێکی ئاوا بەدی نەهاتبوو. ئەمە بارودۆخی ژیانی بەرەو باشبوون و تەسەلی پاڵ پێوەنا. زیادبوونی قازانجی بازاڕ نیشانەی باری لەباری کاروباری بازرگانی و وەسەریەک نانی سەرمایە و دەوڵەمەندبوونە. ئەوەندە زێڕەی کە لە جەنگەی گیران و بەزینی ئێراندا ببوو بە دەسکەوت و بەرەو ئورووپا ڕاگوێزرابوو، بە هۆی ناردنی بەرهەمی وڵات بۆ نێو بازارەکانی دنیا، دەگەڕایەوە ئێران.

هاوکات لەگەڵ لاوازبوونی دەسەڵات و لە دەستدەرچوونی هەرێمەکانی پارت و بەلخ، خلیسکان بەرەو هەڵدێران هەستی پێکرا. پاش قۆناخێکی کورتخایەن کە لە سایەسەری هەڵوێست و هەنگاوی چالاکانەی ئانیتۆخووسی سێهەم باڵی بە سەر وڵات کێشا، قەیرانی سەرلەنوێ سەری هەڵدایەوە و بوو بە ملۆزمێکی ڕاستەقینە. لەو ڕۆژگارەدا ڕژێم بە دەستێوەردانی توندوتیژی خۆی لە ڕۆژهەڵات، توانی ڕەوتی پێداویستی و هاوسەنگیی ناوچەکە بگۆڕێ و بیشێوێنێ و ئاوا قەیرانێکی قوولی ئابووری بەدی بێنێ. ئەودەمەی کە پارتەکان گەیشتنە سەر ڕووباری فورات و سنووری باڵی خۆرنشینیان لەوێ دیاری کرا، ناوەندی سیاسی و ئابووریی جیهان گۆڕانی بە سەردا هات و لانیکەم بۆ ماوەی چوار سەدەیەک گوێزرایەوە بۆ بەستێنەکانی ڕووباری دیجلە.

---

١ـ کۆنکیستادۆر. سەرناوی سەربەگزبەندانی ئیسپانیایی کە خۆیان لە گرتنی ئەمریکا هەڵکردبوو.م.

سلۆکی خاوەنی شارێیانی نێوان کیشوەران بوون کە لە ئێرانەوە دەچوونە چین و هیندووستان و پەرەیان پێدان و پێیان ڕاگەیشتن. ڕێگاوبانەکان لە دەریای سوورەوە هەتا هیند بنکەی سەربازی دەیپاراستن. لە ویشکارۆ و بیابانان کۆمەڵێک کاروانسەرا و خەزێناو ساز کران. زۆر جاران کەرتی تایبەت بە مەبەستی پەرەی کاروباری بازرگانی خەرجوبەرجی لێدانی نوێکەندانی دابین دەکرد. خێرایی پەیوەندی و ڕەوتی گەیاندن و گواستنەوە گەیشتە ترۆپکی خۆی و وای لێهات کە هەتا بەرلە سەردەمی داهێنانی مەکینەی هەڵماژۆ، هیچ سەردەمێک نەیتوانی بگاتەوە شانی و تۆزی بشکێنێ. ئەگەرچی سلۆکی دەستیان بە سەر ئەو ڕێگایەدا نەدەڕۆیی کە لە باکووری دەریای خەزەرەوە بەرەو باشووری ڕووسیا دەخوشی، بەڵام خۆ ئەو ڕەوگەیەی کە پاش تێپەڕبوون بە دەریای خەزەردا، شانبەشانی ڕووبارەکانی «کووروس» و «فاسیس»دا دەگەیشتەوە بەستێنەکانی دەریای ڕەش، بە دەست ئەوانەوە بوو. سلۆکی لە ناوچەکانی باکووری جەیحوون بە مەبەستی پاراستنی خۆیان کەوتنە گەشت و گەڕان و هەڵنان و دۆزینەوەی شوێنەکان و لەم ڕەوتەدا کورتکرانەوەی ڕێگاوبانی بازرگانی وەبەرچاو گیرا و دەوروبەری دەریای خەزەر دیترایەوە. لە کەنداوی فارس، کۆمەڵێک لک و پەلی گرینگ و بەرچاوی گەمییەوانی ڕێکخران و توانییان پەیوەندیی نێوان هیند لە خۆرهەڵات و دەریای سوور لە خۆرنشین دابین بکەن.

بارودۆخی بازرگانی لەم قۆناخەدا جارێکی دیکە گۆڕانی بە سەردا هات. قەبارەی کەلوپەل و بەرهەمی هەرزانبایی کە لە ماوەی سەردەمی ڕابردوودا، بەشی هەرە زۆری ئاڵوویرەکانی پێکدێنا، پلەی دابەزی و شتومەکی جوان و ناسک جێی گرتەوە. ڕۆم وەکوو دەورگێڕێکی تازە کەوتە نێو ڕەوتی کاروباری

بازرگانیی جیهانەوە. کەرەسەی خاوی وەکوو دار و کانزا کە ئێران و هیند گەورە بەرهەمهێنەریان بوون، کڕیارێکی زۆر سەرەیان بۆ گرتبوون. کەلوپەلەکانی بازرگانی بریتی بوون لە: بەردی گرانبایی و گەواهێراتی نەخشین و کەندەکاریکراو، دەرمانی هیندی کە هەتا کەوشەنی برۆتانی[1] دەگوێزرایەوە، گیاوگۆڵ، مەڵهەم، ڕۆن، عەتر، ئەرخەوان، گوڵاو، دەفری سواڵین، شووشە، کووتاڵ، دەسکاری هونەری، پاپیرووس و کۆمەڵی کۆیلان. ئەم ڕەوتەی بازرگانی لەگەڵ کاڵا و کەلوپەلاکان شێوەی تازەی بیروبۆچوون و ڕێکاری نوێباوی ئابووری و ڕێوشوێنی گەرمەتەندووری کڕین و فرۆشتنی دێنایە ئێرانەوە.

لە ئێرانەوە جلوبەرگ، خشڵ و زێڕوزەمبەر، بەردی گرانبایی، مافوورە، تۆوی گەنم، قورقوشم و سەگی ڕەسەن دەنێردرایە دەرەوە. زۆر و زەوەندیی کەرەسەی خاو گەشەی بە سەنعەتی ئێرانی دا، بەتایبەت بە کووتاڵ و مافوورە و هەڵکۆڵین و نەخشاندنی کانزا کە هونەرمەندان و وەستاکارانی ئێرانی چاکی لێدەزانن و تێیدا بەناوبانگن، وەڕمێن کەوتن. هەروەها وڵاتی ئێران هاتە سەر ئەم بڕوایە کە بازاڕی ئێران لە چنگ هێندێک بەرهەمی هاوردەی دەرەکی ڕزگار بکا؛ بۆ وێنە هەوڵ درا پاپیرووس کە پاوانی میسرییەکان بوو، بە جەگەن و گیاوگۆڵی خۆماڵی ساز بکرێ یان لەبری پاپیرووس کەوڵی ئاژەڵان بۆ نووسینەوەی دەقان خۆش بکەن. بۆ گێڕانی بەرداشان، ماڵات بوونە جێگرەوەی ئادەمیزاد. بەرهەمی سەنعەتکاران زیاد دەکا و کارگەی گۆزەکردن، پەیکەرسازی، کەندۆخینی سەر یەسقان و شەقڵاندنی کانزایان پەرە دەستێنن و دانانی خانووبەران ڕمێن پەیدا دەکەن و لە سەردەمی خۆیان دوا ناکەون.

---

١ـ برۆتانی(بریتەنی) ناوچەیەکە لە خۆرنشینی فەرانسە.م.

ڕۆژگاری سلۆکی بۆ چاندنی بەربلاوی هەموو شینکە و ڕووەکێک، ڕۆژگارێکی پڕشنگدارە. لەم چاخەدا باشووری ئورووپا، بەتایبەت ئیتالیا دەکەوێتە ژێر باندۆری ڕۆژهەلات و دەکەوێتە چاندن و ڕەنێوهێنانی کۆمەڵێک ڕووەک و بەخێوکردنی ئاژەڵی تازەهاتووی نووتونوێ. ڕۆژهەلاتی بەزیو، ئورووپای بەزاند. پەمۆ، لیمۆ، کاڵەک، کونجە، گوێز، زەیتوون، خورما، هەنجیر، مراوی و گای ئاسیایی، ئاڵوگۆڕێکی ڕاستەقینەیان لە بواری کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی ئیتالیادا بەدی هێنا.

سلۆکی بە دەوری زەویوزارانەدا هاتن و ڕێکیان کردن و لە ناوچە تازەکاندا زنەکێشیان لێدان و بوورەیان دەرهێنان و بەیاریان کێڵان. بازاڕ پێداویستی بە داهێنانی ڕەوت و ڕێبازی زانستی و ئاقلانە بوو. شارەزایی لە بواری کشتوکاڵدا یەکجار زۆر پەرەی ئەستاند و وای لێهات کە تەنانەت لە سەدەکانی نێوەڕاست و سەردەمی ئیسلامیشدا لەو ڕادەیەی تێنەپەڕاند. بۆ لێدانی دارەمێو و ڕەنێوهێنانی، شێوازی تازە ڕەچاو کرا و نیر و ئامووڕێکی تازەبابەت هاتە گۆڕ و زەوی کرایە سێوەرزە. دابی ئاوداشتن گۆڕانی بە سەردا هات و لێدانی دارستان و ڕەنێوهێنانی میوەی چاک و داری بەری بوونە باو.

سلۆکییەکان پێکهاتەی کشتوکاڵی ئێرانی سەردەمی هەخامەنشییەکان تێکەوەدەپێچن و گەلێک زەویوزاری بەربلاوی میری و تایبەتی یان سەر بە پەرستگاکان بە سەر شاراندا دادەبەشن یان دەیانکەنە باربووی کۆچەرنشینانی لەشکری. ئەم ڕەوتە دەبێتە هۆی بەدیهاتنی ئاڵوگۆڕ لە کاروباری کشتوکاڵیدا و بۆ ماوەی سەدان ساڵ خۆی ڕادەگرێ و لەسەر بنەمای پێکەوەژیانی هاوبەش و کاری شانبەشان لەگەڵ یۆنانییەکان دادەمەزرێ کە لێیان فێری شێوەی تازەی وەرزێری دەبن.

لـه ملّکوماشـی دیکـەدا، جووتیـارانی تێبەسـتەی زەوی دەبنـه چەشـنێک ئیجارەدار، بـەڵام لـه هـەر جێگایـەک زەوی‌وزاری گـەوره دابـەش نـەکرابوون، بارودۆخی ژیانی وەرزێران بەپێی ڕێ‌وشوێنێک بوو که هەتا ئەندازەیەک بەرەو باشـی و کرانـەوه دەڕۆیی. ئـەو جـەماوەره گوندەکییـەی کـه ڕەنجبـەری سـەر زەوی‌وزاری شاران بوون، کەم‌وزۆر ئازاد کران. بەڕاستی سلۆکییەکان له بواری گۆڕینی ڕەوتی کشت‌وکاڵدا، خاوەنی پله و پێگەیـەکی گرینـگ و تـایبـەتـن و ئازاد کردنی جووتیارانی ئێران، به باری سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری‌دا، به کارێکی گەوره دادەندرا.

دەکـارکرانی کانزاکـان، بەتایبـەت کـانزای گرانبـایی، یـەکجار بـەرچاو بـوو. سلۆکییەکان زێڕیان له هیند، باکووری خۆرنشین، بەلخ، ئەرمەنستان و قەفقازەوه دێنا. ئێرانیش له لای خۆیەوه ئاسن و مز و قورقوشمی دەنارده دەرەوه، که له ژێر چاوەدێریی کاربەدەستانی میری‌دا کانگاکانی بەرهەمیان زیاتر لێ‌هەڵدەگیرا. تـەواوی کانگاکـانی سـەر زەوی و ژێر زەوی پـاوان بـوون و بـه ملّکی پادشـا دادەندران.

له بواری ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا، مەیل بۆ بەدی‌هێنانی یەکسانی له نێو تەواوی چین و توێژەکـان، بەتایبـەت شارنشینان‌دا، هەسـتی پێدەکرێ و لـەم ڕەوتـەدا وەرگرتن و فێربوونی فەرهەنگ و زمانی یۆنانی به مەرجی سـەرەکی دادەندرێ و ڕێگا بۆ ئێرانییانی وەسەر یۆنانی‌گەڕاوی پاڵدەستی یۆنانییەکان خۆش دەکا که له ژێر سایەی یاسایەکدا دەژیان. جیاوازیی نێوان ڕەگەزی ئێرانی و یۆنانی خێرا بەرەو تێداچوون دەچوو.

حکوومـەتی سـلۆکی ئـاوا دەبێتـه پێکهاتەیـەکی سـەرمایەداری و خـاوەنی چواربەندەیـەکی بـەهێز و پتـەوی دارایی. پادشـا ڕۆژبـەڕۆژ پـاوانی بەرهـەم و

کارگاکان بە شێوەیەکی زیاتر دەخاتە ژێر چۆکی خۆی و بەکردەوە تەواوی سەرچاوەکانی داهاتی وڵات بە دەستەوە دەگرێ. بە بڕوای دەستەیەک لە توێژەران، سیاسەتی پادشایانی سلۆکی پێشکەوتووترین گەلاڵەی ئابووری و پڕ وردەکارییە کە تا بەرلە سەدەی بیستەم دنیا بە خۆیەوە دیوە؛ بەڵام دیسانیش ئەستاندنی پیتاک خەڵکی تەزاندبوو، چونکە تەنیا تاقمێکی کەمی کۆمەڵ داهاتی وڵاتیان پێدەبڕا کە بریتی بوون لە پادشا و بنەماڵەی پادشایەتی، مەزنانی بارگا، کاربەدەستان و خاوەن پاوانە تایبەتەکان، بازرگانانی نێونەتەوەیی و پلەیەک بەرەژێرتر، واتە ئەو لەشکرچییانەی کە لەسەر زەوی‌وزاران بنەیان داکوتابوو. دام‌ودەزگای دارایی جەماوەری بە شێوەیەکی سامناک دادەدۆشی و ژیان تاڵ و دژوار بوو. جا هەر بۆیە لە جاران زیاتر خەڵک پەنایان دەبرد بۆ ڕوانگەی ڕزگاریدەرانە و ئاوا سەرکەوتن و پەرەی دینەکانی مەسیحی و مانەوی و بوودایی خۆی دادەڕێژێ و پێدەگا. وەرگیرانی سەرانە، باجی خانووبەرە، پیتاکی مەڕ و ماڵات، زەوی‌وزار، باغ، منداڵبوون، زەماوەند و مردن وەبەرچاو گیرابوون. حکوومەت بۆ خەرج‌وبەرجی پادشا و بارگا، ڕاگرتنی قۆشەن، هێزی دەریایی، بەڕێوەبردنی کاروباری پەرستگاکان و موغان و پشتیوانی کردنی زانست و هونەر پێویستی بە پووڵ بوو. دەزگای دارایی هەموو دەخرێنەوە سەر یەکتر و چاوەدێری و پێڕاگەیشتن دارولەلەی بۆ دادەندرێ و یەکەمین بنەماکانی ئامار گەلاڵەی بۆ دادەڕێژرێ. ڕێ‌وشوێنێک بۆ بەرهەمی کارگاکان، لەگەڵ خوێ و هەموو چەشنە عەتر و بۆنێک و ئاڵوگۆڕی کاڵای بازرگانی و هات‌وچۆی نێو ڕووبارە گەورەکان دادەندرێ. حکوومەت خاوەنی سیاسەتێکی کشت‌وکاڵی، سیاسەتێکی سەنعەتی و سیاسەتێکی بازرگانی بوو، بەڵام لەم

ڕێبازانەدا، بنەماكانی دیموكراسی دیزە بە دەرخۆنە دەكرا و قازانج و بەرژوەندیی جەماوەری بەرفەرمانی دەخرایە پشتگوێ.

**

پەرەگرتن و بڵاوبوونەوەی ئورووپاییەكان لە سەردەمی ئەسكەندەر و جێنشینەكانیدا، ئەوەندەی فەرهەنگی ماددیی ئێرانییەكان دەوڵەمەند كرد كە چەند پشت دواتر هەر پێوەی ژیان. ئەو فەرهەنگە بەرباسە میراتێكی گەورەی لە دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و ڕەوتی پەرەئەستاندنی شارسازیدا بەجێهێشت. زۆر دواتر بنەماكانی گەلاڵەی هیپۆدامووس[1] كە لەو ڕۆژگاریدا باو بوو، پادشایانی ساسانی كە بناغەدانەری گەورەی شاران بوون، ڕەچاویان كرد.

یۆنانی توانییان كۆمەڵێك دابودەستوور لە ژیانی شارنشینیدا بەدی بێنن و بە سەركەوتوویی پەرەی پێبدەن. ئەوان سەنعەتێكی بەهرەمەند، كشتوكاڵێكی بەهێز و بازرگانییەكی پێشكەوتوویان بەدی هێنان و ڕایەڵەیەكی بەربڵاوی ڕێ و ڕەوگەیان دامەزراندن. دنەی زانست و هونەریان دان و ڕۆژمێرێكی تازەیان كردە باو. قازانجی ئەم كارانە تەنانەت لە شوێنی دوورەدەستی وەكوو خارەزمیش هەستی پێدەكرێ و ڕەنگی داوەتەوە. بەپێی لێكۆڵینەوە تازەكانی شوێنەوارناسی لەو ناوچەیەدا دەركەوتووە كە ئەو سەردەمە گەلێك شار و ئاوەدانیی خاوەن شووره و قەڵا سازكراون، كشتوكاڵ گەشەی كردووە، دەسكاری وەستاكاران ڕمێنی بووە و ژیانی كۆمەڵایەتی لە گەڕانكەڕی ئاورگایان خێوەتی هەڵداوە و ئەستۆندەكی خۆی چەقاندووە. لەگەڵ ئەمەشدا سلۆكییەكانیش نەیانتوانی چارەسەری كێشەی سەرەكی بكەن و یەكییەتیی

---

[1] ـ هیپۆدامووس فەیلەسووف و نژیاروانێكی میلیتیی یۆنانی بوو لە سەدەی پێنجەمی پێشزایینیدا و گەلێك شاری لەسەر گەلاڵەی ڕێكوپێك ساز كردن.م.

سیاسی لە نێوان دوو تۆرەمەکەدا بەدی بێنن یان لانیکەم هاوکارییەکی بەربڵاویان بخەنە نێوان؛ هەنگاوێک کە بە بڕوای ئەسکەندەر پێویست بوو. مەزنانی وڵات هەرگیز بەڕاستی پاڵیان بە ئێرانییەکانەوە نەدا و نەیانتوانی حکوومەتێکی نەتەوەیی دامەزرێنن و بە هیچ شێوەیەک بۆیان نەکرا کە بە باری سیاسی و ئەخلاقیدا ڕەزامەندیی گەلی ئێرانی وەدەست بێنن؛ بەڵام چونکە بە زۆرەملی نەکەوتبوونە شوێن سیاسەتی وە یۆنانیگێرانی وڵات، ئێرانی بە چەشنێکی ڕێکوپێک و ئاشکرا، دژیان ڕانەدەوەستان. لە تەرکێن باسی نانەوەی هەرا و ئاژاوە یان سەرهەڵدانی خەڵکی خۆماڵی لە ئارادا نییە و ئەم مەبەستە دەریدەخا کە بۆچی ماوەی سەت ساڵی پێچوو هەتا پارتەکان توانییان ئێران وەربگرنەوە.

ڕەوشتی بەجێی دۆستایەتیی یۆنانییەکان بە لای ئێرانییانەوە تەریک و نامۆ مایەوە کە توانیبوویان یەکییەتیی نەتەوەیی و هەتا ڕادەیەکی زۆر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی خۆیان بپارێزن. کۆمەڵانی خەڵک هەرگیز نوقمی فەرهەنگی یۆنانی نەبوون و ڕەوتی ژیانی باب و کاڵی خۆیان پاراست و دەستیان لە پێشینەی کولتووری و کۆمەڵایەتی و دینیی خۆیان هەڵنەگرت. گەل کەوتە پەراوێزی ئەو چینەی کە یۆنانی و ئێرانییەکانی تەواوەی نێو فەرهەنگی یۆنانی پێکیان هێنابوو. «دژایەتیی نەتەوەیی و دینی، ناکۆکیی کۆن و نەپساوەی نێوان کرێکار و سەرمایەداری تەشەنە پێکرد.» شار بەدی هاتن و پێکەوەنەسازانی لەمێژینەی نێوان شار و گوند ڕەنگی دایەوە. ئەم ناتەبایی و پێکەوەنەسازانە بەرەبەرە ئاوری ناکۆکیی نێوان کەمینەی یۆنانی و زۆرینەی ئێرانیی خۆشتر دەکرد.

ڕوون و ئاشکرایە کە تاقمی ئەو ئێرانییانەی وا لەگەڵ یۆنانییەکان کاریان دەکرد و بەشداری بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بوون لەچاو جەماوەر شانەبەرزە و زێدەپاروویان بۆ دابین دەکرا، هەروەک چۆن دەرەبەگانی ئێرانی زێدەپشکیان بۆ براببوویەوە. جەماوەری شارنشین وەکوو یۆنانییەکان دەکەوتنە ژێر باڵی یاسایەک و بەشێک لە گوندنشینانیش خاوەنی تۆزێک ئازادی بوون کە دواتر لە سەردەمی پارتەکان و ساسانییەکاندا، لێیان بێبەش کران. وەکوو دیارە ئێرانی نەیدەویست ببێتە یۆنانی، بەڵکوو ئاواتی ئەوە بوو کە هەر بە ئێرانی بمێنێتەوە. هەر شتێک شارستانییەتی غەوارە بۆی دێنا وەریدەگرت، بەڵام نەیدەویست تێدا بتوێتەوە. لە ئاکامدا ئەگەرچی بە یۆنانیکرانی ئێران وەکوو ڕەوتێکی درێژخایەن دەچوو، بەڵام نەیتوانیبوو بە قووڵی ڕیشەی لە نێو کۆمەڵدا دابکوتێ و زیاتر لە ڕووکاردا پەلی هاویشتبوو. ئەم هەنگاوە لە ڕواڵەتی خۆیدا سەرکەوتووانەی دەنواند، بەڵام نەیتوانیبوو بە ناخدا شۆڕ ببێتەوە. «ئەو دوو دنیایەی کە بە زەبری چەک و زۆرەملی تێکەڵ ببوون، لە ڕاستیدا زۆر پێکەوە جیاواز بوون.» بەزینی ئێران شکستێک بوو بۆ شارستانییەتی یۆنانی و بەپێچەوانە سەرکەوتنێکی ئاشتیخوازانە بوو بۆ ئێران. لە ئاکامدا ئێرانی ماکەی دەوڵەمەندی و پێشکەوتووتر لە جاران، بەرەی خۆی لە قورِاویّ دەرکێشا و گەنجینەی هەموو دەسکەوتەکانی کردە پایەندازی زنجیرەی پادشایانی پارتی بە ڕەسەن ئێرانی، کە لە ڕوانگەی ئێرانییەکانی باڵی خۆرنشینی وڵاتەوە بە بێگانە دادەندران.

***

## بەشی ٥

# پارتەکان[1]

هێشتا دووسێ ساڵێک بە سەر ڕاپەڕینی «دیۆدۆتووس»ی مێرهەرێمی بەلخ و جوێبوونەوەیدا تێنەپەڕیبوو کە هەرێمی پارتی باڵی خۆرهەڵاتی بەلخیش سەربەستیی خۆی ڕاگەیاند. داخوا لەو زەمانیدا ئەم کار و هەنگاوە دەکرا یەکەمین نیشانەی دژکردەوەی ئێرانیگەری بێ دژی یۆنانیگەری؟ قبووڵ کردنی ئەم گریمانەیە سەخت و دژوارە. ئەو خێڵەی کە دەبوو زنجیرەی پادشایانی داهاتوو دامەزرێنێ هەرگیز سەری وەبەر سلۆکییەکان نەهێنا و ناوچەی گەرمێن و کوێستان کردنی لەمێژینەیان نەکەوتە نێو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیانەوە. زیاتر بێدەسەڵاتی و لاوازیی پەرەگری سلۆکی بوو کە چەشنی بۆن و بەرامەیەک لە زەمانێکدا تەنەوەی کرد و بە شێوەیەکی کەموزۆر هاوشێوە دوو حکوومەتی نوێ دامەزران: حکوومەتی یۆنانیی بەلخ و حکوومەتی پارتی. بنەماڵەیەکی یۆنانی و بنەماڵەیەکی ئێرانی گەلاڵەی چەشنێک بزووتنەوەیان بەرەو سەربەخۆیی دارشت و ئەو ڕایەڵە بێجێیانەیان هەڵپساندن کە ئەم هەرێمانەیان بە حکوومەتی دوورەدەستی سلۆکییەوە دەبەستەوە. ئەگەرچی هۆی

---

١ـ لە دەقی سەرەکیدا بە بەشێکی جیاواز لە بەشی چوارەم دانەندراوە، بەڵام موعین و بێهفرووزی کردوویانەتە بەشێکی سەربەخۆ.و.

سەربەخۆبوونی ئەم دوو حکوومەتە یەک بوو، بەڵام هۆکاری دامەزرانیان تەواو پێکەوە جیاواز بوو.

ئێمە خاوەنی زانیارییەکی ئەوتۆ نین دەربارەی پارتەکان و ئەوەندەی دەیزانین ڕێمان بۆ خۆش دەکا هەتا بیسەلمێنین کە ئەوان لە خێڵی پارنی و بەشێکی هۆزی دەهێ [داهە] بوون. هۆزی داهە پێکهاتبوو لە تیرە و خێڵاتی سکایی و بە کۆچەری و دەوارنشینی لە نێوان دەریای خەزەر و دەریای ئارالدا دەژیان. بەپێی گێڕانەوەی نووسەرانی کۆن ئەم هۆزە بریتی بوون لە سوارچاکان و شەڕکەران و ئەو کاتە خۆیان بە بەختیار دەزانی کە لە شەڕاندا کوژرابان و مردنی سروشتی و نێو نوێنوبان بە دزێو و سووکایەتی دادەندرا. توێژەران لایان وایە کە دەوروبەری ساڵی ٢٥٠ی پ.ز. دوو برا بە ناوی ئەرشەک و تیرداد، وێڕای چەکدارانی خۆیان و پێنج سەرکردەی دیکە، ناوچەی سەرووی «تەجەن»یان داگیر کرد. دیۆدۆتووسی پادشای تازەی بەلخ هێرشی بۆ بردن، بەڵام ئەوان لە مەترسی دەرباز بوون و هرووژمیان بردە سەر هەرێمی پارتی دراوسێی و میرهەرێمەکەیان کوشت. دوو ساڵ دواتر ئەرشەک لە شەڕدا کوژرا، بەڵام پارتەکان کە هەمیشە لە شەڕدا بوون، بە سەرکردایەتیی تیرداد، تەواوی ئەو ناوچەیەیان گرت کە ئەمڕۆ بۆتە سنووری ئەوبەری دەریای خەزەری ڕووسیا و ئێران. تیرداد هەر لەو کێوانەدا یەکەمین قەڵای تەختگای خۆی دانا کە وەک هێلانەی هەڵۆ دەستی پێڕانەدەگەیشت. ماوەیەک دواتر شارێک بە ناوی ئەرشەکی سەرجەلەی خانەدانی خۆیانەوە ساز کرا و تیرداد وەکوو پادشای پارت لەوێ تاجی پادشایەتیی نایە سەری.

سلۆکووسی دووهەم ویستی بەر بەم جووڵانەوەیە بگرێ و ئەگەر بۆشی بکرێ لووتی داگیرکەران بشکێنێ و پاشەکشەیان پێ بکا. کاتێک قۆشەنی

سلۆکووس بۆیان دەچێ و لێیان نیزیک دەبێتەوە، وادیارە تیرداد دەگەڕێتەوە سەر فەند و فێڵی سوارانی سەکایی و بەرەو گیاجارەکانی نیشتمانی خۆیان دەکشێتەوە. ئەو شێواوی و شڵەژانە توندوتیژەی کە ئەنتاکییەی گرتبۆوە، سلۆکووسی ناچار کرد کە دەست لە پەلاماری هەڵبگرێ و بەلەز بەرەو سووریا بگەڕێتەوە. پارتەکان هەلەکەیان خوازتەوە و سەرلەنوێ گەڕانەوە ئەو شوێنەی کە تیرداد گرتبووی و خێرایەکی هەرێمی هیرکانیای[1] باشووری ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەریشی خستە سەری. بەم شێوەیە کوانووی حکوومەتی داهاتووی پارت هەڵگیرسا کە بە یەکجاری ڕێگای شاهانشایەتیی سلۆکیی لەگەڵ حکوومەتی یۆنانیی بەلخ گرت و پشوویڕی کرد. ئەگەرچی پارت لە مابەینی ئەو دوو حکوومەتانەدا ئابلۆقە درابوو، بەڵام بۆ پاراستنی خۆی و بەربڵاوکردنەوەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی، بە ئەندازەی پێویست خاوەنی هێز و بڕشت بوو.

گیاجارەکانی دراوسێ کە وەک پوورەی هەنگی ئادەمیزادان وابوون و عێلاتی خزمانی پارتەکان لەوێ دەژیان، بێگومان لەچاو ئێرانییەکان یاریدەدەرێکی جێی متمانەتر بوون، ئەگەرچی ئێرانی ئەوانیان هێندەی فەرمانڕەوایانی یۆنانی بە خەنیم نەدەزانین. دواتر و لە ماوەی پتر لە سەدەیەکدا، هەر شکست و نیشانەیەکی تازەی داشکانی دەسەڵاتی سلۆکی بۆ حکوومەتی فەریکەی پارت، بە خەنیمەت دادەندرا.

هێشتاش نازانین ئەوان چ ناوێکیان لە خۆیان ناوە. واژەی پارت کە لە سەرچاوەکانی خۆراواییدا ناسراوە و خۆی دەنوێنێ، ڕەنگە لە واژەی «پارسوڤە» وەرگیرابێ کە پێشتر لە زەمانی کووروش و داریووشدا باسی کرابوو. هێندێک لە ئێرانناسان لایان وایە مانای ئەم وشەیە دەبێتە

---

١ـ هیرکانی. گورگان

«سوارەی شەڕکەر». جەماوەری نیشتەجێ بە تێکڕای سەڵتەسوارانی پەلاماردەری جاروبارەی ڕۆژهەڵاتی ئێران و تیرە و هۆزە دەوارنشین و ڕەوەندەکانیان دەگوت پارسوڤە و پاشان هەرێمێکی ڕۆژهەڵاتی ئێرانی پێ ناودێر کراوە. هەڵبەت وێشدەچێ کە وشەی پارت لە پارنی وەرگیرابێ. پارنی خێڵێکە بۆتە هێما و سەمبولی جووڵانەوەی گەورە و بەربڵاوی سەکاییەکان کە سەدەیەک دواتر، لێشاوی پەلاماریان بارودۆخی ئێرانی بە گشتی ژێروژوور کرد و تۆماری تەمەنی حکوومەتی یۆنانیی بەلخی تێکەوەپێچا.

سی و حەوت ساڵ پادشایەتیی تیرداد دەرفەتێکی گونجاو بوو هەتا بتوانێ هێز و دەسەڵاتی خۆی پتەو بکا و قۆشەنێک پێکبێنێ و بەرەو خۆرنشین بڕوا و پایتەختی بگوێزێتەوە بۆ شاری یۆنانیی سەتدەروازە[1] کە لە قەراخ شاڕێی بازرگانیی نێوان خۆرهەڵات و خۆرنشیندا خۆی دەنواند. شاری ئەرشەک، سەتدەروازە، هەگمەتانە و تیسفوون کە هەر چواریان وەختی خۆی پایتەخت بوون بە نیشانەی چوار قۆناخی پێشکەوتنی خانەدانێکی دەوارنشین دادەندرێ کە لە پۆپەی شکۆ و شانازیدا، توانی تایبەتمەندییەکانی ڕەگەزیی خۆی بپارێزێ. «ئەردەوان»ی[2] یەکەمی جێنشینی تیرداد هێشتا ئەوەندە بەهێز نەبوو کە بتوانێ بەرەنگاری قۆشەنی ئانتیۆخووسی سێهەم ڕاوەستێ، کە بە مەبەستی ڕێکخستنی کاروباری وڵاتەکەی قۆشەنی بەرەو ڕۆژهەڵات دەنگ دا. ئەردەوانی یەکەم کە بەرگەی نەگرت و بەزی، بەناچاری دانی بە حکوومەتی سلۆکیدا هێنا؛ بەڵام ئەم تێشکانە نەبوو بە کۆسپ و تەگەرەی سەر ڕێگای «پریاپاتیووس»ی[3] جێنشینی

---

١ـ دامغان

٢ـ ئەرتەپان، ئەرتەبان. ئەرتە بە واتای پیرۆز و مرۆی چاک و کاردروستە. «بان» یان «وان» پارێزەرە.و.

٣ـ فریاپاتیووس

کە دەرفەتی شکانی ئانتیۆخووسی سێهەم بە دەستی ڕۆمییەکان، بۆ گرتنی هەرێمەکانی دەریای خەزەر نەخوازیتەوە. پارتەکان تەنیا خێڵێک نەبوون کە هەلی لاوازبوون و تێداچوونی حکوومەتی سلۆکییان بە دەستی یۆنانییەکان خواستەوە. مادی ئاترۆپاتکان سەربەخۆیی ڕاگەیاند. «ئالمائید»یش پاش گرتنی ناوچەی ئیسفەهان، دەستی گەیشتە سەربەستی. ڕەنگە لەم ڕەوتی جووڵانەوەیەدا پارس لە پێشەوەتریان بووبێ. لە باشووری بابل، پادشایەتیی کاراسێن (خاراسێن) دامەزرا. ناوچە و هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریی سلۆکی لە چوارچێوەی دەسەڵاتیان دەرباز بوون و چەندین حکوومەتی بچووکیان پێکهێنان کە سەبارەت بە سەربەخۆبوونی خۆیان پێداگر و دەمارگرژانە دەجووڵانەوە، ئەگەرچی هیچ سازان و خاڵێکی هاوبەش پێکەوەی گرێ نەدەدان و سەرلەبەریان پاروویەکی چەور و نەرم بوون بۆ دەسەڵاتێکی نوێ. ئەم هێز و دەسەڵاتە لە خودی شا مێهردادی یەکەمی دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئیمپراتۆریی پارتدا کۆبوویەوە (١٧١ ـ ١٣٨ی پ.ز). ئەم پادشایە بۆ ڕزگارکردنی هەرێمە دابڕاوەکانی ئێران، کۆمەڵێک ناوچە و مەڵبەندی لە ژێر سێبەری ئاڵای پادشایەتی‌دا کۆکردنەوە و ئەوەش بزووتنەوەیەکی بەربڵاو بوو کە ڕۆمییەکان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕێگایان بۆ خۆش کردبوو. مێهردادی یەکەم لە نێوان ساڵانی ١٦٠ و١٤٠ی پێش‌زایین‌دا، دوای چەند شەڕێک ئەم هەرێمانەی خستە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆی: ماد، ئالمائید، پارس، کاراسێن (خاراسێن)، بابل و ئاشوور لە قوڵی خۆرنشین و گێدرۆزیا و ڕەنگە هەرات و سیستان لە خۆرهەڵات. پارتەکان گەیشتنە نیزیک ڕووباری فورات، بەڵام سلۆکییەی سەر لێواری ڕووباری دیجلە و گەورەترین شاری بەشی ئاسیا و ناوەندی بەهێزی بازرگانی بە خۆی و نیزیکەی شەشسەدهەزار

دانیشتۆوه، خۆی شلوێ نه‌کرد و هه‌ر وای نه‌زانی که مێشێکیشی لێ میوانه. توێژه‌ران به‌پێی کۆمه‌ڵێک به‌ڵگه لایان وایه که ده‌بێ ڕێککه‌وتننامه‌یه‌ک بۆ به‌ڕێوه‌بردنی کاروباران به شێوه‌یه‌کی کاتی له نێوان سه‌رکه‌وته‌ی پارتی و بازرگانانی مه‌زن و خاوه‌ن برشتی «یۆنانی ـ سامی»دا به‌سترابێ. سه‌ربازخانه‌ی پارتی له سلۆکییه دانه‌ندرا، به‌ڵام هێزێکی گه‌وره به‌ره‌ورووی شار و له باڵی چه‌پی ڕووباری دیجله له‌شکربه‌زی کرد و بنه‌ی داکوتا که پاشان ئه‌و شوێنه «تیسفوون»ی پایته‌ختی پارتی لێ سازکرا(ق۷۷).

داخوا مه‌یل و ئه‌وینی له‌گوڕی سه‌ربه‌خۆیی‌خوازانه‌ی حکوومه‌ته بچووکه‌کان یان ده‌ربازبوون له به‌ند و داوی حکوومه‌تی ناوه‌ندی کارێکی وای کرد که له هه‌موو شوێنێک پارته‌کان به ڕزگاریده‌ری خه‌ڵک له ژێر نیری سلۆکییه‌کان دابندرێن؟ هه‌ر چۆنێک بێ ئه‌و هه‌رێمانه‌ی وه‌کوو مادی ئاترۆپاتکان یان پارس که هه‌ستی ئێرانیگه‌ری ره‌نگی تێدا دابوونه‌وه، زۆر به‌توندی به‌ره‌وڕوویان چه‌قین و ده‌گژیان ڕۆچوون؛ به‌ڵام مێهرداد ڕێگای خۆی به‌رنه‌دا و بوو به بووژێنه‌وه‌ی ئیمپراتۆریی کۆنی هه‌خامه‌نشی. نازناوی پادشای گه‌وره‌ی خرایه سه‌ر ناوی و به مه‌به‌ستی نیشان‌دانی نیازپاکیی خۆی سه‌باره‌ت به دانیشتووانی یۆنانی که له قه‌ڵه‌مڕه‌وی ده‌سه‌ڵاتی‌دا بڵاو ببوونه‌وه، له‌سه‌ر سکه‌کانی خۆی نووسی فیلۆهیلێن، واته «یۆنان‌خۆشه‌ویست».

ئه‌وه‌ی ڕاستی بێ هه‌بوونی په‌یوه‌ندییه‌کی سست و له‌رزۆک له نێوان ئه‌و هه‌رێمانه‌دا که مێهردادی یه‌که‌م گرتبوونی، کارێکی وای کرد که ورده‌ورده سرت‌وخورتی ناره‌زامه‌ندیی جه‌ماوه‌ری یۆنانی و ئێرانی خێرایه‌کی بوو به ده‌نگ و هه‌را و ئه‌مه‌ش ڕاست له جه‌نگه‌یه‌کدا بوو که دێمێتریووسی دووهه‌م لێبڕابوو هه‌تا به خۆی و قۆشه‌نی به‌رفه‌رمانییه‌وه، باڵی ڕۆژهه‌ڵاتی




٧٧ـ شاهانشایەتیی پارت

ئیمپراتۆرییەکەی بگرێتەوە. یۆنانییەکانی شارنشین، بەتایبەت دانیشتووانەکەی سلۆکییەی لێواری رووباری دیجلە، خەڵکی ئالمائید، پارس و تەنانەت بەلخیش دژی فەرمانڕەوای نوێ، چوونە یاریدەی دوژمن؛ بەڵام بەخت بوو بە یاری پارتەکان و پادشای سلۆکی بەزی و بە دیل گیرا. هەڵبەت بە شێوەیەکی زۆر جوامێرانە لەگەڵی جووڵانەوە و بردیان لە هیرکانی دایاننا و مێهرداد کچێکی خۆی دایە. پادشای پارت لەگەڵ جەماوەری یۆنانی کە بە تەواوی هێز و توانایانەوە چووبوونە یاریدەی دوژمنی، زەبروزەنگی نەنواند، بەڵام لە هەرێم و ناوچە گیراوەکاندا بە زۆرەملی مەزنایەتیی خۆی سەپاند و زەبرێکی توندی لە خەڵکی ئالمائید وەشاند و وەکوو ئانتیۆخووسی سێهەمی پێشەنگی، دوو پەرستگای دەوڵەمەندی «ئاتێنا» و «ئارتێمیس»، کە ڕەنگە نەزرگەی پیرۆزی ئاناهیتا بووبن، تاڵانی کردن و دەسکەوتێکی زۆری لەگەڵ خۆی برد. مێهرداد ساڵی ١٣٨ی پ.ز. مرد و قەڵەمڕەوی بەربڵاوی ئیمپراتۆرییەکەی لە فوراتەوە تا هەرات بۆ فەرهادی دووهەمی کوڕی بە میرات بەجێهێشت. بەپێی گێڕانەوەی ئەو سەرچاوە کەموکورتانەی کە باسیان کردووە، فەرهاد کەسێکی پیاوچاک، لەخواترس، ئازا و یاسادانەرێکی دادپەروەر بووە. دەکرێ کار و خزمەتەکانی فەرهادی دووهەم بۆ ژیاندنەوە و بووژاندنەوەی حکوومەتێکی ئێرانی، لەگەڵ هەنگاوەکانی کوورووشی گەورە بەراورد بکرێن، چونکە هێندێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەوی تێدا بوو.

ئانتیۆخووسی حەوتەم[1] برای دیمیتریووسی دەسبەسەر، پێینایە ڕکێف و بۆ گرتنەوەی هەرێمە گیراوەکان و دەربازکردنی براکەی هێزێکی قورسی بەرەو ناوچەی دووچۆمان گاڵدا و لە سێ شەڕاندا پارتەکانی بەزاندن، چونکە

---

١ـ ناسراو بە سیدێت

هێزەکانی پارتی لەگەڵ قۆشەنی ڕاهێندراوی یۆنانی بەراورد نەدەکران. ئانتیۆخووس گەیشتە هەگمەتانە [هەگمادانە]، بەڵام سەرما سەری دە سوێیە نا و بەری پێگرت. پادشای سلۆکی لەو کۆنە پایتەختە بنەی داکوتا و بە مەبەستی تێپەڕاندنی وەرزی زستان هێزەکانی بە سەر شار و گونداندا دابەشی. لەم کاتەدا فەرهاد پێشنیاری پێکهاتن و ئاشتبوونەوەی پێکرد. مەرجی یۆنانییەکان ڕاشکاوانە بوون: پارتەکان دەبێ دیمیتریووس ئازاد بکەن و بێجگە لە خاکی پارت دەست لە تەواوی هەرێمە گیراوەکان بکێشنەوە و باج و پیتاک وە ئەستۆیان بگرن. پادشای لاوی پارت لەبەر کەمتەرخەمی و لێنەوەشاوەیی فەرمانڕەوای یۆنانی لەو هەڕەشە مەترسیدارە خەلەست. خەڵکی خۆماڵی لە چنگ زوڵم و زۆری ئەو سەربازانەی کە لە ماڵەکانیاندا قوونیان داگرتبوو، وەگیان هاتبوون و لەسەر ئەهایەک ڕاوەستابوون، هەر بۆیە بە دنەی سیخوڕانی پارتی وەخۆکەوتن و ڕاپەڕین. هاوکات پادشای پارت لەناکاو هەڵیکوتایە سەر ئانتیۆخووس. تێداچوونی سلۆکییەکان قسەی لەسەر نەمابوو. پادشای سلۆکی کوژرا و بەشێک لە قۆشەنەکەی دەورەی درا و دایە پاڵ لەشکری پارت. سەرکەوتنی بەرچاوی سلۆکییەکان لە ماوەی چەند مانگاندا کە وێدەچوو ڕەنگە بتوانێ دیواری ڕووخەکی حکوومەتەکەیان پتەو بکاتەوە، کارەساتی گەورەی لێکەوتەوە، چونکە تازە هیچ هێزێکی ڕێکوپێک لە ئارادا نەبوو کە بتوانێ ڕێگری ئەگەری پەلاماری پارتەکان بێ بۆ سەر سووریا. ساڵی ١٢٩ی پ.ز. بۆ مێژووی کولتوور و شارستانییەتی یۆنانی لە ئاسیادا، ساڵێکی تاڵ و ناخۆش بوو، چونکە تازە نەیتوانی لە جێی خۆی هەستێتەوە و سەرهەڵبداتەوە. لەم ساڵەدا حکوومەتی سلۆکی کە هەتا دەیان ساڵی دیکەش خۆی ڕاگرت، سەری وەبەر ئێرانی سەرکەوتوو هێنا. سنووری ئورووپا بە یەکجاری هەتا فورات پاشەکشەی کرد.

پارتەکان هەڵیانکردە سەر سووریا، چونکە لەو زەمانەدا دەبوو بەر بە هێرشی درندانەی ڕەوەندەکانی سنووری باڵی ڕۆژهەڵاتی ئێران بگرن. لەو سەردەمەدا کە فەرهاد توانیبووی ئانتیۆخووسی حەوتەم ببەزێنێ و دەرووی ڕووناک و پرشنگداری داهاتووی بە ڕووی پەرەی پادشایەتیی پارتدا کردبۆوە، جووڵانەوەیەکی بەربڵاوی تیرە و خێڵاتە ڕەسەنەکانی سەکایی، کە لە ناوچە دوورەدەستەکانی تورکستانی چینەوە هاتبوون، ئێرانی گرتەوە. پێشتر یەکەم شەپۆلی کۆڕەوی ئەم بیابانگەردانە لە زەمانی «مێهرداد»دا زەنگی مەترسیی وەجرینگە هێنابوو کە لێیان وەدەست هات و شکاندنی. فەرهاد حوکمدارێکی لە دووچۆمان دانا و بەرەو خۆرهەڵات کەوتەڕێ هەتا بتوانێ بەر بە هرووژمی پەلاماردەران بگرێ. واوێدەچێ کە ئەوانە دەبنە دوو قۆڵ و یەکیان ڕاستەوخۆ ملی ڕێی مەرو و شاری سەتدەروازە و هەگمەتانە دەگرێ و بەرەو باڵی خۆرنشین دەڕوا و قۆڵەکەی دیکەیان ڕوو دەکاتە باشوور و بە مەرو و هەراتدا تێدەپەڕێ و خۆی دەگەیەنێتە هەرێمی دەوڵەمەندی سیستان. یەخسیرە یۆنانییەکانی قۆشەنی ئانتیۆخووسی حەوتەم، کە فەرهاد لەگەڵ لەشکری خۆی تێکەڵی کردبوون لە یەکەم تێکهەڵچووندا بارزە بوون و پشتی پارتیان بەردا و فەرهاد کوژرا. ئەردەوانی دووهەمی مام و جێگرەوەی فەرهاد، هێندەی پێنەچوو کە گیرۆدەی چارەنووسی برازاکەی بۆوە. ئەو میرهەرێمەی کە فەرهاد بۆ بابلی دانابوو، خۆی بە شا دانا و هەروەها حکوومەتی «خاراسێن»یش سەربەخۆیی ڕاگەیاند. کاتێک مێهردادی دووهەم، دەوروبەری ساڵی ١٢٣ی پ.ز. دانیشتە سەر تەختی دەسەڵات، ئیمپراتۆریی پارت حاڵی شڕ بوو، چونکە خۆرنشین ئاژاوە گرتبوویەوە و خۆرهەڵات کەوتبوویە بەر شەپۆلی هرووژمی بیابانگەردانەوە. مێهردادی دووهەم کە لێوەشاوەترین پادشای زنجیرەی

خانەدانی پارت بوو سەرەتا باڵی خۆرنشینی هێور کردەوە و پاشان هەتا کلکەی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەسپی ئاژاوت و سنوورەکانی گەیاندە سەیحوون (ئاموودەریا). سەرلەنوێ هەرات و مەرووی گرتنەوە و شەپۆلی ڕەوەندە دەشتەکییەکانی بەرەوپاش بردەوە و ملی بە سیستان دانەواند. سەرکەوتنی وی زۆر گرینگ بوو، چونکە توانی دنیای خۆرنشین لە هەڕەشەی سەکاکان ڕزگار بکا. «سەگزی»یەکان کە هەتا دوێنێ هەر بە ڕەوەندی دەشتەکی دادەندران، بوونە بەرگێڕەوە لەسەر ڕێگای هۆز و خێڵاتی دراوسێیان و بەم شێوەیە بوونە پشتیوانی شارستانییەتی ئاسیای خۆرنشین و ئەو دەورەی گێڕا کە ئێران توانی لە مێژووی درێژی خۆیدا بیگێڕێ.

هرووژمی دەوارنشینانی بیابانگەردی ئاسیای ناوەندی، حکوومەتی «یۆنانیی بەلخ»ی ڕامالی و پێدەشتەکانی باکوور و باشووری لای نێوقەدی ڕووباری جەیحوون بوونە نشیمەنگانی دوو هۆزی گەورەی ساکارووکایە لە خۆرنشین و یووەچی یان تۆخارەکان لە خۆرهەڵات. خێڵاتی پێشەنگ لە درێژەی شەپۆلی بەربڵاویاندا بەرەبەرە خوشین و دەستەیەک بە ڕەوگەی باکووردا ڕوویان کردە پەنجاب و دەستەیەکی دیکە بە باڵی باشووردا بەرەو سێند ڕۆیشتن. ئەم تیرە و هۆزانە لە سەرەتای سەدەی یەکەمی پێش‌زایینیدا، لەسەر کاول و هەرەسی میرانی یۆنانیی بەلخ، حکوومەتێکیان دامەزراند کە بە لانی سیاسی و کولتووریدا یەکجار لە پارتەکانەوە نیزیک بوو. بێگومان حکوومەتەکانی هیند لە جەغزی دەسەڵاتی پارتی بەدەر بوون. هێندێک وێدەچێ کە حکوومەتەکانی ڕۆخج و سیستان هەتا سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینی، دانیان بە پادشایەتیی پارتدا هێنابێ. لەم ڕۆژگارەدا فەرمانڕەوایەک بە ناوی

گۆندۆفاریس[١]، کە دەڵێن ڕەنگە بە ڕەسەن پارت بووبێ، تەواوی ئەو حکوومەتانەی پێکەوە کۆکردنەوە و پادشایەتییەکی بەهێزی پێکهێنا کە لە سیستانەوە هەتا ئەوبەری ڕووباری سێند چەتری ئەنگاوتبوو.

دەوروبەری ساڵی ١١٥ی پ.ز. شاندێکی ئیمپراتۆری چین هاتن و چوونە خزمەت مێهرداد. حکوومەتی پارت ڕێککەوتننامەیەکی لەگەڵ نووسین کە بەپێی وی دەبوو بە مەبەستی پەرەی بازرگانیی نێونەتەوەیی، چەند هەنگاوێک بهاوێژرێ. ئێران وەک پردێکی گەیاندن و گواستنەوەی کاڵا، بە گرینگترین ئاڵقەی ئەم زنجیرەی پێکەوەلکانەوە دادەندرا. بیست ساڵ دواتر، مێهردادی دووهەم دەستی لە کاروباری ئەرمەنستان وەردا و «تیگران»ی ژێربالی خۆی لەوێ کردە پادشا و بەم شێوەیە لاپەڕەیەکی تازەی لە مێژووی ئەم وڵاتەدا کردەوە کە چارەنووسی بە چارەنووسی ئێرانەوە گرێ دەدرێ. ماوەیەک دواتر تیگران لەگەڵ «مێهرداد ئووپاتۆر»ی پادشای پۆنت یان بۆنتووس بوو بە هاوپەیمان. ئەم پادشایە لە مابەینی ساڵانی ١١٢ تا ٩٣ی پێش‌زایین‌دا، توانی پادشایەتییەکی بەهێز لە ئاسیای بچووک و تەنانەت چەند ناوچەیەکی یۆنان‌دا دامەزرێنێ و ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتی بە سەر ڕۆمییەکان‌دا ڕابشکێ و نەهێڵێ بێنە پێشەوە. مێهردادی دووهەم لە حاند ئەم هاوپەیمانی و بەهێزبوونەی ئەرمەنستان‌دا، وستەی نەکرد و وەکوو پارسەنگ دەوری گێڕا. ساڵی ٩٢ی پ.ز. ڕۆمییەکان گەیشتنە فورات و مێهرداد کەیخودایەکی ناردە لایان کەوا باشە پێکەوە پێکبێن. سیلا کە بە هێز و بڕشتی پارتەکانی نەدەزانی، لایەکی وای لە نێردراوەکەی نەکردەوە و پادشای گەورە دڵی ئێشا و لە دوو پادشای خاوەن‌دەسەڵاتی ڕۆژهەڵات نیزیک بۆوە. ئەو سووکایەتییەی کە ڕۆمییەکان لە

---

١ـ گۆندۆفیر

یەکەم پەیوەندیی خۆیان‌دا لەگەڵ پارتەکان نواندیان، زۆر قورسیان لەسەر شانی کەوت.

لە پێکهاتنی پادشایەتیی پارت‌دا، مێهردادی یەکەم دەوری کووررووش و مێهردادی دووهەم دەوری داریووشی گێڕا. پادشای یەکەم پەرەی بە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی دا و پادشای دووهەم ڕێکوپێک و سەقامگیری کرد. مێهردادی دووهەم ئێرانی کردە کەڵەهێزێکی جیهانی. پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕۆمی خۆرنشین و چینی باڵی خۆرهەلات، نیشاندەری بایەخی وڵات و دەوری مەزنانەی ئەوە لە ژیانی سیاسی و ئابووریی سەردەمەکەی‌دا و هەر ئەمە کارێکی وای کرد کە بە «شای شاهان» ناودێر بکرێ.

دوای نەمانی ئەم پادشایە، پارت کەوتە نێو قۆناخێکی قووڵی بەرەو داڕمان. لە ماوەی سی ساڵدا پادشایەکی زۆر هاتن و جێگایان گرتەوە و لەسەر تەختی دەسەڵاتەکەی پاڵیان دایەوە. بە هۆی شەڕ و کێشەی نێوخۆیی، دەسەڵاتی ئیمپراتۆری وا دابەزی و کەوتە باری کزی کە تیگرانی پادشای ئەرمەنستان و قەرزداربارِی پارتەکان بۆ وەدەستهێنانی تاج و تەختی دەسەڵاتی، چەند هەرێمێکی لێدابڕی و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی هەتا نیزیک هەگمەتانە بڕی کرد. پاشان نازناوی «شای شاهان»ی بە باڵای خۆی بڕی و ئاوا سووکایەتییەکی قورسی هاویشتە سەر شانی پارتەکان. «پادشایەتیی پارت لاواز و دابڕدابڕ خۆی دەنواند و لە هەموو لایەکەوە نیشانەکانی تێداچوونی بەڕوونی دیار بوون و وێدەچوو کە جارێ لەسەر نەخشەی ئاسیای خۆرنشین شۆڕاوەتەوە.» لەم کاتەدا تیگران لەسەر داوای خەڵکی سووریا کە لە چنگ کێشە و هەرای دوایین داخوازەرانی حکوومەتی سلۆکی جاڕز ببوون، تاج و

تەختی سلۆکییەکانی یەکلایی کردەوە و بوو بە خاوەنی. بارودۆخەکە وای لێهاتبوو کە وێدەچوو ڕەنگە پادشای پارتیش سەر وەبەر تیگران بێنێ.

لە هەلومەرجێکی ئاوا نالەباردا کە داوێنی ئیمپراتۆریی پارتی گرتبۆوە، حکوومەتی ڕۆم دەیهەویست ئێران بەپێی پەیماننامەیەکی کە دەبوو بنووسرێ، لە شەڕی ڕۆم لەگەڵ ئەرمەنستان و پۆنتدا بێلایەن بێ، بێئەوەی هەڵسوکەوتی ڕۆمییەکان لەگەڵ پادشای پارت گۆڕانێکی گرینگی بە سەردابێ. لووکووس پێشنیار یان داوای بەستنی پەیماننامەی کرد و فەرهادی دووهەمیش سەلماندی و لەبەروەی خۆی بە پیاو دەزانی، پێی لە بەڵێنی خۆی نەنا و پەلاماری سووریای نەدا، ئەگەرچی لەو زەمانیدا لووکووس لە شەڕەکانیدا گرێ و کۆسپێکی زۆری وەبەرهاتبوو. تەنانەت دواتریش ئەو کاتەی مێهرداد ئووپاتۆر چەند جارێک بەزی و داوای بەستنی پەیمانی خستە بەردەمی حکوومەتی پارت، فەرهاد پەیماننامەی کۆنی لەگەڵ پۆمپێئووس نوێ کردەوە و هەمیشە بە چاوی ڕێزەوە لە ڕۆمییەکانی دەڕوانی، بەڵام ئەوان بە لووتبەرزی و نەزانیی خۆیان، بایەخێکی وایان بۆ گەلێک دانەدەنا کە زۆر بەوردی بەڵێنەکانی خۆی دەبردە سەر. هەر ماوەیەک دواتر ڕۆم پەیماننامەکەی پێخوست کرد و دەستی بە سەر هەرێمەکانی خۆرنشینی پارتدا گرت و لەگەڵ پادشایانی بەرفەرمانی فەرهاد پیلانی گێڕا و تەنانەت کاتێک فەرهاد لەم کارانە وەجواب هات و ناڕەزامەندیی دەربڕی، بە سووکایەتی وڵامی درایەوە. دوای کوژرانی فەرهادیش، نوێنەرانی ڕۆم ڕەوت و ڕێبازی خۆیان نەگۆڕی و گابینیووس بە وەرگرتنی پارەیەکی قورس قبووڵی کرد کە بۆ ئەوەی مێهردادی سێهەم ببێتە پادشا، دژی ئۆرۆدی دووهەم بکەوێتە بەربەرەکانی، بەڵام هیچ کارێکی نەکرد، چونکە خوازیارێکی تەختی دەسەڵاتی میسر کە ئاوا وەکوو مێهرداد تێمابوو،

پارەیەکی زیاتری دا بە گابینیووس و مەزنی ڕۆمیش لێی وەرگرت. کاتێک کراسسووس کرایە کۆنسوولی سووریا، چنۆکی و چاونەزێریی ڕێبەرانی ڕۆمی گەیبوویە پەرپەرۆچکەی خۆی. ئەنجومەنی مەزنانی ڕۆم نەیدەویست لەگەڵ پارتەکان بکەونە شەڕ، بەڵام کراسسووس ڕاست وەک سەربازەکانی خۆی پێی وابوو گیرانی ئێران هاسانە و سامانی کەڵەکەبووی ئەو وڵاتە بۆ وی دەسکەوت و خەنیمەتێکی گەورەیە. هێزەکانی ڕۆمی بزووتن، کەچی لە نیزیک کارره (حەرران)، سوارەی قورسەچەک و سووکەڵەچەکی پارتی بە سەرکردایەتیی سۆرێنا [سوورێن = سۆرێن]، سەرۆکی گەورەی بنەماڵەی دەرەبەگانی ئێرانی، ڕۆمییەکانی بەزاندن. لە چواربەشان سێبەشی لەشکری ڕۆم کوژرا و بە دیل گیرا و کراسسووس و کوڕیشی لەم شەڕەدا سەریان دانا (٥٣ی پ.ز). سوارەی قورسەچەکی پارتی کە بریتی بوو لە کەوانداران سەرکەوت و توانی لەشکری بێپێکهاتەی سوارەی ڕۆمی بشکێنێ. شەڕی کارره ڕۆمی ناچار کرد کە هێزی سوارە بخاتە ڕیزی قۆشەنی خۆی، هەروەک چلۆن نیزیکەی هەزار ساڵ لێرەوبەریش، یەکەمین پۆلی ئێرانییانی هاتوو بۆ بانووی ئێران، ئاشوورییەکانیان ناچار بەم کارە کرد.

بەپێی دەقی گێڕانەوەیەک، سەر و باسکی بڕاوی «تریوومڤیر»ی[1] چارەڕەشیان بردە لای ئۆرۆدی دووهەم. لەم کاتەدا پادشای پارت، وێڕای پادشای ئەرمەنستان و پیاوانی بارگا، سەرقاڵی تەماشای شانۆی «باکا»ی[2] بەرهەمی ئوورپیپیدێس بوو[3]. سەرکەوتنی جێی سەرسوڕمان و

---

١- یەکێک لە سێ حوکمدارانی ڕۆم کە وێڕای دوو کەسی دیکە کاروبارەکانی هەڵدەسووڕاند.م.

٢- کاهینانی ژنی پەرستگای باکووس کە خوای شەرابە.م.

٣- ئوورپیپید. شاعیری یۆنانی کە دەستە شێعرێکی زۆری لە پاش بەجێماوە (٤٨٠ - ٤٠٦/٤٠٥ی پ.ز)

چاوەڕواننەکراوی پارتەکان، بەرچاوی ڕۆمییەکانی ڕوون کردەوە و هەستیان بە بایەخی ڕاستەقینەی هێزی پارتی کرد کە زیاتر کاری داکۆکی کردن بوو نەک هێرش بردن. هەڵۆی لۆژیۆنەکانی[1] ڕۆمی ماوەیەکی زۆر لە پەرستگاکانی پارتی بە هەڵاوەسراوی مانەوە و ئێرانی دیلانی ڕۆمییان لە ئاوەدانییەکانی مەرو نیشتەجێ کردن و گەلێکیان لەوێ ژنیان هێنا و ماڵیان پێکەوەنا. ڕۆم زانی کە تووشی هەڵەیەکی گەورە هاتووە و لێکدانەوەی پێچەوانەی سیاسەتوانان و سەرکردەکانی سەربازی و نەناسینی ئێران تووشی ئەو مەرەدەی کردوون. ڕۆمی هەمیشە بە چاوی سووکەوە لە چەکداران و سەردارانی قۆشەنی ئێرانیان دەڕوانی. جارێکی تر ئێرانییانی چەک بە دەست، ماکەی هێلێنیسمیان لە سنوورەکانی خۆیان دەرپەڕاند کە ڕۆمی خۆیان بە میراتگری دەزانی. لێرە بەو لاوە تا ماوەی پتر لە سەدەیەک، فورات بە کەوشەنی یەکلاییکراوە دادەندرا. لە لایەکی دیکەوە، سامییەکانی خۆراوا کە بریتی بوون لە جووەکانی فەلەستین، نەبەتییەکانی دەمیشق، عەرەبەکانی دەشتەکی و پالمیرییەکانی دوژمنی ڕۆمییەکان، سەرلەبەریان چاوی هیوایان بڕبوویە ئێران کە لەو وڵاتەدا ئۆرۆد وەکوو جێگرەوەی ڕاستەقینەی هەخامەنشییەکان خۆی دەنواند. ئەوان بە یاریدەی سووکەڵەسوارانی پارتی، تۆڵەی خۆیان لە ڕۆمییەکان کردەوە. لە کتێبی تەوراتدا بزووتنی پارتەکان تەنیا بۆ لێدان و خاشەکێشانی ڕۆمییە دڕندەکان پێشبینی کرابوو؛ بەڵام بەداخەوە کە ڕزگاربوونیان تەنیا بۆ ماوەیەکی کەم و کاتی دەستی سەرکەوتووانی ڕۆمی کورت کردەوە، چونکە دواتر ڕۆمییەکان بە

---

١ـ هێمای ئەم لۆژیۆنانە کە هەرکام بریتی بوون لە ٦٠٠٠ کەس، هەڵۆ بوو، بۆیە ئاوا ناودێر کرابوون.و.

زەبروزەنگی زیاترەوە سواری سەریان بوونەوە و دوولینگەیان بە ملیدا هێنانەوە.

سیابەختیی کراسسووس وەکوو چارەڕەشیی ئانتیۆخووسی حەوتەم، کەم و زۆر سووریای بەبێ چاوسوور و داشدار هێشتەوە و شەڕەکانی نێوخۆی ڕژم ببوونە کۆسپ و تەگەرە و هێزەکانی ڕژمی نەیاندەتوانی بە سەر باروداوخی ڕۆژهەڵاتدا سوار بن. وێدەچوو کە جارێکی تر، ڕێگای پێشوەچوونی پارتەکان بەرەو لێوارەکانی دەریای مەدیتەرانە کرابووبێتەوە، بەڵام هەلومەرجی نێوخۆیی بوو بە کۆسپ و لەمپەری وەدیهاتنی ئامانجەکە. سۆورێنا کە بەپێچەوانەی پادشا دەسەڵاتی یەکجار زۆر تەنەوەی کردبوو، کوژرا. «پاکۆر»ی کوڕەی گەنج و کەمئەزموونی ئۆرۆد بوو بە سەرکردەی سپایەک کە تای هێزی سۆورێنا نەدەهاتەوە لە «کاررە» و بەرەو سووریا جمی و شەڕێکی وای بۆ نەکرا و شکا. ساڵی ٥١ی پ.ز. سەرلەنوێ هێز و سپای ڕێکخستەوە و سەرتاسەری ناوچەکەی گرتەوە و بۆ ماوەی چەند مانگێک سووریا کەوتەوە بەردەستی پارتەکان، کە بوونە هۆی شێوان و تێکچوونی باری ئابووریی باڵی خۆرنشین. پاکۆر نەیدەتوانی درێژە بە چالاکی و هەڵسووڕانەکانی بدا، چونکە بە هەڵە تاوانی پیلانی دژی باوکیان بە ئەستۆیدا هێنا. ئۆرۆد بانگیهێشتەوە و چی وای نەمابوو بکوژرێ، بەڵام ڕزگاریی هات. ڕوون نەبۆتەوە کە پارتەکان بۆچی لە ماوەی دە ساڵەی داهاتوودا، هێرش و پەلاماری خۆیان وەدوادا. تۆبڵێی ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵات یان کێشە و هەرای نێوخۆ یام ملنەدانی تاقمێک لە مەزن و ماقووڵانی پارتی، کە هەموویان سەرکردە و شازی لەشکر بوون، بەریان بە پەلاماردانی سووریا گرتبێ؟ هەر چۆنێک بووبێ ئەم کارە هەتا ساڵی ٤٠ی پ.ز. وەدوا دەکەوێ و سەرەنجام ئۆرۆد و پاکۆر لەو ساڵەدا بە پێداگریی «لابینووس»ی

باڵوێزی پێشووی «برووتووس»، کە سەری وەبەر خزمەتی پارتەکان هێنابوو، هێرشیان کردە سەر سووریا.

قۆشەنی ئێرانی لە نێوان لابینووس و پاکۆردا دابەش کران. لابینووس هەڵمەتی باڵی باکووری خرایە سەر شانی و بەشی زۆری ئاسیای بچووکی گرت و هەتا ئیۆنییە ڕانەوەستا. پاکۆر بەرەو باشوور شۆڕ بۆوە و لە هەموو جێگایەک پێشوازیی لێکرا. سووریا و فەلەستینی گرت و «هێرۆد»ی لە بەیتولموقەددەس دەرپەڕاند و میرێکی خۆماڵیی لە جێی دانا. نەبەتییەکان سەریان وەبەر فەرمانی پارتەکان هێنا. نیزیکەی سەرلەبەری ڕۆژهەڵاتی ڕۆمی کەوتە ژێر ڕکێفی پارتەکان. لابینووس بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک فەرمانڕەوای ئاسیای بچووک بوو. شەڕی سووریا لە ساڵی ٣٨ی پێش‌زایین‌دا برایەوە، بەڵام قۆشەنی پارت خۆی لە حاند لەشکری ڕۆمی بۆ ڕانەدەگیرا. لابینووس کوژرا و پاکۆر خەیانەتی پێکرا. پاکۆر هەڵیکردە سەر هۆردووگایەکی ڕۆمی کە پێی وابوو کەسی لێ نییە بیپارێزێ. لەوێ قۆشەنی قورس و گرانی کە سوارانی کەواندار باڵی پاراستنیان بە سەر نەکێشابوو، تێکوپێک شکا. پاکۆر کوژرا و نەمانی لە ئێران‌دا بە قووڵی ڕەنگی دایەوە، چونکە وڵات پیاوێکی ئازا و شەڕزان و دەسکەرەوەی دیار و شایانی لە کیس چووبوو. ئەم شەڕەی دوایی سەلماندی کە سوارەی قورسەچەک و زرێپۆش، خۆی بۆ هەڵناسووڕێ و ناتوانێ هەڵکاتە سەر لەشکری ڕۆمی؛ بەڵام دیسانیش ئەم هرووژم و پەلامارانە بێ‌ئاکام نەبوون.

ڕۆمی ئەو خەڵک و فەرمانڕوایانەیان بە سەختی سزا دا کە خێرایەکی بە چەپڵەڕێزان و شادی چوونە پێشوازی هێزەکانی ئێرانی. هێندێکیان باج و پیتاکێکی قورسیان بە سەر شانی‌دا سەپا و تاقمێکیش وەکوو پادشای بەیتولموقەددەس مەرگیان بۆ برایەوە و هێرۆد سەرلەنوێ گەڕایەوە جێی خۆی.

«ئۆرۆد»ی پیر لەڕێوە بە دەست کوڕەکانی خۆی کوژرا و فەرهادی چوارەم جێی گرتەوە (دەوروبەری ساڵی ٣٧ی پ.ز). چوونە سەر دەسەڵاتی ئەم پادشایە سەرلەنوێ کێشە و هەراکانی نێوخۆی ژیاندەوە و ملانەی نێوان چینی باڵادەست و خواردەستە باڵی بە سەر وڵات کێشایەوە. گێرە و کێشەی مابەینی تیرە و هۆزان و دوو بەشی گەورەی سوارەی قورسەچەک و سوارەی کەواندار هەڵگیرسا. لە باروودۆخێکی ئاوا نالەباردا، هەڕەشەی پەلامارێکی تازەی ڕۆمییەکان ڕووی خۆی نیشان دا و ئەویش بریتی بوو لە پەلاماری ئانتۆنیووس[١] کە لەشکرێکی یەکجار بەهێز و بڕشتی ڕۆمیی هێنا و بە سەر ئێرانی دادا و پێی نایە قەفقاز. ئیبێرییەکان و ئاڵبانییەکانی بەزاندن و سەری پێ چەماندن و ئەرمەنستانی پێمل کرد. کاتێک لە بەرەی پشتەوەی لەشکری دڵنیا بۆوە، بەرەو مادی ئاترۆپاتکان باڵی گرت و هات هەتا پایتەختەکەی گەمارۆ بدا و ئاوا مەودایەکی زۆر کەوتە نێوان بار و بارخانەی چەکوچۆڵ و بژیوی. ئانتۆنیووس بۆ وەدی هێنانی گەلاڵەی گرتنی سەرتاسەری ڕۆژهەڵات کە قەیسەری ڕۆم لە دە ساڵی ڕابردوودا دایڕشتبوو، دانەدەسەکنی، بەڵام شەڕی کارڕە هێشتاش هەروا ڕەنگی کاڵ نەببۆوە. ئانتۆنیووس نەیتوانی لە نێو ئەرمەنییەکان[٢] و مادەکان و ئالمائیدەکاندا[٣]، هاوپەیمانێک بۆخۆی بدۆزێتەوە، چونکە هیچکەس ئامادە نەبوو خەیانەت بە قازانج و بەرژەوەندیی هاوبەش بکا.

فەرهادی چوارەم لەگەڵ سوارەی سووکەڵەی خۆی بەرەو بارگە و بنەی لەشکری ئانتۆنیووس گورمی بەست و پاسەوانەکانی شەقوپەق کرد و چی ئامرازی قەڵاگرییە بردی و سووتاندی. ئانتۆنیووس بەبێ ئامرازی قەڵاگری و

---

١ـ مارک ئانتۆنی

٢ـ دانیشتووانی ئەرمەنستان

٣ـ خەڵکی خووزستان (ئیلیمایی).م.

بژێوی سەربازانی، دەروەستی جێگایەکی قایم و پتەو نەدەهات کە پارێزەرانی زۆر ئازایانە کەوتبوونە بەرەنگاری. وردەوردە وەرزی سەرما ئاسۆگی دا و سەرداری ڕۆمی لێبڕا بکشێتەوە. لەو کاتەدا هێزەکانی پارتی لێی وەدەست هاتن و لەپڕ و لێرولەوێ کوشتە و زامار و خەسارێکی بەرچاو و قورسیان خستە سەر دەستی. فەرهاد سەرکەوتنەکەی کردە جێژن و ناوی خۆی خستە سەر ئەو سکانەی لە نێو بارگە و بنەی ڕۆمییەکاندا دۆزرابوونەوە و وێنەی «ئانتۆنیووس» و«کلێئۆپاترا»یان لەسەر شەقڵ کرابوو. لە بەهاری داهاتوودا، ئانتۆنیووس توانی ئەرمەنستان بگرێتەوە و پادشاکەی ببەزێنێ. ساڵی دواتر هەتا «ماد» ڕۆیی، بەڵام دژکردەوەی هاوبەشی پارتەکان و ئەرمەنییەکان بەشبڕاویان کرد و نەیانهێشت ئاوی خۆشی لە گەرووی ئاوابێ و پاش ماوەیەکی کەم ئۆکتاڤیووس بەزاندی و هەوساری دەسەڵاتی لە دەستی دەرهێنا.

بیروڕای گشتی لە ڕۆم سەبارەت بە پارتەکان گۆڕا. ئێستا هێزی بەرەنگاربوونەوەیان بۆ هەموو لایەک ڕوون ببۆوە. ڕۆمی تێگەیشتن کە ویستی پەلاماردەرانەیان هەڵەیە و هەڵوێست و ڕێبازی ئەوانەی کە پێوە بوون دەست بە سەر چەند ناوچە و هەرێمێکی خۆرهەڵاتدا بگرن، وەکوو بڵقی سەر ئاو بووە. «ئووگوست»یش کە ڕەنگە لە سەرەتادا پێیخۆش بووبێ ئاسیا بگرێ و سەری پێ نەوی بکا، بیروبۆچوونی گۆڕی و کەوتە سەر باری بەدیهێنانی ئاشتی. پارت بە هەڕەشەیەک بۆ سەر ڕۆم دانەدەندرا. پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، هەرا و کێشەی بەربڵاوی نێو بارگای میری، شەڕی نێوان تیرە و خانەدانان، ئاوات و ئامانجی جوداییخوازانەی جەماوەری بەرفەرمانی ئیمپراتۆری و بێدەسەڵاتبوونی حکوومەتی ناوەندی، کارێکی وایان دەکرد کە ڕۆمییەکان بە شێوەیەکی باش لەگەڵیان پێک بێن. گۆڕانی ڕەوشتی ڕۆم بەرهەمی خۆی

لێکەوتەوە: فەرهادی چوارەم هەڵۆی لۆژیۆنەکانی کراسسووسی دانەوە دەست ئووگوست و پاشان لە ترسی کوژرانی منداڵەکانی خۆی، هەمووی ناردن بۆ ڕۆم هەتا پارێزراوبن. هەروەها دەیهەویست بەم شێوەیە ڕێبازی نیازپاکانەی خۆی سەبارەت بە ئیمپراتۆریی ڕۆم و خودی خوندکاری وڵاتەکە بسەلمێنێ.

ڕۆم بەرەبەرە بۆی ڕوون بۆوە کە پێکهاتن و حاوانەوەی نێوان ئەم دوو هێزە، قازانج و بەرژەوەندیی هەردک لایان دەپارێزێ و ئەمەش تەنیا لە ڕێگای گەشە و پەرەی کاروباری بازرگانییەوە سەر دەگرێ؛ بەڵام ڕۆم دەیهەویست پارێزرانی کەوشەکانی دابین بێ، هەر بۆیە پێوە بوو کە چەند حکوومەتێکی قالۆر دامەزرێنێ. یەکێک لەوان «پالمیر»ی سنوورەکانی خۆرهەڵات و ئەوی دیکەیان ئەرمەنستان بوو. حکوومەتی ڕۆم و پارت هیچیان پێیان خۆش نەبوو کە ئەرمەنستان سەربەخۆ بێ. لە ڕوانگەی هەردک لاوە، ئەرمەنستان شوێنێکی بارناسکی سەربازی بوو. هەردک لا پێکهاتن کە پادشایەکی دەسنێژی ڕۆم و بە لای یۆنان‌دا کەوتوو بۆ ئەرمەنستان دابندرێ. فەرهاد ڕێککەوتنەکەی سەلماند، بەڵام خەڵک بە گشتی لەبەر ئەم زێدەپشکەی کە دای بە ڕۆمییەکان، ڕقیان لێ‌هەگرت و لە ئاکام‌دا بەرەبابی مێهردادی یەکەم بوونە پادشا و جڵەوداری حکوومەت.

سەرەڕای ئەم ڕێککەوتن و پێکهاتنەش، پەیتاپەیتا پادشایانی ئەرمەنستان دەچوونە سەر تەختی دەسەڵات و هەر جارەی ڕۆمییەکان و پارتەکان بە قازانجی خۆیان یەکیان دێنا و یەکیان لادەبرد. نە دۆستایەتیی نێوان دوو ئیمپراتۆرییەکە و نە ئاژاوە و شێوانی باری ئەرمەنستان هیچیان نەبوونە کۆسپی سەر ڕێی ڕۆم کە وەکوو دەمڕاست و سەرهەڵوێستی ئەم وڵاتە خۆی بنوێنێ. فەرهادی پێنجەم کە باوکی دەرمانداو کردبوو، بە مەرجێک ڕۆم دەبێتە

دەستەبەری دەسەڵات و بە پادشابوونی کە ئامانجەکانی خۆی لە ئەرمەنستان وەلابنێ. هێندەی پێنەچوو کە پیاوماقووڵانی وڵات ئەم پادشا گەنجەیان لێخست و داوایان لە ئووگوست کرد کە کوڕێکی فەرهادی چوارەمیان لە ڕۆمەوە بۆ بنێرێتەوە. ڤێنۆنی یەکەم[1] هاتەوە ئێران، بەڵام ماوەیەکی زۆری خۆ بۆ نەگیرا، چونکە پەروەردەی خۆراوایییانەی وی بە دڵی مەزن و ماقووڵانەوە نەدەنووسا؛ جا بۆیە ئەویش لێخرا و پەنای بردە سووریا و لەوێ کوژرا.

ئەردەوانی سێهەم کە لە دایکەوە دەچۆوە سەر خانەدانی ئەشکانی و کوڕی بەرێ بوو، بوو بە جێگرەوەی ڤێنۆن. بنەماڵەی ئەردەوان خاوەنی پەیوەندییەکی توندوتۆڵ بوو لەگەڵ هیرکانی (گورگان) و میرەهەرێمی مادی ئاترۆپاتکان. بەرەبابی مێهرداد بەشیان بە دەسەڵاتەوە نەما و بەرەی نوێ لە ژیانی دینی و فەرهەنگیی وڵاتدا، بزووتنەوەیەکیان لەسەر بنەمای بووژاندنەوەی ویستی نەتەوەیی و ئێرانیگەری، بەدی هێنا. ئەم کارە بۆ ڕۆم بە شکستێک دادەندرا، چونکە پادشایانی وە ڕۆمیگەراوی پارتی کە لە ئەرمەنستان داندرابوون، وەکوو فەرمانڕەوایانی ئێران، خرانە لاوە. پادشایەتیی درێژخایەنی ئەردەوانی سێهەم، هاوکات بوو لەگەڵ راپەڕینی سلۆکییەی لێواری ڕووباری دیجلە و هەراکەی حەوت ساڵی درێژە کێشا. ئەم شەڕ و کێشەیە کارێکی وای کرد کە دەسەڵاتی ناوەندی نەتوانێ بناغەی پتەو داکوتێ و لە لایەکی دیکەشەوە فێڵ و تەڵەکەی ڕۆم تۆماری تەمەنی پێ‌تێکەوەپێچا. پادشایانی ڕقەبەر بۆ وەدەستهێنانی تاج و تەختی ئەرمەنستان و پارتەکان، دەگژ یەکتر ڕاچوون. سەرەنجام دوو ئیمپراتۆریی خەنیم، پاش شەڕ و کێشەیەکی درێژخایەن لەسەر ئەرمەنستان، لە

---

١ـ ڤێنۆن

زەمانی وەلاشی یەکەمدا [1] پێکهاتن و بڕیار درا کە تیردادی برای وەلاش ببێتە پادشای ئەرمەنستان، بەڵام تاجی خۆی لە دەستی ئیمپراتۆری ڕۆم وەربگرێ. ڕۆم دوای شکانی هێزەکانی، بە مەبەستی پاراستنی ئابڕووی، گەڕایەوە سەر ڕێبازی ئووگوست و شانی بۆ ئەم پێکهاتنە شل کرد. لە ساڵی ٦٦ی زایینیدا، پادشای تازەی ئەرمەنستان، وێڕای بنەماڵەی خۆی و سێ هەزار سوارەی مەزن و ماقووڵان، گەیشتە ئیتالیا و لە نێو بەزم و هەرای ڕۆمییەکاندا، تاجی پادشایەتیی لە دەستی نێرۆن وەرگرت. لەمە بە دوا خانەدانێکی ئەشکانی دەبێتە فەرمانڕەوای ئەرمەنستان و ڕۆمیش تەنیا کۆمەڵێک ئاوات و خەیاڵاتی وەکوو یادگار نەبێ نامێنێ. ئەم پێکهاتنە ئاشتی و ئارامییەکی بۆ مەیدانی شەڕەکەڵی ئەم دوو زلهێزەی دراوسێ بە دیاری هێنا، کە نیوسەدەیەکی خۆڕاگرت و سەلماندی کە پەیوەندیی ئەرمەنستان و پارت چەندە قایم و پتەو بووە.

لە زەمانی وەلاشی یەکەمدا، یەکەمین دیاردە و نیشانەکانی ئێرانیگەریی نوێ خۆی نیشان دا. لەسەر پشتی سکەکانی ئەم پادشایە ئاورگایەک و موغێکی قوربانیکەر وەبەرچاو دێ. بۆ یەکەم جارە کە ئەم سکانە بە ئەلفوبێی پەهلەویی ئەشکانی لێدراون (ق٧٨).

ق٧٨- خەتی پەهلەویی ئەشکانی

---

١- بەلاش

ئەفسانەسازانی ئێرانی پێیان خۆشە کە بڵێن دەقی ئەڤێستا لە زەمانی ئەم پادشایەدا کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە. پادشای پارت بۆ تێکشکاندنی هێزی بەرەنگاربوونەوەی شاری یۆنانیی سلۆکییە، تەمای گرت شاری وەلاش‌ئاباد (ڤۆلۆگێزیا) ساز بکا، کە دواتر بوو بە ناوەندێکی بازرگانی و جێگای شاری سەربزێوی سلۆکییەی گرتەوە. پادشای پارت بۆ یەکەم جار، لە جەنگەی هرووژمی سامناکی ئالانان‌دا کە بە لێژەکانی قەفقازدا سەرەوخوار ببوون، لە ڕۆمییەکانی ڕاسپارد کە وا باشە بە هاوبەشی لەو ڕەوەندانە وەدەست بێن کە هەڕەشە بوون بۆ سەر سنوورەکانی باڵی باشووری قەڵەمڕەوی؛ بەڵام ڕۆم پێشنیارەکەی بردەوە پاش، کەچی لە سەردەمی ساسانییەکان‌دا کە گەف و تین و تەوژمیان زۆر پتر ببوو، هەڵوێستی خۆی گۆڕی.

هەڵوێستی بەرچاوڕوونانەی ئووگوست سەبارەت بە پرس و پێگەی ڕۆژهەلات هێندێکی خۆ ڕاگرت، بەڵام لە سەردەمی ترایان [تراژان]دا، هەڵوێست و سیاسەتێک سەبارەت بە ئێران ڕەنگی دایەوە کە هێندەی لا لە ئاوات و ئامانجەکانی بناغەدانەری گەورەی ئیمپراتۆریی ڕۆم نەدەکردەوە. کێشەی ئەرمەنستان و ئێران جارێکی تر سەری هەڵدایەوە و بە شێوەیەکی توندوتیژ چارەسەر کرا. بەپێی ئەم بۆچوونە دەبوو ئەرمەنستان بگیرێتەوە و ببێتەوە هەرێمێکی سەر بە ڕۆم و پارتیش پێویستە سەری دانەوێنێ و پادشایەکی دەسنێژی ڕۆم بەرێوەی بەرێ. ساڵی ١١٤ی زایینی، ترایان پاش پێمل کردنی تیرە و هۆزەکانی قەفقاز و دوای یەکەمین سەرکەوتن، هەرێمە ڕۆمییەکانی ئاسیای بچووکی گرتن و خستنییە سەر پادشایەتیی بۆسفۆر، بێئەوەی هیچ مەودایەکیان لە نێوانی‌دا بێ. بەم شێوەیە جەغزێکی دەسەڵاتی ڕۆمیی لە دەوروبەری دەریای ڕەش سەقامگیر کرد و پەلاماری بردە سەر

ئەرمەنستان و پادشای وێ بەرلە کوژرانی، تاجی دەسەڵاتی خۆی دایە دەست ترایان.

ئەرمەنستان هاتە نێو جەڵلەی هەرێمەکانی ڕۆمی. پارتەکان کە دوای ماوەیەکی درێژ سەرلەنوێ تووشی شەڕ و هەرای نێوخۆیی ببوونەوە، هیچ دژکردەوەیەکیان نەنواند. ساڵی دواتر، ترایان [ترایانووس = تراژان] پاش ئەوەی گەیشتە ئادیابێنێ[1] و خستییە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی، بەرەو فورات شۆڕ بۆوە و تیسفوونی پایتەختی پارتی گرت و لەوێ کیژی خوسرەو و تاج و تەختی حکوومەتەکەی کەوتە چنگی. دواتر بە ڕەوگەی شانی ڕووباری دیجلەدا ئەسپی تاودا و گەیشتە کەنداوی فارس و ڕەنگە پێی خۆش بووبێ کە هیندیش بگرێ. پاشان لە بابل لای دا و لەو ژوورەدا کە ئەسکەندەر مردبوو، ئاژەڵێکی کردە قوربانی، چونکە ترایان بەو ڕێبازەدا دەڕۆیی کە ئامانجی ئەسکەندەر بوو.

وەکوو دیارە سەرکەوتنەکانی ئیمپراتۆر هێندەیان درێژە نەکێشاوە و ڕاپەڕینێکی هەمووانی سەرتاسەری هەرێمەکانی باڵی ڕۆژهەڵاتی دەریای مەدیتەرانەیان گرتەوە. جوولەکەکانی سیرنائیک، میسر و قوبروس لە جەنگەی ئەم هەرایەدا، ئاوری ئاژاوەیان ڕاکێشا بۆ فەلەستین، سووریا و باکووری دووچۆمان کە سەرلەبەری بریتی بوو لە دنیای سامیڕەگەزان. پارتەکان ئەو کەلێن و کۆسپەی ڕۆمییەکانیان بە هەل زانی و شانیان دایە بەر شەڕی پارتیزانی و دوابەدوای ئەوانیش ئەرمەنستان سەری هەڵدا. ترایان [تراژان] کە ملی نابوو لە لابردن و دانانی پادشایان، تەمای گرت کە لە گەڕانەوەیدا شەڕ بکا و لەخۆوە هەڵسووڕا هەتا قەڵای «هێترا»ی پارتەکان لە ناوچەی دووچۆمان بگرێ، بەڵام بەرلەوەی بگاتەوە ڕۆم مرد و سەری نایەوە.

---

١ـ [ئادیابین، ئادیابێنە]، بەشێک لە ئاشووری کۆن کە هەولێریش دەکەوتە نێو قەڵەمڕەوی.ب.

سەرکەوتنە گەورەکانی ڕۆم بە سەر شکاندا کەوتن. ئەگەرچی ناکۆکی و نەحاوانەوەی نێوخۆی شازادەکانی ئێرانی وڵاتی بەشبەش کردبوو، بەڵام جارێکی دیکەش دوژمنی دەرپەڕێندرا؛ کەچی گیرانی تیسفوون کارێکی وای کردبوویە سەر ڕووحی جەماوەری ئێرانی کە نەیهێشت هەستی نەتەوایەتی لە نێویاندا ببووژێتەوە. هادریانووس [هادریان] کە بوو بە جێگرەوەی ترایان، نەکەوتە شوێنپێی فەرمانڕەوای دەسەڵاتخوازی پێشخۆی و ڕێگای نەدا بارودۆخەکە لە گرێژەنە بچێ و هەر ئاوا پاراستی. فورات هەروەک سنووری نێوان دوو ئیمپراتۆرییەکە مایەوە، بەڵام دیسانیش ئارامی باڵی بە سەر بارودۆخی نێوخۆیی نەکێشا. شەڕ و کێشەی نێوان وەلاشی دووهەم و خوسرەو چەندین ساڵی درێژە کێشا. هرووژمی تازەی ڕەوەندەکانی ئاڵبانی ئەوەندەی دیکەی تین بۆ ئێران هێنا و بارودۆخەکەی تاڵوتوونتر کرد. ئەمانە هەتا نیزیک ناوچەی دووچۆمان دزەیان کرد و بەرەنگاربوونەوەی پڕ کوێرەوەری و ئازایانەی پارتەکان بەرسینگەی لێ برینەوە.

ڕابوونەوەی ئەشکانییەکان و برانەوەی شەڕ لەگەڵ ڕۆم، دوو نیشانەی دیار و بەرچاوی دەسپێکی حکوومەتی وەلاش (بەلاش)ی سێهەمە (١٤٨ـ ١٩٢ی.ز). پادشای پارت پاش خۆ تەیارکردن و دابینی پێداویستییەکانی پەلاماردانی سووریا، ڕووباری فوراتی هەڵبوارد و پێی نایە سووریا و خەڵک بە پیر هێزەکانییەوە چوون. لەم کاتەدا ڕاپەڕینێکی تازەی گشتی دژی ڕۆم چاوەڕوانکراو بوو. پارتەکان ئەگەرچی لە حاند هەسدانەوەی هرووژمی دوژمناندا بە هێزێکی گەورە دادەندران، بەڵام لە جەنگەی پەلامارداندا بێبڕشتیی خۆی بۆ نەدەشاردراوە. هەر ئەم ڕووداوە ڕاست دوو سەدە لێرەوبەر لە سەردەمی پاکۆردا ڕووی دا. سپای وەلاشی سێهەم خۆی لە ئاست

پەلاماری لەشکری ئانتۆنیووسی «پیاوچاک» بۆ ڕانەگیرا و لە «دوورا»[1] شکستێکی گەورەی بە سەر شانیدا هات. پادشا داوای شەرپاوەستانی کرد، بەڵام تازە ڕۆمی گەیشتبوونە ئەوبەری چۆمی دیجلە. تیسفوون گیرا و کۆشکی میری ئاوری تێبەردرا (١٦٥ی.ز). ئەم پایتەختە کە نیوسەدە لەوەی پێش لەبەر سەرهەڵدانی هەرێمەکانی باڵی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریی ڕۆم، توانیبووی قوتار بێ، ئەم جارەیان تەنینەوەی چاقوڵکە گەیشتە فریای و ڕزگاری کرد. ئەم نەخۆشییە لە کەوشەنەکانی ئێرانەوە جوولابۆوە و وادیارە هێزەکانی ڕۆمی کە لە کەناری چۆمی ئارازەوە گەیبوونە دووچۆمان، لەگەڵ خۆیان هێنابوویان و تەنەوەیان پێکردبوو. نەخۆشیی چاوقوڵکە گەیشتە ئاسیای خۆرنشین و چووە میسر و ئاسیای بچووکی گرتەوە و لە ڕێی یۆنانەوە گوێزرایەوە بۆ ئیتالیا و تەنانەت هەتا دەوروبەری «ڕاین»یش ڕۆیی. ڕۆمییەکان بابلیان چۆل کرد، بەڵام دەستیان لە هێندێک ناوچە و مەڵبەندی ڕووباری فورات بەرنەدا و وەکوو دەمڕاست و سەرهەڵوێستی ئەرمەنستان مانەوە. کاتێک شەڕێکی تازەی نێوخۆیی لە ڕۆمدا هەڵگیرسا، بیری تۆڵە لە دەروونی وەلاشی سێهەمدا ڕەنگی دایەوە، بەڵام هەرگیز بۆی وەدی نەهات.

جارێکی تر لە زەمانی «سێپتیمووس سێڤێرووس»دا (١٩٧ی.ز)، تیسفوون کەوتەوە بەردەستی ڕۆمییەکان و بۆ سەری سێجارە پایتەختی پارت تاڵان کرا و سووتێندرا و تەنیا گیروگرفتەکانی سپای ئیمپراتۆر لە وڵاتی وێراندا بوونە هۆی دەربازبوونی. ئیمپراتۆر ملی ئەو ڕێگایەی گرت کە ترایان لە جەنگەی کشانەوەیدا پێیدا گەڕابۆوە و دوو جاری هەوڵ دا کە «هیترا» بگرێ، بەڵام بە

---

١- دوورا ئوورۆپووس یان دوورا ئوورپێس شارێکی یۆنانینشین ڕۆژهەڵاتی نەینەوای کۆن و مووسڵی ئێستاکە.

کاو نەگەیشت و کشایەوە سووریا. لە رۆژگاری دەسەڵاتی «کاراکالا»دا، کێشە و ملانەی نێوان وەلاشی پێنجەم و ئەردەوانی پێنجەم درێژەی کێشا و ئاوری هەراکە لەگەڵ پەلاماری تازەی رۆمییەکان و گیرانەوەی ناوچەی دووچۆمان، پتر گرفەی کرد و شاڵاوی بڵێسەی ماڵکاولبوونێکی زیاتری لێکەوتەوە. کوژرانی ئیمپراتۆری رۆم، بارودۆخی دوو دەسەڵاتە گەورەکەی تووشی ئاڵوگۆڕ کرد. ئەردەوانی پێنجەم دوو جاری «ماکرینووس»ی ئیمپراتۆری رۆم بەزاند و باج و پیتاکێکی زۆری پێوەبەست. سنووری کۆنی ئێران لە لێواری چۆمی فورات، گەڕاوە سەر دۆخی جارانی و هێرشی پارتەکان بۆ سەر سووریا تەنیا وەک هەنگاوێکی کاتی لێکدرایەوە. بەم شێوەیە دوو سەدە و نیو هەوڵ و هەڵسووڕانی رۆمییەکان بۆ پێملبوونی ئێران، سەری نەگرت و بە تێشکان برایەوە. واوێدەچوو کە سەرکەوتنەکانی ئەردەوانی پێنجەم کرانەوەی دەرووی مێژوویەکی تازە بێ لە رەوتی پەرەی قەڵەمڕەوی ئێراندا بەرەو خۆرنشین، بەڵام خانەدانی ئەشکانی ئەم ئامانجەیان بۆ وەدی نەهات، چونکە نەیاندەتوانی هێزێکی یەکپارچەی بەدەسەڵاتی نەتەوەیی پێک بێنن. دواتر ساسانییەکان ئەو هەلومەرجە لەبارەی کە پارتەکان هێنابوویانەدی، بۆ ئەستاندنەوەی تۆڵە لە پارتەکان خواستییانەوە و برشتی چەکوچۆڵی ئێران هەتا بەستێنەکانی دەریای مەدیتەرانە رۆیی.

### پارتەکان و رۆژهەڵات

زانیاریی ئێمە سەبارەت بە بارودۆخی سەکایی کە لە پێدەشتی بەربڵاوی باشووری رووباری جەیحوون نیشتەجێبوون، پاش رووخانی حکوومەتی یۆنانی (دەوروبەری ساڵی ١٢٨ی زایینی)، کەم و کورت و تەماوییە. پاش برانەوەی سەدەی یەکەمی پێشزایین وادیارە کە جووڵانەوەیەک بۆ

یەکخستنەوەیان لە لایەن «کووشان»ەکانەوە دەست پێدەکا کە خۆیان دەبێ لە توخم و تۆرەمەی یووەچی یا تۆخارییەکان بووبن. کووشانەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی زایینیدا، لەگەڵ «کووجوولا ـ کەدفیزێس»[1] دێنە نێو دیرۆکەوە. ئەم پادشایە دوای کۆمەڵێک سەرکەوتنی پەیتاپەیتا و پاش ئەوەی تەواوی هەرێمی بەلخی گرت و خستییە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی، بە هیندوکوشدا تێپەڕی و دەستی گەیاندە ناوچەی کابول و کەوشەنی حکوومەتی هەتا باڵی چەپی ڕووباری سێند پەرەپێدا و ئەو هەرێمانەی لە چنگ ئاخرین پادشایانی بە ڕەگەز پارتی و جێگرەوەی گۆندۆفارێس[2] دەرکێشا. ئەم فەرمانڕەوایە لە جەنگەی پەرەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا بەرەو خۆرنشین، بەناچار دەبێ لەگەڵ پارتەکان تێکهەڵچووبێ و بەگوێرەی ئەو سکانەی کە لێی داون، وادیارە دەبێ ناوچە مەروی لێدابڕیبێ و کەوشەنی هاوبەشی نێوانیان لە لای هیرکانی (گورگان) دیاری کرابێ. ئەم پەرەگرتنەی پادشایەتیی تازەلاوی کووشان، سەر بە سەردەمێکە کە سیاسەتی توندوتیژی نێرۆن و ڕاوێژکارانی، خۆراوای ئاسیای هەتا ڕۆخی ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەری وەلەرزە خستبوو. بەش بە حاڵی خۆی ڕۆم هاتە سەر ئەم بڕوایە کە پەیوەندییەک لەگەڵ هیرکانی دامەزرێنێ و وێدەچێ پەیمانناەمەیەکیان لە مابەینیدا بەسترابێ. ئەم پەیوەندییە لە پلەی یەکەمدا بۆ ڕۆمییەکان خاوەنی سەنگ و بایەخی ئابووری بوو. ئەوان دەیانهەویست کە بە شێوەیەکی ئاسایی، ڕێ و ڕەوگەی گرینگی بازرگانی دابین بکرێن، هەتا لە دەرەوەی جەغزی دەسەڵاتی پارتەکان، بازاڕی کڕین و فرۆشتن لە نێوان ڕۆم و چین و هیندیدا ڕمێن پەیدا بکا و مسۆگەر بێ. بازرگانەکان

---

١ـ کووجوولا ـ کادفیسنس

٢ـ گزندۆفار

بەرهەمی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتیان لە جەیحوونەوە دەگەیاندنە دەریای خەزەر و لەوێڕا دەیانگواستنەوە بەرەو ڕووباری کووررووش (کوور[1]). پاشان لە ماوەی پێنج ڕۆژدا کاڵا و بەرهەمەکانیان دەگەیاندنە لێواری فازیس[2] و دەیانکردنە باری گەمییان و لەوێوە دەیانبردن بۆ دەریای ڕەش. ساڵی ٥٨ی زایینی، هیرکانی (گورگان) لە قەڵەمڕەوی پارت دابڕا و سەربەستیی ڕاگەیاند و باڵوێزێکی نارده ڕۆم.

کووجوولا ـ کەدفیزێس، مەروی خستە سەر جەغزی دەسەڵاتی و ڕەنگە پەیمانێکی لەگەڵ هیرکانی بەستبێ و نیزیکەی سەرتاسەری ڕەوگەی لۆتکەئاژوانی جەیحوونی خستبێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و هەتا دەروازەکانی خەزەر ڕۆیشتبێ. وینا ـ کەدفیزێس[3] کە بوو بە جێگرەوەی باوکی، درێژەی بە کارەکانی دا و ئەم ڕێبازەی کوێر نەکردەوە. ئەم فەرمانڕەوایە بێهێزی پارتەکان و تێکهەڵچوونی ئەوانی لەگەڵ ڕۆمییەکان بە هەل زانی و لە باڵی خۆرنشین هەرات، سیستان و ڕۆخجی لێ دابڕین و لە قۆڵی خۆرهەڵات، سەرتاسەری هیندی خۆرنشینی گرت و خۆی گەیاندە ئاورێژگەی ڕووباری سێند و لەنگەرگاکانی ڕۆژاوای ئەم شێوەدورگەیە. لە لایەکی دیکەوە و لە سەردەمی ئووگوستەوە، دوابەدوای دۆزرانەوەی جەنگە و ڕەوگەی هەڵکردنی وەرزەبای ناوچەکە، گەیاندن و گواستنەوەیەکی بەهێزی دەریایی لە نێوان دەریای سوور و هیندا دەستی پێکرد و کاروباری بازرگانی پەرەی گرت. کاڵا و کەلوپەلی بازرگانی کە لە میسر و بازنەی ڕۆژهەڵاتی دەریای مەدیتەرانەی بەردەستی ڕۆمییەکانەوە دەهاتن، لە لەنگەرگاکانی دەریای سوور باری گەمیێ

---

١ـ کووروس، کور

٢ـ ڕووبارێک لە گورجستانی خۆرنشین؛ ئەمڕۆ پێی دەڵێن ڕیئون.ب.

٣ـ ویمی کادفیزێس

دەکران و دەگوێزرانەوە بۆ زارکی ڕووباری سێند. پاشان لەوێوە بەم ڕووبارەدا دەیانبردن بۆ «پیشاوەر»ی ئێستاکە. ئەوسا دەیانکردنە باری کاروانان و بە هیندوکوش و پامیردا دەیانبردن و لە تورکستانی چین تێدەپەڕین و هەتا خودی چین گیر نەدەبوون. بەم شێوەیە کووشانەکان لە سەرەتای سەدەی دووهەمی زایینییەوە توانییان سێ لکی بەرچاوی شاڕێی ئاوریشم بە دەست خۆیانەوە بگرن کە بریتی بوون لە:

١ـ ڕێ و ڕەوگەی نێوان دوو دەریا [واتە دەریای خەزەر و دەریای ڕەش]؛

٢ـ ئەو ڕێگایەی کە بە مەرودا بەرەو شاری سەتدەروازە و هەگمەتانە دەخوشی و پاش تێپەڕین بە فوراتدا دەگەیشتە دەریای مەدیتەرانە.

٣ـ ئاوەڕێی نێوان هیند و دەریای سوور، نێوان هیند و کەنداوی فارس و دوورگەی خارک، لەگەڵ فورات و مەدیتەرانە.

پێکهاتنی پادشایەتیی کووشان لە باڵی ڕۆژهەڵاتی قەڵەمرەوی پارتەکان، دوو مەترسیی بۆ ساز دەکردن. یەکیان هەڕەشە و مەترسیی سیاسی بوو، چونکە ئێرانی سەردەمی پارتەکان، لەبری ئەوەی لە قۆڵی خۆرنشین خاوەنی ڕکەبەرێک بێ، کەوتبوویە نێوان بەرداشی ڕۆم و کووشان. مەترسیی دووهەم تەنگی بە باری ئابووری هەڵچنیبوو؛ چونکە کووشانەکان وەکوو پارتەکان بەشێک لە شاڕێی گرینگی بازرگانی بە ژێر دەستیاندا تێدەپەڕی و بارانە و گوومرگانەیان دەستاند و دەیانتوانی بە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی پارتەکاندا کاڵای بازرگانی بگوێزنەوە. ڕۆم خێرایەکی ئەم هەلومەرجەی خوێندەوە و وەخۆکەوت هەتا لەگەڵ شاهانی کووشانەکان پەیوەندیی ڕاستەوخۆ دامەزرێنێ. سەرەڕای ئەمەش، کووشانەکان تەنانەت سەردەمی حکوومەتی کانیشکا (١٤٤ـ ١٧٣ی.ز) گەورەپادشای ئەم زنجیرەیە و لە زەمانی جێنشینەکەشیدا کە گەیبوونە پۆپەی

دەسەڵاتی خۆیان، وێنەدەچوو چاویان بڕیبێتە گرتنی ئەو ناوچە و مەڵبەندانەی کە بە زیانی پارتەکان شکابێتەوە. هیند بە خۆی و سامانی زۆر و زەوەندی کە لە ژێر ئاڵای دەسەڵاتێکی یەکپارچەدا کۆنەبۆوە، بە لای کووشانەکانەوە لەچاو ناوچەی ویشکارۆ و ڕووتەنی ئێرانی ڕۆژهەڵاتی، ناوەندێکی بەخێروبێر و سەرنجڕاکێشتر بوو. ئەم ناوچەیە سنووری دوو وڵاتەکەی لێدەگەڕاوە و ئەمڕۆش بە هێندێک ئێروئەوێوە کەوشەنی مابەینی ئێران و ئەفغانستانە. شەڕی نێوان کانیشکا و پارتەکان لە نێو چەند دەقێکی کۆنی بوودایی‌دا تۆمار کراوە و زۆر وێدەچێ کە لە ڕۆژگاری وەلاشی سێهەم‌دا ڕووی دابێ. داخوا پادشای پارت تێدەکۆشا تا هەرێمەکانی ئێرانی کە کووشانەکان گرتبوویانن، بیانگرێتەوە؟ لە دەقی سوریانی‌دا بە شێوەیەکی لێڵ و تەماوی باسی ئەوە کراوە کە لە سەردەمی حکوومەتی وەلاشی چوارەم‌دا (١٩١ ـ ٢٠٧ی.ز)، لەشکرێکی گەورەی «مادەکان و پارسەکان» پەلاماریان بردۆتە سەر ڕۆژهەڵاتی ئێران. بەپێی دەقەکە وەلاش سەرەتا گەمارۆ دراوە و خەسارێکی بەرچاوی بە سەر شانی‌دا سەپاوە، بەڵام هێزەکانی بەرفەرمانی وەخۆ کەوتوونەوە و ڕاماڵیان بردووە و دوژمنیان هەتا «دەریا» ڕەتاندووە. جا کەوایە زۆر وێدەچێ نێوان و پەیوەندیی دوو جیرانەکە، بێنێوبڕ خۆش نەبووبێ؛ بەڵام دەکرێ پێمان وابێ کە پارتەکانی هەمیشە تێکگیراو لەگەڵ ڕۆم، شەکەت و بێبڕستی کێشمەکێشەکانی نێوخۆیی، بێپسانەوە بە شوێن داشکاندنی قەیرانەکانی باڵی ڕۆژهەڵاتەوە بووبن، چونکە ئەو سەردەمەی کە ئەوان بەئاشکرا بەرەو داڕمان گلۆر ببوونەوە، کووشانەکان گەیبوونە پۆپەی دەسەڵاتی خۆیان. ئەم پادشایەتییە بە هەڕەشەیەکی بەردەوام دادەندرا بۆ ئێران و دەیتوانی بە سازکردنی کۆسپ و تەگەرە لەسەر ڕێگای کاروباری بازرگانی، زیاتر بڕستی ئێران ببڕێ. یەکەمین پادشایانی ساسانی

چاکیان ئەم مەبەستە دەزانی، هەر بۆیە شاپووری یەکەم لێدانی کووشانەکان و گرتنی وڵاتەکەیانی، خستە ڕیزی پێشەوەی هەڵمەت و پەلامارەکانی.

**دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی**

پادشایەتیی ئەشکانی کە پتر لە هەموو شتێک پشتئەستوور بوو بە چەند مەزنەخانەدانێکی پارتی [پارت]، لە پلەی یەکەمدا چەشنێک سەرکەوتنی ئێرانییەکانی باکووری وڵاتە بە سەر ئێرانییەکانی باشووردا و زاڵبوونی ئێرانییەکانی ڕەوەندی دەوارنشینی دەرەوەی بانووی ئێرانە بە سەر نیشتەجێیاندا. ئەم جەماوەرەی لە شاراندا بنەیان داکوتابوو، تێکەڵاوی شارستانییەتە کۆنەکانی خۆرنشینی ئاسیا ببوون و جێگاشیان گرتبوونەوە و لە زەمانی ئەسکەندەرەوە ڕەنگیان بە ژیارمەندیی یۆنانییەوە گرتبوو. ئەو کەلێن و کەلەبەرەی کە دوو کۆمەڵی ئێرانیی لێکدادەبڕی، ئەوەندە قووڵ بوو کە لە مەودای سەدان ساڵەی دەسەڵاتی پارتەکانیشدا پڕ نەبۆوە. وێدەچێ کە توخم و تۆرەمەکانی نیشتەجێی وڵات لە کاروباری نێوخۆدا، ڕێبازێکی بەپارێزانەیان ڕەچاو کردبێ و ڕەنگە لە سەرەتادا نەیاری پادشایانی خۆیان و دراوسێیانی دەوروبەر و لێکدانەبراویان بووبن. پادشایانی پارت ئەو مەبەستەیان دەزانی و کاتێک تووشی گێرە و کێشە دەبوون، وایان بە باشتر دەزانی لەبری ئەوەی پەنا بەرن بۆ پارس یان ماد، هاواریان دەبرد بۆ خزمانی دەوارنشینی خۆیان لە ناوچە گیاجاڕ و پووشەڵانەکانی ڕۆژهەڵاتی خەزەر. پەیوەندیی ئەم عێلاتە هەرگیز لەگەڵ زنجیرەی پادشایانی ئەشکانی دانەبڕا و ڕەنگە هەر بۆیە بێ کە چەند سەرچاوەیەکی ڕۆژهەڵاتی، بەتایبەت مێژوونووسانی ئەرمەنی، کووشانەکانیش کە لە تۆرەمەی بیابانگەردانی ئێرانی بوون، بە خزمی خانەدانی پارتەکان دادەنێن.

پارتەکان کە ببوونە میراتگەری ئیمپراتۆریی بەرەو هەڵدێران و برانەوەی سلۆکی، وێناچێ کە تەکانێکی وایان لە خۆیان دابێ هەتا ئاڵوگۆڕێکی زۆر بە سەر بارودۆخی ڕابردوودا بێنین. وەکوو دیارە سلۆکی دەسەڵاتیان بە سەر قوڵەپادشایانی بەردەستی خۆیاندا نەدەشکایەوە و وێدەچێ پارتەکانیش بارودۆخەکەیان بۆ نەگۆڕدرابێ. ئەوان میران و قوڵەپادشاکانیان لەسەر کار لانەبردن، بەڵکوو هەر بەوەندە دامرکان و قنیاتیان هێنا کە دەسەڵاتی خۆیانیان پێ بسەلمێنن و جەماوەری تازەی بەردەسەڵاتیان بەرەو دانی پیتاک و ڕاگرتنی ڕێز و حورمەتی حکوومەتەکەیان پەلکێش بکەن. تۆبڵێی لە دەرەوەی جەغزی ئەم داوایانەوە کە پەیوەندیی نێوان ئەوان و هەرێمەکانیانی تووشی سستی و لاوازی دەکرد، پارتەکان بە سەر کۆمەڵێک هەڵەی وادا نەکەوتبن کە هەستی دوژمنایەتیی بەرهەمهێنابێ؟ بە لای ئێمەوە دەکرێ ئەگەرێکی ئاوا وەبەرچاو بگیرێ؛ چونکە لە زەمانی ئانتیۆخووسی سێهەمەوە، هەرکات سلۆکییەکان هەوڵیان دەدا هەتا هەرێمەکانی پارتی داگیر بکەن، میرهەرێمەکانی سەر بە پارتەکان، زۆر بەپەلە دژی فەرمانڕەوای خۆیان دەجووڵانەوە. ڕۆمییەکان بوونە جێگرەوەی سلۆکییەکان، بەڵام دۆخەکە گۆڕانی بە سەردا نەهات و ئەو دەمەی کە لووکوولووس یان پۆمپێئووس لە ڕووباری فورات پەڕینەوە، گەلێک لە میران و شاهانی دەسنێژ، بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانییەک دژی پارتەکان هەنگاوی بەپەلەیان هاویشت. ماد بۆ ماوەیەکی درێژ بەرەنگاری پارتەکان ڕاوەستا و بەربەرەکانی کرد. هیرکانی (گورگان) کە لە سەرەتاوە خرابوویە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی پارتەکان، لە ساڵی ٥٨ی زایینییەوە بوو بە خاوەنی سەربەخۆیی. ئالمائید[۱] یاریدەی دێمیتریووسی دووهەم و ئانتیۆخووسی حەوتەمی دا و بەپێی سەرچاوە

---

۱ـ واتە خووزستان؛

کۆنەکان، ئەوان لە سەردەمی حکوومەتی ئەردەوانی سێهەمدا سەربەخۆ و تەنانەت دوژمنی ئەشکانییەکانیش بوون.

نووسەرانی سەردەمانی لەمێژین، ناوی هەژدە هەرێمی بەرفەرمانی پارتەکانیان تۆمار کردووە کە یازدەیان بە «سەرگوڵ» و حەوتیان بە «بەرگوڵ» دادەندران. ماد بە خۆی و پادشایانی بە ڕەسەن ئەشکانی دەکەوتە پلەی دووهەم و ئەرمەنستان کە پادشاکانی لە ڕۆژگاری تیردادەوە هەر لەو ڕەگەزە بوون، لە پلەی سێهەمدا دەهات. گەلێک لەم حکوومەتانەی وەکوو پارس، ئالمائید یان خاراسێن، سکەیان لێدەدان. پاشماوەی وڵات بە سەر چەند هەرێمێکدا دابەش کرابوو کە مەزنی بنەماڵەی دەرەبەگانی پارت جڵەوکێشیان بوون. زۆربەی ئەم پیاوانە پلەی میرهەرێمایەتی لە نێویاندا بە میرات دەگەڕا و کەوایە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەوان و پێکهاتە و دامودەزگای قوڵەپادشاکاندا بەدی نەدەکرا. بێجگە لەمانە کۆمەڵێک خێڵ و هۆزی وەکوو کۆسییەکان و ئووکسییەکانی ڕەوەند و نیمچەڕەوەند لە باشووری خۆرنشین و عەرەبەکان لە سنوورەکانی خۆرنشین هەبوون کە بەکردەوە سەربەخۆ دەژیان.
بەگوێرەی گێڕانەوەیەکی ڕۆژهەڵاتی، ئەسکەندەر لە جەنگەی دەسەڵاتی خۆیدا لە ترسی پارسەکان و بە مەبەستی شەلەل پێهێنانی، وڵاتەکەی بە سەر ٩٠ پادشادا دابەشیبوو کە بوو بە هۆی بێهێزی سیاسی و داتەپینی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتیی پارتەکان. شارە یۆنانینشینەکانی وەکوو سلۆکییەی لێواری دیجلە یان سلۆکییەی ئوولەئووس (شووش)، کەوتنە بەردەسەڵاتی پادشایانی دەسنێژ و پارتەکان ئیزنیان دابوون هەتا پێکهاتەی خۆیان بپارێزن. بارودۆخی ژیانیان تۆزێک ئاڵوگۆڕی بە سەرهات و دەبوو سەر وەبەر فەرمانی میرهەرێمێک بێنن کە ئەشکانی لە جێی میرهەرێمی یۆنانی دایاندەنا. پێکهاتەی

سیستمی دەرەبەگییانەی ئیمپراتۆریی ئەشکانییەکان کە زۆر وەکوو پێکهاتەی دەرەبەگیی ئورووپا وابوو لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، لەسەر تەوەرەی حەوت بنەماڵەی گەورە هەڵدەسووڕا کە یەکیان بریتی بوو لە خانەدانی ئەشکانی و ئەمەش یادگاری نەریتی هەخامەنشییەکان بوو. پاش ئەم خانەدانە مەزنانەی دەرەبەگان، نەجیمزادەی بەرەژێرتر یان سوارەی شەڕکەر خۆیان دەنواند و جەماوەری وەرزێران و ڕەشایی و ڕەشۆکی دەکەوتنە پلەی خوارتر. پەیوەندیی نێوان مەزنانی باڵادەست و کۆمەڵانی بچووکی بەرفەرمانیان، پتەوتر بووە لە پەیوەندیی نەجیمزادان لەگەڵ پادشا. وەکوو دیارە حکوومەتی پارت هەمیشە لە باوکەوە نەدەگوێزرایەوە بۆ کوڕ و لە هەڵبژاردنی پادشادا دەنگی ئەنجومەنی مەزنان دەورێکی گرینگی دەگێڕا و سنووری بۆ دەسەڵاتی پادشا دادەنا. هەڵبەت ئەنجومەنێکی دیکەش هەبوو کە پێی دەگوترا «ئەنجومەنی فرەزانان و موغان» کە تەنیا بە لێژنەی ڕاوێژکارانی پادشا دادەندران.

چینی مەزنان کە لە سەرەتادا چواربەندەی دەسەڵاتی پادشایانی پارت بوون، بەرەبەرە ڕێگایان بۆ تێکڕمان و ڕووخانی حکوومەتی ئەم خانەدانە خۆش کرد. پێکهاتەی سیستمی دەرەبەگی داهێنانی پارتەکان نەبوو، بەڵکوو لە هەخامەنشییەکانەوە بۆیان بە میرات مابۆوە و ڕادەستی ساسانییەکانیان کرد. ئەم سیستمە ماوەیەکی درێژخایەن لە سەردەمی ئیسلامیدا بە شێوەیەکی پێکەیشتووتر پارێزرا. ئەوەی ڕاستی بێ دەرەبەگان لەبەر بێدەسەلاتیی پادشایانی پارت، بوونە خاوەنی هێزێکی ئەوتۆ کە بارودۆخەکەی گۆڕی و پەیوەندیی پادشای لەگەڵ جەماوەری بەرفەرمانی تووشی نەمان و دابڕان کرد. لە سەرتاسەری مێژووی پادشایەتیی پارتدا، جاری وابوو مەزن و ماقووڵان بە ڕەچاوکردنی هەڵوێستی تایبەت یان بە پشتیوانیی غەواران ـ بەتایبەت

ڕۆمییەکان ـ پادشایان لێدەخستن و دایاندەنان. هەر جارێک کە پادشایەک لێدەبڕا هەتا دەسەڵاتی خۆی سەقامگیر بکا، بیانووی ملهوڕبوونی پێدەگیرا و لەسەر کار لادەدرا. زۆربەی جاران لادانی پادشایان شەڕ و ئاژاوەی نێوخۆییی بە دوای‌دا دەهات و چەند کەسێک قوت دەبوونەوە و خۆیان بە خاوەنی تاج و تەختی پادشایەتی دەزانی و خۆ خەڵکیش نەیاندەزانی کێ لەسەر هەقە. هەلی وابوو ئەو پادشایانەی کە دەستیان بە تەختی پادشایەتی ڕانەدەگەیشت، پەنایان دەبردە بەر دەوارنشینانی دەشتەکی یان ڕۆمییەکان کە لە کاتی پێویست‌دا بە زەبری هێز و چەک دەچوونە هانایان.

کۆمەڵی ئێرانی لە سەردەمی پارتەکان‌دا داب و نەریتی کۆنباوی خۆی پاراست. مرۆڤی وەجاخ‌زادە و ئازادە، سووکەڵەسوارێکی دەسکەرەوە بوو کە تەمەنی دەکردە بەختی شەڕ و چوونە ڕاو. پارتەکان خاوەنی هێزی ڕێک‌وپێکی سەربازی نەبوون. پێکهاتەی قۆشەنیان بریتی بوو لە ڕەنگدانەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی وڵات. هەر دەرەبەگێک خاوەنی هێزێکی تایبەت بە خۆی بوو و لە جەنگەی شەڕدا دەیهێنا بۆ یاریدەی پادشا. نموونەی دیار و بەرچاو «سۆورێنا»یە لە شەڕی «کاررە»دا، چونکە زۆربەی هێزەکانی بەرفەرمانی، هەر پیاوی خۆی بوون. مەزنانی پایەبەرز دەبوونە تان‌وپۆی هێزی سوارەی زرێپۆشی گەورە و گران کە شیریان لە خۆیان شەتەک دەدا و نێزەیان بە دەستەوە دەگرت و لە شەڕی دەستەویەخەدا شارەزا و سامناک بوون (ق٧٩). ئەم چەکدارانە سواری وشتریش دەبوون، بەڵام وێناچێ کە پارتەکان هەرگیز لە قۆشەنی خۆیان‌دا فیلیان تێوەدابێ. ڕەسەن‌زادەی بەرەژێر، هێزی سوارەی سووکەڵەچەکیان پێکدێنا و ئەم لەشکرە کەوانداره چاکی لە شەڕی دوورئەنگێوی دەزانی و بە هەور و بارانی تیران دەوری دوژمنی دەتەنی و لە چاوترووکانێک‌دا

**خۆی لە چنگ هەڵمەتی خەنیمی قوتار دەکرد و بزر دەبوو. لە شەڕی «کاررە»دا هەزار سەر وشتر باری تیری سپای سوارەی ڕادەگوێست و ببوو بە ناوبانگی قۆشەنی پارت. هێزی پیادە دەورێکی ناسەرەکیی دەگێڕا و پێکهاتبوو لە چیانشینان و کۆیلان. ئەوەی ڕاستی بێ قۆشەنی پارت، هێزێکی بەرگێڕەوە بوو نەک پەلاماردەر و بۆ جەنگەی ئاوا پەروەردە نەکرابوو. شتێکی وایان لە چەکوچۆڵ و پێداویستییەکانی گەمارۆ نەدەزانی و قۆشەنی پارت لە پای شوورە و دیواری قەڵای دوژمنان، بێدەسەڵاتیی خۆی دەرخستبوو.**



ق٧٩- دوورا- ئوورۆپۆس: سوارەیەکی زرێپۆشی پارتی

## پارتەکان و یۆنانییەکان

یەکەمین پادشایانی پارت لە میهردادی یەکەمەوە بەرەودوا، لەسەر سکەکانی خۆیان دەیاننووسی «یۆنانخۆشەویست». داخوا بەڕاستی ئەوان ئەوەندەیان لەم کولتوورەی بێگانە دەزانی و تێیدا نوقم ببوون؟ لەم بوارەدا کۆمەڵێک بەڵگە بە دەستەوەن کە دڕدۆنگی بەدی دێنن و وامان لێدەکەن تا بڕوا بکەین ئەم کارەیان وەک هەنگاوێکی سیاسی، کە بارودۆخی ئێران بە سەریدا سەپاندوون، ئەنجام داوە. ئەوان هیچ ڕێگایەکی دیکەیان بۆ هەڵنەدەبژێردرا. ئەو ئێرانەی کە پارتەکان توانیبوویان لە چنگ یۆنانییەکانی ڕزگار بکەن، زۆر کەوتبوویە ژێر باندۆری فەرهەنگی خۆراوایی و یۆنان کە خاک و وڵاتەکەی بۆ پارتەکان بەجێهێشت، شەقڵ و شوێنێکی قووڵی لەم ژیارمەندییەدا دانا کە ڕەنگ و ڕووی دیمەنێکی تازەی یۆنانی ـ ئێرانی بەدی هات. ئەو دەشتەکییانەی کە لە ناوچەی پووشەڵان و گیاجاڕانەوە هاتبوون چییان لە چنگ دەهات؟ ئەم سوارە ئازا و شەڕکەرانە لە حاند ئەو کەلەپوورەی کە کولتووری یۆنانی توانیبووی لە ماوەی دووسەت ساڵدا لە ئێران بەدیی بێنێ، دەست بەتاڵ بوون و تۆبڵێی توانیبایان چ ئاڵوگۆڕێک لە ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریدا بەدی بێنن؟ وەختایەک کە پارتەکان بوونە فەرمانڕەوای ئێران، دامودەزگایەکی ڕێکوپێک و کۆمەڵێک شاریان هاتنە بەرچاوی کە لەگەڵ کۆچەرنشینانی یۆنانی لێکدرابوون و لەگەڵ چینی دەسمایەدار و دەوڵەمەندی وە یۆنانیگەڕاوی ئێرانی تێکەڵ ببوون و ئاوا بەڕێوەدەچوون. دەوڵەمەندانی ئێرانی کە پردی پەیوەندیی نێوان پارتەکان و یۆنانییەکان بوون، یاریدەی هەردک لایان دەدان و بەڕێوەبردنی کاروباریان کەوتبوویە سەر شانی و کۆکردنەوەی ئەو باج و پیتاکەی کە بەشی هەرە زۆری لە شارە بازرگانییەکانی نێونەتەوەییەوە دەخرایە سەر یەکتر بە ئەرکی ئەوان

دادەندرا. هەروەها ڕێگایان بۆ کاربەدەست و دەمڕاستی میری خۆش دەکرد هەتا ڕەوتـی کاروبارەکـانی خـۆجێیی بخاتـە ژێـر چـاوەدێری. دەوری شـار و سەرمایەدارانی یۆنانی و ئێرانی لە ژیانی سیاسیی وڵاتدا خاوەنی بایەخێکی بەرچاو بوو، چونکە زیاتر لەم شارانەدا، گەرای بیروڕای گشتی دادەندرا و دەگوورا و پێدەگەیی و ڕەوتێکی دەگرتە بەر و تەنانەت چارەنووسی پادشاشی دیاری دەکرد. پادشایانی پارت هەستیان بە بارودۆخەکە کرد و تێیگەیشتن. کاتێک قۆشەنی پارت داوەرین و نەچوونە نێو سلۆکییە و بەرەوڕووی شارەکە هۆردووبەزیان کرد، کارێکی واتادار بوو. ئەم ڕەوت و ڕێبازەی پارتەکان هەتا ڕۆژایەکی کە خاشەیان بڕا، ڕەچاو کرا. «ڕۆمییەکان و پارتەکان لە بابەت پارێزرانی تایبەتمەندی و کولتووری یۆنانیی خۆیانەوە، قەرزداربارى کۆمەڵەی کۆچەرنشینانی یۆنانی بوون.» ئەو کۆچەرنشینانەی ئێران وەکوو پێشەنگی لەشکری پاراستنی پێکهاتە و زمانی خۆیان وابوون. لە ماوەی چەند سەدانـدا زمـانی ئـەوان، بەرلـەوەی زمـانی پارسـی جێـی بگرێتـەوە، وەکـوو زمـانی نێونەتەوەیی لە کاروباری سیاسی و بازرگانیدا کاری پێدەکرا. خەتی یۆنانی کە بیابانگەردانی هەرێمی بەلخ خواستییانەوە و وێنەیان لێهەڵگرتەوە، هەتا سەدەی هەشتەمی زایینی بڕی کرد و کوێر نەبۆوە. دەبێ ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە بیابانگەردانی هەرێمی بەلخ لە کاتی خۆیدا توانیبوویان پادشایەتیی کووشانەکان دامەزرێنن.

پارتەکان نرخ و بایەخی شارستانییەتی یۆنانییان دەزانی و وەکوو بەشێک لە کۆمەڵی ئێرانی لێیان دەڕوانی و پەسنیان دەدا. تێکدانی بارودۆخەکە و گەڕانەوە بۆ سەر دۆخی زەمانی ئەسکەندەر یان بەدی هێنانی دۆخێکی نوێ، بەپێچەوانەی قازانج و بەرژەوەندیی حکوومەت بوو. جا بۆیە پارتەکان دەستیان لەو شارە

یۆنانی‌نشینانە نەبزاوت کە وەکوو مەتەریزی سامان و بەختیاریی مەزنانی تازە بوون. سلۆکییەی لێواری رووباری دیجلە، سلۆکییەی شووش، دوورا ـ ئوورۆپۆس (بابل)، ئوورووک و رەنگە چەند شارێکی دیکەش کە هەتا ئێستا نەدۆزراونەوە، تایبەتمەندیی سەربازی، کشت‌وکاڵی و بازرگانیی خۆیان پاراست و دەستیان لە خاکی دانیشتووانەکانیان نەبزاوت و خۆیان وەرنەدایە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابوورییان و تەنانەت سەربازگەی یۆنانی هەر لە شوێنی خۆیان مانەوە. بەپێی تەتەڵەکانی سەدەی یەکەمی زایینی، هێزە چەکدارەکانیان لە شووش هەروا سەرقاڵی کشت‌وکاڵ بوون. حوکمداران لە نێو بنەماڵەکانی خۆجێیی‌دا و لە لایەن پادشا یان شارەوە هەڵدەبژێردران و دەکەوتنە ژێر چاوەدێریی میرهەرێمان. دادوەرانیش هەر لەم مەزنەوەجاخانە دیاری دەکران. کۆمەڵانی نێو شاران گۆرانیان بە سەردا نەهات و وەکوو خۆیان مانەوە. بەم شێوەیە پێکەوەژیانی هێمنانە لە نێو دوو نەتەوەکەدا درێژەی دەکێشا. هەڵبەت پێکەوە حاوانەوەش هەمیشە سەری نەدەگرت و هێندێک شاری گەورەی وەکوو سلۆکییەی قەراخ رووباری دیجلە هەرا و ئاژاوەی تێدەکەوت. ئەم شەڕ و گەڕانە کە جاری وایە توندوتیژیش بوون، لە نێوان بازرگانانی مەزن و ماقووڵی یۆنانی و جەماوەری ئێرانی و سامی‌دا رووی دەدا و زۆربەشی دەگەڕایەوە سەر لایەنگری یان دژایەتی لەگەڵ ئەو پادشایەی کە دەبێزرا یا دەکەوتە بەردڵان. هەروەها جاری وایە ناکۆکی کەوتۆتە نێوان شار و بارگای میری. بۆ وێنە سلۆکییەی بەرباس بەئاشکرا دژی پادشای پارت راپەڕی و ماوەی حەوت ساڵان بێ‌پسانەوە شەڕی کرد، بەڵام بەگشتی پەیوەندییەکە باش و دۆستانە بوو. میرهەرێمانی پارتی، پایەبەرزان، قەڵەمداران و کاربەدەستانیان هەموو زمانی یۆنانییان دەزانی. پادشایانیش یۆنانییان دەزانی و

کۆمەڵێک بەرهەمی هونەری و سکەی حکوومەتی (و٨٦) دەیسەلمێنن کە ئەوان، بەتایبەت لە دوو سەدەی بەرلە دەسپێکی سەدەکانی زایینیدا، نووسەران و هونەرمەندانی یۆنانییان بەرەو بارگای خۆیان ڕادەکێشان و باڵیان بە سەر دەکێشان.

ئاکاری نیازپاکانەی پارتەکان سەبارەت بە کەلەپووری شارستانییەتی یۆنان لە ئێراندا، دەورێکی گرینگی لە چارەنووس و گەشەی شارستانییەتی ئێرانیدا گێڕاوە. ئەم کارە وای کرد هەتا وڵات لە هەڵدێران و هەڵگەڕانەوەی توند و تیژ پارێزراوبێ. ئەم ڕەوتە وردەوردە نیشتمانی بەرەو پێگەیشتن پاڵپێوەنا و بوو بە هۆی ئەوەی کە لە درێژەی زەمان و بە لەسەرخۆیی، ماکە و هەوێنی بێگانە بتوێتەوە و لە ئاکامدا فەرهەنگێکی نەتەوەیی کە بە شێوەیەکی پڕشنگدار لە شارستانییەتی ساسانیدا ڕەنگی داوەتەوە و دیارە، بەدی بێ.

## دین

لێکۆڵینەوەکانی سەردەم دەربارەی داب و نەریتی دینی و کەندەوکۆژەکانی شوێنەوارناسی دەریدەخەن کە بۆچوونی ئەو کەسانەی پێیان وایە دینی زەردەشتی لە ڕۆژگاری پارتەکاندا سەری هەڵداوە، دەبەنەوە پاش و وەکوو دیارە دینی بەرباس لایەکی وای لێ نەکراوەتەوە. پارتەکانیش هەروەکوو هەخامەنشییەکان زەردەشتی نەبوون[1]. ئەوانەی لایەنگری گریمانەی

[1] ـ گەلێک کەلێن و قوژبن و لایەنی سەبارەت بە دینی ئێرانی لە زەمانی پارتەکاندا بۆ ئێمە نارروونە. زنجیرەی پادشایانی پارت کە لە ناوچەکانی دەرەوەی ئێران و مەڵبەندی دەوارنشینانی ئێرانییەوە گووڕابوون. دەبێ لەسەر بیروباوەڕی پەرستنی توخمەکانی سروشت بووبن و وێدەچێ لە قۆناخی سەرەتاییدا پەرستنی خۆر و مانگیان لەگەڵ خۆیان هێنابێ. ئێمە بۆمان روون نەبۆتەوە کە پارتەکان هەتا چ ڕادەیەک بەم بوارەدا ڕۆچوون و بوونە شوێنکەوتەی دینی باوی ئێرانی یان ئەوەندەی دەیزانین بایەخێکی ئەوتۆی نییە. [ئەم برگەیە دوکتۆر موعین لە دەقەکەی زیاد کردبوو، هێنامە پەراوێز گوتم با شێوەی کارەکە جوانتر دیار بێ.و.]

زەردەشتیبوونی پارتەکانن ، پشت بەو قسەیەی تاسیتووس دەبەستن کە گوتوویەتی، تیردادی پادشای ئەرمەنستان و برای وەلاش (بەلاش)ی یەکەم، کاتێک بەرەو ڕۆم وەڕێکەوتووە هەتا تاجی دەسەلاتی لە دەستی نێرۆن وەربگرێ، خۆی لە سەفەری دەریایی پاراستووە بۆ ئەوەی ئاو کە ماکەیەکی پیرۆزە، پیسی نەکا و نەیلەوتێنێ. بەکورتی و پوختی دەبێ بلێین کە لە هەموو زەمانێکدا ئاو بە لای ئێرانییەکانەوە پیرۆز بووە و هێرۆدۆتیش وەبالی بۆ دەکێشێ و ئێمە دەزانین کە ئاناهیتا خودای ئاو بووە. لە لایەکی دیکەوە زۆر جاران سەنگ و بایەخی ڕستەیەکی تاسیتووس (پازدەهەم، ٢٩) کەوتۆتە ژێر پەردەی کەمتەرخەمی کە دەلێ، لە جەنگەی ڕێورەسمی بەراییدا لە ئەرمەنستان، هەر ئەم تیردادە تاجەکەی خۆی نایە بەر پێی پەیکەرەی نێرۆن و بەپێی باوی سەردەم ئەم کارە سەمبولیکەی پاش قوربانی کردنی چەند سەر ئاژەلێک ئەنجام دا. جا کەوایە لە سەدەی یەکەمی زایینیدا، سەربڕینی ئاژەلان و ڕشتنی خوێنیان لە ئێراندا باو بووە و بە بەشێک لە دابودەستووری بنەمالەی میری دانراوە و ئەم کارەش ناکۆکە لەگەل ڕوانگەی زەردەشت کە زۆر توند دژی سەربڕین و کوشتنی بوونەوەرانە.

سێیانەی «ئەهوورامەزدا ـ میترا ـ ئاناهیتا» کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا دەپەرسترا، وێدەچێ کە لە سەردەمی پارتەکانیشدا خەلک هۆگری بووبن و ڕەنگە دینی ڕەسمیش بووبێ. بۆ یەکەم جار لە ئێراندا و بێگومان وەکوو کەلەپوورێکی یۆنانی و مەقدوونی، یەکەمین پەرستگاکان لە بانووی ئەم ولاتەدا پێشکەشی یەزدانەکانی ئێرانی کران و جگە لە ئەهوورامەزدا هەموویان پەیکەریان بۆ داتاشرا و وێنەیان کێشرایەوە. پەرستگەی چوارپالووی پێشکەشکراوی ئاناهیتا و میترا کە ماوەیەک لەمەوبەر لە «بەردەنیشاندە»

دۆزراوەتەوە، لەگەڵ پەرستگایەکی بە دیمەن جیاوازی دیکە کە ئەویش هەر بۆ ئەم دووانە بوون و لە «مەسجیدسولەیمان»ە، بە شوێن ئەم مەبەستەدا بناغەیان داندراوە. هەردک پەرستگاکە لەسەر سەکۆ یان لە بەرهەیوانی پیرۆز ساز کراون کە پێشتر شوێنێکی دەورەگیراوی تایبەتی پەرستنی ئەهوورامەزدا بووە. ئاناهیتای سەردەمی پارت نێزەیەکی بە دەستەوە و وادیارە ئەم دابەی لە ئاتێنا خواستۆتەوە و وەک کەلەپوور وەریگرتووە. ئاناهیتا لێرەدا پیاڵەیەکیشی بە دەستەوەیە کە نیشانەی ئاوە و سەمبولی خۆیەتی.

لە پەرستگای «مەسجیدسولەیمان»، سێکوچکەی ئەم خودایانە، هێرکوولیشی خراوەتە سەر کە لە ڕووی پێویستی و نیازی شوێن و زەمانەوە لەسەر دیمەنی ڤێرسرێغنە، واتە یەزدانی سەرکەوتن و باڵادەستی خۆی دەنوێنێ. بەم شێوەیە چوار دیمەن لەسەر چوار قەڵافەتی زورڤان دادەڕێژرێ، کە وادیارە پەرستنی لە زۆر کۆنەوە باو بووە و لە سەردەمی بەرلە پێکهاتنی ئیمپراتۆریی هەخامەنشیدا وەبەرچاو هاتووە[1].

وەکوو دیارە لە سەردەمی پادشایەتیی ئەردەشێری دووهەمدا، ئاناهیتا زیاتری لا لێکراوەتەوە و لە ڕۆژگاری پارتەکانیشدا هەروا بووە و بە یەکەم

---

١ـ ئەگەرچی ئێمە لە ئێراندا هیچ دەقێکمان بە دەستەوە نییە کە ئەم مەبەستە بسەلمێنێ. بەڵام کۆمەڵێک بەڵگەنامەی نووسراو لە ئەرمەنستان دۆزراونەوە. چونکە مێژوونووسانی کۆنی ئەو وڵاتە، ناوی ئەو پەرستگایانەیان تۆمار کردوون کە هەرکام سێ جێقوربانییان بۆ ئەو سێ خودایە تێدا بووە. ئەگەر بەرەودوا بچینەوە و بگەینەوە سەردەمی هەخامەنشی، دەبێ قبووڵی بکەین کە ئەو دوو جێقوربانییەی لە بەردەم نەخشی ڕۆستەم و پاسارگادن. لەگەڵ ئەوەی کە کەوتۆتە نێزیک پەرستگەی قەڵاقووچەی چوارپاڵوو. لەگەڵ دووانەکەی دیکە کۆکراوەتەوە و سێیانەی پێکهێناوە. هەروەها ئەو سێ ئاگرەی کە لە پاڵ ئەو سێ جێقوربانییەی سەربانی پەرستگەی سەر سکەی پادشایانی پارسی بەرفەرمانی پارتەکان دیارە. سەمبولە بۆ ئەم سێ خودایە. [ ئەم برگەیە خودالێخۆشبوو موعین لە دەقەکەی زیاد کردبوو. خرایە پەراوێز.و.]

داندراوە. ئەردەشێری دووهەم لە تەواوی ئاوەندە گەورەکانی ئیمپراتۆریی خۆیدا، پەرستگەی تەواو تایبەتی بۆ ئەم خواوەندە ساز کردبوو. پادشای هەخامەنشی وای دنەی پەرستنی ئاناهیتا دا کە چەند سەدەیەک پاش برانەوەی دەسەڵاتیشیان، هەر پەرەی ئەستاند و لە رۆژگاری پارتەکاندا، تەواوی پەرستگاکانی ئێرانی کە لە سەرچاوەکانی دیرۆکیدا ناویان هاتووە، باربووی ئەم خودایە کراون. تیردادی یەکەم لە پەرستگایەکی ئاناهیتای شاری «ئەرسەک»دا تاجی لە سەرنا. لە هەگمەتانەی پایتەختی هاوینەی پادشایەتی پارت، پەرستگایەکی ئاناهیتا هەبوو کە ئانتیۆخووسی سێهەم تالآنی کرد. پەرستگای کەنگاوەر تایبەتی ئارتێمیس واتە ئاناهیتا بوو. ئەو دوو پەرستگایەی کە مێهردادی یەکەم لە ئالمائید تالآنی کردن بۆ «ئاتێنێ و ئارتێمیس» سازکرابوون. لە پەرستگای شووش خاتوونەخوای «نانایا» دەپەرسترا کە بە سامی دەبوو بە ئاناهیتا و لە یۆنانیدا بە ئاتێنێ و ئارتێمیس ناسراوە. لە «ئیستەخر» ئەژدادی خانەدانی ساسانی ئاورەوانی پەرستگەی ئاناهیتا (ناهید) بوون کە لەوێ ئاتوورئاناهیت دەئاییسا[1]. بە بۆچوونی دەستەیەک لە توێژەران، پەسن و پەرستنی ئاگر تایبەت و تێکەڵی دابودەستووری پەرستنی ئەم خاتوونەخوایە بووە. ئەردەشێری یەکەم[2] سەری براوی دوژمنانی بە دیواری ئەم پەرستگایەوە هەڵاوەسی و لە «ئەردەشێرخوررە»، کەوڵی گووراری ئەردەوانی پێنجەمی[3] بەزیوی کوژراوی بە دارەوە کرد.

---

١ـ واتە ئاگری ئاناهیتا

٢ ـ مەبەست ئەردەشێری پاپەکانی سەرزنجیرەی خانەدانی «ساسانی»یە.م.

٣ـ لە دەقی فەرانسەدا وادیارە بە هەڵە نووسراوە چوارەم و لە چەند جێیان چەندپاتە بۆتەوە، بەڵام پێنجەم دروستە و دوکتۆر موعین ڕاستی کردۆتەوە.و.

لە نێو خودایانی سێیانەی ئێرانیدا، ئاناهیتا لە دەرەوەی سنوورەکانی باڵی خۆرنشیــن بــە شێــوەیەکی دیـار تەنیبوویـەوە و پەرسـتنی وی لـە لیدیا بـە «بەلخییـە» ناوبـانگی ڕۆیـی. هـەروەها لـە پۆنـت (پۆنتـووس)، کاپادۆکییـە و ئەرمەنستاندا چاکی برەو پەیدا کرد و کەوتە بەر سەرنج و ڕەنگە پەلوپۆی لە پەرستنی میترا زیاتر پەرەی ئەستاندبێ. میتراپەرستی لە ڕێی چەتەکانی دەریایی کە پۆمپێئووس بە دیلی گرتبوون، گوێزرایەوە بۆ ڕۆم و لەگەڵ قۆشەنچییانی ڕۆمی هەتا ڕاین و دانووب تەشەنەی کرد.

شیز ناوەندی گەورەی دینیی مادی ئاترۆپاتکان[1] و گرینگترین پەرستگای باکووری ئێرانیش هەر باربووی ئاناهیتا کرابوو. لەم پەرستگایەدا کۆمەڵێکی لەمێژینی موغان دەژیان کە وێدەچێ هەتا ئەندازەیەک بڕوایان بە ماکەی بیروبۆچوونی تازەگەرییانەی دینی زەردەشت هێنابووبێ. ئەگەرچی زەمانی ئەم گۆڕانە دیاری ناکرێ، بەڵام دەبێ بزانین کە لەسەر داب و نەریتی کۆنباوی خۆیان دەڕۆیشتن کە زۆر بە قووڵی تێیڕاچووبوون. شوێنپێی ئەو داب و نەریتانە لە قسەکانی «تاسیتووس»دا دیارە کە پێشتر باسی لێوەکرا. یەکێک لە دابەکان دانانی مەیتی مردوو بوو لە دەرەوە کە هەڵبەت پارتەکان ڕەچاویان نەدەکرد، چونکە ئەوان لە نێسا یان لە چیا پووشەڵانەکانی سنووری ئەوبەری خەزەر، وەکوو پادشایانی هەخامەنشی لە گۆڕ و گۆڕخانەکانی میریدا دەنێژران. وەکوو ئاشکرایە دانانی تەرمی مردووان لە دەرەوە و نەنێژرانیان لە سەردەمی پارتیدا زۆر باو نەبووە، چونکە توێژینەوەکانی شوێنەوارناسی لە نیپوور، کاکزێ، دوورا- ئوورۆپۆس و گۆڕستانەکانی سەر بە سەردەمی پارتەکان دەریدەخەن کە ئەوان مردوویان بە کەلوپەل و پێداویستییەکانی نێژرانەوە لە نێو

---

١- ئەم شوێنە ئێستا بە تەختیسولەیمان ناودێرە.و.

تابووتی سواڵینەدا ناشتوون. ئەم چەشنە تابووتانە زۆربەیان ڕووکەشکراون و چەشنێک خاتوونەخوای ڕووتیان لەسەر شەقڵێندراوە و زانایان دەڵێن ئاناهیتایە. ئەم تێبینی و بۆچوونانە بەپێی لێکۆڵینەوەکانی تازەی ئێمە لە شووش و گۆڕستانێکی بەربڵاوی سەر بە سەردەمی پارتەکان، سەلمێندراوە. ئێمە گەلێک گۆڕمان دۆزیونەوە و هێندێکیان ڕەهەندێکی وەکوو چاڵیان تێدایە کە بەرەو جێ تەرمەکە دەچێ و ڕەنگە شێوازەکە سەبارەت بە سەردەمی دوای هەخامەنشی بێ. هێندێکی دیکەیان زۆر قووڵ بە سینەی خاکی مۆردا ڕۆچوون و ڕیزە پلیکانێک هەتا نێو ئەشکۆڵێکی بچووک دەڕوا کە چەند ژوور و چاوەی نێژرانی مردووانی تێدا کۆڵدراوە. هەمیشە تەرمی مردوویان بە ڕاکشانەوە خستوونە نێو تابووتی سواڵینەوە. جاری وایە ئەم تابووتانە لینجاودراونەوە و دەرخۆنەکانیان بە شێوەیەکی ناشیانە دیمەنی مرۆڤی سەرەتاییان لەسەر شەقڵ کراوە و بێگومان لاساکردنەوەی تابووتی مرۆڤی شێوەمەیموونە کە دەبێ وێنەیان لە دەسکاری سووریا یان فەلەستین هەڵگیرابێتەوە (و ٦٨ ـ ٦٩).

لە کۆتاییی سەدەی یەکەم یان سەرەتای سەدەی دووهەمی زایینیدا، ئاڵوگۆڕێکی هێندێک گرینگ لە شێوەی ناشتنی تەرمی مردووەکانی دانیشتووانی شووشدا بەدی هاتووە. گۆڕی تەنیایی و ئەشکۆڵی تایبەتی بنەماڵان وردەوردە کوێر بوونەوە و گۆڕستانی گشتی و هاوبەش هاتنە ئاراوە کە پلیکان و ژووری مردووان و میچەکەی بە خشتی چاک سوورەوەکراو ساز دەکران. تەرمی مردوویان لەسەر سەکۆیەکی بەرەوڕووی زارکی چوونە ژوورەوە دادەنا هەتا تەواو بڕزێ، پاشان یەسکوپرووسکیان کۆماکۆما لە شانی ڕاست و چەپی ئەو شوێنە دەهاویشتنە سەر دوو سەکۆی ناسەرەکی (و٧٠). بێگومان ئەم شێوازە تازەیەی ناشتن لەگەڵ شێوەی باکووری ئێران کە دەبوو تەرمی مردوو

نەنێژریٚ و لە چیا و چۆلان یان لەسەر بانی «قەڵاقووچەی بێدەنگی» دابندریٚ، خاوەنی خاڵی هاوبەشە، بەڵام بە بڕوای ئێمە شێوەی شووش بە قۆناخی نێوان ناشتن و نەناشتن دادەندریٚ. لێرەدا بەڕاستی ئەم پرسیارە دێتە پێش کە داخوا بە دەسپێکی حکوومەتی بەرەی ژنانی ئەشکانی لە پاش ئەردەوانی سێهەمەوە لە مادی ئاترۆپاتکان ئەم شێوازە نەبۆتە باو؟ تۆبڵێی ئەم دابە لە موغەکانی ناوەندی «شیز»ەوە دانەکەوتبیٚ و تەنەوەی نەکردبیٚ بۆ نێو تیرە و هۆزەکانی دانیشتووی باشووری ئێران؟ ئەریٚ بڵێی هەر لە سەرەتاوە چەشنێک تێکەڵاوی و پێکەوەسازانێک لە نێوان دوو شێوەکەدا بەدی نەهاتبیٚ؟

بەپێی توێژینەوە زانستییەکانی ئەمڕۆ، ئەو ئەفسانەیە هەڵدەوەشێتەوە کە دەڵیٚ ئەسکەندەری گەورە «ئەڤێستا»ی کتێبی پیرۆزی ئێرانییەکانی تێدا بردووە، کە بە ئاوی زێڕ لەسەر هەزاران کەوڵە ئاژەڵ نووسرابۆوە. هەروەها سەرنجێکی کەم دەداتە ئەو نەزیلەیەی کە پێی‌وایە ئەڤێستا بە فەرمانی بەلاشی یەکەم نووسراوەتەوە. بەردەنووسی گەورەی شاپووری یەکەم کە لەسەر دیوارەکانی ئاورگای نەخشی ڕۆستەم هەڵکەندراوە و تازە دۆزراوەتەوە، بە لای تاقمێک لە زانایانەوە دیسەلمێنیٚ کە ئەو دەقە پیرۆزەی وا بە ئەڤێستا ناودێر کراوە، لە زەمانی نووسران و هەڵکەندرانی ئەم بەردەنووسەدا کە دەبێتە نیوەی دووهەمی سەدەی سێهەمی زایینی، هێشتا لە ئارادا نەبووە. پسپۆڕانی گەورەی ئەم بوارە لایان وایە کە داهێنانی ئەلفوبێی ئەڤێستایی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووهەمی سەدەی چوارەم یان سەدەی شەشەمی زایینی[1].

---

١ـ لە ڕاستی‌دا ئەوانەی کە پێیان وایە ئەڤێستای نووسرا هەبووە، دەڵێن ئەم کتێبە بە خەتێکی دیکە نووسراوەتەوە کە زۆر وێدەچێ ئارامی بیٚ.م.

پارتـــەکانی ئەشـــکانی راســـت وەکـــوو کووشـــانییەکان، زنجیرەیـــەکی ریشـەداربوون و دەچوونـەوە سـەر تۆرەمـەی ئێرانییـانی رەوەنـدی ئاسـیای ناوەنـدی و بـە چـاوی رێـزەوە لـە دینـی خـەڵکی بێگانـەیان دەڕوانـی و بـە لەسەرەخۆیی لەگەڵیان دەجووڵانەوە. ئەوان پاش زاڵبوون بە سـەر هـەرێمی دووچۆماندا، بە تۆزێک هاوسەنگی و گۆڕانی ڕواڵەتییانەی دینەکانی خۆجێیی ڕازی بـوون. خودایـانی بێگانـەی ناوچـەکانی خۆرنشـین کـە وەک بەشـێک لـە ئیمپراتۆریی ئەشکانی دەهاتنە ژمار، بە لای ئەوانـەوە خێرخـواز و پشـتیوانیان بوون. وێناچێ کە پارتەکان دینی خۆیان لە نێو نەتەوە بەزیوەکاندا برەو پێدابێ. لە دوورا ـ ئوورۆپۆس کە ماوەیـەکی درێـژ بـە ناوەنـد و وێسـتگەی یەکـەمی ئیمپراتـۆریی پـارت دادەنـدرا، ئەگـەرچی کۆچـەرێکی زۆری ئێرانـی لـە جـەغزی حەسارەکانی ئەم شارە بازرگانییەدا دەژیان، بەڵام تەنانەت ئاورگایەکیش لە نێو ئەو گشتە پەرستگایەی شارەکەدا نەدۆزراوەتەوە.

ڕێـزی ئەشـکانییەکان بـۆ دینـەکانی دیکـە، بەتایبـەت لـە پەیوەنـدییان لەگـەڵ نەتەوەی جوولەکەدا دیـارە. جوولەکـە ئـەو پادشـا ئێرانییانـەیان بـە پـارێزەری ڕاستەقینەی دینـی خۆیـان دەزانـین و لەبـەرەوەی کـە سـلۆکی و ڕۆمـی تووشـی چەوسانەوەیان کردبوون، هاتنە سـەر ئـەو بڕوایـە کـە وڵاتـی ئێرانـی هەمیشـە خێرخوایـان، تـەنیا هێـز و دەسـەڵاتێکە کـە ڕەنگـە بتوانێ لـە ژێـر نیـری بێگانـە دەریانکێشێ و ڕزگاریان بکا؛ هەروەک چۆن لە سـەردەمی هەخامەنشـییەکاندا کارێکی ئاوا ڕووی دابوو. درەوشانەوەی شەنگەسوارانی ئازای پاکۆر (پاکۆرس) کە لە بەیتولموقەددەس سەرلەنوێ حکوومـەتێکی نەتـەوەیییان دامەزراندەوە، گـەشـە و نەشەی خستە دڵ و دەروونی جوولەکەکان. لە سـەردەمی پارتەکاندا جوولەکایەتی لە بابل چاکی پەرە ئەستاند. لە ساڵی ٢٠ی زایینیدا، حکوومەتێکـی

بچووک و ڕاستەقینه و دەسنێژی جووله‌کان له بەستێنەکانی ڕووباری فورات دامەزرا و بیست ساڵی خۆڕاگرت. بیروبۆچوونەکان و فەلسەفەکانی گەلی جووله‌که به خۆی و قوتابخانه پێشکەوتووکانییەوه، سەرتاسەری بابل و شاره یۆنانی‌نشینەکانی تەنییەوه و لەم پێکگەیشتن و نیزیکایەتییەدا، زۆر چاک توانی بخزێته نێو دینی ئێرانییەوه و شەقڵی خۆی باوێته سەری. له جەنگەی ڕاپەڕینی بەربڵاوی جووله‌کان له سەدەی دووهەمی زایینی‌دا که سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریی ڕۆمییەکانی هەژاند، پارتەکان دەوریان گێڕا و بوونه پاڵپشتیان. ئەمەگناسینی جووله‌کان بۆ ئەم پشتیوانییه له نووسراوەیەکدا وەبەرچاو دێ که تێیدا هاتووه: «هەر کاتێکی که دیتت ئەسپێکی ڕەسەنی ئێرانی لەسەر گۆڕێکی فەلەستین بەستراوەتەوه، بزانه که جەنگەی هاتنی مەسیحه.»[١]

**شارسازی، نژیاروانی، هونەر**

وادیاره پارتەکان شارسازی گەوره نەبوون و جێگای زۆرمان پێ شک نایەن که ئەوان بناغەیان دانابن. له دەرەوەی بانووی ئێران شاره سازکراوەکانی سەردەمی ئەشکانی بریتین له تیسفوون و هاترا له ناوچەی دووچۆمان و دارابگەرد له نێوخۆی ئێران. شاری «گۆڕ»ی[٢] باشووری شیراز، به دەستی ئەردەشێری سەرزنجیرەی خانەدانی ساسانی له جەنگەیەکدا سازکرا که ئەم میرەی بەرفەرمانی پارتەکان له پادشای خۆی هەڵگەڕابۆوه یان خەریکی ڕاپەڕین بوو، جا بۆیه ڕەنگه بکرێ سازکرانی شارەکه بدرێته پاڵ سەردەمی ساسانی. له ڕووی ڕووکار و گەلاڵەی ئەم شارانەوه بۆمان دەردەکەوێ که نەبوونی تەناهی له ڕۆژگاری پارتەکان‌دا باڵی به سەر وڵات کێشاوه و سەقامگیرنەبوونی

١ـ مەسیح: مەشیا
٢ـ فیرووزاباد

سیاسەتی دەرەوە و ئاژاوەی نێوخۆیی بە قەڵافەتیانەوە دیارە. گەڵاڵەی تێکڕاییی شارەکان بریتییە لە بازنەیەک و ئەوەی ڕاستی بێ وێنەی لە شێوازی شارسازیی کۆنی ئاسیای خۆرنشین هەڵگیراوەتەوە و لاساکردنەوەی گەڵاڵەی هۆردووگا کۆنەکانە، وەک چۆن لە نێو سپای ئاشووردا باو بوو. بێجگە لەمە، مێژووی سازکرانی ئەم شارە دەگمەنانە، وەباڵ بۆ ئەم شێوازە دەکێشن. وەکوو دیارە تیسفوون لە سەرەتادا هۆردووگای هێزەکانی پارتی بووە کە بەرەوڕووی سلۆکییەی لێواری ڕووباری دیجلە بناغەی داندراوە. «هاترا»ش قەڵایەکی سەخت و پتەو بوو لەسەر سنوورەکانی دوو ئیمپراتۆرییەکە و زۆر جاران هێزەکانی ئێرانی کە بەرەنگاری ڕۆمییەکان رادەوەستان، پشتیان بەم شوێنە دەبەست. هەروەها ئەردەشێر «گۆڕ»ی لە زەمانێکدا سازکرد کە بە شوێن ئامانجێکی ئازایانەدا دەڕۆیی و دەیهەویست تاج و تەختی دەسەڵات لە چنگ ئەردەوان دەرکێشێ. ئەردەشێر پێی وابوو ڕەنگە چەند شکستێکی بە سەر شانیدا بێ یان وێدەچێ وای دانابێ کە پێویستە لە شارێکی خاوەنی قەڵا و قایمەدا خۆی بپارێزێ. ئەردەشێر وێنەی بازنەییبوونی ئەم شارەی لە ڕووی «دارابگەرد» هەڵگرتۆتەوە کە ماوەیەک بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری حکوومەتی نێردرابوویە ئەو شوێنە. ڕەنگە دارابگەرد وەکوو لەشکرگایەک بە مەبەستی بەرگرتن لە کێشە و هەرای نێوان دەرەبەگان و عێڵ و عەشیرەتان سازکرابێ. بارودۆخی ئەوسای ئێران لە چەند بارێکەوە دەبێ وەکوو ئورووپای سەردەمی سەدەکانی نێوەڕاست بووبێ.

هەتا ئێستا لە بانووی ئێراندا هیچ شوێنەوارێکی کۆشک و خانووبەرەی پارتەکان نەدۆزراوەتەوە، بەڵام لە ڕووی ئەوانەی کە لە هەرێمەکانی خۆرنشینی وڵات بەجێماون. دەکرێ گەڵاڵەیەکی ڕاست و دروست بخەینە بەرچاوی خەیاڵ.



ق۸۰ـ ئاشوور: کۆشکی پارتی

ئەم نژیاروانییە وەکوو سەردەمی هەخامەنشی، بریتییە لە دوو گەڵاڵە: شێوازی دووچۆمانی یان عیلامی کە بریتییە لە بینایەک و حەوشەیەک، وەکوو لە دوورا- ئوورۆپۆس یان کۆشکی داریووش لە شووش وەبەرچاو دێ. بەپێچەوانە لە ئاشوور (ق۸۰)، هاترا و فیرووزاباد، شێوازی کۆنباوی ئێرانی بریتییە لە نژیارێکی کە بەرهەیوانی هەیە. ساسانی گەلێکیان پەرە بەم شێوازە دا و هەروەها هەتا سەردەمی ئێمەش لە نژیاروانیی نیشتمانیی ئێراندا درێژەی پێدراوە. ئەم گەڵاڵەیە لە رۆژگاری پارتەکاندا سێ ژووری تێدا ساز کرا کە سەرسەرای نێوەڕاست لەوانەی باڵەکانی بەرینتر بوو. کۆشکی تیسفوون بە هێندێک ئاڵوگۆڕەوە سەر بەم شێوازەیە. کەرەسەی سازکرانی ئەم شوێنانەش پێکەوە جیاوازن. زۆربەی دیوارەکان بە قوڕ و خیز و خڕکە بەرد هەڵچندراون و سواغ دراون و دیواری بەردی تاشراوی وەکوو «هاترا» کەمتر وەبەرچاو دێ. دیوارە بەردینەکان بە دیمەن و نەخش و نیگاران ڕازێندراونەوە و لە هاترا ئەم مەبەستە خۆی دەردەخا(ق۸۱).

ئەم کۆشک و تەلارانەی کە بە بەردی تاشراوی نەخشێندراو داندراون، سەر بە نژیاروانیی هەخامەنشین و لە ڕۆژگاری یەکەمین پادشایانی ساسانیش‌دا ئەم شێوازە درێژە درا. دیواری بەردین یان هەڵچندراو بە خشتی سوور، بە گەچبڕی یان وێنەی کێشراوەی سەر گەچ ڕازێندرابوونەوە. لە بابل و ئاشوور و چیای خواجەش کە خۆی دوڕگەیەکی نێو زرێباری هاموونی سیستانە، چەند نموونەیەکی ئەوتۆیان دۆزیوەتەوە. لەم شوێنە، گەچبڕی بریتییە لە خەت و کووزی بە خوارەکەوپێچەکە کە سواری سەری یەکتر بوون و وەک ددانەمشکە دابڕدابڕ کراون و بازنەبازنە بە دەوری یەکتردا لێهاڵاون. وێدەچێ کە وێنەگەریی دیواری لە سەردەمی پارتەکان‌دا زۆری پەرە ئەستاندبێ و بە بڕوای پسپۆڕان یەکدەستبوونی نەخش و نیگاری هەڵتاشراوی ئەم سەردەمە، ڕەنگە ڕەنگدانەوەی شوێن‌پەنجەی وێنەگەری بێ. ئەو چەند کوت و برگە نەخشینەی لاقەدی دیواران کە لە چیای خواجە دۆزراونەوە و دەیانبەنەوە سەر سەدەی یەکەمی زایینی، هەر تەنیا بۆ جوانی کاریان لەسەر کراوە و بە باری بابەت و ڕەنگاوڕەنگی‌دا چڕوپڕ و دەوڵەمەندن. لێرەدا کۆمەڵێک لاکێشە دێنە بەرچاو کە هێڵی کەوانی دەورەیان گرتوون. ئەم شێواز پێشتر لە وێنەگەریی دیواریی ئاشووردا باوی هەبوو کە گەڵای وەنەوشەیی و زەردی کەنگر لە نێویان‌دا ملی کێشابوو. کۆمەڵێک وێنە و دیمەن وەبەرچاو دێن کە بە شێوەیەکی ئازاد و سروشتی کێشراونەوە و بریتین لە «ئیرۆس»ی[1] سواری ئەسپی کوێت یان بەورەباریکە و کۆمەڵی چاوەشان و خواوەندان و شا و شاژن. لە ڕووی ئەمانەوە وادیارە کە هونەری یۆنانی هێشتاش لە وڵاتی ئێران‌دا باو بووە.

---

١ـ ناوی خودای ئەوینی یۆنانی.م.



ق٨١- هاترا: کۆشکی پارتی

هیچ یەکییەتی و وێکچوونێک لە نێوان پەرستگاکانی سەردەمی ئەشکانیدا بەدی ناکرێ. پەرستگاکانی «مەسجیدسولەیمان» کە خاوەنی هەیوان یان سەکۆیەکی پیرۆزن، بە پیرەوەچوونی گەلاڵەی کۆنی ناوچەی دووچۆمانن کە خاوەنی بێلا و بەرهەیوانی درێژووکە و بەرزی خودایان بوون. ئەم شوێنانە نیشاندەری برەوی نژیاروانیی یۆنانین لەو سەردەمەدا کە سەرتاسەری ئاسیای دوور، لە ئاشوورەوە بگرە هەتا «ئای‌خانم»ی بناری پامیر ناوبانگی دەنگی دابۆوە.



ق٨٢ ـ هاترا: گەڵاڵەی پەرستگا



ق٨٣ ـ تاکسیلا: گەڵاڵەی پەرستگای پارتی

شێوازێکی یەکجار جیاوازی دیکەی پەرستگایان وەبەرچاو دێ کە وادیارە دەبێ وێنەی لە نژیاروانیی هەخامەنشی هەڵگیرابێتەوە. گەڵاڵەی پەرستگاکە لەسەر شکڵێکی چوارپاڵوو دارێژراوە و بریتییە لە تالارێکی چوارگۆشە و چەند ژوور یان دالانی بە گەرانگەرێدا لێهالاوە و پێشتر لە شووش و

تەختیجەمشید و بەردەنیشاندە دیتوومانن. پەرستگای سوورەکوتەل و پەرستگاکانی هاترا (ق٨٢) لەگەڵ «تاکسیلا»ی لێواری خۆرهەڵاتی ڕووباری سێند (ق٨٣) دەبێ سەر بەم شێوازی کارە دابندرێن. پەرستگای بوودایییەکان ئاسیای ناوەندی وێنەیان لەو شێوە نژیاروانییە هەڵگرتۆتەوە[١].

بەبێ هێنانە گۆڕی دوو بۆچوون و گریمانە لە بواری هونەری پارتیدا، ناکرێ بکەوینە نێو ئەم باسەوە کە لە نیگای یەکەمدا ناتەبا دێنە بەرچاو. تاقمێک لایان وایە کە پێنج سەدەی پادشایەتیی پارتەکان، سەردەمی دابەزینی ئاستی هونەری بووە بە شێوەیەکی خەموڕووژێن و بەرهەمەکانی ئەو سەردەمە لە جەنگەی گەشەی خۆیاندا، نیشانەی گلۆربوونەوەیان بەرەو قۆناخی بێهێزی و بێپێزی تێدا وەبەرچاو دێ. هێندێکی دیکە بۆچوونی پێچەوانەیان هەیە و دەڵێن کاتێک هونەری پارتی لەناکاو توانی لە ژێر باری قورس و گرانی برشتی هونەری داسەپاوی یۆنانی دەرباز بێ. کەوتە سەر ڕەوڕەوەی نەتەوەیی و کۆمەڵێک دەسکەوتی بێگرێ و تەواوی وەدەست هێنا. لە ڕەوتێکی ئاوادا هونەرێکی بەهێزی تازەی ئێرانی بەدی هات کە شەقڵ و شوێنپەنجەی یۆنانیی پێوە دیار نەبوو. لەو ئاسەوارانەدا نەریتەکانی ئێرانی کە هەرگیز فەرامۆش نەکرابوون، سەرلەنوێ بووژانەوە و پرشنگی ترووسکەداریان هەتا دەرەوەی ئێران ـ بە واتای تایبەتی خۆی ـ ڕۆیی.

بەبێ تێکدانی کۆدەنگی دەکرێ سووری بکەینەوە کە دوو بۆچوونەکە هێندەش پێکەوە جیاواز و ناتەبا نین، چونکە هەرکام خاوەنی کەش و هەوا و ڕوانگەی تایبەتی خۆیانن: تێڕوانین یان بۆچوونی یەکەم کاری بە خودی بەرهەمەکە و

---

١ـ دوکتۆر موعین ئەم دوو برگەیەی دوایی کردبوو بە برگەیەک و هێندێکی دەرهاویشتبوو. لە ڕووی دەقی بێهفرووزی و دەقی سەرەکیی فەرانسەوە مەبەستەکەمان بۆ ڕوون بۆوە و بردمانەوە سەر دۆخی خۆی.و.

شێوەی سازکرانییەتی و ئەوی دووهەم بەرلە هەموو شتێک لەسەر شێوەی بیر و ڕوانگەی هونەرمەندەکە دەڕوا و بایەخی پێدەدا. ئەو قۆناخەی کە هونەری پارتەکانی پێدا تێدەپەڕێ و هونەری ئاوێتەی «یۆنانی ـ ئێرانی» دەگەیەنێتە ئێرانیی نوێ، جێگای داخ و کەسەرە، چونکە گەڕانەوە بەرەوپاشی بەڕوونی تێدا مەیوە. هونەری پارتەکان، هەموو بەرهەمێکی بەرەو بنەبانی کاڵی و نەکوڵیوی بردەوە و تەنانەت یەکەمین ئاسەوارەکانی سەردەمی ساسانی ئەم مۆرکەیان پێوە دیارە؛ بەڵام دیسانیش ئەگەرچی بە باری پەنجەنەخشینیدا کۆڵەوارە، کەچی ئاوا توانی کەلەپووری نەتەوەیی ببووژێنێتەوە و هەرچی مۆرکی بێگانەیە لێی داشۆرێ. ئەم کارە بە باری نەتەوایەتیدا قازانجی پێوە بوو، بەڵام لە ڕوانگەی هونەرییەوە داشکان و زەرەدی بەدی هێنا. لە ڕووی ئەو بڕە زانیارییەی ئێمە هەمانە، کارێکی دژوارە ئەگەر بێتوو بەوردی دیرۆک و تایبەتمەندییەکانی ئەم هونەرە دیاری بکرێ. ئەو گریمانەیەی کە پێیوایە ئاڵوگۆڕی بواری هونەری دەبێ سەدەی یەکەمی زایینی بێ، وێچوویە، بەڵام وادیارە کە ئەم ڕۆژگارە بەرباسە، نابێ حاشا لە کارە هونەرییەکانی نوێئێرانی بێ لە سەدەکانی ڕابردوودا. ئەوەی ڕاستی بێ مێژوویەکی ئاوا تازە نابێ جێی سەرسوڕمان بێ. «ڕەوتی ئاڵوگۆڕی بەرەبەرەی فەرهەنگی، زۆر جاران ماوەیەک پاش ئەو حکوومەتە کاتییانەی کە بوونە هەوێنی ڕسکانیان و لەم بارەدا قەرزدارباریانن، ڕوون دەبێتەوە.»

یەکێک لە تایبەتمەندییە دیارەکانی هونەری پارتی ڕێسای توندوتۆڵی داهێنانی هاودەقسازییە و لە شوێنەوارە ڕەسمییەکانی سەردەمی هەخامەنشیدا وەبەرچاو نایە، بەڵام سەرچاوەکەی لە هەموو شوێنێک بێجگە لە ئێران، گەڕانی بۆ کراوە. بەکورتی واوێدەچێ کە هاودەقسازی لەگەڵ هاتنی یەکەم لێشاوی

ئێرانییەکان بۆ بانووی ئێران دەستی پێکردووە و کۆنترین نموونەی دیمەنی مرۆڤ لە ڕووبەڕوورا، لەسەر ڕووکاری دەفری نەخشینی گۆڕستانی «ب»ی سیلکە خۆی دەنوێنێ و کەوایە سەر بە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش‌زایینە. ماوەیەک دواتر، هونەری لوڕستان نیشان‌درانی سەرتاپای قەڵافەتی مرۆڤ لە ڕووبەڕوورا پەرە پێدەدا. ئەو شێوازە لە کۆمەڵێک شوێنەواری نەزرینە و گەلێک دەسکردی نەخشینی بەخێروبێردا بەدی دەکرێ(و٢٨)، ئەگەرچی ئەم شێوازەی نیشاندانی مرۆڤ لە هونەری ڕەسمیی هەخامەنشیدا لایەکی وای لێنەکراوەتەوە، بەڵام هاودەق‌سازی لە هونەری ئێرانیدا هەبووە و بەردەتاشەکانی «یۆنانی ـ پارسی» وەباڵی بۆ دەکێشن. ساسانییەکان ئەم نەریتە کۆنباوەی هونەری ئێرانییان نەخستە پشتگوێ و توانی دزە بکاتە نێو دەسکاری هونەرمەندانی «سووری ـ دووچۆمانی» و لەوێوە پەڕی هەڵدا و شەقڵی هاویشتە سەر ئاسەوارە هونەرییەکانی بیزانسی.

گرینگترین شوێنەواری هونەری سەردەمی پارتەکان، بێگومان ئەو پەیکەرە زلە مەفرەقەیە کە لە «شەمی»، واتە ناوچەیەکی ئالمائیدی کۆن دۆزراوەتەوە (و٦٤). ئەو پەرستگایەی کە پەیکەرەکەی لێ دۆزراوەتەوە لە نیزیک «ماڵەمیر»ە. ماڵەمیر پێشتر ناوەندی گەورەی سەردەمی «نوێعیلامی» بووە و ئەگەر پایتەختی ئالمائیدیش نەبووبێ، لەبەروەی کەوتبووە سەر ئەو شاڕێ بازرگانییەی کە کەنداوی فارس بە ئیسفەهانەوە دەبەستێتەوە، بە یەکێک لە گرینگترین ناوەندەکانی جەماوەری داندراوە. هەر ئێستاکەش پاشماوەی ڕاخوشینی ئەم ڕێگایە بۆ جەرگەی بانووی ئێران وەبەرچاو دێ کە بەشێکی سەنگچن کراوە و چەند جێگایەکیشی دڵی بەردەڵانی بۆ دادڕاوە.

هەر لەو پەرستگایەدا پەیکەرەیەکی بچووکی سەرپەڕیوی مەفرەقی (و٦٦)، لەگەڵ سەروملی پادشایەکی تاج بە سەری بەردی مەڕمەڕ (و٦٧)؛ هەروەها دوو کوتی سەری پەیکەرەیەکی مەفرەق و لەسەر شێوازی یۆنانی دۆزراوەتەوە کە پێشتر باسمان کرد (و٧١). ئەو کۆمەڵە شتە دۆزراوانەی نێو پەرستگاکە کە زۆربەیان پەیکەرەی بەرد و مەفرەقن، دەریدەخەن کە ئەو چەشنانە برەویان بووە. ئەگەر بێتوو ئێمەش وەکوو هێندێکان پێمان وابێ کە سەری پەیکەرە مەفرەقییەکەی بە دابی یۆنانی سازکراوە، پەیکەرەی ئانیتۆخووسی چوارەمە، دەکرێ لە خۆمان بپرسین داخوا پەرستگای شەمی یەکێک لەو دوو پەرستگایانە نییە کە مێهردادی دووهەم دوای بەزاندنی دێمیتریووسی دووهەم (١٣٩ی پ.ز)، لە جەنگەی گرتنەوەی ئالمائیدا، تاڵانی کرد؟ ئەگەر بێتوو گریمانەی ئێمە ڕاست بێ، ئەو دەسکردە هونەرییانەی کە لە شەمی دۆزراونەوە، نابێ مێژوویان بگەڕێتەوە بۆ پاش سەدەی دووهەمی پێش‌زایین. دەکرێ سەروملی ئەو پەیکەرە بەردینەی شاژنێک (و٧٣) کە لە شووش دۆزراوەتەوە، بدرێتە پاڵ هونەری یۆنانی ـ ئێرانی. وای بۆ دەچن کە پەیکەرەکە «مۆوزا»ی ژنی فەرهادی چوارەم بێ. ئەگەر ئەم نوقڵانەیە ڕاست بێ، پەیکەرەکە سەبارەتە بە بنەبانی سەدەی یەکەمی پێش‌زایین. دەستەیەک لە پسپۆڕان پێیان خۆشە ئەو سەرە گەورەی ڕاگوێزراوەتە مووزەی تاران و لەوێ پارێزراوە و لە هەگمەتانەی هاوینەهەواری پادشایانی پارت دۆزراوەتەوە (و٧٥)، بدەنە پاڵ سەدەی دواتر. ئەم پەیکەرە کە هێشتاش نەسواوە و بیچمی خۆی پاراستووە و لە بەردەقسڵێکی نەرم داتاشراوە، چاوی گەوهەربەند بوون، بەڵام بەگشتی دەسکردێکی بێگیانە. سەرەنجام سەری پیاوێکی ڕیشن کە ئەویش هەر لە بەردەقسڵ داتاشراوە و لە شووش دۆزراوەتەوە (و٧٤)، دەکەوێتە نێو ئەو برگە زەمانییەی هونەری

پارتەکان و ئەو کۆمەڵە شوێنەوارەی پێ تەواو دەبێ. لەم پەیکەرەدا، پەیکەرتاش مەیلی بە لای داهێنانی لارووومەتی تەخت و درێژووکەدایە و ئەو خەت و کووزانەی پێیدا هاتوون، دەبینەوە نیزیک ئەو شێوازەی کە نیشانەی نەخش و نیگارە داتاشراوەکانی نوێئێرانیی پێوە دیارە .

لە نەخش و نیگارە داتاشراوەکانی نوێئێرانیدا ، زۆرکەم شوێنپەنجەی هونەری ڕۆژئاوا وەبەرچاو دێ. ئەوەندەی کە ئێمە سەبارەت بە بەردەتاشەکانی پارتی دەیزانین، بۆمان دەرکەوتووە کە بەبێ هیچ گۆڕانێکی هەست پێکراو، وێنەیان لە دیمەنی سەردەرانە و لادەرانەکانی پەرستگایەکی بەرەوەی سەکۆی تەختیجەمشید هەڵگیراوەتەوە کە لە سەرەتای سەدەی سێهەمی پێشزایینیدا، سازکراوە (و ٦٠ـ ٦١). کۆنترین بەردەتاشی پارتی کە هەتا ئێستا ناسراوەتەوە، سەبارەتە بە مێهردادی یەکەم و مێهردادی دووهەم و لە بێستوون داتاشراوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یەکەمی پێشزایین (و٨٠). ئەم شوێنەوارە ڕەق و ویشک و ناوەستایانە و ساوایە و لە هونەری نوێئێرانیدا سەردەقێکی خاوە. لە پەنا ئەم بەردەتاشە، گۆدەرزی دووهەم بە بۆنەی سەرکەوتنی بە سەر مێهردادی خەنیمیدا، دەوروبەری ساڵی ٥٠ی زایینی یادگارێکی هەڵکەندووە. لەو بەردەتاشەدا هێشتاش هەوێنی یۆنانی ڕەنگی داوەتەوە و بریتییە لە فریشتەی باڵداری سەرکەوتن کە تاجی دەسەڵات دەخاتە سەر سەری پادشا. ئەم دیمەنە ئەگەرچی ڕەقوتەق و چەقبەستوویە، بەڵام جووڵانەوە و هەستی تێدا بەدی دەکرێ.

بەردەتاشەکانی «تەنگی سەرۆک»ی نیزیکی «بێهبەهان»، سەرجەم دەبنە ئاوێنەی باڵانوێنی ئەم شێوازە هونەرییە و ئەگەرچی دەسکارێکی نزمە، بەڵام مەیلی بەرەو بەرزییە. ئەو دیمەنەی کە پادشا سەرقاڵی قوربانی کردنە و

ئاپۆرایەک کەوتوونە دواوەی و هەموویان قەڵافەتیان لە بەرەوڕووڕا داتاشراوە ئەم مەیلەی تێدایە و هەروەها سوارەی قورسەچەکی نێزەداریش هەر لەم جەغزەدایە (و٧٩،٨٢). ڕاست هەر ئەم دیمەنە هاودەقانە و هەر ئەم بێگیانی و هەر ئەم شێوە وردەکارییە، لە ڕێگای داتاشینی چەند خەت و کووزێکەوە لە بەردەتاشێکی دیکەی جودا لە بێستوون و هاوشێوەی ئەودا وەبەرچاو دێ کە میرێک (؟) لە حاند ئاگردانێک سەرقاڵی دانی نەزرینەیە (و٧٧). زنجیرەی ئەم بەردەتاشە گەورانە دەگاتەوە بەردەتاشێک کە ماوەیەک پێشتر لە شووش دۆزیمانەوە. لەم بەردەتاشەدا ئەردەوانی پێنجەمی ئاخرین پادشای ئەشکانی وەبەرچاو دێ کە ئاڵقە یا سووکەڵە تاجێکی فەرمانڕەوایەتی کە هێمای دەسەڵاتە، باربووی میرهەرێمی شووش دەکا. ئەم بەردەتاشە ئەوەی کە شێلە و هەوێن و پێکهاتەی هونەری پارتەکانە لە داتاشینی بەردەتاشان، بە شێوەیەکی ڕوون دەخاتە بەرچاو و ڕەنگە بکرێ بە دوایین شوێنەواری هونەریی سەردەمی پارتەکان دابندرێ (و٧٨).

لێرەدا دەبێ پەیکەرەیەکی بچووک و دیار و هەرە چاکی پادشا بەتایبەتی بخرێتە بەرباس (و٧٦). ئەم پەیکەرەیە لە بەردێکی ڕەق و سەوزەڕەنگ داتاشراوە و لە ڕووی قەبارەیڕا، دەبێ بەردێکی گرانبایی بێ کە ملوانکە یان تاجی پێڕازاوەتەوە و ٣٢ میلیمیتر بەرزە. لەم پەیکەرەدا دیمەنی پادشا لە ڕووبەڕووڕا داتاشراوە و کڵاوی دابی ئەشکانییەکانی لە سەرە و هەردک گوێی گرتووە و گەیوەتە سەر شانی. ئەم کڵاوە کە ڕیزێک بەردی چوارگۆشی گرانبایی تێگیراوە و لە حاند نێوچاوانی دەدرەوشن، سووکەڵە تاجێک کە دوو لیسپە یاڵی ئەسپی تێکتەندراو پێیدا شۆڕبوونەوە سەر شان و کلکەیان ئەستوورترە، وێکهاتووە. کونەکەپۆی گەورە و قەفی سمێڵ و ڕیشی درێژ و

تەشویٚتاشی، وەکوو دیمەنێکی ڕاستەقینەی بێگرێ دەیخاتە بەرچاوان و هەر ئەم شێوازە و مەتینی و مەندیی ڕوخسارە، دەرگامان بۆ دەخاتە سەرپشت هەتا ئەم شاکارە بچووکە بخەینە نێو هەزاران شوێنەواری هونەریی پارتی. پەیکەرەکە لەسەر پەڕەیەکی نیوەبازنەیی هەڵتاشراوە و لای بەرەوەی بە زمانی پەهلەویی ئەشکانی لە سەری نووسراوە: «وەلاش (بەلاش)ی ئەشکانی، شای شاهان». لەبەروەی ئەم شوێنەوارە وەکوو ڕوخساری شەقڵکراوی سەر سکان دەچێ، وێدەچێ هی وەلاشی سێهەم بێ. هەروەها چەشنێک وێکچوون و نیزیکایەتی کەوتۆتە نێوان ئەم شوێنەوارە و پەیکەرە نیوەبەژنەکانی پالمیری.

تەواوی ئەو بەردەتاش و ئاسەوارە هونەرییانەی کە ئێمە باسمان کردن، بە باری کەمدەسەڵاتیی هونەری و لاوازبوونی بابەتەوە، بەتەواوی ئێرانی و سەر بە سەردەمی پارتن. بەرێوەچوونی دابودەستووری دینی بەرەورووی ئاورگایەک، بەخشرانی پلە و پایەی دەسەڵات، شەڕ و تێکهەڵچوونی سواران و دیمەنی ڕاو، هەموویان ئەو بابەتانەن کە هونەری ئێرانی لەو ڕۆژگارەدا بایەخی پێداون و پرشنگی ئەم شێوازە هەتا دوورەدەستان و دەرەوەی سنوورەکانی ئێران ڕۆیشتووە. ئەم ڕەوتە توانی کە باڵی خۆرنشینی ئێرانیش بتەنێتەوە و هەتا لای هەرە بەرەوەی سنووری دەسەڵاتی بڕوا و بەتایبەت بگاتە «دوورا» و باشووری ڕووسیا کە لەوێ چەند دیمەنێکی ئەوتۆ لەسەر دیواری گۆڕخانەی میرانی «سەرمەت» وەبەرچاو دێن. جەماوەری دەوارنشینی ناوچەکانی پووشەڵان و گیاجاڕانی ئووراسی شوێنیان هەڵگرتووە و هەتا نیزیک وڵاتی «چین»یان بردەوە، چونکە کۆشک و تەلاری خانەدانی «هان» بەم هونەرەی ئێرانی دەستاودراوەتەوە و دەردەکەوێ کە هونەری چینی شوێنپەنجەی ئەم شێوازەی پێوە دیارە .



ق٨٤- شووش: کۆمەڵێک دەفری سواڵینەی سەر بە سەردەمی پارتەکان

هونەری پارتی لە لایەکەوە بوو بە جێی سەرڕۆ وەرگرتنی خەڵکانی دیکە و لە لایەکی ترەوە وێنەی لەوان هەڵگرتەوە. بۆ وێنە لە بواری گەواهێرسازیی ڕەنگاوڕەنگ و بە زریقەوبریقەدا کەوتە شوێن دەسکاری دەوارنشینانی کووشان و سەرمەت. هەر ئەم زێڕ و زەمبەر و گەواهێراتە دواتر گۆتەکان و ژێرمەنەکان خۆیان پێ ڕازاندەوە و شێوازەکە هەتا لێوارەکانی مەزنەدەریای ئەتڵەس ڕۆیی و لەوێ مێرۆڤنژینەکان خواستیانەوە و ڕەچاویان کرد.

هەروەها هەر لەو ناوچە ڕووتەن و بێداروبارانەوە کە تەنیا پووش‌وپارن، شێوازی نەخشاندن و شەقڵاندنی بوونەوەران گەیشتە ئێران. لەو دیمەنانەدا ئاژەڵەکان گورج‌وگۆڵ بەبازوبرد و سەرزیندوون و لێرەدا دەکرێ ئاماژە بکەینە ئاگردانێکی مزقەڵایی (و٨٣) کە قەڵافەتی ئاژەڵێک بۆی کراوەتە دەسک و یەکجار جوان و وردەکارانە ساز کراوە و تیژکەڵە و بەگوردە و وەکوو پەیکەرەی ئەو ئاژەڵە کێوییە دەچێ کە لە خەزنەخانەی سەرمەتەکانی «نۆڤۆرۆسییسک»ە.

ئێستا پێویستە بچینە سەر باسی گۆزەکەران و پەیکەرسازانی ئەو سەردەمە کە دەورێکی بەرچاویان لە ژیانی ڕۆژانەدا گێڕاوە. هەروەکوو ئەمڕۆ کە پۆلێک چەرچی و دەسفرۆش لە نیزیک گۆڕستانان کەوڵ و کۆڵیان پان ڕادەخەن و کەل‌وپەلی پێویستی چوونە سەر گۆڕان بۆ فرۆشتن ڕادەنێن، لە سەردەمی پارتەکانیش‌دا، لە دەوروبەری گۆڕخانان و دەرەوەی شوورەی شاران، کارگەی گۆزەکەران و وەستاکاران هەبوون کە پەیکەرەی سواڵینەیان دەسازاندن. ئێمە چەند جێگایەکی ئەوتۆمان لە شووش بەدی کردووون. ئەم هونەرمەندانە تابووتیان بۆ گەوران و کووپەی تێدا نێژرانیان بۆ بچووکان ساز دەکرد. هەروەها کیتەڵە و گۆزەڵە و پیاڵەی شین و بۆری لینجاودراویان بۆ ژیانی بنەماڵان دەسازاندن یان کووزووی متفەڕکی ئاوخواردنەوەی تایبەتی نێو گۆڕانیان بەرهەم دێنان (ق٨٤).

هەر ئەو کارگایانەی باسمان کردن، پەیکەری خاتوونەخوای ڕووتیان ساز دەکردن کە جاری وابوو لە یەسقانیش دایاندەتاشین (و٨٤). هەروەها پەیکەری سووکەڵەسواران، کە ڕەنگە سەمبولی خواوەندانی پاراستن بووبن بە کۆمەڵ لە گۆڕستانان‌دا دەدۆزرێنەوە و دیارە لەو کارگایانەوە هاتوونەدەر. وەک ئاشکرایە پێشتر باسی ئەوەندە قازانجەمان کرد کە پەیکەری سواڵینەی ئەم سووکەڵەسوارانە دەیانخستنە دواوە و لە سەرتاسەری هەرێمی بەردەسەڵاتی سەرکەوتووانی ئێرانی‌دا دۆزراونەوە و بریتین لە میسری هەخامەنشی هەتا قەڵەمڕەوی حکوومەتی پادشاهانی کووشان (و٨١). لە کۆتایی‌دا باسی پەیکەری سواڵینەی خاتوونەخوایەکی ڕووت دەکەین کە لە کارگەیەکی سواڵینەگەریی شووش‌دا دۆزراوەتەوە و مەمکێکی هەڵدەکوشێ و شیرەکەی دادەدۆشێتە پیاڵەیەکی کە بە دەستی چەپی گرتوویەتی. ئەم شوێنەوارە، شەقڵ و

شوێنپەنجەی هونەری خۆرنشینی پێوە دیارە ، ئەگەرچی ماکە و بنەمای تێڕوانینەکە خۆرهەڵاتییە. ئەگەرچی ڕوونیش نەبۆتەوە، بەڵام دەکرێ وای دابنێین کە پەیکەرەکە سەمبولی خاتوونەخوای ئاناهیتایە و لەسەر قەڵافەت و دیمەنی خاتوونەخوایەکی یۆنانی خۆی دەنوێنێ (و٨٥).

## بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی

میراتی بەجێماوی ئەسکەندەری گەورە کە لە نێوان سێ پادشایەتیی مەقدوونیدا دابەش کرا، لە باڵی خۆرنشینەوە کەوتە بەر پەلاماری ڕۆم و لە باڵی خۆرهەڵاتەوە پارتەکان هێرشیان کردە سەری و پاش ماوەیەکی درێژخایەن کە بە گیانەڵڵاوە بوو، پشووی لێبڕا. نەمانی دەسەڵاتی مەقدوونی لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی‌دا، هەرا و ئاژاوەیەکی توندوتیژی نایەوە و واوێدەچێ کە ئاسیای زیاتر گرتبێتەوە. سەرهەڵدان و شێواوی دنیای کۆنی لەرزاند و هەروەک چۆن لە جەغزی ناوچەی دەریای مەدیتەرانەدا ڕەنگی دایەوە، هەر ئاواش ئێران و تەنانەت باشووری ڕووسیاشی گرتەوە. قەیرانی ئابووری باڵی بە سەر هەموو شوێنێک کێشابوو. بەرهەم و بەروبوو دابەزی و تەشەنەی چەتەگەریی سەر ڕێگاوبان و نێو دەریا و ڕووباران، گرێوگۆڵێکی ئەستەمی خستە بەرپێی کاروباری بازرگانی و ڕاگوێزرانی کاڵا و کەلوپەلانەوە. ئەوەی ڕاستی بێ ئەم سەردەمە بە باری هەڵگیرسانی شەڕ و تەنینەوەی تاڵان و ڕێگری‌دا، لەگەڵ تاریکترین سەردەمانی پێشوو بەراورد ناکرێ. ڕووت کردنی کاروانان و بەتایبەت چەتەگەریی دەریایی وای تەنیبۆوە کە ڕۆم هیچ چارەی نەما بێجگە لەوەی خاشەی دوایین قوڵەپادشایانی سلۆکی ببڕێ کە وەکوو بووکەڵەی یاری دەوریان دەگێڕا. ڕۆم پۆمپێئووسی ناردە سەر سووریا و گرتی و ئاوا پەناگای ئاژاوەگێڕانی ناوچەی دەریای مەدیتەرانەی خاپوور کرد و ویشکاوی بەم گەناوە

هێنا (٦٤ی پ.ز). داڕزانی ڕەوشتی دەسەڵاتداران لە پێناو دەوڵەمەندیدا بە شێوەیەکی پەرەگر لە نێو چینی ڕۆمیدا ڕەنگی دابۆوە. ئەم هەڵپەهەڵپە دەبوو بە ملۆزمێکی ڕاستەقینە بۆ کۆمەڵ و جاری وایە کۆماری ڕۆمی تووشی گێرە و کێشەی نێونەتەوەیی دەکرد و کراسسووس بە یەکێک لە سەمبولەکانی ئەم چینە چاونەزێرە دادەندرێ؛ بەڵام لە سەدەی یەکەمی پێش‌زایینەوە تامەزرۆ بوون بۆ بەدی هێنانی ئاشتی ڕۆژبەڕۆژ پتر پەرەی ئەستاند و ئەم بیر و ڕوانینە لە هەرێمەکانی ڕۆم و بەتایبەت لە ئێرانەوە تەنیبوویەوە و تەواوی گەلان و نەتەوەکانی جیهان بەدڵ خوازیاری بوون. ئووگوست لە ڕۆژگارێکدا هەوساری دەسەڵاتی کەوتە دەستی کە بیروڕای ئاشتیخوازانە خزابوویە نێو گیانی ڕۆمەوە.

یەکەمین هەنگاوەکانی ئیمپراتۆری ڕۆم بە مەبەستی بەدی هێنانی هاوسەنگیی جیهانی و سەقامگیرکردنی بارودۆخی گشتی و ڕێگرتن لە هەڵکشان و داکشانی نرخی کەل‌وپەل و بەرهەم، بە شێوەیەکی بەربڵاو ڕەنگی دایەوە و ئاکامی گەیشتە هەرێمێکی دوورەدەستی وەکوو ئێران و هەستی پێکرا؛ بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ڕەوتی نوێ نەیدەتوانی ڕزگاریدەری بنەماکانی کولتووری کۆن بێ و دنیای کۆن و هێلێنسیم تێکڕووخان. دنیا وردەوردە کەوتە سەر ڕەوت و ڕێبازێک کە توانی قەوارە و پێکهاتەی خۆی لەسەر بنەمایەکی نوێی کۆمەڵایەتی و ئابووری دابڕێژێتەوە.

بەرلە ئێستا، واتە لە سەدەی دووهەمی پێش‌زایینەوە، ئیتالیا ببوو بە هۆکارێکی گرینگی ئابووری لە جەغزی ناوچەی دەریای مەدیتەرانەدا و چونکە وڵاتێکی خۆبژیو نەبوو، بەرهەم و کەل‌وپەلی پێویستی لە ناوچە و هەرێمە پەرەگرتووەکانی یۆنانییەوە دەکڕی و هاوکات لەگەڵ ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی و ئابووریی نێوخۆی، هەمیشە پتر خوازیاری کڕینی بەرهەمی دەرەوە بوو.

سەرکەوتنی ڕژمییەکان توانی لێشاوی ئەو سامانەی دنیای کۆن کە بەرەو ڕۆم دەخوشی، بە لای خۆی‌دا گل بداتەوە و بوو بە جەرگەی ئەو ڕایەڵە بەربڵاوەی وڵاتان کە لە سەری «غالیا»وە هەتا ئاسیای ناوەندی و هیند و چین دەڕۆیی. بەرهەم و کاڵای بەزریقەوبریقەی ئەم وڵاتانە کە بریتی بوون لە هاوریشم، هەزویڵە، عاج، بەردی یەکجار گرانبایی و عەتر، بێپسانەوە گەشەی بە کاروباری بازرگانی دەدا و ڕۆمیش لەو سەرەوە کەلوپەلی مەفرەقی، بلووریات، دەسکردی هونەری، شەراب، ڕۆن و بەتایبەت زێڕی بۆ دەناردن. لە بواری بازرگانیی جیهانی‌دا، ئێران بێنێوبڕ وەکوو پردی پەیوەندی دەوری دەگێڕا، چونکە کاروانێکی زۆر پێیدا ڕادەبردن. ئەم ئەرکە یەکجار گرینگ بوو، هەر بۆیە لە خاکی ئێران‌دا چەند بنکە و ناوەندێک بۆ پسپۆڕانی بواری گەیاندن و گواستنەوەی کاڵای بازرگانی لە دەریا و ویشکانی‌دا دامەزرێندران و دەڵاڵانی بازاڕ و ڕێزان و سەرکاروانانیش خۆیان تێوەردا. ناردنی کۆمەڵێک باڵوێز لە چینەوە بۆ بارگای پادشایانی ئەشکانی، کارێکی وای کرد کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان هەردک ئیمپراتۆری‌دا بەدی بێ و هاتوچۆی ڕێگاوبانان باشتر ڕێکبخرێ و گۆڕینەوەی کاڵای نێوان دوو وڵاتەکە بکەوێتە سەر سکەی خۆی. بەرلە سەدەی یەکەمی زایینی کەلوپەلی بازرگانی پاش تێپەڕبوون بە خاکی ئێران‌دا، دەگەیشتنە قەڵەمڕەوی پادشایەتیی کووشان، کە بەشێکیان لە ڕێی پامیر و تورکستانی چینەوە هەتاکوو سنوورەکانی چین ڕادەگوێزران و بەشەکانی دیکەی بە ڕێ و ڕەوگەکانی هیندوکوش و بە درێژەی دەرەی کابول‌دا، دەنێردرانە هیند. هەرگیز حکوومەتەکانی خۆرهەڵات و خۆرنشین ئاوا پێکەوە نەکەوتبوونە نێو ڕایەڵەی پەیوەندی و هەتا بەرلە سەردەمی ئووگوست

هەرگیز شەپۆلی کاڵا و کەلوپەلی بازرگانی لە هەردک سەرەوە ئاوا چاکیان خۆ نەگرتبوو.

بە باری ئابووریدا، ئێران و بابل و سووریا و فەلەستین لە سەردەمی هەخامەنشییەکانەوە پێکەوە بەسترابوونەوە و ئەگەرچی گەلاڵەی خونکاران بە مەبەستی لێکدرانی ئێران و دووچۆمان لەگەڵ ڕۆم سەری نەگرت، بەڵام ئەم پەیوەندییە ئابوورییە هەرگیز دانەبڕا و پەرەشی ئەستاند. ئێران خۆی کانزای دەناردە دەرەوە و ئەو سەردەمە شمشێری چین و هیند لە بازارەکانی دنیادا بەناوبانگ بووە و هێندێک کەس لایان وایە شمشێری دەمیشقی کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا ناوی چاک تەقیوەتەوە، لە ڕاستیدا هیندی یان ڕەنگە چینی بووبێ. پلووتارک چەکوچۆڵی سپای سوارەی پارتەکان بە «مەروی» ناودێر دەکا، ئەگەرچی ئەم شارە تەنیا ناوەندێکی گرینگی بازرگانی بوو بۆ شمشێرەکانی چینی. کاڵا و کەلوپەلە بازرگانییەکانی دیکە بریتی بوون لە: پێستە (کەوڵی ئاژەڵان)، قوماش، دەسکردی دارین، ئاژەڵ، پەلەوەری خۆماڵی، برینج، زەعفەران، دەرمان، بەردی گرانبایی، قیل و ڕۆنی کانگایی. ئەم کاڵایانەش هاوردەی ئێران دەکران: پاپیرووس، دەسکردی مەفرەقی، بلووریات (شووشە)، هەوری سواڵینە، ڕەنگی ئەرخەوانی و هەموو شتێکی کانزایی. کاروباری بازرگانیی نێوخۆ وێڕای پەرەگرتنی بنکە و دامودەزگای بازرگانیی گەورە و بچووک، کە کاڵاکانیان هەرکام لە ڕاستەبازاڕێک دەفرۆشرا، پەرەی ئەستاند. یەکێک لەو کارانەی کە وێدەچێ بە سەر ڕۆژگاری کەساسی و بێڕەمێنیدا کەوتبێ، کاری بانکداری بوو.

بواری گەیاندن و گواستنەوە پێشکەوتێکی بە خۆوە بینی. هەرگیز وەک زەمانی پارتەکان ڕێگاوبان چاکی پیڕانەدەگەیشتن، چونکە پادشایانی پارت زۆر

بەوردی چاوەدێر و پارێزگاری ڕەوگەی هاتوچۆ بوون و ئەو باج و ڕێدارانەی کە وەریاندەگرت، بەشێک لە داهاتەکانی حکوومەتی پێکدێنا. ئەو ڕەوگانەی کە بە چۆلگاندا تێدەپەڕین، لە جێجێیان کاروانسەرا و چالاویان لێ دابین کرابوو. لە چەند شارێکی بازرگانیی وەکوو پالمیر، دوورا و پێترا کۆمەڵێک خان و کاروانسەرایان ساز کردبوون کە بازرگانان لێیان میوان دەبوون. بەپێی ئەو بەڵگەنامانەی کە لە «دوورا» دۆزراونەوە، وادیارە هێزی سوارەی چۆلەوانان هەبووە. خەڵکی سەردەمەکە خێوی پارێزەری کاروانیان بە وشترسوار و ئەسپسوار دێنانە بەر خەیاڵی خۆیان. پارتەکان پاسەوان و پارێزەری بنکە و جێوچانی کاروانان بوون کە ئەسپی حەساوەیان بۆ هاتوچۆی خێرا، تێدا ڕادەگیرا. هەبوونی ئەم شوێنانە بوو کە هەلی ئەوەی بۆ وەردان [ڤەردان = بەردان] ڕەخساند کە لە ماوەی دوو ڕۆژاندا بە مەبەستی لێخستنی گۆدەرزی دووهەمی برای ٣٥٠ مایل ببڕێ. هەر لەم سەردەمەدا بوو کە ناڵ یا کەوشەکی ئەسپ داهێندرا، بەڵام ڕوون نەبۆتەوە کە سەرچاوەکەی خۆرهەڵاتە یان خۆرنشین.

کار و پیشەی سنعاتکاران وا چاکی پەرە گرتبوو کە ئاکامی زۆر باشی لێکەوتەوە و بەرهەمەکان بەرەو چۆنیەتی و وردەکاریی زیاتر پەلیان هاویشت و تەنینی کووتاڵ، هەڵاڵدانی چەرم، هەورگەری، چەکسازی و بلوورسازی پەرەیان ئەستاند. کارێکی بێجێ نییە ئەگەر بیخەینەوە یاد کە ئەم ڕەوتە توانی دەسکردی ڕۆم و ئێران بە جووتە بگرێتەوە و ئاوا تەواو ڕوون دەبێتەوە کە پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان ئەم دوو ناوەندە گرینگەی بەرهەمهێناندا بووە.

ئاڵوگۆڕێکی قووڵ لە بواری کشتوکاڵدا بەدی هات. لە ڕۆم کەسانی دەوڵەمەند و بوێر، زەویوزاری سەر بە حکوومەتیان بە نرخێکی هەرزان

دەکڕی و دەیانکردن بە ملکوماشی بەربڵاوی کشتوکاڵی. وەکوو ئاشکرایە لە ئێراندا بەرەبەرە مووچە و مەزرای بچووک دەخرێنەوە سەر یەکتر و دەکەونە ژێر دەسەڵاتی دەرەبەگانی گەورەوە. ئەوەی ڕاستی بێ وەرزێران و قوڵەئاغایان جڵەویان بە دەست خۆیانەوە نامێنێ و هەر دێ و پتر دەکەونە ژێر تەوژمی دەرەبەگانەوە. ئەگەرچی بەپێی یاسا ئازاد بوون، بەڵام ئەویش تۆڕ و داوی لە دەورەی تەندرابوو. ڕەنگە چاندن و کێڵانی ئەو زەوی‌وزارانە بۆیە بە قازانج بووبێ، چونکە دەرەبەگانی دەوڵەمەند هەم دەیانتوانی ڕێ‌وشوێنی کۆنباوی کشتوکاڵ بپارێزن و هەم بەپێی ڕێ‌وشوێنی زانستی زەوییەکان ڕەنێو بێنن و پێشکەوت و ئاڵوگۆڕ و شێوازە تازەکانی ڕەچاو بکەن و کابرایەکی وەرزێر هەرگیز شتێکی ئاوای لە چنگ نەدەهات و بۆی نەدەلوا. ئەم قازانج و بەرژەوەندییە بەرچاوە، بە تێداچوونی بەشێک لە ئازادیی جەماوەری وەرزێران بەدی هات. دوابەدوای ئەم ئاڵوگۆڕانە، کەلەبەر و جیاوازییەکی هێندە قووڵ بەدی هات کە هەتا ئەو کاتە لە نێو کۆمەڵی ئێرانی‌دا شتی ئاوا ڕووی نەدابوو. کۆمەڵ دابەش کرا و بوو بە جەماوەری شارنشین و گوندنشین و هەرکام سەر بە لقێکی تایبەتی ئابووریی وڵات بوون. ژیانی جەماوەری شار و گوندان هەریەک لەسەر تەوەرەیەکی تایبەت هەڵدەسووڕا. نرخی زەوی‌وزار بەرز بۆوە و ئەم گرانبوونە دەگەڕایەوە سەر باری پارێزرانی سەرمایە و نەفەوتانی. ئەو وەرزێرانەی کە مووچە و بەرەیەکی ئەوتۆیان بە دەستەوە نەبوو، نەیاندەتوانی ملکی خۆیان بپارێزن و لەگەڵ دەرەبەگان بکەونە کێشە و ملانە. بەم شێوەیە وڵات ئاڵوگۆڕی بە سەردا هات و زۆربەی زەوی‌وزارەکان یان بوونە پاوانی حکوومەت یان لێکدران و بە شێوەیەکی بەربڵاو خرانەوە سەریەکتر.

ڕێوشوێنی کشتوکاڵ کە لە سەردەمی یۆنانییەکاندا هەتا ئاستێکی بەرز گەشەی کردبوو، بەرەو پووکانەوە شۆڕ بۆوە، بەڵام ئاژەڵداری و بەتایبەت بەخێوکردنی پەلەوەران زۆری پەرە ئەستاند، چونکە لە بازاڕەکانی دەرەوەدا کڕیاریان زۆر بوون. پاش هاتنی یەکەمین باڵوێزانی چین بۆ ئێران، وێنجە و دارەمێو و پاشان هاروێ، پیواز، زەعفەران و گوڵی یاس گەیشتنە ئیمپراتۆریی ئاسمانی[1] و لەوێ ڕەنێوهاتن. لەو سەریشەوە ئێران قەیسی و کۆخ و پاشان کرمی ئاوریشمی لە چینەوە هێنا. نەیشەکەر لە هیندەوە هێندرایە ئێران و هەر لەو سەردەمەوە چێندرا و پەرەی گرت.

ئەوەی ڕاستی بێ، زانیارییەکی زۆر سەبارەت بە ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئێرانییانی شارنشین بە دەستەوە نییە؛ بەڵام دەکرێ قبووڵی بکەین کە هێلێنیسم شەپۆلێکی وا بەگوڕی ئازادیخوازانەی لەگەڵ خۆی هێنا کە ڕۆم و ئێرانیشی گرتەوە. لە ئێراندا وەکوو ڕۆم جووڵانەوە و ڕەوتێکی نوێ بەدیهات و هەڵسوکەوتێکی تازە لەگەڵ کۆیلان ڕەچاو کرا. کۆیلە ئازادکراوەکان، باشترین دەسکرد و بەرهەمی هونەرییان دەخوڵقاندن و کۆمەڵی کۆیلان کە ڕۆژگارێک وەکوو زرووقەوبرووقە و هاتوباتی ساماندااران دادەندران، وایان لێهات کە لە کاروباری حکوومەتیدا زۆر هەوراز چوون و تەنانەت خۆیان لە تاج و تەختی قەیسەران خۆش کرد. وەک دەبینین لە ئێرانیشدا کەنیزێکی ڕۆمی کە باربووی فەرهادی چوارەم کرا، بوو بە شاژنی یەکەم. ئەم ژنە لە سەردەمی دەسەڵاتی فەرهادی پێنجەمی کوڕیدا کە دواتر شووی پێکردەوە، دەورێکی بەرچاوی لە کاروباری حکوومەتیدا گێڕا.

---

١ـ مەبەست وڵاتی چینە.م.

تێکەڵاوبوونی دوو نەتەوەی دانیشتووی ئێران هەروا درێژەی کێشا. یۆنانییەکان توانیبوویان خاوخێزانی یۆنانی ـ ئێرانی پێکبێنن و لەو جەغزەدا ناوی هەردک نەتەوەکە وەکوو یەک باو بوون. سنووری نێوان چینی باڵادەست و خواردەست بەرەبەرە کاڵتر دەبۆوە. جاری وابوو ئەو یۆنانییانەی کە ببوونە ئێرانی وا بە سەر هەژاری و دەستەنگی‌دا دەکەوتن، کە بە باری کۆمەڵایەتی‌دا بەرەژێرتر لەو ئێرانییانە ڕادەوەستان کە ببوونە یۆنانی. سەرەنجام ئەو کۆمەڵەی کە تێیدا پلە بەرزەکانی حکوومەتی پاوانی یۆنانییەکان بوو، لە ڕووی سامانەوە دەکرێ بە دوو بەشی دەوڵەمەند و هەژار کە ئێرانی و یۆنانی لە هەردک چین‌دا هەبوون.

بەگشتی کۆمەڵی ئێرانی تووشی جیاوازی و کەلەبەرێکی قووڵ هات: دەرەبەگانی گەورە، مەزنانی کۆشک و بارگای میران، پایەبەرزانی حکوومەتی و ئەو بنەماڵانەی کە لە ڕێزەی مەزنەوەجاخانی دیار و بەرچاودا نەدەخوێندرانەوە، پشتاوپشت هاتن و چینێکی تازەی مەزنەوەجاخانیان پێکهێنا و لە بەرامبەر ئەوانیش‌دا چینی جەماوەری ئازادی شاران و گوندان پێکهات. دواتر لە کۆمەڵی ڕۆمی‌دا، ئاڵوگۆڕێکی هاوشێوە ڕووی دا کە چوار چین خۆیان تێدا نواند و بریتی بوون لە: ١ـ خانەدانی میری ٢ـ کلیسا ٣ـ مەزنەوەجاخان ٤ـ جەماوەری خواردەستە.

ئەم دابەشینە لە کۆمەڵی سەردەمی ساسانی‌دا ئاوا خۆی دەنوێنێ:

١ـ مەزنەوەجاخان و شەڕکەران ٢ـ پێشەوایانی دینی ٣ـ قەڵەمداران و کاربەدەستانی حکوومەتی ٤ـ جەماوەری کرێکار.

بەختەوەرانە لە سایەی کۆمەڵێک توێژینەوەی تازەوە کە سەبارەت بە مێژوو، دین، هونەر و شارستانییەتی سەردەمی پارتەکانەوە کراوە، وردەوردە

ڕوخساری ڕاستەقینەی ئەم خانەدانە و بارودۆخی ئێران کە ماوەی پێنسەد ساڵان حکوومەتیان بە سەردا کردووە، دەردەکەوێ. لە سەرەتادا، پادشایەتیی پارت تەنیا وەکوو سەرکەوتنی هەرێمێکی بچووک و بێبایەخی دوورترین سنوورەکانی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریی سلۆکی خۆی دەنوێنێ، بەڵام بەرەبەرە وەکوو پەڵەڕۆنێک دەتەنێتەوە و تەنگ بە پاشماوەی حکوومەتی بەرەو نەمانی یۆنانی هەڵدەچنێ و بە یەکجاری پاکی دەکاتەوە. جووڵانەوە و کشانی ئەشکانییەکان بۆ لای خۆرنشین هاوکاتە لەگەڵ بزووتنی ڕۆمییەکان بۆ لای خۆرهەڵات. وەکوو دیارە لە هەر جێگایەکیش ڕۆمی کشابانەوە، یۆنانی بارگە و بنەی خۆیان دەپێچایەوە. سەرەنجام ڕۆژگارێک دادێ کە ئێرانی و ڕۆمی کەلەپوور و میراتی ماکی و تەنانەت میناکیی یۆنانییەکان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن و لەوبەرەوبەری ڕووباری فورات بەرەوڕووی یەکتر دەچەقن. یەکیان خۆی بە میراتگری هەخامەنشییەکان و سلۆکییەکان دادەنا و دەیهەویست هەتا ئیمپراتۆریی کۆن بخاتەوە سەر یەکتر و بیباتەوە سەر دۆخی جارانی و ڕەوگەیەک بەرەو دەریای مەدیتەرانە بکاتەوە و لایەکەی دیکە بە ویستی قەیسەرەکانی، خۆی بە میراتگری ئەسکەندەر دەزانی و پێوەبوو هەتا ببێتە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوای سەرلەبەری ئاسیا، بەتایبەت [وڵاتی] هیندووستان.

بۆ ماوەی سێسەد ساڵان، ئێران بە شێوەیەکی توندوتۆڵ بەرەنگاری ڕۆم ڕادەوەستێ و تێکرای هەوڵ و تێکۆشانی ڕۆمییەکان، بێجگە لە چەند سەرکەوتنی کاتی، تووشی تێشکان دەبنەوە. ئێران کە گیرۆدەی شەڕ و کێشەیەکی ئاوا درێژخایەن بوو، دەستی دایە چەک و بەرەوڕووی دەسەڵاتێکی یەکجار درندەی وەک ئیمپراتۆریی ڕۆم کەوتە بەربەرەکانی و بەزاندی. ئەم شەڕ و هەرایە پشووی بەرامەیەکی نوێ بە بەر ڕووحی مێرخاسانەی لەمێژینی ئێرانیدا

دەکاتەوە و دەیبووژێنێتەوە، چونکە ئەم رووحە بۆ ماوەیەکی کەم لە سەردەمی دوایین پادشایانی هەخامەنشی‌دا دەژاکێ و لە ڕۆژگاری سلۆکییەکان‌دا چی وای بە بەرەوە نامێنێ.

شەڕ و تێکهەڵچوون لەگەڵ ڕۆم، چەند ئاکامێکی باشی دیکەشی بۆ ئێرانی ئەشکانی بە دوای خۆی‌دا هێنا. تێکشکانی کراسسووس، هێرشی پاکۆر بۆ سەر سووریا، چارەڕەش‌بوونی ئانتۆنیووس و چاوپۆشینەکانی ئووگوست، بە ئێرانییەکانی سەلماند کە ئەوان کۆمەڵێک سەرچاوە و پێداویستیی وایان بە دەستەوەیە کە لە ڕێی ئەوانەوە دەتوانن بەرەوڕووی پەلامارەکانی خۆراوا ڕاوەستن و سەربەستی و جەغزی خاکی خۆیان بپارێزن. وردەوردە ویژدانی نەتەوەیی کە لە زەمانی «ئەرشەک» و «تیرداد»دا هەر نەبوو، لە ڕووحی ئێرانی‌دا خۆی دارشت و ڕەنگی دایەوە. ئەم وەخەبەرهاتنە تەنەوەی کرد و واوێدەچێ کە زنجیرەی پادشایانی ئەشکانیی بە دالّدە و پشت و پەنای خۆی دانابێ. ئەشکانی ئەم هەلەیان قۆزتەوە و هەوێنی بیروبۆچوونی بووژانەوە لە بواری سیاسەت، دین و هونەری گەل‌دا خۆی دەنوێنێ.

ئێرانی سەردەمی ئەشکانی، هاوکات لەگەڵ بەرەنگاربوونەوەی ڕۆم، تەواوی زەبر و پەلاماری بیابانگەردانیشی بەرپەرچ دەدایەوە کە هێندێکیان لە ناوچەی پووشەڵان و گیاجاڕی باکووری ڕۆژهەڵات و تاقمێکیان لە ڕێ و ڕەوگەی قەفقازەوە دادەوەڕین. لەم کێشە و هەرایەدا ئێران خزمەتێکی گەورەی پێشکەشی دنیا کرد، چونکە وادیارە بوو بە پارێزەری سەرلەبەری شارستانییەتی لەمێژینی ئاسیای خۆرنشین، کە خۆی بە یەکێک لە میراتگرانی دادەندرا و لە تێداچوونی پاراست.

ئەگەرچی ئێران لەبەر نەبوونی حکوومەتێکی بەهێز گیرۆدەی شەڕوشووڕی نێوخۆیی ببۆوە و بە کەنەفتی و شەکەتی کەوتبۆوە، بەڵام دیسانیش توانی لە سێ باڵانەوە بە سەر دوژمنی دەرەکیدا زاڵ بێ و لە لایەکی دیکەوە ڕووحی ئێرانیش لە نێوخۆدا ببووژێنێتەوە. پارتەکانی ئەشکانی بەم دوو سەرکەوتنەیان جێگا و ڕێگایان بۆ ساسانییەکان خۆش و تەخت کرد و ئەوانیش چۆن چاکە ئاوایان هەڵەکە خواستەوە و بە نۆرەی خۆیان توانییان یەکییەتی و شارستانییەتێکی وا بەدی بێنن کە ڕەنگە هەرگیز یەکییەتی و شارستانییەتێکی ئاوا ڕەسەنی ئێرانی بەدی نەهاتبووبێ. «ژیانەوە و ڕابوونەوەی لەپڕی ساسانییەکان وەکوو ئەفسانە دەچێ.» پارتەکان بوونە پردی نێوان ئەوان و هەخامەنشییەکان.

***

## لیزگەی پادشایانی ئەشکانی (پارت)

| | | |
|---|---|---|
| ١ـ ئەشک | ٢٥٠ـ ٢٤٨ی پ.ز. | Ca.[1] |
| ٢ـ تیردادی یەکەم | ٢٤٨ـ ٢١١ی پ.ز. | Ca. |
| ٣ـ ئەردەوانی یەکەم | ٢١١ـ١٩١ی پ.ز. | Ca. |
| ٤ـ پێریاتیووس | ١٩١ـ ١٧٦ی پ.ز. | Ca. |
| ٥ـ فەرهادی یەکەم | ١٧٦ـ١٧١ی پ.ز. | Ca. |
| ٦ـ مێهردادی یەکەم | ١٧١ـ ١٣٨ یان ١٣٧ی پ.ز. | Ca. |
| ٧ـ فەرهادی دووهەم | ١٣٨ـ ١٢٨ ی پ.ز. | Ca. |
| ٨ـ ئەردەوانی دووهەم | ١٢٨ـ١٢٤ـ یان ١٢٣ی پ.ز. | Ca. |
| ٩ـ مێهردادی دووهەم | ١٢٣ـ ٨٨ یان ٨٧ی پ.ز. | Ca. |
| ١٠ـ گۆدەرزی یەکەم | ٩١ـ ٨١ ی پ.ز. | Ca. |
| ١١ـ ئۆرۆدی یەکەم | ٨١ ـ٧٥ی پ.ز. | Ca. |
| ١٢ـ سێناترۆک | ٧٥ـ٧٠ یان ٦٩ی پ.ز. | Ca. |
| ١٣ـ فەرهادی سێهەم | ٦٩ـ ٥٨ یان ٥٧ی پ.ز. | Ca. |
| ١٤ـ مێهردادی سێهەم | ٥٧ـ٥٥ی پ.ز. | Ca. |
| ١٥ـ ئۆرۆدی دووهەم | ٥٧ـ ٣٦ ی پ.ز. | Ca. |
| ١٦ـ فیرووزی یەکەم | سالی ٣٨ی پ.ز. مردووە. | |
| ١٧ـ فەرهادی چوارەم | ٣٨ی پ.ز. تا ٢ی ز. | Ca. |

---

١ـ Ca کورتەنیشانەیە بۆ وشەی Circa کە لەبری نیزیکەیە و بۆ ئەو ژمارە یان ڕێکەوتانەیە کە یەکلایی نەبوونەوە.ب.

تێبینی: بەڕێز مەحموود بێهفرووزی ئەم لیزگەیەی لە کتێبەکە زیاد کردووە و لە دەقی سەرەکیدا نییە.و.

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ـ تیردادی دووهەم | ٣٠ـ٢٥ی ز. | Ca. |
| ١٩ـ فەرهادەک یان فەرهادی پێنجەم | ٢ی پ.ز. تا٤ی ز. | Ca. |
| ٢٠ـ ئۆرۆدی سێهەم | ٤ یان ٦ـ ٧ ی ز. | Ca. |
| ٢١ـ ئەنووشی یەکەم(؟) | ٧ـ١٢ی ز. | Ca. |
| ٢٢ـ ئەردەوانی سێهەم | ١٢ـ ٣٨ی ز. | Ca. |
| ٢٣ـ تیردادی سێهەم | ٣٦ی ز. | Ca. |
| ٢٤ـ سینامووس | ٣٧ی ز. | Ca. |
| ٢٥ـ گۆدەرزی دووهەم | ٣٨ـ٥١ی ز. | Ca. |
| ٢٦ـ ڤاردان (واردان) | ٣٩ـ ٤٨ی ز. | Ca. |
| ٢٧ـ ئەنووشی دووهەم(؟) | ٥١ی ز. | Ca. |
| ٢٨ـ بەلاشی یەکەم | ٥١ـ ٨٠ ی ز. | Ca. |
| ٢٩ـ فیرووزی دووهەم | ٧٨ـ١١٥ی ز. | Ca. |
| ٣٠ـ ئەردەوانی چوارەم | ٨٠ ـ ٨١ ی ز. | Ca. |
| ٣١ـ خوسرەو | ١٠٩ـ ١٢٩ی ز. | Ca. |
| ٣٢ـ پارتامازپا | ١١٧ی ز. | Ca. |
| ٣٣ـ بەلاشی دووهەم | ١٠٥ـ١٤٧ی ز. | Ca. |
| ٣٤ـ مێهردادی چوارەم | ١٢٨ـ١٤٧ی ز. | Ca. |
| ٣٥ـ بەلاشی سێهەم | ١٤٨ـ١٩٢ی ز. | Ca. |
| ٣٦ـ بەلاشی چوارەم | ١٩١ـ ٢٠٨ی ز. | Ca. |
| ٣٧ـ بەلاشی پێنجەم | ٢٠٨ـ٢٢٣ی ز. | Ca. |
| ٣٨ـ ئەردەوانی پێنجەم | ٢١٣ـ ٢٢٧ی ز. | Ca. |
| ٣٩ـ ئارتاڤاز (ئارتاواس) | ٢٢٧ـ ٢٢٩ی (؟)ز. | Ca. |

بەشی ٦

# گەشە و پەرەی شارستانییەتی ئێرانی

## ساسانییەکان

ژیانەوە و بووژانەوەی ئێران، دەگەڕێتەوە بۆ زنجیرەیەکی تازەی پادشایان لە هەرێمی فارس. فارس(پارس) دەبێتە ئەو ناوچە لەمێژین و کۆنەی باشووری خۆرنشین کە نیزیکەی هەزار ساڵ پێشتر، یەکەم تیرە و خێڵاتی پارس لەوێ نیشتەجێ ببوون. تاج و تەختی پادشایەتی کەوتە دەست خانەدانێکی نەتەوەیی کە خۆیان بە میراتگری هەخامەنشییەکان دەزانی. ساسانی بە هەڵوەشاندنەوەی حکوومەتی ئەشکانی و بێبەش کردنیان لەم کەلەپوورە، پلە و پایەی فەرمانڕەوابوونیان تەنیا بە مافی خۆیان دادەنا. ساسانییەکان لە پاش شەڕ و کێشەیەکی درێژخایەن و وەچنگ هێنانی تاج و تەختی پادشایەتی، بوونە دامەزرێنەری حکوومەتێکی نەتەوەیی کە پشتئەستوور بوو بە دینی نەتەوەیی و شارستانییەتێک کە ڕەنگە بە باری ئێرانیگەریدا لە سەرتاسەری مێژووی درێژی ئێرانییەکاندا نموونەی نەبووبێ. پێکهاتنی دەسەڵاتێکی بەهێزی ناوەندی، توانی هەوساری ڕەوتی خانخانی و دەرەبەگانی ئاژاوەگێڕ بە دەستەوە بگرێ و پاشان قۆشەنێکی ڕێکوپێک و چاکڕاهاتوو دامەزرێنێ و بەوردی دامودەزگای

حکوومەتی نێوخۆ ڕێکبخاتەوە و بیهاویتە ئەستۆی ئیدارەیەکی ژێر چاوەدێری. ئەم هەنگاوانە کارێکی وایان کرد هەتا ئێران کە هێزی وەبەرهاتبۆوە و بووژابۆوە، ملی ئەو ڕێگایە بگرێ کە ئاخرین پادشایانی ئەشکانی گەلاڵەیان بۆ دارشتبوو. لەم ڕەوت و ڕێبازەدا بڕست و بڕشتێکی پێکەوەنا کە وێدەچێ دنیای ژیارمەند لە نێوان دوو کەڵەهێزی ساسانی و ڕۆمیدا دابەش بووبێ.

لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا، ساسانییەکان بە تێکۆشانی ماندوویی‌نەناسانە و کۆمەڵێک سەرکەوتنی نێوەنێوە، لە سێ بەرەدا بەرەنگاری پەلاماردەران ڕاوەستان کە دەبنە ڕۆمییەکان لە باڵی خۆرنشین، کووشانییەکان و هیاتەلەکان[1] لە باڵی ڕۆژهەلات و ڕەوەندەکان لە قوڵی باکوور. کێشە و هەرای پڕ گرێ‌وگۆڵی ئەرمەنستانیش بەشێک لە هەوڵ و هەڵسووڕانەکانی دەکردنە بەختی خۆی، بێ‌ئەوەی کە هیچ هێمنایەتی و ئارامبوونەوەیەکی پتەوی یەکلاکراوە سەقامگیر بێ. ئەم شەڕوشووڕە درێژ و تێکهەڵچوونە خوێناوییانە لەگەڵ ناوچە و هەرێمەکانی دراوسێ، بۆ ماوەی چوارسەد ساڵان، کەڵەشاخی لە گەلی ئێران دەگرت و دایدەهێزاند، بێ‌ئەوەی باروودۆخی نێوخۆی شاهانشایەتی بتوانێ ڕێ‌چارەیەک بۆ سەقامگیربوونی هاوسەنگی بدۆزێتەوە. سیستمی خان‌خانی هەمیشە پێوە بوو کە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی و ماف و شانەبەرزەی ڕابردووی وەدەست بێنێتەوە. سەرهەڵدان و هەڵگەڕانەوەی سەرکردەکانی سپا کە خوازیاری بە دەستەوە گرتنی دەسەڵاتی باڵا بوون، ملانە و ڕقبەرقەی توندوتیژ لەسەر تەختی ئەو دەسەڵاتەی کە وردەوردە هێز و توانستی دادەبەزی و پاش هەمووان تێکهەڵچوونی ڕاستەقینەی نێوان چین و توێژەکان کە وەکوو بزووتنەوەیەکی کۆمۆنیستی خۆی نواند، بنەماکانی کۆمەڵی

---

[1] ـ دروستەکەی «هێپتالی»یە و بە عەرەباندن دەبێتە هێبتال و بە هەڵە بۆتە هیاتەلە.م.

ئێرانی لەرزاند. وای لێهات کە جۆگەلەی خوێن لە شار و گوندان لووزەوی بەست و ئەمانە تێکرایان دەستیان دایە دەستی یەکتر و لەو جەنگەیەدا کە دنیا پێیوابوو دەسەڵاتی ساسانی گەیوەتە پەرپەرۆچکەی خۆی ، دوژمنانی زەبری گورچووبڕ و یەکلاکەرەوەیان لێوەشاند. نەتەوەی عەرەبی دەشتەکی کە تازە لە قۆناخی دەوارنشینی ترازابوو و لە جەغزێکی بەرچاوتەسکانەی دینیدا خولی دەدا، توانی ئێرانی لاوازبووی دەستی خەنیمانی، بشکێنێ. ئەم نەتەوەیە بۆ ماوەی چەند ساڵان خۆی وەک مەزن و میری ئیمپراتۆریی بەربڵاوی ئێران ناساند. میراتی ساسانییەکان بۆ عەرەبان وەکوو قوتابخانەیەکی هێژا وابوو. سەرکەوتنی عەرەبان بە باری سەربازیدا، خەباتێکی درێژخایەنی ئاشتیخوازانەی لێکەوتەوە و لە ئاکامدا کولتوور و شارستانییەتی ئێران دەرەقەتی هات و بە سەریدا زاڵ بوو.

**

بەپێی نەقڵ و نەزیلە کۆنباوەکان «ساسان»ی باپیرەگەورەی ساسانییەکان، لە پەرستگەی ئاناهیتای ئیستەخردا خاوەنی پلەیەکی هێژا بووە. پاپەکی[1] کوڕی کە بوو بە جێگرەوەی لەگەڵ کیژی میرێکی خۆوڵاتی زەماوەندی کرد و پاش ڕێکخستنی کۆدەتایەک دەسەڵاتی لە چنگ دەرهێنا. هەر پاپەکە کە دواتر وەکوو سەرزنجیرەی ڕاستەقینەی خانەدانی ساسانی ناسرا و دەسپێکی دەسەڵاتی (۲۰۸ی زایینی) بە داهاتنی سەردەمێکی نوێ دادەندرێ. پادشای پارت ئەم ئاڵوگۆڕەی دەسەڵاتی بە ڕەوا نەزانی و پێشنیاری پاپەکی بردەوە پاش کە دەیکوت با شاپووری کوڕی جێگای بگریتەوە. بەم شێوەیە نێوانی پادشای

---

١ـ بابەک

گەورە لەگەڵ میری بەردەسەلاتی تێکچوو. ئەم برانی پەیوەندییە دەریدەخا کە لەو سەردەمەدا ئێران و بەتایبەت هەرێمی پارسی گیرۆدەی هەرا و ئاژاوە بووە.

ئەردەشێری کوڕی دووهەمی پاپەک لە دارابگردی پارس سەرکردەیەکی لەشکری بوو. ئەردەشێر پاش نەمانی باوکی دانی بە دەسەلاتی شاپووری کاکی‌دا نەهێنا. هێندەی نەمابوو پێکدابێن و شەڕیان لە نێوانی‌دا هەڵگیرسێ کە شاپوور لەپڕ بە ڕووداوێک سەری نایەوە و ڕێگای بۆ ئاوات و ئامانجەکانی ئەردەشێر خۆش کرد کە خۆی وەکوو شای پارس ناساند. ئەردەشێر قوڵەمیرانی هەرێمەکەی یەک بە دوای یەکدا تێدابردن و یەکییەتیی هەرێمەکەی دابین کرد و حکوومەتی خۆشی لە دەرەوەی پارس، واتە ئیسفەهان و کرمانیش‌دا چەسپاند و سەقامگیری کرد. سەرکەوتنەکانی وی دڵەڕاوکەیان خستە دەروونی ئەردەوانی پێنجەم. ئەردەوان لە حوکمداری ئەهوازی ڕاسپارد کە خێرا خاشەی دەسەلاتی سەربەستیخوازانەی ئەردەشێر بکێشێ، بەڵام پەلامارەکەی تێکشکا و ماوەیەک دواتر ئەردەشێر وەخۆکەوت و لە سێ شەڕی پەیتاپەیتادا، پادشای گەورەی پارتی بەزاند و لە جەنگی یەکلاکەرەوەی هەرێمی شووش (سووزیان)دا کوشتی (٢٢٤ی ز). پێنسەد و پەنجا ساڵ دوای ڕووخانی هەخامەنشییەکان، دەسەلاتی ئێران کەوتەوە دەست نەتەوەی پارس و وەکوو جێگرەوەی ڕەوای هەخامەنشییەکان بوو بە درێژەدەری شارستانییەتی ئێرانی.

بەزاندنی ئەردەوانی پێنجەم و کوژرانی، نەیانتوانی تەواوی کەند و کۆسپەکانی سەر ڕێگای ئەردەشێر بۆ ئەوەی ببێتە فەرمانڕەوای بێبەرگێڕەوەی ئێران، لابەرێ. هاوپەیمانی و یەکگرتنێکی بەهێز بۆ تێهەڵچوونەوەی خانەدانی ئەشکانی بە دژی ئەردەشێر بەدی هات. ماکەی ئەم بزووتنەوەیە خوسرەوی یەکەمی پادشای ئەرمەنستانی بە ڕەگەز ئەشکانی بوو. خوسرەو ڕێ و ڕەوگەی

قەفقازی ئاوالّە کرد و لە سەکاییەکانی ڕاسپارد کە بێنە یاریدەی. ڕۆمیش بوونە پشتیوانی و پادشای بەدەسەلاّتی کووشانیش کە ئەندامانی بنەماڵەی ئەردەوان پەنایان بۆ بردبوو، هێزە چەکدارەکانی خۆی ناردنە نێو ڕیزی هاوپەیمانان. وەکوو دیارە لە نێو تەواوی بنەماڵە گەورەکانی پارتدا، تەنیا بنەماڵەی قارێن[1] دژی ئەردەشێر جووڵایەوە و ئەوانی دیکە پادشای نوێیان دڵنیا کردەوە کە پێی وەفادارن.

ئەردەشێر لە زنجیرەیەک شەڕ و پەلاماردا، هاوپەیمانانی بەزاندن و بە ڕەچاو کردنی ڕەوت و ڕێبازی بەخشینەوەی بەرتیل هێندێکیانی لەم شەڕە بێهوودەیە پەشیمان کردەوە. ڕۆمییەکان و سەکاییەکان خۆیان کەنار دا و پادشای کووشان پاش دوو ساڵ شەڕ، پاشەکشەی کرد و سەرەنجام پادشای ئەرمەنستان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەردەشێر بە تەنیا مایەوە. خوسرەوی یەکەمی پادشای ئەرمەنستان یەکجار بەگەرمە کەوتە بەربەرەکانی و ئەردەشێر پاش دە ساڵ تێکهەڵچوون توانی بیبەزێنێ. ئەردشێر بوو بە فەرمانڕەوای ئیمپراتۆرییەک کە لە فوراتەوە هەتا مەرو و هەرات و سیستان پەڕی هەڵدابوو. پادشای ساسانی پاش شکاندنی ڕقەبەرانی نێوخۆیی، ویستی کە سنوورەکانی وڵاتەکەی پتەو بکا و بیانپارێزێ، جا هەر بۆیە نەیدەتوانی خۆی لە تێکهەڵچوون لەگەڵ ڕۆمییەکان لابدا. ئێرانییەکان پاش چەند جارێک تێکشکان، سەرەنجام توانییان دوو شاری سەخت و قایم و گرینگی نوسەیبین[2] و حەرران[3] بگرنەوە(ق٨٥).

---

١ـ کارێن
٢ـ نەسیبین
٣ـ کاراهە




ق۸۵ـ ئیمپراتۆریی ساسانی

ئەردەشێر لە ماوەی نیزیکەی پەنجا ساڵدا زەبری لە یەکەیەکەی ڕقەبەرانی دەوەشاند و بە ئازایەتی دەکەوتە پەیکەردەی چارەنووسی و سەرەنجام توانی لە ئێراندا شاهانشایەتییەکی نوێ دامەزرێنێ. یەکەمین سەرکەوتنی بریتی بوو لە دامەزراندنی سپایەکی بەهێز کە دەیتوانی ئاوات و ئامانج و گەلاڵەکانی وەدی بێنێ. ئەردەشێر لە سەردەمی ژیانی خۆیدا، شاپووری کوڕی کردە شەریکەدەسەڵاتی و بەپێی گێڕانەوەکان، ماوەیەکی کەم بەرلەوەی بمرێ، تەختی دەسەڵاتی ڕادەستی شاپوور کرد و دەستی لە ژیانی پڕ جموجووڵی بەردا.

شاپوور حکوومەتێکی لە باوکییەوە بە میرات بۆ بەجێما کە دامودەزگای پارتەکانی تێدا هەڵنەوەشایەوە، بەڵام لەسەر بنەمای کۆکرانەوەی هێز لە ناوەندی دەسەڵاتدا بناغەی بۆ دارێژرا و سیستمی دەرەبەگی یان هەمان خانخانی تێیدا وەکوو خۆی مایەوە. ئیمپراتۆری بە پێکهێنانی سپایەکی ڕێکوپێک و دامەزراندنی دامودەزگایەکی لەباری ئیداری کە لەسەر تەوەرەی نوێ هەڵدەسووڕا، بناغەی داکوتا و سەقامگیر بوو. ئەم پادشایە هەر لە سەرەتاوە سەرنجی خستە سەر کاروباری دەرەوە. وەکوو پێشتر باسمان کرد، لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینییەوە، دامەزرانی پادشایەتیی گەورەی کووشان لە سنوورەکانی باڵی ڕۆژهەڵات، توانیبووی وەکوو مەترسییەکی سیاسی بۆ سەر ئێران خۆی بنوێنێ و لە بواری ئابووریدا گرێ و کۆسپی بخاتە سەر ڕێگای. شاپوور لە لایەکەوە کەوتبووە نێوان بەرداشی ڕۆمییەکان و کووشانییەکان و لە لایەکی ترەوە هەمیشە بە مەبەستی چارەسەری کێشەی ئەرمەنستان هەوڵی دەدا و هەڵدەسووڕا. لە باڵێکی دیکەوە هەڕەشە و سەرێشەی ڕەوەندەکانی پەلاماردەری ڕێوبانەکانی قەفقاز بەرۆکیان بەرنەدەدا. حکوومەتی تازەی ساسانی هەستی بەو مەترسییە کرد کە نەکا لەپڕ سنوورەکانی ئاوری شەڕ و

ئـاژاوە بیانگریتـەوە و هێزەکـانی دەروەسـتی شـاڵاوی هـەموو لایـەک نەیـەن. شاهانشـایەتیی کووشـان بـە دوو بـاراندا سـەرنجی شـاپووری بـۆ لای خـۆی ڕاکێشـا؛ یەکـەم دەوڵەمەنـدبوونی بـە هـۆی گەشـەی کاروبـاری بازرگـانیی نێونەتەوەیی و دووهەم دژایەتی لەگەڵ دەسەڵاتی شاپوور. جا هەر بۆیە شاپوور لە پێشدا بەرەو کووشان بزووت و بەپێی بەردەنووسێکی دووروودرێژ کە لەسەر دیوارەکانی ئاورگای نەخشی ڕۆستەم هەڵکەندراوە، ئاوا سەرکەوتنەکانی خۆی دەگێڕیتەوە: «سپای سەرکەوتەی وی سەرەتا «پیشاوەر»ی پایتەختی زستانەی پادشایانی کووشانی گـرت و دۆڵـی سێندی خستە ژێر ڕکێفی؛ پاشان ئەسپی بـەرەو باشوور تـاودا و لـە هیندوکوش تێپەڕی و هەرێمی بەلخی گـرت و بە ڕووباری جەیحووندا پەڕییەوە و گەیشتە سەمەرقەند و تاشکەند.» خانەدانی پادشایانی کووشان کە کانیشکای گەورە سەرزنجیرەی بـوو، تۆمـاری تەمـەنی تێکەوەپێچرا. لەو کاتە بەدواوە زنجیرەیەک فەرمانڕەوای دیکە دێنە سەر کـار کە دان بە حکوومەتی ئێراندا دێنن و دەسەڵاتیان لـە جـەغـزێـکی بەرتەسکتر واوەتر ناچێ.

پاش ئەوەی کێشەی خۆرهەڵات بڕایەوە و کاروبارەکان ڕێک بوون، شاپوور بایدایەوە سەر قۆڵی خۆرنشین. لێرەشدا بەخت باڵی گرت و بە سووریادا شۆڕ بۆوە و گەیشتە ئەنتاکییە[1]. شاپوور دوای چەند جار بەزین، ئامادەی گەڕانەوە بوو، بەڵام لەناکاو «گۆردیانووس»ی ئیمپراتۆر کوژرا و فیلیپی کوڕی، ناسراو بە فیلیپی عەرەب بە پەلە و بە هەڵەداوان پەیماننامەی ئاشتیی لەگەڵ شـاپوور مۆر کرد و باج و پیتاکێکی قورسی خستە سـەر شـانی خـۆی و دەستـی لە دووچۆمان و ئەرمەنستان هەڵگرت بۆ ئێران (٢٤٤ی زایینی). پازدە ساڵ دواتر

---

١ـ ئانتیووش

شەڕ و لێکدان لەگەڵ ڕۆم هەڵگیرسایەوە و سەرکەوتنێکی بەدەنگوناوی بە دوایدا هات. شاپوور گەلێک شاری سووریای وەک ئەنتاکییەی گرتن. لە نیزیک ئێدیس[1] سەرکەوتنێکی گەورەی وەچنگ هێنا و «ڤالێریانووس»ی ئیمپراتۆری لەگەڵ حەفتاهەزار چەکداری لۆژیۆنێری ڕۆمی بە دیل گرت و بەرەو ئێرانی گاڵدان (٢٦٠ی زایینی). ئەم کۆمەڵە دیلانە لەو شارانەدا کە خۆیان بەپێی گەڵاڵەی لەشکرگاکانی ڕۆمی بنیاتیان نان، بنەیان داکوتا. پیاوانی ڕۆمی وەکوو پسپۆڕ، نژیاروان، ئەندازیار و شارەزای کاران بوونە بەشداری کاروباری ئاوەدان کردنەوەی وڵات و دەستیان گەیاندە نێو هەڵبەستنی پرد و بەنداوان و بەم شێوەیە هەرێمێکی دەوڵەمەندی وەکوو خووزستان قازانجێکی زۆری پێگەیشت و هێندێک شوێنەواری ئەو سەردەمە هێشتاش لە زەمانی ئێمەدا کەلکی لێوەردەگیرێ.

شاپوور لە گەرمەی سەرکەوتنەکانیدا، سووریا و کاپادۆکییەی خاپوور کردن، بەڵام لە گەڕانەوەدا کەوتە بەر پەلاماری پادشای پالمیر و تێکشکا و بەشێک لە دەسکەوتەکانی دۆڕاند. ئەم شکانە لە ڕوانگەی ئێرانییەکانەوە هیچ شتێکی لە نرخ و بایەخی بەزاندنی ڤالێریانووس کەم نەکردەوە. شاپوور بۆ یاد و بیرەوەریی سەرکەوتنی خۆی فەرمانی دا هەتا دیمەنی ئیمپراتۆری ڕۆم کە لە بەرامبەریدا بە چۆکدا هاتووە لە پێنج شوێنی هەرێمی پارس لەسەر زەرد و ماهان داتاشن(ق٨٦).

شاپووری سەرکردەی مەزن، لە ڕەوتی ڕێکوپێک کردنی کاروباری نێوخۆی ئیمپراتۆریدا، کەوتە شوێن هەنگاوەکانی باوکی و بە سەرەنجامی گەیاندن. بیری

---

١ـ ڕۆها یان ئەڕڕۆها



ق٨٦ ـ بیشاپوور: سەرکەوتنی شاپووری یەکەم

بەرز و پێشکەوتنخوازانەی شاپوور وای لێکرد کە فەرمانی دا هەتا تەواوی ئاسەوار و دەقەکانی یۆنانی و هیندی لە بواری پزیشکی و ئەستێرەناسی و فەلسەفەدا وەربگێردرێن. شاپوور کە ئیمپراتۆرییەکی مەزنی بەدی هێنابوو، زۆر بە چاکی لای لە «مانی» کردەوە و باڵی پاراستنی بە سەر ئەم داهێنەرەی دینی «هەمووانی»دا کێشا. بیروڕای مانی کە وێنەی لە دینی زەردەشتی، بوودایی و مەسیحی هەڵگیرابۆوە، توانی کۆمەڵێک پەیڕەو و لایەنگر لە نێو توخم و تۆرەمەکانی ئاسیای خۆرنشین کە سەر بەو دینە باسکراوانە بوون، لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. داخوا شاپوور بە ڕاکێشانی مانی بۆ لای خۆی و ڕێخۆش کردن بۆ پەرەپێدانی ئایینەکەی، بە شوێن ئامانجی کەموزۆر دوور و درێژەوە بووە؟ ئەوەی ڕاستی بێ ئەم بۆچوون و گریمانەیە هێندە وێناچێ وابێ. ئەگەر بێتوو ئەم بیر و خەیاڵە لە هێلانەی مێشکی ئەو پادشا گەورەیەدا گەرای دانابێ، بەڵام خۆ جێنشینەکانی ڕچە و ڕێبازی ئەویان ڕەچاو نەکرد، چونکە هەر پاش نەمانی شاپوور (٢٧٢ی ز)[1]، مانی کەوتە بەر شەپۆلی ئازار و ئێشاندن و لە سەردەمی بارامی یەکەمدا کە بێگومان کەوتبوویە ژێر باندۆری پێشەوایانی مەزدایی[2]، کوژرا[3].

سەبارەت بە قۆناخی کورتخایەنی هۆرمزدی یەکەم و بارامی یەکەم، کە هەردووکیان کوڕی شاپوور بوون، زانیارییەکی کەم بە دەستەوەیە. لە ڕۆژگاری بارامی دووهەمدا (٢٧٦-٢٩٣)[4]، سەرباری هەڵگیرسانی شاوری ئاژاوەیەکی توندوتیژ لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتیی ئیمپراتۆری، شەڕێکی تازە لەگەڵ

---

١ـ بەپێی لێکۆڵینەوەکانی بەڕێز تەقیزادە، شاپوور ساڵی ٢٧٣ی زایینی مردووە.م.

٢ـ مەبەستی دینی زەردەشتییە.م.

٣ـ کیرتیری مووبەدی ناوداری زەردەشتی لە کوژرانی مانیدا دەوری گێڕاوە.م.

٤ـ وەک دەکتور ئیحسانی یارشاتر دەڵێ دەبێ ساڵی ٢٧٧ی زایینی ڕاست بێ.م.

حکوومەتی ڕۆم دەستی پێکرد. برای ئەم پادشایە کە وەکوو جێگری میر، هەوساری حکوومەتی سیستان درابوویە دەستی، بە مەبەستی گرتنی تەختی دەسەڵاتی پادشایەتی ڕاپەڕی و پادشای کووشان یاریدەی دا چونکە دەیزانی شاهانشا بڕشتی نییە و کاتی ئەوە هاتووە دیسان دەسەڵاتی تێهەڵچێتەوە. بارامی دووهەم دەبوو لە دوو بەرەدا شەڕ بکا، جا هەر بۆیە بە مەبەستی پاراستنی تاجی پادشایەتی و هەڵچنینی براکەی، بەپەلە پەیمانی ئاشتیی لەگەڵ ڕۆمییەکان مۆر کرد و دەستی لە باکووری دووچۆمان و ئەرمەنستان هەڵگرت و بۆی بەجێهێشتن.

بارامی سێهەم پاش چەند مانگێک پادشایەتی بە دەستی «نەرسی»ی کوڕی شاپوور حکوومەتەکەی ڕووخا و دەسەڵاتی ساسانی کەوتە بەرڕکێفی بەرەبابی کوڕە چووکەی ئەم بنەماڵەیە. دەسەڵاتی پادشای نوێ بە شێوەیەکی بەختیارانە دانەگیرسا، چونکە تێکهەڵچوون لەگەڵ ڕۆم شکستی لێکەوتەوە و لە ئاکامدا تێکڕای خاوخێزانی نەرسی وەکوو ڕووداوەکەی پێشووی داریووشی سێهەم، لە لایەن دوژمنەوە بە دیل گیران. بەپێی پەیمانی پێکهاتنێک، ئێران ئەرمەنستانی بچووک و سەرلەبەری هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی دیجلەی دا بە خەنیمانی. لە ماوەی سەدان ساڵ شەڕ و کێشە لەگەڵ ئێران، ڕۆم هەرگیز دەسکەوتێکی ئاوا بەربڵاوی وەچنگ نەهێنابوو؛ هەر بۆیە بە شێوەیەکی ڕەزامەندانە هەتا چل ساڵ ئەو ئاشتی و پێکهاتنەی تێکنەدا. شەڕی باڵی خۆرنشین ئێرانی وا لاواز کردبوو کە زەبری چەک نەیدەتوانی بەرگێڕەوەی کووشانەکان بێ و بەناچاری هەوڵی دا هەتا بە زەماوەندێک ئەو مەترسییە بڕەوێنێتەوە. هۆرمزدی دووهەم، کوڕ و جێگرەوەی نەرسی (۳۰۳ ـ ۳۰۹) لەگەڵ شادۆتێکی کووشانی زەوجی و بووکی

تازە بوو بە بارمتەی هەڵسوکەوتی باش و لەباری بنەماڵەکەی لەگەڵ خانەدانی ساسانی.

مەرگ و نەمانی هۆرمزدی دووهەم تاج و تەختی پادشایەتیی نایە بەردەستی منداڵێک کە شاپووری دووهەم بێ. درێژەی دەسەڵاتی ئەم پادشایە لە ماوەی ٧٠ ساڵدا (٣٠٩ ـ ٣٧٩ی ز). جێی خۆیەتی کە بیخاتە ڕیزەی دوو پادشای سەرەتای داگیرسانی دەسەڵاتی زنجیرەی خانەدانی ساسانی. لە تافی منداڵیی شاپووری دووهەمدا، پادشایەتیی کووشان هەلی لە گێرە و کێشەی نێوخۆ و بێهێزیی ئێران هێنا و وێدەچێ کە توانیبێتی دەسەڵاتی پێشووی خۆی وەدەست بێنێتەوە و تەنانەت بەشێک لە خاکی حکوومەتی دراوسێشی داگیر کردبێ؛ بەڵام هەر پاش ئەوەی کە شاپوور شەیتانی پێکەنی، کەوتە سەر ڕچە و ڕێبازی [شاپووری یەکەمی] هاوناوی و دژی کووشانییەکان کەوتە خۆ. ئەم جارەیان کووشان شکا و وەکوو هەرێمێکی نوێ خرایە سەر خاکی ئێران و تازە لە نێو شازادەکانی ساسانی حوکمداری بۆ هەڵبژێردرا کە ناوەندی دەسەڵاتەکەی بەلخ بوو. گەشەی سیاسیی ئێران، توانی گەشەی فەرهەنگی بە دوای خۆیدا بێنێ. هونەری ساسانی خێرایەکی لە ڕێی ئەو دەروازانەوە کە بە شەڕ و پەلامار کرابوونەوە، گەیشتە ڕۆژهەڵاتی دوور و شارە لاپەڕەکانی تورکستانی چین و تەنانەت خودی وڵاتی چینیش.

شاپووری دووهەم کە سەبارەت بە دوژمنی باڵی ڕۆژهەڵاتی خاترجەم بوو، بە مەبەستی سڕینەوەی پەڵەی پێکهاتنی پێشووی بارامی دووهەم و نەرسی لەگەڵ ڕۆمییەکان، لە باڵی خۆرنشین وەخۆ کەوت هەتا هەرێمەکانی دابڕاوی ئێران بستێنێتەوە، بەڵام شەڕەکە درێژەی کێشا. سەرەتا تێکهەڵچوونەکان لە بەرژەوەندیی ڕۆمییەکان بوون، کەچی پاشان بە قازانجی ئێران برانەوە. لەبەر

ئەو مەترسییانەی کە لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی خۆیان نواند و وێدەچوو کە ڕەنگە ئاکامی یەکەمین سەرکەوتنەکانی شاپوور تێدابەرن، بۆ ماوەیەکی کاتی شەڕ ڕاگیرا. هرووژمی کووشانییانی بچووک و هەیاتەلەی خیۆنی، شای شاهانیان ناچار کرد کە لەو کەوشەنە شانی بداتە بەر شەڕ و تێکهەڵچوون، بەڵام وەکوو دیارە ئاکامی باشی لێکەوتەوە و پەلاماردەران وەکوو «هاوپەیمانان» لە خاکی کووشاندا بنەیان داکوتا و بەڵێنیان دا کە بۆ شەڕی دژی ڕۆمییەکان یاریدەی پادشا بدەن و هێزی چەکداری بخەنە بەرڕکێفی. ئەو هەنگاوانەی کە ڕۆم بە مەبەستی دابینکردنی ئاشتی هاویشتنی بە ئاکام نەگەیشتن و شاپووری دووهەم لەگەڵ هاوپەیمانانی ڕۆژهەڵاتی ئەسپی بەرەو مەیدانی شەڕێکی تازە تاودا و سەرکەوتنێکی یەکجار پرشنگداری لێکەوتەوە و ئەویش بریتی بوو لە گیرانی «ئامێد»[1]. ڕۆمی دژکردەوەیان نواند و هێرشیان هێنا و تەنانەت تیسفوون کەوتە مەترسی، بەڵام بە کوژرانی یوولیانووسی ئیمپراتۆر، پاشەکشەیان کرد و پەیمانی پێکهاتن مۆر کرا و ناوچە کێشە لەسەرەکان خرانەوە بەردەستی شاپوور. ئەرمەنستان سەرلەنوێ وەرگیرایەوە، بەڵام لەبەر ئەو فێڵوفرتانەی کە ڕۆم دەیهێنان و دەیبردن هەتا پادشایەکی لایەنگری خۆی بخاتە سەر تەختی دەسەڵات، شاپووری دووهەم بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی دا و وەک چۆن وڵاتی کووشان ببوو بە هەرێمێکی ئێران، ئەرمەنستانیش بە زەبری هێز دەستی بە سەردا گیرا و لەوی بەولاوە کەوتە ژێر دەسەڵاتی «مەرزبان»ێک[2].

---

١ـ ئامید. ئامیدا. دیاربەکری ئێستا.و.

٢ـ سنوورپارێز. حوکمدار یان سەرکردەی پاراستنی سنوور.و.

ناکۆکی و کێشەی نێوان ئێران و ڕۆم وای تەنیبۆوە کە هەتا ئەو زەمانی شتی ئاوا ڕووی نەدابوو. لەو ڕۆژگارەوە کە «کۆنستانتین»ی گەورە بڕوای بە مەسیحییەت هێنا و ئەرمەنستان لەسەر ئەو پێوشوێنە دینییە دەڕۆیی، وڵاتی بەرباس بە تامەزرۆیی مەیلی بەرەو بیزانس دەبزووت، بەڵام بەشێک لە مەزن و ماقووڵانی ئەرمەنستان پێیان خۆش بوو کە پەیوەندیی کۆنی خۆیان لەگەڵ ئێران بپارێزن، چونکە شارستانییەتی ئەم وڵاتە لە ماوەی سەدان ساڵدا توانیبووی شوێنێکی قووڵ لەسەر شارستانییەتی ئەرمەنستان دابنێ. ئەرمەنستان کە ببوو بە جەرگەی شەڕەکانی ئێران و ڕۆم، لەم سەردەمەدا بە سەر دوو باڵی لایەنگرانی ئێران و لایەنگرانی ڕۆمدا دابەش کرا. هەڵبەت ئەو چارەسەرەی کە شاپووریش بۆ ڕۆمرکاندنی گڕەمەشقەڵانی تاسەی ئەوان ڕەچاوی کردبوو، دادی نەدا. دینی ڕەسمی و تازەی ئیمپراتۆریی ڕۆم، کۆمەڵێک گرێ و گرفتی خستنە سەر ڕێگای مەسیحییەکانی بەرفەرمانی شای شاهان. پایەبەرزانی ئێرانی بە باری سیاسیدا لێیان دڕدۆنگ بوون و سەرکوت و چەوساندنەوەیان ڕووپەڕێکی تازەی وای هەڵدایەوە کە پاشماوەی حکوومەتی درێژی شاپووری دووهەم تێیدا شەڵاڵی خوێن بوو.

پاش نەمانی ئەم پادشایە، قۆناخێکی پتر لە سەدەیەک دەست پێدەکا کە تێیدا شەڕ و کێشەی نێوان پادشایانی سووکەڵە و بێبڕشت لەگەڵ مەزنەوەجاخانی هاوپەیمانی پێشەوایانی دەسڕۆیشتووی زەردەشتی درێژەی کێشا. مەزنەوەجاخانی پایەبەرز، سەرەڕای تەواوی ئەو دارولەلەیەی کە دامودەزگای میری بە مەبەستی سنووردار کردنی دەسەڵاتیان وەبەرچاوی گرتبوو، بەپێی داب و نەریتی سەردەم، توانییان بەشێک لە شانەبەرزە و زێدەپشکەی خۆیان بپارێزن و چونکە هێندێک پلەی بەرزی حکوومەتی لە نێویاندا بە میرات دەگەڕا،

دەسەڵاتیان پتری تەنەوە کرد. هێز و دەسەڵاتی پادشا کە لەبەر دژایەتی کردنی مەزن و ماقووڵان دابەزیبوو، ڕێگەی نەدەدا بە پادشا کە وەک باوی سەردەمی یەکەم پادشایانی ساسانی، خۆی جێنشینی خۆی دیاری بکا. لەم قۆناخە درێژەدا، ئێران بوو بە خاوەنی پادشایەتییەکی هەڵبژێردراو لە نێو ئەندامانی بنەماڵەی ساسانیدا و لەبەر ناکۆکی و کێشەی نێوان لایەنگرانی هەرکام لە بەربژارە زۆرەکان، بوو بە بەشبەش و باڵباڵێن.

تەنینەوەی دەسەڵاتی مەزن و ماقووڵان پێشتر لە سەردەمی ئەردەشێری دووهەمەوە دەستی پێکردبوو. ئەم ڕەوتە لە زەمانی شاپووری دووهەم و بارامی چوارەمدا درێژەی پێدرا؛ یانی لەو کاتەدا کە ئێران بە شوێن دۆزینەوەی چارەسەرێکی نوێوە بوو بۆ کێشە و پرسی ئەرمەنستان. ڕۆم و ئێران پێکهاتن و ئەم هەرێمە کرایە دوو بەش و لە ئاکامدا چوارپێنجەمی گەڕایەوە سەر ئێران (۳۸۹ی ز). لێرە بەولاوە ئەرمەنستان تەنیا بۆ ماوەیەکی کەم پادشای خۆی پاراست و لە ساڵی ٤۲۹ی زایینییەوە جارێکی دیکەش بۆوە هەرێمێکی ساکاری ژێردەسەڵاتی حوکمدارانی داندراوی پادشای گەورە و ڕۆمیش هەر ئەم شێوازەیان ڕەچاو کرد.

لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەو سێ پادشا باسکراوەدا، بێگومان هەڵسوکەوتی نەرم و نیان لەگەڵ مەسیحییەکان پتر لە ڕۆژگاری شاپووری دووهەمدا ڕەنگی داوەتەوە. بەم شێوەیە لە زەمانی یەزدگردی یەکەمدا ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی لە بواری هەڵوێست و جووڵانەوە لەگەڵ مەسیحییەکانی ئێراندا ڕووی داوە. پاش ئەوەی کە پادشا کیژێکی جوولەکەی هێنا، وا بە چاکی لەگەڵ مەسیحییەکان جووڵایەوە کە ئەوان ناودێریان کرد بە «پادشای مەسیحی». شاپوور

کۆبوونەوەیەکی پێکهێنا لە گەورەپیاوانی دینی و «جاسلیق»ێک[١] لە سلۆکییە و پێنج «مەتران»ی[٢] لە هەرێمەکان بنەگر کردن و فەرمووی کە ڕێبەرانی مەسیحی ئازادن هەتا ڕێورەسمی دینیی خۆیان بەڕێوە بەرن؛ بەڵام وێدەچێ کە مەسیحی پێیان لە بەرەی خۆیان زیاتر ڕاکیشابێ و سنووری ئازادییان بەزاندبێ. جاری وایە هەڵسوکەوت و جووڵانەوەیان لەگەڵ پەرستگا و پێشەوایانی زەردەشتی ئەوەندە توندوتیژ بوو کە پادشا کەوتە ژێر تەوژمی ڕێبەرانی زەردەشتی و وای لێهات هەتا ڕێ و ڕەوشتی خۆی سەبارەت بە مەسیحییەکان بگۆڕێ.

وێدەچێ کە لە زەمانی یەزدگردی یەکەمدا، ئاوری ناکۆکیی نێوان ئێران و دەسەڵاتی تازەی هەیاتەلەی خیۆنی لە ڕۆژهەڵات هەڵگیرسابێ. وەکوو باسمان کرد شاپووری دووهەم هەیاتەلەی وەکوو «هاوپەیمانان» لە خاکی کووشاندا بنەگرکردن. هەیاتەلە خاشەی حکوومەتی کووشانە بچووکەکانیان کێشا و حکوومەتێکی بەدەسەڵاتیان دامەزراند و لە سەرەتای سەدەی پێنجەمدا کیسیان لە بێبرشتیی دەسەڵاتی ناوەندیی ئێران هێنا و لە دوو باڵی هیندوکوشەوە پەرەیان بە قەڵەمڕەوی خۆیان دا و لەو شوێنەوە بوونە مەترسی بۆ سەر هیندیش.

دوای نەمانی یەزدگردی یەکەم، کوڕەکانی دەمیان تێکنا و کردیانە برەمبرەم کە کێهەیان جێی بگرێتەوە. بارامی پێنجەم (٤٢١ـ٤٣٨ی ز) بە یاریدەی هێزەکانی میری عەرەبی «حیرە»، لەو هەرایەدا سەرکەوت. حیرە حکوومەتێکی بچووک و دەسنێژی ساسانییەکان بوو لە خۆرنشینی فورات و بارامیش لەوێ هەڵیدابوو. دەستێوەردانی نەتەوەیەکی غەوارە لە کاروباری زنجیرەی پادشایانی ئێراندا

---

١ـ پلەی پێشەوایانی دینی مەسیحی.و.

٢ـ پلەی پێشەوایانی دینی مەسیحی و دەکەوێتە بەرەژێر جاسلیقەوە.و.

سەردەقی بۆ شکا و کەسانێکی دیکەش خواستییانەوە و بەرەبەرە بوو بە یەکێک لە هۆکارەکانی دابەزینی هێز و دەسەڵاتی ئیمپراتۆری.

هیچ پادشایەکی ساسانی وەکوو بارامی پێنجەم بە مرۆیەکی گەل‌پەسند نەناسراوە. ئەو پیاوێک بوو ڕاوچی، شاعیر و مووسیقی‌زان کە بەتەواوی تامی لە ژیان دەزانی. خۆی لە کێشمەکێشم لەگەڵ مەزنان پاراست و بەشێک لە دەسەڵاتی بۆ تەرخان کردن. لەبەر هاتنە ئارای کۆمەڵێک ئەفسانە سەبارەت بە ئازایەتیی بارام، ناوی بە نەمری ماوەتەوە و لە ماوەی سەدان ساڵدا، تەنانەت دوای ڕوانەوەی ئیمپراتۆریی ساسانیش، بۆتە بابەتێکی سەرنج‌ڕاکێش لە نێو هونەرمەندانی ئێرانی‌دا. بارام لە شەڕێکی دژی هەیاتەلەدا سەرکەوت و توانی ڕووحی پرکێشیان خاو بکاتەوە و بەر بە پەرەگرتنی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان بگرێ، بەڵام شەڕ و تێکهەڵچوونی لەگەڵ بیزانس سەرکەوتنی کەمتری بە شوێنەوە بوو. هۆکاری ئەم شەڕە دەگەڕێتەوە بۆ سەر پێخوست‌کرانی مافی مەسیحییەکان و لە ئاکامدا ڕێککەوتنێک بەدی هات و ئازادیی دینی بۆ مەسیحییەکان وەبەرچاو گیرا. جارێکی دیکەش کۆمەڵێک ڕووداو بوونە هۆی پێکەوەسازانی ئێران و ڕۆم. پێشتر لە زەمانی شاپووری سێهەمدا ڕێککەتننامەیەک لە نێوان پادشا و ئیمپراتۆر «جۆڤیانووس»دا نووسرابوو. بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە هەردک لا دەبوو بەشداری پاراستنی ڕێ و ڕەوگەکانی قەفقاز بووبان. ئێرانی لەو ناوچانە چەند قەڵات و قایمەلانیان ساز کردن و سەربازخانەکانی ئێرانی بوونە پارێزەریان و حکوومەتی ڕۆمیش بەشێک لە خەرجەکەی دابین دەکرد. لەم ڕۆژگارەوە شەپۆلی هوونە ڕەوەندەکان بێبڕانەوە هرووژمی دەکردە سەر ئەم کۆسپ و لەمپەرانە و جاری وایە دەستیان بە سەردا دەگرتن. وەکوو ئاشکرایە لە ساڵی ٣٩٥ی زایینی‌دا، نەک تەنیا هەڵیاندەکوتایە

سەر ئەرمەنستان، بەڵکوو هێرشیان دەبردە سەر کاپادۆکییە و باکووری سووریاش و تەنانەت هەرەشە و مەترسیش بوون بۆ سەر ئەنتاکییە. لە زەمانی بارامدا، جارێکی دیکە حکوومەتی ڕۆم لێبڕا کە بچێتەوە سەر ڕێککەوتننامە کۆنەکە و بەشداری پاراستنی ڕێ و ڕەوگەکانی قەفقاز بێ. لە ڕۆژگاری بارامی پێنجەمدا، کێشەی مەسیحییەکانی ئێران چارەسەر کرا. لە گەرمەی کێشە و هەرای نێوخۆیاندا، پادشای ئێران کە پشتیوانی جاسلیقی تازە بوو، بەرەو پێکهێنانی کۆبوونەوەی کەشیشانی پاڵ پێوەنا کە تێیدا بڕیاریان دا کلیسای ئێران لە کلیسای بیزانس دابڕێ و سەربەخۆ بێ. بەم شێوەیە گومان و دڕدونگیی ئێران سەبارەت بە کاکەوبرالەیان لەگەڵ ڕۆمییەکان دەبوو ببڕێتەوە.

مەسیحییەکان کەوتبوونە بەر سەرنجی یەزدگردی دووهەم (٤٣٨ ـ ٤٥٩ی ز)، بەڵام ئەم نیازپاکی و لاواندنەوەیە هێندەی نەکێشا. پادشای ناوبراو پاش دەربڕینی هەستی هۆگربوونی سەبارەت بە دینەکان و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە لە تێکڕای ئەوانەی لە ئێراندا باو بوون، سەرەنجام بە دەمارگرژی لەسەر دینی زەردەشتی مایەوە و دوای ئەم یەکلابوونەوەیە کەوتە ئازار و ئێشاندنی یەهوودییەکان و مەسیحییەکان. بڕیاری پادشا کە دەیگوت دەبێ ئەرمەنستان بێتە سەر دینی زەردەشتی، خەڵکی هەرێمەکەی هاروژاند و ڕاپەڕین باڵی ئەنگاوت و پەل و دەستەی هێزەکانی ئێرانی تێکشکان. لە جەنگەی ئەم هەرایەدا پادشای ئێران لەگەڵ هەیاتەلەش تێکهەڵچووبوو. پاشان یەزدگرد وەکوو سەرکردەی هێزەکانی خۆی گەیشتە ئەرمەنستان و سەربزێوانی بەزاندن و بە مەبەستی دەمکوت کردنی خەڵک، نوێنەرانی مەزنەوەجاخان و پێشەوا دینییەکانی ئەوانی لەگەڵ خۆی هێنان بۆ ئێران.

لە سەردەمی دەسەڵاتی پیرووزدا (٤٥٩_٤٨٤ی ز)[١]، بارودۆخی نێوخۆی ئیمپراتۆری یەکجار شێوابوو. قاتیوقڕی لە ماوەی چەند ساڵی بێنێوبڕدا، کۆمەڵێک شار و ناوچەی بە سەر وێرانیدا خستن و وای لێهات کە پادشا چاو لە پیتاک بپۆشی و تەنانەت لە نێو خەڵکدا گەنم دابەش بکا. گێرە و کێشەی دینی وڵاتی دابەشی و پادشا دەستی لە ئازاردانی جوولەکان هەڵنەگرت. مەسیحی ببوونە پەیرەوی دوو ڕێباز: یەکیان نەستووری کە پێیان وابوو مەسیح خاوەنی دوو سرشتی خودایی و ئادەمزادییە و ئەوانی دیکە مۆنووفیزیستەکان بوون کە وایاندەزانی خودا لە ڕووحی خودی مەسیحدا تواوەتەوە و هەردک سرشتی خودایی و ئادەمزادی بوونە یەک و مەسیح خودایە. جگە لەم ڕووداوانە، شەڕەکانی پیرووز لەگەڵ هەیاتەلە وڵاتی بردە سەر لێواری هەڵدێران. پیرووز پاش یەکەم شکان و بە دیل گیرانی، بە مەبەستی ئازادکرانی خۆی دەستەبەر بوو هەتا باج و خەراجێکی قورس بدا و لە ماوەی کۆکردنەوەی ئەو گوژمەیەدا قوبادی کوڕی بە بارمتە دانا. پێوەبەسترانی باج و پیتاکی تازە بە خەڵکەوە و بارمەتیی دووبارەی ڕۆمییەکان دەبوو بخرێنە سەر یەکتر و لە خۆکرینەوەی پادشا بدرێن.

بەکورتی هەڵوێست و سیاسەتی بیزانس سەبارەت بە ئێران لە نێو جەغزی زیرەکی و وریاییدا هەڵدەسووڕا. لە ڕوانگەی ڕۆمەوە ئێران دەبوو دەوری پووشکەوڵات یان بەلاگێڕەوە ببینی و زەبری ئەو کێویلانە بگرێتە خۆی کە ڕەنگە هێرش و هرووژمیان بۆ سەر سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریی ڕۆم بە مەترسی داندرابا. هەروەها ئەگەر ئێران ئاوا یەکجار بێدەسەڵات بووبا، ڕێگا بۆ پەلوپۆ هاویشتنی تازەی بیزانس دەکرایەوە. بەپێی دەقی سەرچاوەکانی

---

١_ یان péroz (پێرۆز).

خۆراوایی، ئیمپراتۆر «زێنۆن» بە مەبەستی وەدی هاتنی ئامانجەکانی خۆی پیرووزی لە هەیاتەلەکان کڕییەوە و ئازادی کرد. زێڕی ڕۆم دەبوو بەختی پاراستنی کەوشەنەکانی دووچۆمان کرابان، چونکە ڕەنگە هەرێمە دەوڵەمەندەکانی کەوتبانە بەر پەلاماری خاپوورکەرانەی ئێرانییەکان. بەکورتی هەتا ئەو زەمانەی کە ئێرانی لەگەڵ جەماوەری کێویلە سەرقاڵی شەڕ بوون، دووچۆمان دەکەوتە دەرەوەی ناوچەی مەترسی؛ هەر بۆیە ڕۆم هاوکات لەگەڵ یاریدەدانی ئێران لە حاند تێکشکانێکی یەکجار کارەساتباردا، دەیهەویست شەڕیان لەگەڵ هوونەکانیش بۆ هەڵگیرسێنێ و ئاوری دووبەرەکایەتی بگەشێنێتەوە. بەگوێرەی دەقێکی سوریانی، هوونەکان بە فیتی ڕۆمییەکان پاش تێکدانی قەڵا و قایمەی ڕێ و ڕەوگەکانی قەفقاز کە هێزەکانی پیرووز دەیانپاراستن، هەڵیانکردە سەر ئەم پادشایە و هەتا هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی تێڕاچوون. پەلاماری هوونەکان کارێکی وای کرد کە شای شاهان ناچار بێ دەنگی لەشکری بدا بۆ بەرپەرچدانەوەیان.

پاش چەند ساڵان کە لە بەرەی هەیاتەلەدا باشتر لە بەرەی قەفقاز، هێوری و ئارامی باڵی ئەنگاوت و ئاوا پیرووز توانی قەرەبووی باری دارایی و داهاتی بکاتەوە و قۆشەنی پێویست پێکبێنێ، لێبڕا کە سەرلەنوێ بە گژ دوژمنانیدا بچێتەوە. پیاوانی دەورروبەری هەرچی وەبەریان هەڵخوێند کە وا باشە دەست لەو تەمایەی هەڵبگرێ، بەڵام سەرنەکەوتن. پیرووز ساڵی ٤٨٤ی زایینی هەڵیکردە سەر هەیاتەلە و دیسان بەزی و لەو هەنگاوە نابەجێیەدا سەری دانا.

لە زەمانی نەمانی پیرووزەوە، نەتەوەی دراوسێی باڵی ڕۆژهەڵاتی ئێران، تازە بە هاوپەیمانی ئێران داناندرێ و نەتەوەیەکی بەرفەرمانیش نییە کە باج و خەراج بدا، بەڵکوو زۆروکەم خۆی بە سەردار و سەروەر دەزانێ و تەنانەت بەوەندە

باجە قورس و نەغدەش ڕازی نابێ کە لە زەمانی پادشایەتیی چوار کەس لە جێنشینانی پیرووز لە ماوەی پتر لە نیو سەدەدا وەریدەگرت. پادشای هەیاتەلە ویستی کە دەست کە کاروباری نێوخۆی ئێران وەربدا و لە هەنگاوی یەکەمدا سەری بردە نێو دەمەقرە و ڕقبەرقەی خوازیارانی تاج و تەختی پادشایەتی و پیلانەکانی نێو کۆشک و بارگای میری. ئەم هەنگاوە لە زەمانی بەلاشی جێگرەوەی پیرووزدا هەستی پێدەکرێ، بەڵام دوای چوار ساڵ جێی بۆ قوباد چۆل کرد. ئەگەر بێتوو وەبیر خۆمانی بێنینەوە کە قوباد چەند ساڵێکی تافی لاوەتیی خۆی لە نێو هەیاتەلەدا تێپەڕ کردووە، دەکرێ بگەینە ئەم ئاکامە کە ئەم دەسەڵاتە لەو ڕووداوانەدا دەوری گێڕاوە کە بوونە هۆی بە پادشابوونی ئەم پادشایە (٤٨٨ی زایینی).

«هەر شەڕێک تێکشکانی بە شوێنەوە بووبا، دژکردەوەیەکی دینی و سیاسیی لێدەکەوتەوە.» ئەو ئەرکەی خرابوویە سەر شانی قوباد، قورستر بوو لە ئەرکی تێکڕای باب و باپیرانی. وڵاتی ئێران دوای کێشانی دەردی قاتیوقڕی و ڕوودانی شەڕەکانی پیرووز و تێکشکانی یەکجارەکی، کەوتبوویە سەر هەڵدێری سەرسووتانی ئابووری. جەماوەری بەرفەرمان ڕادەپەڕین و ڕەوەندەکان دەستیان لە تاڵانوبڕۆ هەڵنەدەگرت. دەبوو لە سنوورەکانی باکووری بەرپەرچی هوونەکان درابایەوە و خەراجیش درابایە هەیاتەلە. هەبوونی زێڕ پتر لە هەموو سەردەمێک پێویست بوو، بەڵام خەزێنە جرینگەی لێوەنەدەهات. قوباد پەیتاپەیتا باڵوێزی ناردن بۆ قوستەنتەنییە، بەڵام کارەکەی بێبەروبوو بوو. دەبوو لە جەغزی سیاسەتی نێوخۆدا، لە نێوان مەزنەوەجاخانی هەمیشە دەسەڵاتدار و گەلدا کە وێکرا ببوونە مەزدەکی و خوازیاری بەدی هاتنی ئاڵوگۆڕی قووڵی

کۆمەڵایەتی بوون بە قازانجی بێبەشان، یەکیان هەڵبژێرێ. پادشا بە چاونەترسی گەلی هەڵبژارد هەتا بتوانێ دەسەڵاتی مەزنان بەرەو لاوازی بەرێ.

بزووتنەوەی مەزدەکی لەسەر ڕێوشوێنی ئایینێک هەڵدەسووڕا کە بە شێوەیەکی تایبەت لە خوڵقانی جیهان و دنیای دیکەی دەڕوانی. مەزدەک ئەم دینەی لە ڕووی ڕێ و ڕەوشتەکانی «مانی»یەوە گەشە و پەرە پێدا و بانگی پەیڕەوانی خۆی کرد کە خۆیان لە ڕق و قین و شەڕوەنی بپارێزن. بۆچوونی مەزدەک لەسەر دابەشینی سامان بە شێوەیەکی هاوسەنگ لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا، سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشا. دەبوو سامانی دەوڵەمەندان کە بریتی بوو لە دارایی و ژنەکانیان، لە نێو هەژاراندا دابەش کرابان. لە نێو کۆمەڵێکی وەکوو کۆمەڵی ئێرانی سەردەمی ساسانیدا کە چینەکان تێیدا لە یەکتر جیاواز بوون، مرۆڤی بە بنەچەکە خواردەستە، هەرگیز نەیدەتوانی لە چینی خۆی تێپەڕێ و بەرەو سەر بڕوا و هەڵبدا. لەم پێکهاتەیەدا بنەماڵە و مڵکوماش و لێکدابڕانی چینەکان بەئاشکرا خۆی دەنواند. گەلاڵەی ڕێبازی مەزدەک کە جێی خۆیەتی بە کۆمۆنیزمی ئێرانی ناودێر کراوە، بە شۆڕشێکی ڕاستەقینە دادەندرا. تاقمێک لە زانایان، ئەم شۆڕشەیان بە دژکردەوەی کۆیلان، جووتیارانی نیمچەکۆیلە و جەماوەری بەربڵاوی مرۆڤی پێشتر ئازادی شار و گوندان داناوە، کە دژی دەرەبەگی و یاسای کۆیلەداری ڕاپەڕیون. ئەمە شەڕێکی چینایەتی بوو کە بۆنی دژایەتی لەگەڵ حەرەمخانەی مەزنانی لێوەدەهات کە پڕن بوو لە ژنانی دەسبەسەرکراو.

قوباد بوو بە لایەنگری ئەم بزووتنەوەیە و کۆمەڵێک یاسای پەسەند کرد کە وێدەچێ هێندێکیان سەبارەت بن بە ژنان. قوباد کەوتە نێو داوی پیلانێک و لێخرا و گیرا، بەڵام گیانی خۆی ڕزگار کرد و ماوەیەک دواتر هەڵات و پەنای

بردە بەر بارگای هەیاتەلە. ساڵی ٤٩٩ی زایینی هێزێکی هەیاتەلەی خستە بەرڕکێفی و گەڕایەوە ئێران و بە یاریدەی ئەوان، «زاماسپ»ی برای لێخست و چۆوە سەر دۆخی جارانی و لەو ڕۆژگارەوە هەڵوێست و سیاسەتی گۆڕی. قوباد لەبەروەی ناچار بوو خەراجی هەیاتەلە بدا و مووچە و مانگانەی هێزەکانی بەرقەرمانیشی دابین بکا، بە مەبەستی بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنانی پاڵی بە هەیاتەلەکانەوە دا. کاتێک ڕۆم خۆی لە دانی گوژمەی دیاریکراوی دەرهاویشت، پەیوەندییەکان تێکچوون و قوباد هێرشی بردە سەر ناوچەی دووچۆمان و «ئامێد»ی گرت و لەوێ دەسکەوتێکی زۆری وەچنگ هێنا. پاش پێکهاتنێک لەگەڵ بیزانس، کەوتە شەڕێکی ئازایانە دژی هوونەکان کە هەتا برانەوەی دەسەڵاتی بە شێوەیەکی نێوەنێوە درێژەی کێشا.

وەکوو دیارە بزووتنەوەی مەزدەک درێژەی بە ڕێبازی خۆی دا. ئەم بزووتنەوەیە بوو بە شۆڕش و کۆمەڵێک ئاژاوە و هەڵوێستی توندوتیژی لێکەوتەوە. ماڵ و سامانی دەوڵەمەندان بە تاڵان چوون و ژنیان ڕفێندران و دەست بە سەر زەویوزاریاندا گیرا. قوباد پاش هێوربوونەوەی بارودۆخەکە بە ڕووساردی لەگەڵ سەرۆکانی مەزدەکی جووڵایەوە کە تاقمێک نەجیمزادەش چووبوونە سەر دین و نێو ڕیزەکانیانەوە. کاتێک مەزدەکی دژی جێنشینایەتیی خوسرەوی کوڕی ڕاوەستان، ئەم پادشایە نێوانی لەگەڵ تێکدان. کۆبوونەوەیەک بۆ باس و دەمەتەقە پێکهات کە تێیدا پێشەوایانی زەردەشتی و مەسیحی ببوونە ڕکەبەری مەزدەکییەکان. مەزدەکی بەزین و قەڵتوبڕ کران و کتێبەکانیان سووتێندران و دەست بە سەر ماڵ و سامانیاندا گیرا. ئەم بزووتنەوەیە داکووژا، بەڵام بیروبۆچوونیان دواتر کاری بۆ کرا و بە نهێنی بڵاوبوویەوە و

مایەوە. نیوسەدە دواتر کوڕی قاقانی[1] گەورەی تورکانی خۆراوا بوو بە سەرجەلەی هەژاران و بێبەشان و ناوچەی ئاوەدانی بوخارای داگیر کرد و مەزنەوەجاخان و بازرگانانی دەوڵەمەندی لە خانە و لانەی خۆیان دەرپەڕاندن؛ بەڵام سەرکەوتنەکەی هێندەی خۆ بۆ نەگیرا. ئەم راپەرینە سەرکوت کرا و کوڕی قاقان گیرا و بە شێوەیەکی دڕندانە کوژرا. وێدەچێ کە دینی مەزدەکی لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی زایینیدا بووبێتە هاندەری «خۆرزاد»ی برای پادشای خارەزم. خۆرزاد دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت و دارایی و سامانی مەزنەوەجاخانی بە مەڕ وماڵات و کچان و ژنانەوە لە نێو هەژاراندا دابەش کرد. پادشا ناچار بوو کە داوای یارمەتی لە عەرەبان بکا و ئەوانیش بە سەرکردایەتیی «قوتەیبە» هاتن و دەسەڵاتی پادشایان سەقامگیر کردەوە و خاشەی کار و هەنگاوی خۆرزادیان کێشا.

قوباد کە خۆی کەسێکی ئاشنا بوو بە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، ویستی هەتا بارودۆخەکە بەرەو باشی بگۆڕێ، هەر بۆیە گەڵاڵەیەکی بۆ ئاڵوگۆڕی دارایی و داهاتی حکوومەت داڕشت، بەڵام مەرگ مەودای نەدا کە ئاواتەکانی وەدی بێن و جێنشینەکەی ڕێبازی ئەوی کوێر نەکردەوە. لێرەدا پێویستە وەبیری بێنینەوە کە لە زەمانی قوباددا ڕێچکەدینی نەستووری لە ئێراندا بوو بە تاقانەی دینی مەسیحی و کلیسای تازەش وەکوو دینی زەردەشتی کە هەمیشە دژی زەماوەند نەکردن و ڕەبەنی بوو، ئەم دابەی وەلانا و بە نابەجێی دانا.

لە سەردەمی خوسرەوی یەکەمدا (٥٣١ـ ٥٧٩)[2]، ئیمپراتۆری توانی لە شەڕ لەگەڵ مەزنان و جەماوەری خەڵکدا بە سەرکەوتوویی دەرباز بێ. بنەمای

---

١ـ خاقان

٢ـ مەبەست «ئەنووشەڕەوان»ە ـ نۆشینڕەوان ـ ئەنووشیروان = نۆشیروان.و.

دەسەڵاتی پادشایەتی هیچ زەمانێک وەکوو ئێستا نەیتوانیبوو ئاوا پتەو خۆی داڕێژێ، چونکە تەواوی چینەکان و تەنانەت پێشەوایانی دینیش سەریان وەبەر پادشا هێنابوو. لە سەرەتای کارەکانیدا پادشا بڕیاری دا کە تەواوی ئەو زەویوزارانەی لە جەنگەی دەسدرێژیی مەزدەکییەکاندا داگیر کرابوون، بدرێنەوە بە خاوەنەکانیان. چەند یاسایەکی پەسند کرد و چارەنووسی ژنان و ئاپۆرای منداڵانی ڕفێندراوی نەجیمزادانی لە گەرمەی سەرهەڵدانی مەزدەکییەکاندا ڕوون کردەوە. حکوومەت پەروەردەکرانی ئەم کوڕوکاڵانەی گرتە ئەستۆی کە لە داهاتوودا دەبوونە مەزن و ماقووڵانی سەر بە دەسەڵات و لەسەر شێوازێکی تازە دەڕۆیشت و دابی کۆن کوێر دەکرایەوە. مشووری گوند و ئاوەدانییان خورا و سەرلەنوێ نۆژن کرانەوە و دەستیان بە ڕێگاوبان و پرداندا هێنانەوە و جۆگە و کاریز جۆماڵ و خاوێن کرانەوە و مەڕ و ماڵاتی تێداچوو جێگایان پڕ کرایەوە. حکوومەت کۆمەڵێک یاسای پەسند کردن کە شێوەی کاروباری دارایی و داهاتی ئیمپراتۆری ئاڵوگۆڕی بە سەردا هات. هەموو زەویوزارێک پێداچوونەوەی حیساباتی بۆ ئەنجام درا و بەگوێرەی چۆنیەتی و ڕێژەوی خاک و چەشنی بەرهەمەکەی، پیتاکی پێوەبەسترا. سەرانەی مرۆڤ بەپێی چین و توێژی خۆی دیاری دەکرا. تەواوی ئەم ئاڵوگۆڕانە دەگەڕانەوە سەر هەناسەیەکی تازە کە ڕەنگدانەوەی مەیلی پادشا بوو بۆ ڕەچاو کردنی دادپەروەری و ڕاگرتنی پارسەنگی زیاتر لە نێو کۆمەڵدا. وەکوو دیارە ئەم ڕێوشوێنانە دەبوونە دابینکەری داهاتی وڵات و بۆ بەرەنگاربوونەوەی گرێ و کۆسپی نێوخۆ و شەڕ و تێکهەڵچوونی دەرەکی پێویست بوون. چاکسازی پەرەی ئەستاند و داوێنی سپاشی گرتەوە، کە هەتا ئەو کاتە تەنیا خاوەنی تاقە سەرکردەیەکی بەهێز بوو. لە سەردەمی نۆشیرواندا چوار

سەرکردە بۆ چواربەشی سپای ئیمپراتۆری وەبەرچاو گیران. گەل دەبوو مل بدا بۆ چوونە سەربازی و خوسرەو هێز و دەستەی «جووتێر- سەربازی» پێکهێنان و بە مەبەستی پاراستنی باشتری سنوورەکان، گەلێک عێل و عاشیرەتی لەسەر کەوشەکانی دامەزراندن کە دەوری هاوپەیمانانی رۆمی یان چینییان دەگێرا. بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی پەلاماردەرانی دەشتەکی و بیابانگەرد چەند قەڵا و قایمەلانی لەسەر رەوگەی «دەربەند» ساز کرد و لە نیزیک گۆشەی باشووری رۆژهەڵاتی دەریای خەزەر شوورەیەکی چەندین کیلۆمیتری راکێشا هەتا ئاوا بتوانێ پێدەشتی گورگان بپارێزێ کە دەتگوت کەلێن و قەڵشتێکە لە نێو زرێی چیاکانی ئێراندا.

ئەگەرچی پەیمانی «ئاشتیی هەمیشەیی» لەگەڵ بیزانس مۆر کرابوو، بەڵام دیسانیش خوسرەو لە ساڵی ٥٤٠ی زایینیدا هەڵیکوتایە سەر سووریا. ئەنتاکییە گیرا و سووتێندرا و جەماوەرەکەی راگوێزران بۆ شارێکی تازە کە هەر لەسەر شێوەی ئەو شارە و لە نیزیک تیسفوون ساز کرابوو. ئەو پەیمانی پێکهانەی کە ماوەیەک دواتر مۆر کرا، سەرەرای داسەپاندنی باج و خەراجێکی قورس، ئاڵوگۆرێکی لە سنوورەکانی خۆرنشیندا بەدی نەهێنا و جارێکی دیکە بوو بە دەستەبەری ئازادیی مەسیحییەکان. خوسرەو هەر لەم ساڵەدا کە خۆی بەهێز و دەسەڵات دەهاتە بەرچاو، لە حاند دانی باج و خەراجی ساڵانە بە هەیاتەلە سەری بادا کە تازە نەیاندەتوانی ویست و داخوازی خۆیان بە سەر ئێراندا بسەپێنن. بیست ساڵ دواتر، واتە ئەو زەمانەی کە خوسرەو لەگەڵ تورکانی خۆراوا ببوو بە هاوپەیمان، توانی بە یەکجاری هێزی هەیاتەلە تێکبشکێنێ و قەڵەمرەوی دەسەڵاتیان لە نێوان ئێران و تورکاندا دابەش کرا و لە ئاکامدا سنوورەکانی رۆژهەڵاتی ئێران هەتا رووباری جەیحوون لەبەریەک کشایەوە. چونکە سنوور و

دەڤەرەکانی باکووری ئێران سەربازخانەیان لێ داندران، بە شێوەی پتەو توانییان خۆیان لە ئاست هێرشی هوونەکان ڕابگرن و لە باشووری ئیمپراتۆری، یەمەن خرایە سەر قەڵەمڕەوی ئێران.

پەرەی خاکی ئێران و گەشەی هێز و بڕست و سەرکەوتنی قۆشەنی، بەئاشکرا هەڕەشە بوون بۆ سەر بیزانس و هیچ گومانی نەبوو کە شەڕێکی تازەی لەگەڵ کۆنە دوژمنی بە ئەستۆوە دەبێ. هەر بۆیە حکوومەتی ڕۆم کەوتە چالاکی و هەڵسووڕانێکی یەکجار بەربڵاوی سیاسی هەتا بتوانێ یەکییەتی و هاوپەیمانییەک دژی ئێران پێکبێنێ و بەتەواوی ڕکەبەرەکەی گەمارۆ بدا. چەند باڵوێزێک نێردرانە لای تورکانی خۆراوا و نەتەوەکانی دیکەی ئاسیای ناوەندی کە دەبوو پێکهێنەری باڵی باکووری ڕۆژهەڵاتی یەکییەتییەکە بوو‌بان. کۆمەڵێک باڵوێزی دیکەش بە مەبەستی وتوویژ لەگەڵ حەبەشە و حکوومەتە عەرەبییەکان بەڕێکران هەتا باڵی باشووری خۆرنشین پتەو بکرێ کە بەرەی بەربڵاوی سنووری هاوبەشی دوو ئیمپراتۆرییەکەیان پێکدێنا. هەڵسووڕانی ڕۆمییەکان ئاکامێکی لێنەکەوتەوە. ئەو شەڕەی کە لەبەر هەرا و ئاژاوەی ئەرمەنستان قەوما، هۆکارێکی تازە بوو بۆ بەهێزتر بوونی دەسەڵاتی سەربازیی ئێران. دووچۆمان کەوتە بەر پەلاماری قۆشەنی شای شاهان و کاول کرا. پادشای پیر، دوای نیزیکەی نیو سەدە دەسەڵاتداری، لە جەنگەی دیدار و وتوویژی پەیمانی ئاشتیدا، کۆچی‌دوایی کرد. سەرچاوەکانی ڕۆژهەڵاتی خوسرەو بە پادشایەکی تەواو دڵخواز، پارێزەری گەلان، تامەزرۆی دادپەروەری، شێلگیر و خێرخواز دەناسێنن. ڕەنگە بکرێ سەردەمی دەسەڵاتی خوسرەو هەم بە باری پێشکەوتنی سیاسی و دەسکەوتی سەربازیدا و هەم بە لایەنی گەشەی شارستانییەتی

ئێرانی لە بواری هونەری و زانست و وێژەدا، بە پرشنگدارترین سەردەمی ساسانی دابندرێ.

هۆرمزدی چوارەمی کوڕی (٥٧٩_٥٩٠ی ز)، پیاوێکی لێوەشاوە و زیرەک و خوێندەوار بوو. ئەو دەیهەویست بە ڕچە و ڕێبازی باوکی‌دا بڕوا و دەسەڵاتی بە سەر مەزنان و پێشەوایانی دینی‌دا بشکێنێتەوە. هۆرمزد لەبەرروەی کەمتر پارێزی ڕەچاو دەکرد، خێرایەکی کەوتە نێو گرێ و کۆسپی ئەو دوو چینە دەسەڵاتدارەی کۆمەڵی ئێرانی کە بۆیان بەدی هێنابوو. لەم ڕەوتەدا و بە مەبەستی سەقامگیرکردنی هێز و دەسەلاتی پتر پاڵی بە جەماوەری مەسیحیی بەرفەرمانییەوە دا و هەر ئەوەش دژکردەوەیەکی توندتری لە لایەن موغانی زەردەشتییەوە لێکەوتەوە. بارودۆخی دەرەوەی ئێران لەوەش ناخۆشتر بوو. ئاکامی هەڵوێست و سیاسەتەکانی بیزانس وردەوردە دەرکەوت و شاهانشایەتیی ئێرانی ناچار کرد کە بەرەنگاری دوژمنانی بکەوێتە بەربەرەکانی و هاوکات لە سێ بەراندا بجەنگێ. یەکێک لە گەورەترین سەرکردەکانی سەردەم بە ناوی بارامی چووبین لە بەرەی هوونەکاندا لە باکوور و بەرەی تورکان لە خۆرهەلات، زنجیرەیەک سەرکەوتنی وەدەست هێنا، بەڵام لە پەلامار دژی بیزانسییەکان تێکشکا. هۆرمزد ئەم تێکهەڵچوونەی بە دڵەوە نەنووسا و بە سەرساردی لەگەڵ بارام جووڵایەوە، لە ئاکامدا بارام کە یەکجار خۆشەویستی سەربازەکانی بوو، لە پادشا هەڵگەڕایەوە. مەزن و ماقووڵان پێیان وابوو ئێستا جەنگەی تۆڵە کردنەوەیە لە هۆرمزد؛ هەر بۆیە گرتیان و کوێریان کرد و خستیانە بەندیخانەوە و خوسرەوی دووهەمی کوڕیان (٥٩٠_٦٢٨ی ز)[١] لە جێی دانا؛ بەڵام خۆ بارامی چووبین بە شوێن ئامانجێکی گەورەتردا دەگەڕا.

---

١ـ مەبەست خوسرەو پەرویزە.و.

بارام چونکە لە ڕەگەزی یەکێک لە خانەدانە زۆر گەورەکانی ئەشکانی بوو، دەیهەویست دەستی بگاتە تاج و تەختی پادشایەتی، هەر بۆیە بە یاریدەی هێزەکانی پایتەختی گەمارۆ دا و خۆی بە پادشا دانا. ئەم دەسدرێژییە بۆ سەر پلەی پادشایەتی لە لایەن کەسێکەوە کە لە خانەدانی ساسانی نەبوو، بە کارێکی چەپەڵ دادەندرا. خوسرەو لە ئاست ئەم کۆدەتایە هیچی بۆ نەکرا و بەناچاری پەنای بردە بەر ئیمپراتۆر «مووریس» و ئەویش پشتیوانیی لێکرد و هێز و لەشکری نایە بەرڕکێفی. خوسرەو پەلاماری بارامی دا و سەرەونخوونی کرد و کوشتی و تەختی دەسەڵاتی وەچنگ هێنایەوە. ئەم یاریدەدانەی بیزانس پەیمانی پێکهاتنێکی قورس و گرانی بۆ ئێران بە شوێنەوە بوو. ئێران زۆربەی هەرە زۆری ئەرمەنستانی لە دەست دا و سنووری یۆنانی گەیشتە گۆلی وان و تفلیس.

چەند ساڵ دواتر و پاش مردنی ئیمپراتۆر مووریس، خوسرەوی دووهەم بە بیانووی وەرگرتنەوەی تۆڵە، خۆی لە داوی بەڵێنەکانی پێشووی دەرباز کرد و هەڵیکوتایە سەر حکوومەتی بیزانس. قۆشەنی ئێران سەرلەنوێ ئەرمەنستانی گرتەوە و «ئێدێس»ی[1] داگیر کرد و لە کاپادۆکییە تێپەڕی و توانی دەست بە سەر «قەیسەرییە»شدا بگرێ و بگاتە بۆسفۆر و دەوروبەری سکووتاری (٦١٠ی ز)[2]. ساڵی دواتر هێزەکانی پادشا، سووریا، ئەنتاکییە، دەمیشق و سەرەنجام «بەیتولمەقەددەس»یان گرت و لە ماوەی سێ ڕۆژدا ئەم مەڵبەندەیان تاڵان کرد. پتر لە پەنجاهەزار مەسیحی کوژران و شتە پیرۆزەکانی پەرستگا بۆ وێنە لەتێک لەو چاخەی کە مەسیحی پێوەهەڵاوەسرابوو، ڕاگوێزرانە ئێران. ساڵی ٦١٦ی ز. قۆشەنی ئێران «غەززە»ی گرت و گەیشتە نێو خاکی میسر و دەستی

---

١ـ ڕۆها یان ئەڕرۆها

٢ـ شارێکی وڵاتی ئالبانی

بە سەر بابیلۆن[١] و ئەسکەندەرییەدا گرت و شانبەشانی رووباری نیل بەرەوسەر هەتا سنووری حەبەشە رۆیی. لە ئاکامدا قەڵەمرەوێک بۆ ئێران بەدیهات کە پاش سەردەمی هەخامەنشی هەتا ئەو زەمانە هەرگیز ئاوا پەلوپۆی نەهاویشتبوو. سەرکردەکانی خوسرەو پاش گرتنی ئەنقەرە[٢] لە ئاسیای بچووک، قوستەنتەنییەیان ئابلۆقە دا و هەر ئەو کاتە لە بەرەی خۆرهەڵاتی، هەیاتەلەی بەرفەرمانی تورکانیش بەزین. ئیمپراتۆری هەرگیز سەرکەوتنی ئاوای وەدەست نەهێنابوون و قەت وڵات وەکوو سەردەمی خوسرەوی دووهەم هێزی تێنەزابوو، هەروەها هەرگیز ئیمپراتۆریی رۆم ئاوا نەکەوتبوویە سەر لێواری هەڵدێران.

وەکوو دیارە دژکردەوەی بیزانس هێندە بە قووندا نەکەوت و هێراکلیووسی[٣] ئیمپراتۆری تازە هێرش و پەلامارێکی توندوتیژی دەست پێکرد. ئیمپراتۆر لە ماوەی چەند ساڵاندا سەرتاسەری ئاسیای بچووکی رزگار و پاشەکشەی بە قۆشەنی شاهانشا کرد. هەڵیکوتایە سەر ئەرمەنستان و گەیشتە ئازەربایجان و لەوێ دەستی بە سەر گرینگترین پەرستگەی ئێرانیدا گرت و پاش ئەوەی توانی لەگەڵ خەزرەکانی هاوپەیمانی، کە لە قەفقاز تێپەڕیبوون، یەکتر بگرێتەوە، گەیشتە دەرە و دەشتی دیجلە و تیسفوونی گەمارۆ دا. خوسرەو کە لە پەنا و پەسیوێکی دەرباز بوون دەگەڕا، کەوتە چنگ نیزیکانی خۆی و کوژرا. رووخانی ئیمپراتۆری و چارەنووسی خەمورووژێنی خوسرەو پەرویز لەم زەمانەدا، جێگای سەرسوڕمانە. ئەگەر بێتوو لای دیکەی رووداوەکە بەوردی نەخرێتە بەر باس و لێدوان، رووداوێکی لێڵ و تەماوییە و هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ نادۆزرێتەوە؛

---

١ـ قاهیرەی ئێستا

٢ـ ئانکارا

٣ـ هێرکوول، هێرقێل

جا هەر بۆیە دەبێ تایبەتمەندییەکانی خودی پادشای گەورە و بارودۆخی نێوخۆی وڵات وەبەرچاو بگیرێن. خوسرەوی دووهەم پیاوێکی چاوبرسی، تووڕە، تۆسن، ترسەنۆک و دووڕوو بوو. پادشا گەلی لە ژێر باری باج و پیتاکدا هاڕیبوو. بەزەیی بە گەورە و بچووک و بەهێز و بێهێزدا نەدەهات. لەبەروەی پیاوێکی دڕدۆنگ بوو، تەنانەت نیزیکترین خزمەتکارانی خۆی ئاودیوی دنیای نەبوون کردن. چونکە تامەزرۆی زریقە و بریقە و شان و شەکەوت بوو، پارەیەکی زۆری بۆ بارگای خۆی خەرج دەکرد. کۆشک و بارگای میری پڕ بوو لە هەزاران ژنی مارەنەبڕاو و کۆمەڵی خزمەتکاران و لۆتی و چاوەش و گۆرانیبێژ. لەبەروەی پیاوانی وڵات دەبوو بچنە ڕیزی قۆشەنی میری بەرەبەرە ژمارەیان کەم دەبۆوە. ئەو گەلانەی کە پێ لە بەرەی خۆیان زیاتر ڕادەکێشن گیرۆدەی قەیرانی ئاوا دەبن و تۆرەمەیان پەرە ناگرێ. ئێرانی لە هەرەتی پێشکەوت و سەرکەوتنی خۆیاندا ئاوا تووشی بەزین و داوەشان بوونەوە.

سەرکەوتنەکانی ئیمپراتۆر هێراکلیووس، گومانی لەسەر مەسیحییەکان ساز کردبوو کە پادشا لەوپەڕی دڵڕەقیدا دەیچەوساندنەوە و دەیئێشاندن. دەتگوت تەواوی توخمەکانی سروشت دژی خوسرەو وەخۆکەوتوون؛ چونکە سێڵاوە بەربڵاوەکانی ڕووباری دیجلە سەرلەبەری ناوچە بەرێژەوەکانی کردن بە زۆنگاو و تەنانەت بەشێک لە کۆشکی تیسفوون بە گوڕمی لافاو داڕما. پادشا کە نەخۆش بوو، پەیماننامەی ئاشتیی لەگەڵ هیراکلیووس مۆر نەکرد. خوسرەو کە لە لایەن سەرکردە سەرکێشەکانی خۆیەوە دەورە درابوو، سەرەنجام بە دەستی کوڕی خۆی کە لە داوێنی «ماریا»ی شادۆتی بیزانسی بەرببۆوە، دوایین زەبری لێوەشا و کوژرا.

لە ماوەی چاردە ساڵ پاش مەرگی خوسرەوی دووهەمدا هەتا دەگاتە یەزدگردی سێهەمی ئاخرین پادشای ساسانی، کەمتر لە دوازدە پادشا لەسەر تەختی دەسەڵات پاڵیان نەداوەتەوە. مەرگ و نەمانی دوایین پادشای گەورەی ساسانی، ئەو دیوارە سەخت و پتەوەی کە خوسرەو لە هێز و دەسەڵات و دڵرەقی بۆ هەسدانەوە ی تاســە و ئــاواتی پرکێشـــانەی دەرەبـــەگان و سەرکردەکانی لەشکری دایرشتبوو، تێکیرووخاند. وڵات لەبەر شەڕوشوور و باج و پیتاک و زوڵم و زۆرداری و شەپۆلی ڕقبەرقە بەرەو خنکان دەڕۆیی. شــازادەکان تــەنیا بووکەڵــەی گەمــە و یــاری بــوون لـــە نێـــو باڵبـــاڵێنی دەسەڵاتداراندا و بۆیە تاجیان لە سەر دەنا هەتا دوای چەند مانگێک بکوژرێن. لەبەروەی پیاو لە کورتێی دا، ژنیان کردنە پادشا و بووران[1] و ئازەرمیدوختی کچی خوسرەو خۆیان لەو پلەیەدا دیتەوە. سەرکردە گەورەکانیش بە پشتیوانیی چەکدارانی خۆیان و یاریدەی بیزانسییەکان، دەیانویست دەست بە سەر تەختی پادشایەتیدا بگرن، ئەگەرچی هیچکامیان لە تۆرەمەی خانەدانی ساسانی نەبوون و هیچ مافیان نەبوو بۆ وەرگرتنی پلەی پادشایەتی. بەکورتی لەبەروەی ئەندامانی خانەدانی ساسانی سەرلەبەریان بە تۆبرکران گەیبوونە ویشکاوی تۆرەمەیان، وای لێهات کە دەسەڵاتداران لە ساڵی ٦٣٢ی زایینیدا بە مەبەستی دانانی شایەکی تازە ناچار بوون شازادەیەکی پەنابەر لە ئیستەخر بدۆزنەوە. شازادەیان لە حەشارگەی دەرکێشادەر و هەر لەوێ تاجی پادشایەتییان نایە سەری؛ بەڵام تازە درەنگ بوو، چونکە ئیمپراتۆری کە دامودەزگا و ڕێکخستنی قۆشەنی پێشتر تاقی کرابۆوە، هەر ئەم هێزە خەریک بوو لێکیدادەبڕی و شیرازەی لێکهەڵدەوەشاند. وەکوو دیارە سەرکردەی هێزەکانی میری کە

---

١ـ پوورانمیدوخت

حوکمداری هەرێمەکانیش بوون، قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیان بە کەڵەبڕ یان هەمان پانەوانەمیر دەزانی. ئەم بارودۆخە بە شێوەیەکی جێی سەرسوڕمان سەردەمی ئاخرین پادشایانی هەخامەنشیی دێنایەوە یاد کە میرهەرێمەکان چلۆن توانیبوویان دەست بە سەر هەرێمەکانی خۆیاندا بگرن. ئیمپراتۆری لێکهەڵوەشا و بوو بە کۆمەڵێک وڵاتۆکە و مێژوونووسانی عەرەب بەوردی ناوی هەموویان تۆمار کردوون. هیچ هێزێک نەیدەتوانی خۆی لەبەر ئەو تەوژمە ڕابگرێ و کۆمەڵی مەزنەوەجاخانی نوێ کە خوسرەوی یەکەم ڕێکیخستبوو، هێشتا ئەوەندە تورت و فەریکە بوو کە نەیدەتوانی بە شێوەیەکی شیاو دەسەڵاتی لەرزۆکی بنەماڵەی هەڵتەکاوی ساسانی بپارێزێ. پەلاماری لەگوڕی چولەوارنشینانی ناشارستانی خاشەی هەموو شتێکی کێشا.

ڕۆستەمی سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکانی ئێران، سەرەڕای شارەزایی و لەشەڕزانی و قۆشەنی دەسکەرەوەی، لە قادسییەی نیزیک «حیرە»ی دووچۆمان شکستێکی بە سەر شانیدا هات و لەو شەڕ و هەرایەدا کوژرا. هێندەی پێنەچوو کە تیسفوون گیرا و خەزنەخانەی گەورە وەبەردەستی عەرەبان کەوت. شەڕ و بەربەرەکانی لە بانووی ئێران درێژەی کێشا و یەزدگرد هێزێکی تازەپشووی کۆکردەوە و لە دەشتی نەهاوەندی باشووری هەمەدان بەرەوڕووی عەرەبان کەوتە بەرخۆدان؛ بەڵام ئەم جاریش عەرەب سەرکەوتن. پادشا وێڕای بارگای بەرەو ڕۆژهەڵات ڕەوی و چەشنی ئاخرین پادشای هەخامەنشی لە دەوروبەری «مەرو» کوژرا و شاهانشایەتی ڕووخا (٦٥١ی زایینی).

## پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و هێزی چەکدار

سەرچاوە راستەخۆکانی سەبارەت بە دەسپێکی سەردەمی ساسانی، گەلاڵەیەکی گشتییان دەربارەی رایەڵوپۆی کۆمەڵایەتیی ئەو رۆژگارەی ئێران خستۆتەڕوو. سەرخان و ژێرخانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی وا سفت و پتەو و قووچەکی تەندرابوو کە مرۆڤ نەیدەتوانی چیناوچینی تێدا بکا و بەرەو سەر پێهەڵبچێ. پادشا لە نووچکەی ئەم قووچەکەوە خۆی دەنواند و کۆمەڵ بە سەر چوار چیندا دابەش دەکرا و لە سەرەوە بەرەو خوار جەماوەری چینەکان پتر دەبوون. ئەم کەسانە بە کۆڵەکە و چواربەندەی وڵات و پێکهێنەری دەرەبەگایەتی دادەندران و بەشداری بەڕێوەبردنی دەبوون. چینی یەکەم بریتی بوون لە تێکڕای شازادان و کۆمەڵێک پادشای ورد و درشت کە سەریان وەبەر پادشای گەورە دێنا و لە چاکەی ئەم کارە ئەوانیش خاوەن دەسەڵاتی ناوچەیی و خۆجێیی بوون. هەروەها کۆمەڵێک شازادەی دیکەی بنەماڵەی میری کە فەرمانڕەوای هەرێمە بەربڵاوەکانی وەکوو سیستان و کرمان یان هەرێم و مەڵبەندە گیراوەکانی وەکوو کووشانی سەردەمی خۆیان بوون، هەر دەکەوتنە چینی یەکەمەوە. ئەگەر بێتوو ئەم چاخە لەگەڵ سەردەمی پارتەکان بەراورد بکەین، بە شێوەیەکی هەستپێکراو بۆمان دەردەکەوێ کە لە رۆژگاری ساسانییەکاندا زنجیرەی قوڵەپادشاکانی خۆجێیی کەم بوونەوە و لە ناوچە سنوورییەکان تۆویان بڕاوە. لەم ناوچە و مەڵبەندانەدا دەوری قوڵەپادشاکان زۆروکەم وەکوو ئەو تیرە و هۆزە زۆر و زەوەندانە دەچن کە رۆمییەکان لەسەر سنووری خۆیان بنەگریان کردبوون. ئەگەرچی پێملبوونی ئەوان جاری وایە راست و پتەو رەنگی نەداوەتەوە، بەڵام دیسانیش دەبوو کۆمەڵێک سەرباز بخەنە بەردەستی حکوومەتی ناوەندی و قەڵەمڕەوی خۆیان بپارێزن و بەکورتی بەرپرسی

پاراستنی تەناهیی سنوورەکانی ئیمپراتۆری بن و بەرپەرچی پەلاماری دەرەکی بدەنەوە.

لە چینی دووهەمدا، سەرۆکانی حەوت مەزنەماڵەکان خۆیان دەنواند کە ژمارەیان لە سەردەمی هەخامەنشییەوە بەرەودوا گۆڕانی بە سەردا نەهات. هەلومەرجی ژیانی دەرەبەگانەیان، میراتی ڕاستەوخۆی سەردەمی پارت بوو. لەو ڕۆژگاریدا هێز و دەسەڵاتی ئەو مەزنەماڵانە کۆسپ و تەگەرەی سەر ڕێی سەقامگیربوونی دەسەڵاتی پادشایەتی بوو. ساسانییەکان وێڕای قبووڵ کردنی ئەم چینە، تێکۆشان هەتا هێز و دەسەڵاتیان دابەزێنن، جا هەر بۆیە ئەم دابەزینی دەسەڵاتە لە خولی یەکەمی فەرمانڕەوایەتیی ئەوانەوە هەتا زەمانی مەرگی شاپووری دووهەم درێژەی کێشا. ئەوەی ڕاستی بێ لە سەردەمی ئەو پادشایانەوە کە دواتر لەسەر تەختی دەسەڵات پاڵیان دایەوە هەتا ڕۆژگاری بە پادشابوونی خوسرەوی یەکەم کە بە قۆناخێکی ١٢٥ی ساڵەی پڕ ئاژاوە و بێهێزی دادەندرێ، چینی دووهەم وەبرەو کەوتنەوە و چوونەوە سەر دۆخی پێشوویان، بەڵام لە ڕۆژگاری دوو پادشای دواییدا، دیسان بەرەو کەمدەسەڵاتی گلۆر بوونەوە. مەزنەوەجاخان بە هەڵگیرساندنی کێشە و هەرای دەسەڵاتپەرستانەی لەمێژینەیان لەگەڵ ناوەندی دەسەڵات، بوونە یەکێک لە هۆکارەکانی دارمانی حکوومەتی ساسانی. زێدەپشک و شانەبەرزەی ئەم مەزنەماڵانە بە چاکی ڕوون نەبۆتەوە، بەڵام وەکوو دیارە لە تەواوی هەرێمەکاندا برشتی دەسەڵاتیان ڕەنگی داوەتەوە و پاڵە و سەپان و ڕەنجبەر و جووتیارکانیان بێجگە لە باج و پیتاکی میری، دەبوو بەشی ئەوانیش جوێ بکەنەوە. لەبری ئەم قازانج و داهاتە مەزنانیش بە زەبری چەک و چەکدار دەبوونە پارێزەری پلەی پادشایەتی و لە جەنگەی پێویست و تەنگەتاویدا،

لەسەر شانیان بوو کە وەکوو سەردەمی پارتەکان دەستە و پەلی تەیار ڕێک بخەن. تاقمێک لەو میرەماڵانە لە ماوەی چوارسەت ساڵەی مێژووی پڕ هەوراز و لێژی ساسانیدا، توانییان پلە و پایەی بە میرات گەڕاوی خۆیان بپارێزن و نەهێڵن بەرپرسایەتی ئیداری و لەشکری لە دەستیان دەربچێ.

لە ڕاستیدا دەوری سەرەکیی چینی «مەزن و ماقووڵان»، کەم کردنەوەی دەسەڵاتی پەرەگری سەرۆک و سەرکردەکانی مەزنەماڵان بوو کە پلەداران، وەزیران، سەرۆکی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و ئەفسەرانی میری لەو ڕیزەدا خۆیان دەنواند. گەشە و پەرەی جەغزی دەسەڵاتی ئەم چینی سێهەمە، بە چەشنێک داهێنانی ساسانییەکان دادەندرێ. پادشایەتیی ساسانی کە لە لایەکەوە پشتئەستوور بوو بەم چینە و لە لایەکی دیکەوە بە قۆشەنی دڵگەرم بوو، توانی سەرلەنوێ کاروباری وڵات ڕێک بخاتەوە و هێزێکی وا دامەزرێنێ کە سەردەمی ئەشکانی بە خۆیەوە نەدیبوو.

لە خوارخوارەوە کە دەبێتە چینی چوارەم «ئازادان» خۆیان دەنواند کە بریتی بوون لە قوڵەئاغا و نیمچە وەجاخزادە و کوێخای گوندان. ئەمانە ببوونە ڕایەڵەی پەیوەندیی نێوان جەماوەری گوندەکی و حکوومەتی ناوەندی کە کاربەدەستانی حکوومەتی بە نوێنەری داندرابوون. ئەم قوڵەمیر و بەگلەرانە بەرپرسی کۆکردنەوەی باج و پیتاکی جەماوەری گوندەکی بوون و هەرکام هێزێکی چەکداری بچووکیان پێکهێنابوو. خەڵکی گوندان زیاترین حەشامەتی ئێرانیان پێکدێنا و بەپێی یاسا ئازاد بوون، بەڵام بەکردەوە ببوونە کۆمەڵانی کۆیلەی تێبەستەی زەوی‌وزار و لەگەڵ ملکوماش و گوندان دەفرۆشران.

دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی ساسانی بە شێوەیەک چواربەندەی لێکدرابوو کە مەزنەوەزیر یان سەرۆکوەزیر دەکەوتە لووتکەی و بەکردەوە جڵەوی دەسەڵاتی

بە دەستەوە دەگرت و کەموزۆر بە چاودێریی پادشا، ئەرکەکانی ڕادەپەڕاند. ئەگەر بێتوو پادشا بە دەستەوە نەبووبا، ئەم مرۆڤە پایەبەرزە دەبوو بە جێگرەوەی و بە کاروباری سیاسی ڕادەگەیشت و مشووری کاری شارانی دەخوارد و قەراروبڕی و پەیماننامەکانی مۆر دەکرد و جاری وایە وەکوو سپاسالاری هێزە چەکدارەکان بەشداری شەڕ و تێکهەڵچوون دەبوو. هەروەها مەزنەوەزیر دەکەوتە سەرووی تەواوی وەزارەتخانە یان دیوانخانەکان کە کۆمەڵێک قەڵەمداری شارەزای بواری نووسین و دارشتنی ڕاپۆرت و پەیماننامەی سیاسی و نامەگۆڕینەوەی ڕەسمی، کاریان تێدا دەکردن. ئەم تاقمە دەیانتوانی بێجگە لە پلەی «دیوانداری»، لە تەواوی پلەکانی دیکەی ئیداری‌دا کار بکەن کە بریتی بوون لە: کاروباری نووسینگەی حکوومەتی، بەشی ناردنی نامە و نامەگۆڕینەوە، بەشی دادوەری، بەشی دیاری‌کردنی پلە و بەخشینی پلەی شانازی، کاروباری سەربازی و دارایی. ئەم بەرپرسایەتییەی دوایی بە یەکێک لە گرینگترین پلە و پایەکانی حکوومەتی دادەندرا و بەڕێوەبەری ئیدارەی باج و پیتاک وەکوو سەرۆک کۆمەڵێک ژمێریار و باجئەستێن و کاربەدەستی دیکەی دەکەوتە بەرفەرمانی. ئەم پلەیە بەرپرسایەتییەکی قورسی دەکەوتە سەر شانی، چونکە دەبوو تەوەرەی ژیان و مافی وڵات و پێداویستییەکانی دابین بکا و بیگێڕێ.

بەشی زۆری داهاتی وڵاتێکی کشتوکاڵیی وەکوو ئێران، دەبوو لە پیتاک و مڵکانەی زەوی‌وزارانەوە دابین بووبا کە سەرانەی خەڵکیشی دەکەوتە سەری؛ بەڵام لە ڕۆژگاری کۆن‌دا زۆربەی جاران کۆکرانەوەی باج و پیتاک و مڵکانە و سەرانە، پڕکێشی و چەوساندنەوەی تێدا دەکرا و کاربەدەستانی میری وایان تەنگ بە خەڵکی گوندان هەڵدەچنی کە قەرزداربار دەردەچوون. سەردەمی

ساسانیش نەیتوانی خۆی لەم ملۆزم و پەتایە بەدەر و دوور بگرێ کە لە مێژووی گەلانی وەکوو میسرییەکانی سەردەمی «بەتالیسە» و ڕۆمییەکانی سەدەی دووهەم و سێهەمدا، هەرا و ئاژاوەیان بە شوێنەوە بوو. پادشایانی ساسانی زۆر جاران بە مەبەستی هێورکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک، بڕی قەرزەکانیان دەبەخشی یان شێوازی دانی باج و پیتاکیان دەخستە سەر بارێکی ڕێک و هاسانتر.

پادشا گەورەترین دادوەر بوو. ئەگەر بێتوو کەسێکی خەڵکی وڵاتەکەی مافی پێشێل کرابا یان هەقی خۆی بۆ وەرنەگیرابا، دەیتوانی سکاڵای بەرێتە لای. گەلی ئێران هەمیشە تامەزرۆی هەق و دادپەروەری بوون و گەلێکیان ڕێز بۆ دادوەری پیاوچاک دادەنا. ئەگەرچی دیوانی دادوەری لە ئارادا بوو، بەڵام پتر پیاوانی ئایینی بەو کارە ڕادەگەیشتن، چونکە یاسا و ڕێسای وڵات بە دینەوە شەتەک درابوو. لە شاری هەرێمەکاندا ئەم ئەرکە دەخرایە ئەستۆی پێشەنگانی دینی، بەڵام لە گوندان ئاغا و کوێخا ئەم کارانەیان ڕادەپەڕاند. ڕوون نەبۆتەوە کە داخوا کۆمەڵێک یاسای نووسراو بە دەستەوە بووە یان نا، بەڵام کتێبی پیرۆزی زەردەشتی چەند بەشێکی تایبەت داوە بە مافی ئەندامانی کۆمەڵ، تاوانەکانی دژی پادشا، حکوومەت، دین، خەڵک و هتد. «ڤەر»[١] و ئەشکەنجەدان باو بووە و

١ـ لە ئەڤێستادا Varah و لە پەهلەویدا Var لە ڕەگی Var بە واتای ناسینەوە و باوەڕمەندبوونە. لە ئێرانی کەونارادا بریتی بووە لە کۆمەڵێک تاقیکردنەوە کە دەبوو سکاڵاکەر و سکاڵالێکراو، هەقبوونی داوا و قسەی خۆیانی پێ بسەلمێنن. چونکە لە ڕۆژگاری کۆندا دۆزرانەوەی ڕاستەقینە دژوار بووە، بەناچاری پەنایان دەبردە بەر هێزەکانی ئەوپەڕسروشتی و ئاوا خوازیاری ناسرانەوەی هەق و ناهەق دەبوون. یانی لە دادگاییکرانی لێل و تەماویدا چارەیەکیان پێ شک نەهات کە هەرد لای کێشەکە بەتاقی بکەنەوە و هەرکامەیان بۆی دەرچوو ئەویان ڕاست دەکا و لەسەر حەقە. بڕ: مەزدیەسنا، بە قەڵەمی وەرگێر، ل ٤٤٢ بەرەودوا.م.

بەپێی ئەو نەزیلانەی کە لە شەهیدانی مەسیحی گێڕدراوەتەوە، ئازار و ئەشکەنجەکان یەکجار تاڵ و ناخۆش بوون.

ئیدارەی نێوخۆی وڵات هەمیشە لەسەر تەوەرەی دابەشبوون بە سەر چەند هەرێمێکدا هەڵدەسووڕا کە پتر پایەبەرزانی خانەدانی میری و جاری وایە مەزنەوەجاخان و لە کلکەی دەسەڵاتی ساسانیدا، سەرکردە سەربازییەکان بەڕێوەیان دەبردن. سنووری هەرێمەکان هەمیشە وەکوو خۆیان نەدەمانەوە و تووشی گۆڕان دەبوون. دابەشکرانی وڵات بە سەر چەند هەرێمدا کە جاری وایە ڕەنگی گریمانە و ئانقەستی پێوە دیار بوو، زۆر جاران گرێوگۆڵی وەبەر ڕەوتی هەڵسووڕانی کاروباری بەڕێوەبەرایەتی دێنا و تەنانەت دەبوو بە گرێ و کۆسپی سەر ڕێی پەرە گرتنی کار و هەڵسووڕانی گەشەی داهات و سامان. خودی هەرێمەکان بە سەر چەند ناوچەیەکدا دابەش دەکران کە میرناوچەکان بەڕێوەیان دەبرد و ئەوانیش دەکرانە چەند مەڵبەندێک و حکوومەت سەرۆکی گچکەی بۆ دیاری دەکردن و قوڵەئاغا و کوێخادێ دەکەوتنە بەرەوەیان. سەرلەبەری ئەم پێکهاتە و ڕایەڵە ئیدارییە پاش پەلاماری عەرەبان هەروەک خۆی مایەوە و پاشماوە و ئاسەواری تەنانەت لە ڕۆژگاری ئێمەشدا وەبەرچاو دێ. بەگشتی ئەم بارودۆخە لە سەردەمی ئەشکانییەوە باڵی بە سەر وڵات کێشاوە کە مەزنانی دەرەبەگ گەیبوونە قۆناخی دەستوەردان لە کاروباری بەڕێوەبەرایەتیدا. لە سەردەمی ساسانیدا هەنگاوێکی گەورە هاوێژرا و ئەویش بریتی بوو لە نەگۆڕ مانەوەی پێکهاتەی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و بەسترانەوەی ڕاستەوخۆی بە ناوەند و گوێڕایەڵبوونی هەرێمەکان بۆ پایتەخت. بەم شێوەیە وڵاتێک کە لە سەردەمی پارتەکاندا بە سەر کۆمەڵێک حکوومەتی

گچکەدا دابەش کرابوو، لە سەردەمی ساسانیدا یەکتری گرتەوە و بنەیەکی سەرەکیی بۆ دیاری کرا کە توانی دابینکەری شکۆ و بایەخی بێ.

هەروەها ڕێوشوێنێکی ورد و باریکیش بالّی بە سەر کۆشک و بارگای میریدا کێشابوو کە موو بە موو ڕەچاو دەکرا. مەزنان و کاربەدەستانی بارگا بەپێی توخم و تۆرەمە یان کار و ئەرکی پێسپێردراویان بە سەر سێ دەستەدا دابەش دەکران کە خزمان و کەسانی پادشا و پاشان یارانی هاوڕکێف و هاودەمانی دەکەوتنە پلەی یەکەم و تاقمی تەڕدەست و ویشکەڕن و قۆشمەچی دەکەوتنە پلەی خوارتر. گۆرانیبێژان و چاوەشان دواتر دەهاتن و لە بارگادا ئەرکێکی گرینگیان دەکەوتە سەر شانی و بەگوێرەی هونەر و ئەو سازانەی کە دەیانزانی بیژەنن ئەوانیش دەبوونە سێ تاقم.

بە مەبەستی دابینبوونی خەرجوبەرجی قورس و گرانی بارگای میری کە بریتی بوو لە هەزاران کەس و هەروەها بۆ دابینی داموودەزگای بەڕێوەبەرایەتی، قۆشەن و ڕاپەڕاندنی کاروباری پێویستی خزمەتی هەمووانی، جگە لە باج و پیتاک داهاتی دیکەش لە ملّکوماشی پادشا و کانگاکانی دەست حکوومەت و گوومرگانەی بواری بەربلاوی بازرگانی، هەڵدەگیران و دەسکەوتی جاروبارەی شەڕانیشیان دەکەوتە سەر کە خەزێنەی بەتالّیان دارمالّ دەکردەوە. خەرجکرانی ئەم داهاتانە دەگەڕایەوە سەر خواستی پادشا و هەر کات لە نێو پادشایانی ساسانیدا کەسانێکی بەرچاوڕوون دەهاتنە سەر دەسەلات و دەیانهەویست یاریدەی خەڵک بدەن، تێکڕایان وەکوو سەردەمی هەخامەنشی مەیلیان بە لای پاشەکەوتی ساماندا دەشکایەوە. بەم شێوەیە لە جەنگەی سەرکەوتنی عەرەباندا، تەواوی ئەو خەزێنانەی میری کەوتە دەستیان کە ماوەیەکی زۆر بیر و خەیالّی مێژوونووسانی بە خۆیەوە شەتەک دابوو.

لە ماوەی سێسەت ساڵەی یەکەمی پادشایەتیی ساسانیدا، پێکهاتەی سپا و سەرکردایەتییەکەی بە دەست سپاسالارێکی هەرە مەزنەوە بوو. ئەم پلەیە بە میرات دەگەڕا و هەمیشە بە چنگ یەکێک لە ئەندامانی خانەدانی میرییەوە بوو. دوو سەرکردەی گەورە دەکەوتنە بەرفەرمانی سپاسالاری گشتی و یەکیان ڕێکخستنی کاروباری قۆشەنی دەکەوتە سەر شانی و ئەوی دیکەیان فەرماندەی سپای سوارە بوو. ئەم دوو پلەیەش هەر دەدرانە بنەماڵە مەزنەکانی میری. خوسرەوی یەکەم ئەو پێکهاتەیەی گۆڕی و پلەی سپاسالاری هەرە بەرزی کوێر کردەوە و چوار سەرکردەی بۆ چوار باڵی باکوور، باشوور، خۆرهەڵات و خۆرنشین دیاری کرد و قۆشەنی خستنە بەرفەرمانی و هەرکامەیان جێگرێکی بۆ دانان. ئەم کارە کە بە مەبەستی نەهێشتنەوەی دەسەڵات لە دەست تاقە کەسێکدا کرابوو، لە درێژخایەندا دیسان کۆمەڵێک مەترسیی بەدی هێنا و بۆمان دەرکەوت کە ئەم سەرکردانە لە دوایین ساڵەکانی حکوومەتی ساسانیدا چ دەورێکی شوم و دزێویان گێڕا.

قۆشەنی ساسانی وەکوو سەردەمی پارتەکان لەسەر تەوەرەی هێزی سوارەی قورسەچەکی زرێپۆش هەڵدەسووڕا کە بریتی بوون لە مەزنەوەجاخانی ئێرانی. ئەم بەشە لە لایەن هێزی سوارەی سووکەڵەچەکی کەوانداری نەجیمزادانی بەرەژێرترەوە یاریدە دەدرا. لە دوای ئەم سوارە زەبروەشێنانەوە، فیلسوارەکان ڕادەوەستان کە پارتەکان هەرگیز کەلکیان لێوەرنەگرتبوون. پاشەنگی لەشکر بریتی بوو لە هێزی پیادەی جەماوەری گوندەکی کە چاک تەیار نەدەکران و بە باری سەربازیدا بایەخێکی ئەوتۆیان پێنەدەدرا. هێزی پشتیوانی هۆز و نەتەوەکانی سەر بە ئێران و دانیشتووی سنوورەکانی ئیمپراتۆری، زۆر لەوانە گرینگتر بوون و لە سەردەمی هەخامەنشییەوە سوارەی شەڕکەر و

ئازایان پێکدێنا. لە سەردەمی ساسانییەکاندا ئەم هۆز و نەتەوانە بریتی بوون لە خەڵکی سیستان، ئاڵبانییەکان، کووشانییەکان و هەیاتەلەی خیۆنی. هێزی سوارەی ئەرمەنیش زۆری بایەخ پێدەدرا و لە قۆشەنی ساسانیدا جێگای دیاری پێ تایبەت درابوو. قۆشەن دەکرایە چەند لەشکرێک و ئەویش بە سەر چەند هێزی بچووکتری وەک ئەمڕۆدا دابەش دەکرا. فیڵ و فەندی گەمارۆدان کە لە سەردەمی پارتیدا پەرەیەکی وای نەگرتبوو، لە زەمانی ساسانییەکاندا بە جارێک پەرەی ئەستاند و لە شێوازی ئابڵۆقەدانی شاراندا، شانیان لە شانی ڕۆمییەکان دەدا. بە مەبەستی پاراستنی سنوورەکان، بەتایبەت لە سەردەمی خوسرەوی یەکەمدا، کۆمەڵێک کۆچەرنشینی بچووک و ڕاستەقینەی سەربازی بۆ تیرە و هۆزە شەڕکەر و ڕاگوێزراوەکان دامەزرێندران. بەم شێوەیە ئیمپراتۆری دەکەوتە نێو بازنەی پارێزرانی جەماوەری سەر بە ئێران و لە دوای ئەوانەوە قۆشەنی ڕێکوپێکی ئێرانی لە پێگە و مەتەریزەکانی خۆیدا ئامادەی بەرەنگاری بوو.

وادیارە نامیلکە و کۆمەڵە وتاری پسپۆڕانەی سەربازی لە سەردەمی ساسانیدا دەبێ یەکجار بەپێز و پڕنێوەرۆک بووبن، بەڵام ئەم بۆچوونە تەنیا لە ڕووی چەند سەرچاوەیەکی ناڕاستەوخۆوە ڕوون دەبێتەوە، دەنا خۆیان نەدۆزراونەوە. کۆمەڵێک نامیلکە سەبارەت بە پێکهاتەی قۆشەن لە سەردەمی ئاشتی و شەڕدا بە دەستەوە بووە کە باسی چۆنیەتیی هێنانە بەرکاری هێزی سوارە و بەخێوکرانی ئەسپان و ڕاهاتنی کەوانداران و بژیوی قۆشەنچییانی تێدا نووسرابوو. چەند بەشێکی ئەم نامیلکانە تایبەت درابوون بە بارودۆخی شەڕ و لێکدان، هەڵسوکەوت لەگەڵ دوژمنان، هەڵبژاردنی شەرگە و ڕۆژ و کاتی

**تێکهەڵچوون و مەبەستی لەم بابەتە. بەگشتی زانستی سەربازیی ئەم سەردەمەی ئێران، نەکەوتۆتە بەرەژێری شەڕزانینی قۆشەنی ڕۆمییەکانەوە.**

## **دین**

**لە ڕۆژگاری هاتنە سەر دەسەڵاتی زنجیرەی خانەدانی ساسانی‌دا، پارسی لانک و کوانووی ژیانیان ، خاوەنی دینی ئەهوورامەزدا و پارێزەری ڕێبازی ئاناهیتا بوو کە پەرستگای هەرە گەورەی کەوتبوویە «ئیستەخر» و لەوێ هیربەدان[1] یان موغانی ئاورگا خەریکی کار و خزمەت بوون و وێدەچێ خانەدانی ساسانی لەوێ خاوەنی پلەیەکی هێژا بووبن. وەکوو دەزانین ساسان و باوکی لەم ناوەندە دینییەدا خاوەنی پلەی بەرز بوون و پاپەک [بابەک] بەرلەوەی بگاتە پلەی پادشایەتی، لەوێ ببوو بە جێنشینی باوکی و ئەردەشێریش دەسکەوت و خەنیمەتی خەنیمانی بەزیوی لەوێ کۆ دەکردەوە. داب و نەریتی بنەماڵەی ساسان لە سەردەمی شاپووری یەکەمیش‌دا درێژەی کێشا و ئەو پەرستگایەی کە لە شاری بیشاپووری خۆی‌دا سازی کرد، بە باری شێوازی هێنانی ئاو بۆ دەوری تالاری ناوەندی جێی سەرسوڕمانە. تۆبڵێی لەو زەمانەدا پەرستنی ئاور و پەرستنی ئاو کە ئاناهیتا سەمبولی بوو، تێکەڵ کرابن؟[2]**

---

١ـ هیربەد یان هیربۆد: مامۆستا و ڕاهێنەر.و.

٢ـ کۆمەڵێک لێکۆڵینەوە کە لەم ئاخرییانەدا سەبارەت بە دینی ساسانی کراون. ئەو قسە و باس و گێڕانەوانە دەبەنەوە پاش کە وێدەچێ دواتر هەڵبەسترابن. بەپێی دەقی ئەم سەرچاوانە ئەردەشێری پاپەکان پاش سەقامگیربوونی وڵات، دینی زەردەشتیی کردۆتە دینی ڕەسمی وڵات کە لە هەرێمی پارس‌دا هەروا بێ‌خەوش‌وخاڵ مابۆوە. بەگوێرەی ئەو ڕاستەقینە دیرۆکییەی کە کۆمەڵێک دەق و بەردەنووس و نیشانەکانی شوێنەوارناسی دەیدرکێنن، ئەو قسەیەی سەرەوە نابێ وابێ. بێگومان پارس پارێزەری نەریتی کۆنباوی ئێرانی بووە، بەڵام خۆ ئەوە هەر ئەو دینە نییە کە وێدەچوو پەیوەستی ئاڵوگۆڕی دینی زەردەشتی بووبێ. بەڵکوو پتر هەر ئەو دینە لەمێژینەی مەزدایی‌یە کە زۆروکەم بێ ئاڵوگۆڕ مابۆوە. ئەم دینە هەر ئەو ڕێبازەیە کە ئەردەشێری دووهەم پەسن و پەرستنی ئاناهیتای تێوەگلاند و ڕەوتێک بووە تایبەتی←

داخوا زەردەشت ئاڵوگۆڕێکی لە دینی ئەهوورایی‌دا بەدی هێنابوو؟ هەڵبەت دەبێ قبووڵی بکەین کە ئەردەشێری بابەکان پاش سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی، دینی زەردەشتیی هەتا ئاستی دینی ڕەسمی هەڵکێشا و هەورازی برد. بەپێی ڕوانگە و ڕێبازی گۆڕانخوازانەی دینی پێغەمبەری سەدەی شەشەمی پێش‌زایین، ئەهوورامەزدا یان «خێوی ئاوەز» تەنیا خودایەکی شیاوی پەرستنە و دژی پەرستنی خودایانی دیکەی دینە کۆنەکانی ئێرانییە. ئەهوورامەزدا خوڵقێنەری جیهان و چاکەیە و ناکۆک و ناتەبایە لەگەڵ «سرشتی‌خراپ». ئەم دیندارییە خاوەنی کۆمەڵێک ڕێ‌ورەسم و پەسن و پەرستنی یەزدانییە کە پێشەوایانی خوارۆژووری دینی بەڕێوەی دەبەن.

ئەگەرچی هەتا ئێستا تەواو ڕوون نەبۆتەوە کە داخوا لە جەنگەی هاتنە سەر دەسەڵاتی ساسانییەکان‌دا، دینی زەردەشتی لە فارس لە باو بووە یان نا، بەڵام بۆمان دەرکەوتووە و بەپێی لێکۆڵینەوەکان لەسەر سەکۆی پیرۆزی مەسجیدسولەیمان ڕوون بۆتەوە کە دانیشتووانی باشووری خۆرنشینی بانووی ئێران لە ڕۆژگاری پارتەکان و سەرەتای دامەزرانی حکوومەتی ساسانییەکان‌دا

---

ئاگرپەرستی و ئەویش بە سەمبولێکی خودایەتی دادەندرا. وێدەچێ ئەردەشێری دووهەم پێوە بووبێ کە دینێکی هاوبەش بۆ تەواوی نەتەوەکانی شاهانشایەتی بەدی بێنێ؛ هەر بۆیە بە لاساکردنەوەی دینەکانی بابلی و یۆنانی کە دیمەنی خودایانی خۆیان دەخستە بەرچاو، پەیکەری بۆ ئاناهیتا داتاشی. دەکرێ ئەم لادان یا تازەگەرییە لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشانی پەیڕەوانی بوودا لە جەنگەی گەشەی دینی بوودایی‌دا بەراورد بکرێ کە بە باری ساز کردنی پەیکەری بوودادا کەوتبوونە ژێر باندۆری دنیای یۆنانی ـ ڕۆمی. [لە وەرگێڕانەکەی موعین‌دا ئەم بڕگەیە لە دەقی کتێبەکە زیاد کراوە... .و.]

شوێنکەوتەی زورڤانیسم[1] بوون کە لە ڕاستیدا بە لقێکی دینی مەزدایی دادەندرێ و ئەم سنوورەی نەپەڕاندووە.

ماکە و نێوەرۆکی ئەم دین و دینداریيە لەسەر تەوەرەی پەرستنی زورڤان، واتە خودایەتیی لەمێژینی جەماوەری ئێران بە مانای «زەمانی بێبڕانەوە» هەڵدەسووڕا. زورڤانی «نێرمێ» بە زگێک دووانەی ئەهوورامەزدا و ئەهریمەنی دەبێ. ئەهوورامەزدا سەمبولی چاکە و ئەهریمەن سەمبولی خراپەیە. پێشتر باسمان کرد کە زورڤان خۆی بریتی بوو لە خودایەتییەکی چوارینە و لەسەر شکڵ و شێوەی خودایانی جیاواز خۆی دەنواند کە بریتی بوون لە ئەهوورامەزدا، ئاناهیتا، میترا و ڤێرسرێغنە. ئەم چوارانە لەسەر هەیوانی پیرۆزی مەسجیدسولەیمانی سەردەمی پارتەکان، هەرکام خاوەنی میحرابی تایبەتی خۆیان بوون.

زۆربەی هەرە زۆری سەردەمی پێنسەد ساڵەی حکوومەتی خانەدانی ساسانی لە نێو شەڕ و لێکدانی بێڕوحمانەی مابەینی پەیڕەوانی دوو ڕێبازی مەزداییدا تێپەڕی کە بریتی بوون لە دینی ڕەسمیی زەردەشتی و زورڤانیسمی لەمێژینی ئێرانییەکان.

لە ئاخروئۆخریی سەدەی سێهەمی زایینیدا کە دەبێتە سەردەمی حکوومەتی بارامی دووهەم، زەبروزەنگی توندوتیژی دینی وڵاتی هێنایە لەرزین و لە ڕۆژگاری پادشایەتیی شاپووری دووهەم یانی کلکەی سەدەی چوارەمی زایینیدا ئەم تەوژمە سەری هەڵدایەوە. کەچی دواتر و لە درێژەی بەشێکی هەرە زۆری سەدەی پێنجەمی زایینیدا، زورڤانیسم سەرکەوت و پیاوێکی پایەبەرزی وەک «مێهر نەرسی» کە مەزنەوەزیری سێ پادشای دوابەدوای یەکتر بوو، داکۆکیی

---

١ـ زوروانیسم

لێکرد. لە زەمانی وەزارەتی «مێهر نەرسی»دا زورڤانیسم بوو بە دینی ڕەسمی و سەرەنجام لە زەمانی «پیرووز»دا بە یەکجاری کوێر بۆوە و بنەی بڕا.[1]

لە سەردەمی شاپووری یەکەمدا، یانی ئەو سەردەمەی کە ئیمپراتۆریی گەنج بە شێوەیەکی پتەو بناغەی داکوتابوو و لە مەیدانی سیاسەتی نێونەتەوەیی‌دا ببوو بە خاوەنی کۆمەڵێک بەرژەوەندی، دەبێ لە جەنگەی شەڕ لەگەڵ ڕۆمدا کە پێویست بووە تەواوی هێز و وزەی نیشتمانی کۆببنەوە و یەکترگیر بن، پرسی دینی ئیمپراتۆری هاتبێتە گۆڕ. وێدەچێ هەر بۆیە بێ کە شاپوور سەرنجی کەوتۆتە سەر «مانی» و دینەکەی و توانیویەتی دۆستایەتیی لەگەڵ دامەزرێنێ.

مانی کە لە ڕاستی‌دا کوڕی مەزنەخانەدانێک بوو، وەک زەردەشت و بوودا و عیسا تەواو خۆی بە پێغەمبەری خودا دەناساند و دەیگوت ڕاسپێردراوە هەتا تەواوکەری دینەکانی پێشووبێ. لە دینی نوێباوی مانی‌دا وەکوو مەسیحایەتی ڕێگای تێوەچوون بۆ تەواوی مرۆڤەکان بەبێ جیاوازیی تۆرەمە و چین و توێژی کۆمەڵایەتی، کرابۆوە. پوختەی باوەڕەکانیشی کە بە دینەکانی بابلی و ئێرانی پاراو ببوو، کەوتە ژێر باندۆری بوودابیسم و مەسیحایەتی. بناغەی ئەم دینە لەسەر ملانەی نێوان تاریکی و ڕووناکی یان بە واتایەکی تر نێوان چاکە و خراپە داندراوە و جیهان لەم دوو ماکەیە پێکهاتووە کە هەمیشە پێکەوە شەڕیانە. ڕووحی مرۆڤ ڕووناکیدەر و جەستەی بە تاریکایی دادەندرێ و سەرلەبەری ڕوانگەی مانەوی بە دەوری ڕزگاربوونی ڕووح لە [زیندانی تاریکی] لەش‌دا دەخولێتەوە. ئەو دەمەی کە تەواوی ڕووحەکان و تێکڕای ڕووناکی کە بەندکراوی ماکەیەکن ئازاد بکرێن و بەرەو خۆر تێهەڵبن، ئاسمان و زەوی

---

١ـ دوکتۆر موعین ئەم پێنج برگەیەی پێشووی لێ دەرهاویشتبوو. بەپێی دەقی بێهفرووزی و دەقی فەرانسە گەڕایەوە سەر شوێنی خۆی.و.

**تەفروتونا دەبن و لێکدادەبڕێن و حکوومەتی ڕووناکایی دەبێتە هەتاهەتایی. بڕواداران بەکردەوە دەبوونە پۆلی هەڵبژاردان و بیسەران. تاقمی یەکەم کە بریتی بوون لە پیشەنگانی دینی، دەبوو بە ڕەبەنی بژین و گۆشت نەخۆن و خۆیان لە چاوچنۆکی و درۆ بپارێزن. بیسەران (نیووشەندەکان) دەیانتوانی زەماوەند بکەن و وەکوو خەڵکی دیکە بکەونە کار و هەڵسووڕان، بەڵام دەبوو نەهێڵن ئاوێتەی ڕووحیان گەردی لێ بنیشێ و نەدەبوو سامان کۆ بکەنەوە. لەم دینە تازەدا نە قوربانی کران هەبوو، نە پەرستنی بوتان، بەڵام نوێژ و ڕۆژوو وەبەرچاو گیرابوو. مانەوییەکان ڕێوشوێنی وسڵی پاکبوونەوەیان ئەنجام دەدا و بڕوایان بە تۆبەی بەرلە مردن هەبوو[١].**

**دینی مانەوی، دینی جوولەکانی ترۆ دەکرد و مووسا و پێغەمبەرانی بەنیئیسرائیلی بە شەیاتینی دەزانین و خوداکەیانی بە خودای تاریکی دادەنا. لە بواری گەشەی فرەزانی و وردەکارییەکانی پەیدابوونی جیهان و بە تەکوزبوونیدا، کەوتە ژێر باندۆری ڕوانگەی گنۆسی[٢]. سروودەکانی وێنەیان لە بابلییەکان هەڵگیراوەتەوە و سەرچاوەی بیر و باوەڕی پەیامەکانی زەردەشتن. لە**

---

١ـ زانایان پێیان وایە کە ئەمە بارودۆخی دینی ئێران بووە لە باڵی باشووری خۆرنشیندا. لە باڵی باکووری خۆرنشین و دەوروبەری پەرستگای گەورەی «شیز»، دینی کۆنباوی ئێرانی پنجی داکوتابوو. لەوێ ڕێوڕەسمی دینی لە لایەن موغانەوە ئەنجام دەدرا کە بریتی بوون لە کۆمەڵێک پێشەنگی دینی کە وێڕای پاراستنی نەریتی توێژی خۆیان، لە سەردەمێکدا کە ئێمە نازانین کەنگێیە، داب و نەریتی زەردەشتیشیان قبووڵ کردووە. ئێمە بۆمان ڕوون نەبۆتەوە کە ئەم دوو ناوەندە دینییە دەبێ پەیوەند و نێوانیان چۆن بووبێ. ڕەنگە شوێندانانی ناوەندی باکووری خۆرنشین پێشاوبرکەی ناوەندی باشووری خۆرنشینی دابێتەوە، بەڵام دیسانیش ئەم ناوەندەی دوایی کەوتە ژێر سێبەری یەکەم پادشایانی خانەدانی ساسانی و لە ماوەی تەمەنی چەند پشتاندا لێیدانەبران. [لە وەرگێڕانەکەی موعیندا ئەم بڕگەیە لە دەقی کتێبەکە زیاد کراوە، منیش کردمە پەراوێز، با هەم مەبەستەکە نەفەوتێ و هەمیش شێوەی کارەکە ڕوون ببێتەوە.و.]

٢ـ ڕێبازی گنۆستیکی. ئەم ڕێبازە دینییەش بڕوای بە دووانەپەرستی بووە. بە بڕوای پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە، دنیای ڕووح ڕاست دنیای ڕووناکییە و دنیای لەش هەمان دنیای تاریکییە... .و.

ئایینی مانیدا عیسا خاوەنی پلەیەکی هێژایە و بڕوابوون بە سێیانەی مەسیحایەتی و هێندێک بەشی ئینجیل خوازراونەوە و فەلسەفەی تەناسوخ لە بوودایی وەرگیراوە و ناوی فریشتەکانیش سوریانین.

داخوا ئەو دەمەی کە شاپووری یەکەم بە چاوی ڕێز و نیازپاکانەوە لە مانی ڕوانی و ڕێی بۆ خۆش کرد هەتا سەرقاڵی بانگەواز و کۆکردنەوەی پەیرەوانی بێ، دەیهەویست ڕۆژایەک دینی مانی بکاتە دینی ڕەسمی وڵاتەکەی؟ داخوا پێی وابوو خانەدانی تازەی ساسانی کە توانیبووی ئیمپراتۆرییەکی نوێباو و بەهێز دامەزرێنێ، ناچارە کە بە دینێکی تازەبابەت تین‌وتاوی وەبەربێنێ؟ وەکوو دیارە ئەم دینە لە خودی ئێراندا سەرهەڵدەدا و پیاوێکی ئێرانی دەیهێنێ و دەیگەشێنێتەوە و پڕە لە چاوپۆشی و دینەکانی دیکەی ئاوێتە کراوە و لەگەڵ سەردەم ڕێکە. تۆبڵێی بۆیەی وا نەکردبێ هەتا ئەم دینە تازەیە قبووڵ بکا، چونکە دینی باو لە «ئیستەخر» لە حاند شەپۆلی دینەکانی گەورەی وەک مەسیحایەتیدا هیچی بۆ نەدەکرا ؟! ڕەنگە پێی وابووبێ دینی مانی دەتوانێ ئاوات و ئامانجەکانی وەدی بێنێ. بەکورتی هەر لە دوای مەرگی شاپووری یەکەمەوە، پێشەوایانی مەزدایی، بەتایبەت موغانی باکوور بە سەرۆکایەتیی «کەرتیر» لێی وەخۆ کەوتن و ئەم هەڵوێستە لە ڕۆژگاری بارامی دووهەمدا کە کەرتیر سیاسەتمەدارێکی یەکجار بە دەسەڵات بوو ڕەنگی دایەوە. هۆکاری ئەم دژکردەوەیە دەکرێ بگەڕێتەوە سەر گەمارۆدرانی دینی بوودایی و مەسیحایەتی. دینی بوودایی لە دەسپێکی حکوومەتی زنجیرەی دووهەمی پادشایانی کووشانەوە کە «کانیشکا» سەرزنجیرەیانە، کرایە دینی باوی وڵات و ئەو کاتە لە خۆرهەڵات لەوپەڕی پەرە و گەشەی خۆیدا بوو. کۆمەڵێک ناوەندی مەسیحایەتی لە باکووری دووچۆمان دامەزرابوون و لە باڵی خۆرهەڵات لەگەڵ

دینی جوولەکان کە هەمیشە لە بابل پەرەی بە پەلوپۆی خۆی دەدا، سەرقاڵی ملانە و بەرەنگاری بوو. لەم کاتەدا دینی مەزدایی تەنانەت لە نێوخۆی ئێراندا کەوتە بەر هەڕەشەی دینی مانی و پێشەوایانی. هەر ماوەیەک دوای نەمانی شاپووری یەکەم، مانی دادگایی کرا و حوکمی کوژرانی بۆ برایەوە و سەری تێدا چوو. پەیڕەوانی مانی کەوتنە بەر شەپۆلی ئازار و ئێشاندن و لە نیشتمانی خۆیان پەڕەوازە بوون؛ تاقمێکیان چوونە قوڵی ڕۆژهەڵات و لە ئاسیای ناوەندی دینی مانی توانی شوێنێک بۆ بانگەوازی بیر و باوەڕی خۆی بدۆزێتەوە. تاقمێکی دیکە بۆ لای سووریا و میسر بازرە بوون. بەپێی دەقی دووردوودرێژی سێ بەردەنووسان کە لەسەر ڕەوەز و بیناکانی پارس هەڵکەندراون، کەرتیر شانازی بەوە دەکا کە مەسیحی و مانەوی و بەرەهمەنانی ئازار داون؛ بەڵام پاش نەمانی کەرتیر، کاتێک «نەرسی»ی کوڕی شاپووری یەکەم هاتە سەر دەسەڵات، بارودۆخەکە بەجارێک گۆڕدرا. عەرەبەکانی دانیشتووی کەوشەنی باڵی خۆرنشینی ئێران چووبوونە سەر دینی مانی و نەرسی ویستی کە دژی ڕۆمییەکان پشتیان پێببەستێ. لە میسریش مانەوی زۆر بوون و توانیبوویان لەگەڵ قوتابییەکانی مانی لە ئێران پەیوەندی داگیرسێنن. نەرسی بە ئاکار و کرداری نیازپاکانەی خۆی ئەوانی کردن بە کۆمەڵانی وەفادار بە ئێران و دواتر توانی لە ڕاپەڕینەکانی دژی «دیۆکلیسین[1]»دا ئەرک و دەورێکی گرینگیان بخاتە سەر شانی. واوێدەچوو کە هەلومەرج بۆ بووژانەوەی دینی مانی و ڕەنگە دینی عیسایش لە ئێراندا لەبار بووبێ. نەبوونی ژێدەری بەربڵاوی دەوڵەمەند ڕێگەمان پێنادەن کە بزانین چ کۆمەڵە ڕووداوێک بوونە هۆی گۆڕانی ڕەوتی ڕووداوەکان و ژیانەوەی دینی مەزدایی؛ بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە دینگۆڕکەی

---

١- دیۆکلیتین

کۆنستانتینی گەورە لە سەردەمی پادشایەتیی شاپووری دووهەمدا، کارێکی وای کرد کە مەسیحییەکان بە تاوانی سیخوڕی بۆ ڕۆم کەوتنە بەر تەوژمی ئازار و چەوساندنەوە، هەروەک چۆن مانەوییەکان لە ڕوانگەی ڕۆمییانەوە، بە فسۆسی ئێران دادەندران. ئەم ڕووداوانە مەزداییسمی گێڕایەوە سەر دۆخی جارانی و بووژایەوە و بوو بە هۆی تێداچوون و بڕانەوەی زورڤانیسم.[1]

ئێمە نازانین کە لەو سەردەمەدا موغەکان هەتا کوێ توانییان دینی زەردەشتی بپارێزن و ئەم دینە چەندە توانی وەکوو دینی ڕەسمی بناسرێ. دینی زەردەشتی پەرستنی ئەهوورامەزدای پاراست و بیری تاقانەبوونی خودای بەرەو پێدا. بەکورتی ئەم ڕوانگەیە لەو سەردەمەدا کە دینە گەورەکان لەسەر تاقانەپەرستی دەڕۆیشتن، دەبوو چەکی دەستی مووبەدان بێ بۆ پاراستنی دینەکەیان. ئەوان داب و نەریتی باشووری خۆرنشینیان وەرگرت و چونکە نەیاندەتوانی خودایانی لەمێژینی وەکوو ئاناهیتا و میترا وەلابنێن، ئەوانیان هەتا پلەیەک خوارتر داکێشا. هەر لەو ڕۆژگارەدا بۆ ئەوەی لە کاروانی ڕۆمییەکانی ئەهلی کتێب وەدوا نەکەون، دەبوو چەکێکی وەکوو ئەوانیان پێ بێ و ڕێسا پیرۆزەکان لە ڕێگای کتێبەوە بچەسپێن. بەم شێوەیە نووسینەوەی ئەڤێستا دەستی پێکرد و کۆمەڵێک دەقی زارەکی کە هێندێکیان سەر بە سەردەمانی لەمێژین بوون، کۆکرانەوە. تاقمێک لە توێژەران لایان وایە کە ئەم کتێبە لە سەدەی چوارەمی زایینیدا کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە و تاقمێکیش دەیبەنەوە بۆ سەدەی شەشەم. هەر چۆنێک بێ ئەم پرسە هێشتا بە یەکجاری یەکلایی نەبۆتەوە و چارەسەر نەکراوە. تەنانەت هێشتاش ئەم باس و پرسە لە ئارادایە کە داخوا لە پاڵدەستی

---

١ـ لە دەقی موعیندا ئەم ڕستەیە زیاد کراوە: «پێشەنگانی ئەم دینە سەریان وەبەر پادشا هێنا و لەگەڵی بوونە یەک و ئاوا پەلیان ئەستوور بوو.» و.

ڕێوشوێنی سیاسی و ڕێکخستنەکانی موغاندا، کۆمەڵێک ڕووناکبیر بەپێی فەلسەفە و زانستەکانی سەردەم بە دوای داهێنانی دینێکی تازەوە نەبوون؟ ئێران پاش یەکانگیربوونی سیاسی، بوو بە خاوەنی یەکییەتیی دینیش. دینی زەردەشتی بە پاڵپشتی دەسەڵاتی دنیایی هێزی وەبەرهات و دوای تاراندنی دینی مانەوی، توانی مەسیحایەتی لە هێڵی ڕووباری فورات و بوودایەتی لە درێژاییی ڕووباری هیرمەند بوەستێنێ. تەنانەت لە سەردەمی تەنینەوەی فەرهەنگی یۆنانیدا، ئێران دژی ڕوانگەی شارستانییەتی یۆنانی بوو بۆ سەر جیهان، هەروەک چۆن بە گەشاندنەوەی ڕووحی نەتەوەخوازانەی کۆنی خۆی، یەکجار بەتوندی دژی دەسەڵاتی دنیاداگری ڕۆم و دینی مەسیحی کە سەمبولی بوو ڕادەوەستا. دینی زەردەشتی کە موغەکان ڕێوشوێنیان بۆ دانا و هەتا ئاستی دینی ڕەسمیی وڵات ڕۆیی، لەم شەڕ و هەرایەدا یاریدەی وڵاتی دەدا و هێزی دەروونی و ورەی گەلی خستە بەرەی پاراستنی ڕۆژهەڵات، کە ئێران لە حاند دەسەڵاتی ڕۆژاوا، خۆی وەکوو قارەمانی ملانەکە ناساندبوو.

لە پاڵ دینی تەواو سەقامگیر و باودا، نژیاروانییەکی وردەکارانە و ڕێک و بەجێ لەسەر شێوەی دوو دنیای سەربەخۆ، بەڵام تێبەستەی گریمانەیەک، قوت دەبنەوە کە بریتییە لە چوارتاق و ئاورگایەک کە سەمبول و پارێزەری داب و نەریتە کۆنباوەکانی دیندارانەی ئێرانین.

ئەو سەکۆ یان شوێنە پیرۆزەی ئێرانییەکان کە جەماوەر لە جێگایەکی سەر و بەر ئاواڵەدا بۆ ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی دینی لە دەورەی دەهاڵان، پەرستگایەکی چوارباڵی پێوە زیاد دەکرێ کە ناودێرە بە چوارتاق و بریتییە لە چوار کۆڵەکەی چوارباڵ ئاواڵە کە گومبەزێک لە چەشنی تاقی ئاسمان لەسەریان ڕاوەستاوە.

ئاگر وەکوو ماکەی سەرەکی بۆ بەڕێوەچوونی داب و نەریتی دینی لە ئاورگادا دەپارێزرێ و ئەویش بریتییە لە ژوورێکی بچووک و داخراو لە نیزیکی چوارتاقەوە. ئەم ژوورە بەپێی دابی سەردەم بە ویشکەبەرد هەڵچندراوە و هەتا ئەمڕۆش هەر لە باوە و کوێر نەبۆتەوە[1].

**وێژە و هونەر و زانستەکانی تر**

بەپێچەوانەی ئەو مەبەستەی کە تاقمێک بەبێ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە دەیڵێن، هونەری ساسانی ئاکامی ژیانەوە و بووژانەوەیەکی لەناکاو نییە و ناکرێ ڕەنگدانەوەی دواتری هونەری یۆنانی بێ. هەروەها بە سەرهەڵدانەوەی نەریتی کۆنباوی خۆرهەڵاتیش داناندرێ کە هیچ مۆرک و شوێنپەنجەیەکی خۆرنشینی پێوە نەبێ. هونەری ساسانی کە دوایین ڕەنگدانەوەی خۆرهەڵاتی کۆنە و تەمەنی دەگاتە چوارهەزار ساڵ و خۆی حەوترینگەیەکی هونەری ئێرانییە کە هەزار ساڵی بە سەردا تێپەڕیوە و دەروازەکانی بە ڕووی ڕەوت و ڕێبازەکانی دەرەکیدا کراوەتەوە. ئەم هونەرە ئەوەی هات بەخێری هێنا و بەگوێرەی داب و نەریتی خۆماڵی گۆڕانی بە سەردا هێنا. ئەم هونەرە هەمیشە شتی خواستۆتەوە، بەڵام چونکە ببوو بە هونەری ئیمپراتۆرییەکی جیهانی، پرشنگی هاویشتە دەوروبەری و خۆشی شتی لێ خوازرایەوە و پەلوپۆی هەتا وڵاتانی یەکجار دووری دنیا ڕۆیی. ڕەنگدانەوەی زۆر کۆنی ئەم هونەرە بوو بە جێگرەوەی ڕاستەوخۆی دوایین گرشە و ورشەی هونەری پارتی کە بە ڕەسەن ئێرانی بووە.

---

١ـ بەداخەوە ئەم سێ برگەیەی دوایی لە وەرگێرانەکەی دوکتۆر موعیندا نییە، بەڵام بەڕێز مەحموود بێهفرووزی هێناویەتی و لە ڕووی دەقی سەرەکیڕا ئەوەمان بۆ ڕوون بۆوە.و.

وەک پێشتر باسمان کرد، ئەردەشێر بەرلەوەی ببێتە پادشا، شاری «فیرووزاباد»ی بەپێی ڕێوشوێنی باوی شارسازیی ئێران لەسەر شێوازی بازنەیی ساز کرد، شێوازێک کە بەتایبەت لە سەردەمی پارتەکاندا باو بوو.
لە سەردەمی شاپووری یەکەمدا ڕێوشوێن و شێوازی شارسازی گۆڕانی بەسەردا هات. شاری بیشاپووری ئەم پادشایە بەپێی ئەو شێوە و شێوازە خۆرنشینیە سازکرا کە هیپۆداmووس کردی بە باو (ق٨٧). ئەم گەڵاڵەیە لەسەر ڕووبەرێکی لاکێشەیی هەڵخراوە و بە شوێن هەڵکەوتی سروشتیی زەویدا دەڕوا و دوو شەقامی سەرەکی لە جەرگەی شار وەکوو خاچ بە سەر یەکتردا تێدەپەرن. ساسانییەکان بە بناغەدانەری گەورەی شاران دادەندرێن و بەپێی سەرچاوەکانی مێژوویی زۆربەی هەرە زۆری پادشایانی ساسانی، بە شێوەی بەرچاو بایەخیان بە سازکرانی شاران داوە. ئێمە تاکوو ئێستا هیچ شتێک سەبارەت بە گەڵاڵەی شارەکانی دیکەی ساسانی نازانین؛ بەڵام گەڵاڵەی ئەو شوێنانەمان بە دەستەوەیە کە پادشایانی ئێران دیلە ڕۆمییەکانیان تێدا نیشتەجێ دەکردن. شاپووری یەکەم دیلەکانی لە «گوندی شاپوور» بنەگر کردن. کاول و هەرەسی ئەم شارە دەکەوێتە نێوان دزفوول و شووشتەر و بەشی هەرە زۆری بە نووکی گاسن کێڵدراوە و تەخت بووە و تێداچووە. ئەم شارە کەوتۆتە سەر ڕووبەرێکی بەربڵاوی لاکێشەیی و وێکچوونی لەگەڵ لەشکرگای ڕۆمی سەیر دەنوێنێ. ئێمە هەر ئەم شێواز و گەڵاڵەیەمان لە «هەیوانی کەرخە»ی نیزیک شووش وەبەرچاو هاتووە. بەپێی چەند سەرچاوەیەک، شاپووری دووهەمیش ئەو یەخسیرانەی کە لە خۆرنشینەوە هێنابوونی، لێرەی نیشتەجێ کردن.



ق٨٧ـ نەخشەی شاری بیشاپوور

نژیاروانیی ساسانی زۆر توند لە داب و نەریتی نەتەوەیی شەتەک دراوە و درێژەدەری شێوازی کاری پارتەکانە. هەتا برانەوەی سەدەی سێهەم دیوارەکان بە بەردی دانەی تاشراوی ڕێک و لەبار هەڵچندراون. یەکێک لە کۆشکەکانی بیشاپوور ئاوا ساز کراوە کە شاپوور دیلی تاجداری خۆی لەوێدا بەند کرد. بەردەکانی بە هەڵکەندرانی کۆمەڵێک دیمەن و بابەتی مێژوویی ڕازێندراونەوە و پادشامان دیتە بەرچاو کە پێی ناوەتە ڕکێف یان لە نێو ئاپۆرای مەزنانی هاوڕێیدا چەقیوە. ئەم مەبەستە دەیسەلمێنێ کە لە سەردەمی ساسانیدا و لانیکەم لە سەرەتای دەست بە کاربوونیانەوە، لەم شێوازەیان زانیوە. بینایەکی بچووک کە بەگوێرەی گەلاڵەی کۆشکەکانی «هەترە»[1] سازکراوە «تاقی گرێ»یە لەسەر ڕێگای بەغدا بەرەو کرماشان (ق٨٨)؛ ئەم جێگایە تەواو وەکوو پەرستگای بیشاپوور دەچێ (و ٩٨). هەروەها دەبێ باسی بینای «پایکوولی»ش[2] بکرێ کە ڕەنگە ئەویش ئاورگایەک بووبێ[3].

لێرەدا دەبێ بینای نەزر و نیازیشمان لە بیر نەچێ کە ئێستا دوو کۆڵەکەی ماوە و کەوتۆتە ناوەندی شاری بیشاپوورەوە. بەپێی بەردەنووسی ئەم شوێنە، وادیارە دەبێ پەیکەرەی شاپووری یەکەمی لێ بووبێ (ق٨٩). بەگشتی ئەم جێگایە وێنەی لە شێوازی «سوریانی ـ ڕۆمی» هەڵگیراوەتەوە و بە چێشکە و

---

١ـ هاترا

٢ـ پایکۆلی

٣ـ سەبارەت بە بینای پایکوولی کە دوو بەردەنووسی گرینگی پەهلەوی و پارتی لەسەر هەڵکەندراوە، دەبێ زانیارییەکانی پێشوو کە دەگەڕێنەوە سەر لێکۆڵینەوەکانی هێرتسفێلد، ڕاست بکرێنەوە. ئەم شوێنە کە کەوتۆتە سەر سنوورەکانی ئێران و ئێراق و لە خاکی ئێراقە، لەبەر بەردەنووسەکەی بە یەکێک لە گرینگترین ئاسەوارەکانی سەردەمی ساسانی دادەندرێ. پایکوولی پەرستگا یان ئاورگا نەبووە و بەڵکوو جێگایەکە کە «نەرسی»ی پادشای ساسانی وەک یادگاری بەزاندنی بارامی سێهەم سازی کرووە. ئێرە هەر ئەو شوێنەیە کە مەزنانی ئێران، کاتێک بارام لە ئەرمەنستانەوە دەچوو بۆ تیسفوون، چوونە خزمەتی... .م.




ق ٨٨ ـ تاقی گرێ

ق٨٩ ـ خەتی پەهلەویی ساسانی

ڕوانگەی ئێرانی دەستاو دراوەتەوە. لە ڕووکاری بیناکە هێشتاش پایەی پەیکەرەی پادشا وەبەرچاو دێ کە کەوتۆتە نێوان دوو ئاگردانەوە. هەڵکەندرانی دەقێک لەسەر یەکێک لەو دوو کۆڵەکانە لەسەر شێوازی خۆرهەڵاتییە.

وەکوو ئاشکرایە کەرەسەی خانووبەران زۆربەیان بریتی بوون لە خڕکەبەرد و قوڕ و قوڕەسواغ. کۆشکی فیرووزاباد ئاوا ساز کراوە و میچی بە کەوانەی بەرهەیوانی دیارە و گومبەزەکانی بە دوای یەکتردا ڕیز بوون (ق۹۰-۹۱). گەڵاڵەکەی بریتییە لە تێکەڵەیەکی جوان و دڵگری ژووری میوانان و بەشی ئەندەروونی؛ کەچی ئەم دوو بەشە لە نژیاروانیی هەخامەنشیدا لێک جودا بوون. دانانی دیواری بەرد و قوڕ لە کۆشکی شاپووری یەکەمیشدا وەبەرچاو دێ. سەرسەرای گەورەی ئەم کۆشکە لە چەرگەیدا گومبەزی بە سەر کشاوە و خاوەنی چوار هەیوانە و سەرجەم وەکوو خاچ دەچێ (و۸۹). خشتەی سوورەوەکراو زۆری قوڕەکاری پێکراو، بەتایبەت لە هەرێمی بابل کە هێشتاش بەشێک کۆشکی تیسفوون میچی سەر تەلاری چوونە دیداری پادشای هەر ماوە (و۸۷).



ق۹۰- کۆشکی فیرووزاباد



ق٩١- ڕووکاری کۆشکی فیرووزاباد (ئاوا چۆتەوە سەر دۆخی خۆی.)

داندرانی خشتی کاڵ باو بووە و یەکێک لە بەرچاوترینی ئەو جێگایانە ئێستاش ئاسەواری دیارە، شوورەی دەوری شاری «ئیستەخر»ە کە وێدەچێ بەرلە سەردەمی ساسانی سازکرابێ (ق٩٢). کڵاوقووچە نیوبازنەکانی ئەم حەسارە کە وادیارە لە سەردەمی ئیمپراتۆریی ڕۆمەوە لە خۆرهەڵات بایەخێکی تایبەتی پێدراوە ، لەگەڵ قەڵای بیشاپوور و شاری «تاکسیلا»ی باکووری خۆرنشینی هیند کە زنجیرەی دووهەمی پادشایانی کووشان لە سەدەی دووهەمی زایینیدا سازیان کردوو، نیشانەی باو بوونی ئەم شێوازەن.




ق٩٢ـ ئیستەخر: شوورەی شار کە بە خشتی کاڵ سازکراوە.

چوارچێوەی پەرستگاکان گۆڕانیان بە سەردا هات. ژووری سەرەکی و چوارگۆشەی ئاورگا ڕێڕەوێک بە دەوریدا لێدەهاڵاوە. یەکێک لە گەورەترینی ئەم ئاورگایانە کە دیوارەکانی ١٤ گەز پێهەڵچوون، شاندی ئێمە لە بیشاپوور دۆزیویەتەوە (و٩٨؛ ق٩٣). لە تەنیشت ئاورگای فیرووزاباد، قەڵاقووچەیەک ساز کراوە کە لە جەنگەی کۆبوونەوە و ڕێورەسمی ئایینیدا سەربانەکەی ئاوری لێکراوەتەوە (ق٩٤). زۆربەی ئەم ڕێورەسمانە لە دەورەی ئەو هەیوانانەوە بەڕێوە دەچوون کە هەر چوار لایان کرابۆوە و چوار کۆڵەکە سەریان وەبەر

گومبەزیان هێنابوون. بێجگە لە ئاوری پیرۆزی هەرگیز نەکووژاوە، لە ئاگردانێکیشدا ئاوریان دەکردەوە و لە خوار گومبەزەکە دەیانخستە بەردەمی ئاپۆرای خەڵک (و٩٧).




ق٩٣- بیشاپوور: نەخشەی ئاورگا

دیواری کۆشکان و ماڵان کە بە قوڕ و بەرد یان خشتی سوور دادەندران، ئەوەندە نالێک بوون کە دەبوو سپیکرابانەوە و بە گەچبڕی نەخشێندرابان. لە کۆنترین کۆشکدا کە دەبێتە کۆشکی ئەردەشێر لە فیرووزاباد، ئەم ڕەنگاندن و نەخشاندنە هێندەی بایەخ پێنەدراوە و تەنیا چەند خەت و کووزێکی لەسەر دابی دەسکاری میسرییەکانی تێدا ڕەچاو کراوە کە دەرگا و تاقچەکانی تەختیجەمشیدیان پێ ڕازاندۆتەوە (ق٩٥). ئاڵوگۆڕی لەناکاو لە سپیکاری و گەچبڕیی سەردەمی دووهەمین پادشای ساسانیدا کە شاپوور یەکەمە،

ڕووی دا. لە کۆشکی بیشاپووری پادشادا کە هێندێک پاش بەزاندنی «ڤالێریانووس»ی ئیمپراتۆر سازکراوە، سەرسەرای گەورەی تایبەتی چوونە دیداری پادشا بە ٦٤ تاقچە ڕازێندراوەتەوە و گەچبڕی کراوە (و٨٨). شێوە و شێوازی نەخش و نیگارەکان، کارتێکردنی قووڵی «سوریانی - ڕۆمی »یان پێوە دیارە کە بریتین لە خەت و کووزی پێچاوپێچ و گوڵ و لاسکی چەلیپایی و گەڵاکەنگرانە. دواتر ئەم شێوازە بە قەڵافەت و دیمەنی بوونەوەران، گیاوگۆڵان و کۆڕی ڕاو و تەنانەت ڕوخساری پادشایان جوانتر دەکرێن. بەردی مەرمەڕی هەڵکۆڵدراو تەنانەت لە کلکەی سەردەمی ساسانیدا شوێنی لەسەر کاری بەردتاشان دادەنا. نەخشێندرانی ئەشکەوتی تاقبوستان (ق٩٦)، لەگەڵ سەرەکۆڵەکە بەردینەکان و کۆشکەکانی میری دەکەونە ئەم ڕیزەوە (ق٩٧).



ق٩٤- فیرووزاباد: قەڵاقووچەیەک کە ئاورگای تێدایە



ق٩٥- فیرووزاباد: کۆشکی گەچبڕیکراو



ق٩٦- تاقبوستان: وردەکارییەکانی سەرەکۆڵەکەیەکی هەڵتاشراو



ق٩٧- بێستوون: چەند سەرەکۆڵەکەی کۆشک و تەلارێکی کاول بوو

هەر لە ڕووی ئەم سەرچاوە دیرۆکییانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کۆشک و تەلاری پادشایانی ساسانی بە نەخش و نیگاری سەر دیواران ڕازێندراونەوە و کۆشکی تیسفوون ڕووداوی گیرانی ئەنتاکییەی لەسەر لادیواری سپیکاری کێشراوەتەوە. لێکۆڵینەوە تازەکان لەسەر هەیوانی کەرخەی ناوەندی دەسەڵاتی ساسانی دەریدەخەن کە کۆمەڵێک قەڵەمکێش لەسەر دیوارە سپیکارکراوەکانی کۆشکی میری نەخشێندراون. هەروەها ئێمە لە کۆشکی بیشاپوور ژمارەیەکمان سزاویک دۆزیونەوە کە ڕووبەری هەیوانیان داپۆشیوە و کۆمەڵێک زانیاری دەخەنە سەر زانینەکانی پێشوومان. وەکوو دیارە ئەو

وەستاکارانەی مزاویکیان تێگرتوون لە ڕووی وێنە یان نموونەوە کاریان کردووە. هێندێک لە تەختە مزاویکەکان بە تەنیایی هەر تاقە دیمەنێکیان لەسەر نەخشێندراوە. لەسەر ٢٢دانەیان دوو دیمەنی هاوشێوە بەدی ناکرێ و ئەم مەبەستە دەیسەلمێنێ کە هونەرمەندانی سەردەم خۆیان لە دووپاتبوونەوەی دیمەنەکان پاراستووە و تەنیا وێکچوونیان ڕەچاو کردووە (و٩٥). بێجگە لە چەند دیمەن و ڕوخساری کە لە لاجەوە کێشراونەوە و نیوەی سەر و دەموچاویان دیارە، ئەوانی دیکە هەموویان سێچوارەمی دیمەنیان خراوەتە بەرچاوان. وێدەچێ ئەمە شێوازی هەڵبژاردە و دڵخوازی هونەری سەردەمی ساسانی بووبێ و ڕەنگە وێنەی لە هونەری سوریانی- ڕۆمی هەڵگیرابێتەوە. لەسەر تەختە مزاویکی دیکە کە گەورەترن، نێوەنێوە دیمەنی ژنان و پیاوان کێشراونەوە. لەم نێوەدا دیمەنی خاتوونێکی بارگا دێتە بەرچاو کە خۆی باوەشێن دەکا. بارگانشینان جلوبەرگی ئاودامێنیان پۆشیوە و تاجەگوڵینەیان لە سەریان داوە و چەپکە گوڵیان بە دەستەوەیە (و ٩٦). لەسەر یەکی دیکە خاتوونێکی چاوەش بە ڕووتوقووتی سەرقاڵی لێدانی سازێکی ژێدارە. کۆمەڵێک دیمەنی قەڵەمکێشی دیکە لە نژیاروانیدا ڕەنگیان داوەتەوە، هەروەک چۆن لە نەخش و نیگارەکانی «دوورا- ئوورۆپۆس»دا هەر ئەم شێوازە خوازراوەی هونەری یۆنانی ڕەچاو کراوە.

پادشایانی ساسانی پتر لە تەواوی ڕابردووان، توانیویانە پارێزەری شێوازی هەڵکۆڵینی بەرد و داتاشینی ڕەوەزان بن کە تەمەنی ناسرانی لە ئێراندا دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی سێهەمی پێشزایین. پتر لە سی بەردەتاشی ساسانی توانیویانە ڕەوەز و تیشەشاخی بانووی ئێران بنەخشێنن کە بەشی زۆریان کەوتوونە پارسی زێد و نیشتمانی سەرەکیی ئەوان و هیچیان بە هەوێنی دینی

دەستاو نەدراونەوە. باس و بابەتی بەردەتاشەکان بریتین لە بەخشینی پلە و پایە، بەزاندنی خەنیم، ڕاو یا پادشا و ئاپۆرای یارانی یان ئەندامانی بنەماڵەکەی. ئەم بابەتانە لە ڕەوتی چوارسەت ساڵدا وەکوو ئاوێنەی ڕووداوەکان خۆیان دەنوێنن. سەرەتای گوورانی ئەم هونەرە لە ڕووی بەردەتاشی فیرووزابادەوە دەستنیشان دەکرێ کە دیمەنی زاڵبوونی ئەردەشێر بە سەر ئەردەوانی پێنجەمدا دەخاتە بەرچاو و دیارە کە هێشتا زۆر بە خەستی کەوتۆتە ژێر سایەی هونەری پارتی و بە باری وردەکاری و تەخت و ڕێکبوونی کەندۆخیندا قەرزداری هونەرمەندانی پارتە. ماوەیەک دواتر و هەر لە زەمانی ئەو پادشایەدا، دیمەنەکان بە شێوەی دەرزەقیو داتاشراون. ئەم شێوازە بەتایبەت لەو دیمەنەدا وەبەرچاو دێ کە پادشا بە شێوازی سەمبولیکی تایبەتی ڕۆژهەڵات ئاڵقەی ڕازاوە بە جقجقە لە دەستی ئەهوورامەزدا وەردەگرێ و ئەویش بریتییە لە هێما و نیشانەی پادشایەتی. ئەهوورامەزدا و پادشا هەردووکیان سواری ئەسپن و یەکسمەکانیان بە نۆرە پادشای بەزیوی پارتی بە دەستی ئەردەشێر و ئەهریمەنی سەمبولی چەپەڵی و خەنیمی ئەهوورامەزدا پێخوست دەکەن (و۹۹). لە زەمانی شاپووری یەکەمەوە دیسانیش وڵات دەکەوێتە ژێر کارتێکردنی هونەری خۆراوایی و شێوەیەکی تازە لە جلوبەرگدا بەدی دێ. پێشتر لەبەرووەی جلوبەرگ پڕ بە بەری مرۆڤ نەدەخرایە بەرچاو، ئەندامی قەڵافەتی دیاریی نەدەکرد، بەڵام لەم قۆناخە بە دواوە شێوازەکە دەگۆڕێ و پۆشاک فشوفۆڵ خۆی نانوێنێ و لەگەڵ لەش دەق دەگرێ. بە وێنە هەڵگرتنەوە لە بەردەتاشەکانی ڕۆمی، هونەرمەندانی ئێرانی دەکەونە داتاشین و ڕێکخستنی کۆمەڵێک دیمەنی ڕێک و تەواو. لەو دیمەنانەدا پادشا دەکەوێتە نێو جەرگەی یارانی، هەروەک چلۆن لە دیمەنی بەزاندنی «ڤالێریانووس»دا لە بیشاپوور دێتە

بەرچاو (ق٨٦). ئەوەی ڕاستی بێ کەسەکان وا دانەتاشراون کە بڵێی ناسێنەر و نیشاندەری تاقمی هاوشانان بن. ئەم مەبەستە بەتایبەت لە ڕووکاری بەردەتاشێکی دیکەدا لە بیشاپوور خراوەتە بەرچاو کە هەر بەزاندنی ڤالێریانووس دەگێڕێتەوە و چاردە ڕیز لەسەر تەوەرەیەکی کەوانەیی داتاشراون (و١٠٠). لەو بەردەتاشەدا مەیلی شکانەوە بە لای نەخش و نیگاری ڕۆمیدا، بەتایبەت کۆڵەکەی بەردینی داتاشراوی یاد و بیرەوەریی تراژان، ڕەنگی داوەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ کاتێک ئیمپراتۆر لە ڕۆم دەستووری داتاشرانی ئەم شوێنەوارەی دا، دەیهەویست پێچ و گەوەی بەردی مەرمەڕ وەکوو کرانەوەی تۆمارێک بێتە بەرچاو کە باسی دوو جار سەرکەوتنی ئیمپراتۆر بەبێ نێوبڕ بخاتە بەرچاو؛ کەچی بەردەتاشی  شاپوور کە قووڵ داتاشراوە، تەنیا بریتییە لە چەند ڕیزێک کە نە پێکەوە بەستراونەوە و نە پەیوەندییان بە دیمەنی سەرەکییەوە هەیە و سەرجەمی ڕیزەکان سەبارەتن بە بابەت و ڕووداوێکی دیار و سنووردار.

هونەری بەردەتاشی ساسانی لە سەردەمی بارامی یەکەمدا گەیشتە چڵەپۆپەی خۆی. دیمەنی تاج لە سەرنانی ئەم پادشایە لە بیشاپوور، هیچکام لە ئاسەوارەکانی دیکەی هونەرمەندانی ئێرانی تۆزی ناشکێنن و بەڕاستی ڕووحیان وەبەرهێناوە. وردەکاری و بەرزیی ئەم هونەرە لە زەمانی بارامی دووهەمدا پارێزرا، بەڵام لە سەدەی چوارەمەوە دارێژرانی گەلاڵەی شوێنەواران تین و گوڕی جارانیان نەما و لە نەرمی دیمەن و ناسکی کەوتن، ئەگەرچی لە کاری کەندۆخیندا وردەکارییەکان بوونەوە باو. لە کلکەی برانەوەی سەردەمی بەرباسدا، بەردەتاشی دیمەنی ڕاوی تاقبوستان (ق٩٨) نیشانەی کارتێکردنی قووڵی وێنەگەریی پێوە دیارە.



ق٩٨ـ تاقبوستان: بەردەتاشی سەبارەت بە جەنگەی ڕاوی پادشا

زۆربەی توێژەران پێیان لەسەر وێکچوونی بەردەتاشەکانی ساسانی و ڕۆمی داگرتووە و هەتا ڕادەیەکیش بۆچوونێکی ڕاستە، بەڵام دیسانیش لە نێوان ئەم دوو شێوازە هونەرییەدا، چەند جیاوازییەک بەدی دەکرێن و نیشانەی دوو دنیای جیاواز و دوو ڕوانگەی کەموزۆر ناتەبان. نەخش و نیگاری داتاشراوی ڕۆمی پەلێکە سەر بە نژیاروانی و خاوەنی جەغز و ئەندازەی دیاریکراو، بەڵام لە بەردەتاشی ساسانیدا پێچەوانەیە و زۆر جاران قەڵافەتی مرۆڤ لە قەڵافەتی ئادەمیزادی ئاسایی گەورەتر دەردەکەوێ. بەردەتاشی ڕۆمی دەیهەوێ ڕووداوێکی ڕاستەقینەی مێژوویی یان ڕووداوێکی سیاسی بگێڕێتەوە کە لە ڕێگای کۆمەڵێک دیمەنی پەیتاپەیتاوە، ڕاستەقینە و خەیاڵ بە جوانی تێکەڵ دەکرێن. بەردەتاشی ساسانی کە ئەویش زیاتر باسی گێڕانەوەی ڕووداوێکی

دیرۆکییە، تەنیا بەشێکی دیار و بەرچاوی زەق دەکاتەوە و لێی لانادا. ئەم هونەرە لە خۆراوادا وەکوو فیلمێکی سینەمایی دەچێ، بەڵام لە خۆرهەڵات چەشنی وێنەیەک وایە کە لە جێی خۆی چەقیوە و تیشکی هاویشتۆتە سەر تەنیا دیمەنێک کە زیاتر ناسێنەری ڕووداوەکەیە. بەم شێوەیە سەرکەوتن و زاڵبوون لە دیمەنێکدا خۆی دەبینێتەوە کە تێیدا پادشا یان خودا بە پاوە ڕاوەستاون یان سواری ئەسپن و دوژمنی پشتەوقەفار پێشێل دەکەن. لە دیمەنێکی دیکە و شەڕێکی دەستەویەخەدا، پادشای ساسانی خەنیمەکەی بە ئەسپەوە تێکهەڵدەگلێنێ. وەکوو دیارە سەرەنجامی تێکهەڵچوونەکە ناگاتە دەم و کاتێکی هەستوروورژێن و پەیوەندیی ئەم هونەرە لەگەڵ دیمەنی بەردەتاشەکانی تەختیجەمشید کە پادشا لە جەنگەی کوشتنی دێوەزمەی سەیردا دەخاتە بەرچاو، جێگای سەرسوڕمانە. بەردەتاشی ساسانی چۆن دیمەنی مەند و مەتین و داوەستاوی هونەری سەردەمی هەخامەنشی دەپارێزێ، هەر ئاواش تین و گوڕی کۆڕی ڕاو و تێکهەڵچووکانی پارتی کوێر ناکاتەوە. ئامانجی ئەم هونەرە نیشان دانی بابەتێکی نەگۆڕە و پادشایەک دەخاتە بەرچاو کە کۆشک و تەلارێکی دراوەتە پاڵی، ئەوەندە هەیە بە گۆڕانی پادشا، تەنیا ئاڵوگۆڕ بە سەر تاجەکەی دەهات کە ئی هەرکامەیەکیان پێکەوە جیاواز و تایبەتی خۆیان بوو. لە شێوازی کار و لێکدرانی بابەتەکاندا جیاوازییەکی زۆر وەبەرچاو دێ. لە هونەری ساسانیدا هەرگیز شوێنی قەومانی ڕووداوەکە بایەخی پێنەدراوە و نەخراوەتە بەرچاوان. کۆمەڵە کەسێک لە دەوری پادشا هاڵاون و بەپێی هونەری ڕۆژهەڵاتی قەڵافەتی پادشا یەکجار لەوان گەورەتر داتاشراوە. لەم دیمەنانەدا نیشاندانی ڕێزێک مرۆڤ تەنیا ڕێچارەیەک بووە کە بەردتاشان پەنایان بۆ بردووە و ئاوا قەڵافەتەکان وەکوو بەشێکی سەربەخۆ دیارن، ڕاست وەک چۆن

لە سەردەمی هەخامەنشی‌دا باو بووە. لە بەردەتاشی ئێرانی‌دا تاقمی ئادەمیزادان دەور ناگێڕن. ڕوون و ئاشکرایە کە ئەم هونەرە هێندێک ڕێوشوێنی خۆراوای قبووڵ کردووە، بۆ وێنە شێوەی نیشان‌دانی جل‌وبەرگ و خوارەکەوپێچەکەی ئەندام و سروشتی‌بوونی قەڵافەتی مرۆڤ؛ بەڵام بەردەتاشی ساسانی بە هێنانە گۆڕی دیمەنی هاوشێوە، دەرخستنی جیاوازیی زەق، شێوازی نیشان‌دانی پلە و پێگەی بنەماڵەیی و پاراستنی تایبەتمەندی و واتا و نێوەرۆکی شاراوەی، هەر بە ئێرانی ماوەتەوە، چونکە لە ئێران‌دا خستنەڕووی سەرکەوتنێک، دەبوو بە چەشنێک سێحر و جادوو دەستاو درابایەوە هەتا ئاوا کەوڵی هێز و شانازیی هاویشتبایە سەر شانی پادشا. ئەم شێوازە لەگەڵ شێوازی بەردەتاشی خۆراوا ناتەبایە.

سەبارەت بە کەل‌وپەل و ئەو شوێنەوارە هونەرییانەی کە سەبارەتن بە شاردنەوە و ناشتنی مردووان لە سەردەمی ساسانی‌دا، زانیارییەکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نییە. لەو سەردەمەدا مردوویان دەبردن و لە نێو «قەڵاقووچەی بێدەنگی»دا دایاندەنان. پاش ئەوەی دەڕزین و گۆشتیان دادەماڵدرا، یەسکەکانیان لە پەڕۆیەکەوە دەپێچان و دەیانبردن و دەیانخستنە ئەو قوڵکە یان یەسکدانانەی کە لە قەدی کێوان هەڵیانکەندبوون یان لە ژووری تایبەتی نێژران دەیانشاردنەوە. کوت و لەتی چەند یەسکدانێکی سواڵینە لە تورکستانی ڕووس دۆزراونەوە کە سەر بە کلکەی دەسەڵاتی ساسانین؛ بەڵام لە ئێران‌دا تەنیا دوو یەسکدانی بەردین دۆزراونەوە. یەکیان یەسکدانی بیشاپوورە کە نەخش و دیمەنی لەسەر هەڵکۆڵدراوە (ق٩٩_١٠٠). ئەوەی لەسەری هەڵکەندراوە یەکجار سواوە و بە سەر کوێربوونەوەدا کەوتووە. ڕوخساری ئادەمیزادەکان کە لە لاجەوە داتاشراون یەکجار ساکارن و قووڵ داتاشراون و شوێنەواری

وردەکارییان پێوە دیار نییە. ئەگەر بێتوو ئەم پەیکەرانە لەگەڵ پەیکەرانی سواڵینە پێکەوە هەڵسەنگێنین، بۆمان دەردەکەوێ کە لەم چەشنەی دواییدا دیمەنی میترامان دێتە بەرچاو کە سواری عارەبانەی خۆی بووە و ئەسپانی باڵدار رایدەکێشن. هەروەها ئەهوورامەزدا، ڤێرسرێغنە و خاتوونەخوای ئاناهیتا وەبەرچاو دێن. ڕەنگە ئەمانە سەمبولی سێیانەی ئایینی مەزدایی بن.

کەندەکاریی سەردەمی ساسانی باشتر ناسێندراوە، چونکە دەیان دەوری، شەربە، تونگەڵە و بوتری دۆزراونەوە. تەواوی ئەم ئاسەوارانە نەخشێندراون و بریتین لە کۆمەڵێک بابەتی فرەچەشن، بەتایبەت ڕاوی پادشا، لایەکی زیاتری لێکراوەتەوە. لێرەدا پادشا سواری ئەسپە و جلوبەرگی گرانبایی کردۆتە بەری و تاجێکی گەواهێربەندی کردۆتە سەری کە یەکجار وەستایانە کاری لەسەر کراوە. پادشا سەرقاڵی تیرهاویشتنە و ئەو ئاژەڵانە دەنگێوێ کە بازرە بوون و ئەویش کەوتۆتە سەریان. ئەم دیمەنە بە شێوەیەکی ناسروشتی خۆی دەنوێنێ و یەکجار لەگەڵ بابەت و نێوەرۆکی بەردەتاشان جووتە و یەکتر دەگرێتەوە(و٩٠). لەم دیمەنەدا ڕاوی ڕاستەقینە وەبەرچاو نایە و هەموو شتێک پێچەوانەی باری ڕاوی سروشتییە؛ بۆ وێنە جلوبەرگی پادشا و ئەو شریت و جغجغانەی کە دەشەکێنەوە و تاجی پادشا کە ڕەنگە لە جەنگەی چوارناڵەی ئەسپیدا بە سەرییەوە نەبێ و ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی کە دەوری ڕاوکەریان داوە ناسروشتین. ئەمە دیمەنێکی تێکەڵاو و شێوەیەکی وێنەگەرییە کە مەبەستێکی شاراوەی تێدایە و دەبێ بە هێنانە ئارای چەشنێک سێحر لە جەنگەی ڕاودا، زاڵبوونی پادشا مسۆگەر بکا و هێز و وزەی وەبەربنێ هەتا بتوانێ لەگەڵ شێر و بەور و بەراز تێکهەڵچێ. ئەم دیمەنە ئاوێنەی نیشاندانی «پادشایەکی ڕاوچی»یە.



ق٩٩- بیشاپوور: یەسکدان (ستۆدان)ی بەردینی هەڵکۆڵدراو




ق١٠٠- بیشاپوور: یەسکدانی بەردینی هەڵکۆڵدراو (بابەتەکان بەوردی خراونە بەرچاو.)

بابەتەکانی دیکە بریتین لە دیمەنی بەخشینی پلە و پایە یان پادشای دانیشتووی سەر تەخت و کۆڕی میوانان، کە وادیار زۆر کەوتۆتە بەردڵان (ق١٠١). دەبێ ژمارەیەک لەو تونگەڵە و بوتریبیانەی بە دیمەن و قەڵافەتی سەماکەران یان کەنیزان ڕازێندراونەوە، بخرێنە ئەو ڕیزەوە (و٩١). هێندێک لە

دەورییەکان دیمەنی بوونەوەرانی ڕاستەقینە یان خەیاڵییان لەسەر هەڵکەندراوە (ق١٠٢). وێدەچێ جوانترین و وەستاکارانەترین شوێنەوارەکان لە سەدەی سێهەم و چوارەمی زایینیدا خولقێندرابن. کارەکانی دواتر زۆربەیان لاساکردنەوە و وێنەهەڵگرتنەوەن.



ق١٠١ـ نیشان‌درانی دیمەنی پادشایان لە کاری زێرینگەریی ساسانی‌دا

بەردەئاوێنە کە کەرەسەیەکی ڕەسەنە و هەر لە کۆنەوە مرۆڤ زۆری بایەخ پێداوە، چاکی سەرنجی هونەرمەندانی ساسانیی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. ئێمە شوێنەوارێکی کەمی بەردەئاوێنەمان گەیوەتە دەستی و ڕەنگە لەو ڕۆژگارەدا کە پیشەی شووشەگەری یەکجار برەو دەستێنێ و پێشاوبڕکەی داتاشین و



ق۱۰۲- شه‌ربه‌ی زێوینی ساسانی

که‌ندزخینی به‌رده‌ئاوێنه ده‌داته‌وه، ئه‌م شوێنه‌وارانه به سه‌ر که‌می‌دا که‌وتبن. دیارترین و ناسراوترین کاری هونه‌ری له‌سه‌ر به‌رده‌ئاوێنه، گه‌ردنئاوێزێکی زێڕئاژنه سه‌ر به خه‌زنه‌خانه‌ی «سه‌ن دێنی» که ئه‌مڕۆ له به‌شی میدالیاکانی [کتێبخانه‌ی نه‌ته‌وه‌یی] پاریسه. ئه‌م گه‌ردنئاوێزه دیمه‌نی پادشایه‌کی ساسانی ده‌خاته به‌رچاو که له‌سه‌ر ته‌ختی خۆی دانیشتووه و پێچکه‌کانی بریتین له ئه‌سپی باڵدار (ق۱۰۳).



۱۰۳- میدالیای به‌رده‌ئاوینه‌ی زێڕئاژن، خه‌زنه‌خانه‌ی سه‌ن دێنی، کتێبخانه‌ی نه‌ته‌وه‌یی پاریس

خەزنەخانەی «سەن مارک» لە ڤێنیز[1]، «دەوری»یەکی لێیە کە چڵ و گەڵای لەسەر هەڵکەندراوە و ئەم شێوازە لە گەچبڕیی ساسانیدا یەکجار برەوی بووە (و٩٤). لەم شوێنە شەربەیەکی بە گوڵ نەخشاویش پارێزراوە کە دەکرێ کاری کارگەکانی ئەو سەردەمەی ئێرانی یان ئەو کارگایانە بێ کە کەوتوونە ژێر باندۆری ئەوانەوە (و٩٢).

کەندەکاریی سەردەمی ساسانی لە ڕێی هەزاران ئاسەواری نێو مووزان یان کۆلێکسیۆنی عەنتیکەدارانی سەرتاسەری دنیاوە ناسراوە. هێندێکیان دیمەن و ڕوخساری خودی خاوەنەکانیان لەسەر هەڵکەندراوە و بە خەتی پەهلەوی ناو و ناوبانگیان نووسراوە، بەڵام زۆربەیان دنیای بوونەوەران یان گیاوگۆڵیان لەسەر هەڵکەندراوە و مەبەستەکان زمانی ئاماژەیان تێدایە و هەتا ئێستاش ئێمە لێیان حاڵی نەبووین. «ئێمە لێرەدا مۆرێک دەخەینە بەرچاوان کە لە قوڕی سوورەوەکراو سازکراوە و سەبارەتە بە سەدەی شەشەم و لەو چینەی شووشدا دۆزراوەتەوە کە سەر بە سەردەمی ساسانییە. ئەم مۆرە بە شریتێک لە بەڵگەنامەیەکی ڕەسمی قایم کراوە کە ڕەنگە پارشمەن یان هەمان پێستە ئاژەڵ بووبێ. لەسەر ئەم مۆرە واژۆی کابرایەکی پایەبەرز دیارە کە نیوەبەژنی خۆشی لەسەر شەقڵ کراوە (و١٠١).»[2]

ئێرانی نێوان وڵاتی «چین»ی ڕەنێوهێنی ئاوریشم و ڕۆمی گەورەترین کڕیاری کووتاڵی ئاوریشمی گرانبایی، ئاوریشمی خاو و کووتاڵی ئاوریشمی پێدا ڕادەگوێزرا. پادشایانی مەزنی ساسانی کە پێیان خۆش بوو ئێرانیش بەشداری بەرهەمهێنانی پارچەی ئاوریشم بن، دوابەدوای سەرکەوتنەکانی خۆیان لە

---

١- وێنیز

٢- وەکوو دیارە لە دەقی وەرگێرانەکەی دوکتۆر موعیندا ئەم چەند ڕستەیە زیاد کراوە. دەقی فەرانسە مەبەستێکی ئەوتۆی تێدا نییە.و.

سووریا، به کۆمەڵ وەستاکار و جۆلایان ڕاگوێستن بۆ هەرێمەکانی ئێران و بەتایبەت له خووزستان نیشتەجێیان کردن.

کۆمەڵێک بەردەتاشی وەک تاقبوستان، دیمەنێک له نەخش و نیگاری پارچەکانی سەردەمی ساسانی دەخەنەوه یاد، چونکه وەستاکاران لەوێ زۆریان وێنه لەوان هەڵگرتۆتەوه. چەند نیشان یان میدالیایەک دۆزراونەوه که به دیمەنی بوونەوەران و جەنگەی ڕاو، بەتایبەت ڕاوی بارامی گۆڕ و بابەتی سەمبولیکی دیکه ڕازێندراونەوه و هەموویان دەدرێنه پاڵ ڕۆژگاری ساسانی. هەزارەی یەکەمی زایینی، سەردەمێک بوو که ئاسەواری پیرۆز و متفەڕک له ڕۆژهەڵات دەکڕدران و له نێو کاڵای بازرگانیدا خۆیان دەنواند. جوانترین و شکۆمەندترین کووتاڵی ئێرانی دەکرانه کفنی ئەوانەی گەیبوونه پلەی «پیرۆز»ی. بەم شێوەیه کلیسا گەورەکانی ئورووپا بوونه خاوەنی قەوارەی کووتاڵی سەردەمی ساسانی و ئێستاش هەر پاراستوویانن، بەڵام له خودی ئێران شتی ئاوا نەکراوه. هاتنی ئیسلام نەیتوانی دابی کفنکردنی تەرم و پیشەی سەبارەت بەم کاره تێدابەرێ. له چەند گۆڕێکی سەر به ڕۆژگاری پاش ساسانییەکاندا، جاری وایه به هەڵکەوت کووتاڵی وا دۆزراونەوه که هێشتاش دوای سەدان ساڵان دیمەنی پیاوچاکانیان لەسەر ماوه (و۹۳).

هەتا هونەر بەهێز بووبا، چاکتری بڕ دەکرد و پەلی داویشته ناوچه و هەرێمه دوورەدەستەکان و تەنانەت مانەوەشی له وڵاتانی دەرەوه پتر جێگای دڵنیایی بوو. هونەری ساسانیش لەم هونەرانه بوو که توانی له چینەوه هەتا مەزنەدەریای ئەتڵەس باڵی بنگێوێ. کاردانەوەی ئەم هونەره له خۆراوا بوو به ڕاوکەی هونەری سەدەکانی نێوەڕاستی ئورووپا و چاکی ڕەنگ دایەوه. کلیسای «ژێرمینیی دێ پرێ» له نیزیک «ئۆرلێئان» که لەسەر شێوازی ئاورگایەک ساز

کراوە، دیوارە سپیکار و گەچبڕیکراوەکانی داری ژیانیان لەسەر کێشراوەتەوە. ئەم دیمەنە ئەشکەوتی تاقبوستان دەخاتەوە یاد و بە کارێکی تاق و ناوازە دانانرێ. سپیکاری و گەچبڕییەکانی مەزارگەی ڕاهیبە «ئاگیلبێرتا» کە ساڵی ٦٦٥ زایینی کۆچی‌دوایی کردووە و لە سەیزانی کلیسای «ژوار»ی نێوان پاریس و «شاتوو ـ تیری» نێژراوە، نموونەیەکی دیکەی لەم چەشنەیە.



ق١٠٤ـ بەردەتاشی نەخشی ڕۆستەم: ئەردەشێری بەرەوڕووی ئەهوورامەزدا

پادشا وەکوو سەمبولی ئەهوورامەزدا لەسەر زەوی، بە خۆشفەڕی لە هونەری ساسانی‌دا خۆی دەنوێنێ و لە بارگای شکۆمەندی‌دا خەریکی ڕێوڕەسمی تاج لە سەرنانە. ئەم دیمەنە بۆتە سەرچەشنی هونەرمەندانی بیزانسی و مەسیحی سەرکەوتوویان لە ڕووی کێشاوەتەوە کە چەند فرشتەیەک و یارانی و پێغەمبەرانی دیکە و نووسەرەوانی ئینجیل دەورەیان داوە. دواتر هونەرمەندانی بیزانسی قامکی شادەی ڕادێراوی مرۆڤ کە نیشانەی ڕێزدانان بوو بۆ مەزنانی سەردەمی ساسانی ، دێننە ئارا کە هەر لە واتاکەشی

حـاڵی نـەبوون (ق١٠٤ـ١٠٥) زێڕینگـەرانی ئورووپـای ناوەنـدی، کەنـدەکاریی سەردەمی ساسانییەکانیان خواستەوە و ڕەنگە ئەوانیش هەر وەک ئێمە شتێکی وایان لەو چەمکانە نەزانیبێ. وێدەچێ ئەو وەستاکارانەی کۆمەڵێک ئاسـەواری هێژای زێڕینیـان بـەدی هێنـاوە و گەنجینـەی «ئـاتیلا»یـان لـێ پڕ کـردووە و توێژەران دەیبەنەوە سەر سەدەی هەشتەم و نۆهەمی زایینی، هـەر بە شـوێن ڕچەی لاسایی‌دا هەنگاویان نابێ و کاریان بـە چەمک و واتـای بـابـەتـەکـان نـەدابـێ (ق١٠٦ ـ ١٠٧).



ق١٠٥ـ کلیسای بیک(Indre): کۆڕی پەسن و پەرستنی موغان؛ هونەری دینیی فەرانسە لە سەدەی دوازدەهەمی زایینی‌دا



ق١٠٦ـ گۆزەڵەی زێڕی گەنجینەی ناودێر بە ئاتیلا

هەروەها هونەری ساسانی بۆتە سەرمەشقی وێنەگەرانی ئاسیای ناوەندی و دیواری پەرستگا پیرۆزەکانی بوودایی بە شێوازی کاری ئەوان ڕازاوەتەوە (ق١٠٨). قوماشکەرانی میسری و بیزانسیش لەو جەغزەدا خولیان داوە، بەڵام «میراتگری ڕاستەقینەی ئێرانی سەردەمی ساسانی، ئیسلامە.» ئەوەی ڕاستی بێ ئیسلام لە هەر جێگایەکی پەرەی گرت، لەگەڵ خۆی وێنە و دیمەنەکانی هونەری لەمێژینی ساسانی ڕاگواست و وەکوو دیارە ئیسلام توانی ئاخرین پرشنگی خۆی باوێتە سەر ناوچە دوورەدەستەکانیش.



ق١٠٧ـ نێوقەدی گۆزەیەکی زێڕینی سەر بە گەنجینەی ناودێر بە ئاتیلا



ق١٠٨ـ گەچبڕیی «بوودایی»ی مۆنگ ئۆی (تورکستانی چین)

ئەدەبیاتی فۆلکلۆر و نەتەوەیی کە پشتاوپشت دەگەڕا و دەماودەم دەگێڕدرایەوە و پاراو دەبوو بە بیر و باوەڕی خەڵک و ژیانی گەل، لە سەردەمی ساسانیدا جێی بۆ ئەدەبیاتێکی نووسراو چۆڵ کرد کە بە مەبەستی خوێندنەوەی مەزنەوەجاخان و بارگانشینان دەنووسرا. چەند بەشێکی ئەڤێستا ـ کە سەرچاوەی هەموو زانستەکان بوو ـ کۆمەڵێک بابەتی پزیشکیی تێدایە کە

دەستوورەکانی بوقرات لەگەڵ ڕێوشوێنی دینی زەردەشتی ڕێک کرابوون. وەرگێڕانی شوێنەواری یۆنانی، لاتینی و هیندی لە سەردەمی شاپووری یەکەمدا دەستی پێکرد و لە ڕۆژگاری خوسرەوی یەکەمدا، کە بە ڕۆژگاری بزووتنەوە و بووژانەوەی ئێرانی دادەندرێ، چاکی پەرە پێدرا. سەردەمی خوسرەو کە بۆ حاوانەوە لەگەڵ هەموو دینێک یەکجار شازە و ڕاست بەپێچەوانەی کلیسای بیزانسە، دەبێتە پەنا و پەسیوی ئەو فەیلەسووفە یۆنانییانەی کە لە وڵاتی خۆیاندا کەوتبوونە بەر گوڕمی ئازار و ئێشاندن و تیسفوون باوەشی بۆ کردبوونەوە. شەپۆلی بیروبۆچوونی ڕۆژاوایی کە لەم ڕۆژگارەدا دزەی کردە خاکی ئێران و لەگەڵ بیروبۆچوونی هاتووی هیندی تێکەڵاو کرا، توانی بەرچاوی ڕووناکبیرانی ئێرانی بەرینتر بکا. لە نێو ئەو کەسانەدا دەکرێ باسی گەورە پزیشکی پادشا، واتە بەرزوویە[1] بکرێ. ئەو لە نووسینەکانی خۆیدا باسی کۆمەڵ و ڕەوشت و دینان دەکا. خوێنەرەوان یەکجار هۆگری کتێب و نامیلکەی سەبارەت بە ئامۆژگاری بوون و ئاسەوارێکی زۆر لەم بوارەدا نووسران، بەڵام بەداخەوە هەموویان نەگەیشتوونە دەستی ئێمە و هەتا ئێستا تێداچوون. لەم بەرهەمانەدا کۆمەڵێک بابەت خراونە بەرباس کە بریتین لە: ئاوەزمەندی، خێر و چاکە، دلۆوانی، ئەرکی دەوڵەمەند سەبارەت بە هەژار و ڕاشکانی هەژاربوونی شەرافەتمەندانە بە سەر دەوڵەمەندبوونی لووتبەرزانە و نادادپەروەرانەدا. پەرەگرتنی دەربڕینی بیروڕای ئازاد، دەسەڵات و دەستڕۆیشتنی پێشەنگانی دینی زەردەشتیی هێنایە لەرزە و ئەوانیش لێی وەخۆکەوتن، بەڵام ئەو بەرەنگاربوونەوەی ئەوان دژی بیروڕای فەیلەسووفانی دەرەکی، بە قازانجیان نەبرایەوە. ئەو دەقانەی کە گەیشتوونە دەستی ئێمە دەڵێن پێشەوایانی دینی

---

١- برزوویە

گیرۆدەی گەندەڵیی باوەڕ و چاوچنۆکی و تەنانەت لە دین وەرگەڕان ببوون، چونکە پێشەوایانی ڕەسمی بەگوێرەی شەپۆلی دینە گەورەکانی سەردەم، دەکەونە بانگاواز بۆ پەرستنی خودایەکی تاق و تاقانە و ئەم ڕوانگەیە دەبووژێننەوە. ئەم ڕەوت و ڕێبازە تازەیە کاتێک لە ئێراندا بوو بە باو کە ئیسلام توانیبووی سەرکەوتووبێ و ئەو کاتەش پەلەقاژە بۆ ڕزگارکردنی دینی نەتەوەیی یەکجار درەنگ بوو.

## بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی

بناغەی ئابووریی ئیمپراتۆریی ساسانی وەکوو رابردوو پتر لەسەر کشتوکاڵ داندرابوو نەک بازرگانی، بەڵام دیسانیش سەردەمی ساسانی کە ئاخرین ڕووپەڕی دنیای کۆن و کەونارایە، بە تێکۆشانی دامودەزگا و دامەزراوەکانی حکوومەتی و هەوڵ و هەڵسووڕانی تاقەتپرووکێنی جەماوەرەکەی، دەتوانێ سیستمێکی پرشنگداری سیاسی و کولتووریی وا بەدی بێنێ، کە هەتا ئەمڕۆش شوێنەواری هەر ماوە و بڕی کردووە. سەردەمی ساسانی بە لانی زۆربوونی داهات و دابەشینی بەرهەم و پەرەی دەسکردانەوە لە سەردەمەکانی دیکەی تێپەڕاندووە. چەشنێک هاوسەنگی لە تێکڕای ژیان و چالاکی و هەڵسووڕانی مرۆڤ و لە هەرێمی دەریای مەدیتەرانەدا بەدی هات کە لە ئیمپراتۆریی ڕۆم و ئیمپراتۆریی ساسانیشدا ڕەنگی دایەوە. لەم بابەتەوە ئەم بەشەی جیهانی کۆن کەوتۆتە پێش ئورووپای باشووری و ناوەندی و باکووری و لەوانی تێپەڕاندووە. کۆمەڵە سکەی زێو و مس و بەهەڵکەوت زێڕی ساسانی، لە ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا، ڕووبەرێکی زیاتر دەتەنێتەوە. بێگومان لەم ڕۆژگارەدا نووسرانی پسوولەی دەستەبەربوونی بانکی تەواو دێتە برەو. وەکوو ئاشکرایە بانکدارانی جوولەکەی بابلی و دامەزراوە هاوشێوەکانی ئێرانی لەم ڕەوتەدا

دەوری بەرچاویان گێڕاوە. خۆ ڕاستە کە داهێنانی پسوولەی دەستەبەربوون دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووهەمی پێش‌زایین، بەڵام ئەو کاتی هێندەی نەتەنیبۆوە و تەنیا بریتی بوو لە دان‌هێنان بە قەرزوقۆڵە یان ڕێکەوتی درانەوەی‌دا. لە سەردەمی ساسانی‌دا نووسرانی پسوولەی دەستەبەربوون یان باوەڕنامەی بانکی وەکوو بەڵگەنامەی ڕەسمی دەوری گێڕا. بانکەکانی ئیمپراتۆری کە بە دەست ئێرانی یان جوولەکانەوە بوون، بەپێی بەڵگەنامەی نووسراو بە شێوەیەکی بەربڵاو دراویان دەستاودەست پێدەکرد. تاقمێکی کەم لە پسپۆڕانی دارایی و بانکی دەزانن کە وشەی «چەک» یان زاراوەی دەستەبەربوونی بەڵگەنامەی بانکی لە زمانی پەهلەوی‌ڕا چۆتە نێو [زمانەکانی ئورووپایی]. ئەم کارە داهێنانێکە کە ئێرانی لە سەرەتای سەدەکانی نێوەڕاست‌دا کردوویانەتە باو. بازرگانانی مەسیحیی سووریا دواتر شێوازی نووسینی پسوولەی دەستەبەربوونی ئێرانیان خواستەوە و بردیانە خۆراوا و لە سەردەمی «مێرۆڤینژی»یەکانەوە[1] ڕەمێنی پەیدا کرد.

کارپێکرانی سکە لە شاران‌دا برەوی ئەستاند و گەلێک «درەم»ی زیـــوی ساسانی (و١٠٢) لە ئێران یان وڵاتانی دراوسێی‌دا دۆزراونەوە. لە ناوچە و مەڵبەندی گوندەکی و لە دێهاتان، مووچە و مانگانەی جووتیاران، سەربازان، کاربەدەستانی حکوومەت و تەنانەت پیتاکیش بە کەل‌وپەل دابین دەکران و ئەم نەریتە لە هێندێک ناوچەدا هەتا سەردەمی ئێمەش هەر درێژەی هەیە. هەڵبەت وەکوو دیارە بازرگانیی دەرەوە تەنیا لەسەر تەوەرەی دان و وەرگرتنی سکە هەڵسووڕاوە. بازرگانیی دەرەوە لەچاو سەدەکانی ڕابردوو بە شێوەیەکی

---

١ـ یەکەمین زنجیرەی پادشایانی فەرانسە کە لە کلکەی سەدەی پێنجەمی زایینی‌ڕا هەتا نێوەڕاستەکانی سەدەی هەشتەمی زایینی حکوومەتیان بە سەر ئەم وڵاتەدا کرد.و.

هەستپێکراو زیادی کردووە و پتر کاڵا و کەلوپەلی گرانبایی و زریقەوبریقەدار تایبەتی بارگای میری و چینی دەوڵەمەندانی مەزنەوەجاخی ئێرانی بەرمێن بوون. وەرگیرانی پیتاک بە شێوەی کاڵا و کەلوپەل بوو بە هۆی ئەوەی کە میران پاشەکەوتێکی یەکجار بەرچاوی بەرهەمی سەرەکی بخەنە سەر یەکتر و سەرکار و پاکاری حکوومەت لە بازاڕاندا بڵاویان بکەنەوە. قازانجێکی دیکەی ئەم دەسەڵاتدارانە ئەوە بوو کە دەیانتوانی لە جەنگەی قاتیوقڕیدا بگەنە فریای خەڵک و ئەرکی سەر شانی پادشایان بوو کە بە مەبەستی هێورکردنەوەی شەپۆلی چارەڕەشییەکانی گەل، مل بۆ ئەم کارە ڕاکێشن.

هەرگیز لە ڕۆژگارانی پێشوودا کاروباری بازرگانی وەکوو ئەم سەردەمە ئاوا بە شێوەیەکی توندوتۆڵ چاوەدێریی بە سەردا نەکراوە، جا هەر بۆیە حکوومەت ناچار بوو هەتا لەبەر هاتوچۆی بەرچاو، لە ڕێگاوبان و چۆماواندا کاروانسەرا و خەزێناو و جێلەنگەران ساز بکا. کۆمەڵێک لێپرسراو بۆ ئەم کار و خزمەتانە دیاری کرابوون و چاوەدێر بوون بە سەر وێستگەکانی سنووری و لەنگەرگاکانی دەریاییدا. هەروەها حکوومەت کڕین و فرۆشتنی چەند کاڵا و بەرهەمێکی گرینگی وەکوو ئاوریشمی خاوی کردبوو بە پاوانی خۆی کە لە چینەوە دەهێندرا و بەتایبەت لە کارگەکانی «سووری ـ فنیقی»دا دەکار دەکران. هێندەی پێنەچوو کە ئەو جەماوەری وا پادشایانی ساسانی هێنابوویانن و لە چەند ناوچەیەکی ئێران نیشتەجێیان کردبوون، لەگەڵ وەستاکارانی باسکراو کەوتنە ڕقە و کۆمەڵێک کارگەی شووش، گوندی شاپوور و شووشتەر بۆ تەنینی کووتاڵ ناوبانگیان ڕۆیی. هەوڕوهاڵی جوانی سواڵینە و دەسکردی شووشەی «سووری ـ فەلەستینی» و ئەسکەندەرییەیی دەگەیشتنە بازارەکانی ئێران.

کڕین و فرۆشتنی کووتاڵ و جلوبەرگ یەکجار بەرچاو بوو. عەنبەریان لە دەریای ڕەشەوە دێنا و پاپیرووس کە پتر لە جاران جێگای پێستەی ئاژەڵی گرتبۆوە، هەمیشە خوازیار و کڕیاری هەبوو. وێناچێ کە بەرلە سەردەمی ئیسلامی کاغەز لە چینەوە چووبێتە ولاتانی دیکە. هەزوێڵە و تامەچێشتی بۆنخۆشی چین و عەرەبستان بە خاکی ئێراندا تێدەپەڕین. سونبول و بیباریان لە [هەرێمی] مادەوە هەناردەی دەرەوە دەکرد. پەرەگرتنی بازرگانیی نێونەتەوەیی چەند کۆچەرنشینێکی بازرگانانی بەدی هێنا و بەتایبەت جوولەکە و سوریانی لە ناوچە دوورەدەستەکانی وەکوو هیند، تورکستان، برۆتانی و کەنارەکانی دەریای ڕەش بنەگر بوون. ئەو ناوەندانەی بازرگانی کە سەرقاڵی کڕین و فرۆشتنی هەموو شتێک بوون، لەم سەردەمەدا بە سەر پسپۆڕیدا کەوتن و تەنیا خۆیان بە کڕین و فرۆشتنی گەنم و پاتاڵ و بەرهەمی کارگەکانەوە سەرقاڵ کرد. بەم شێوەیە جیاوازی نێوان بازرگانانی نێوخۆیی و ئەوانەی کەلوپەل و کاڵایان دەناردە دەرەوە، روون بۆوە و لە ئاکامدا دەڵاڵی بازاڕان پەرەیان گرت. سەرجەم کاروباری بازرگانیی دەرەوە لەچاو سەردەمی پێشوو هێندەی پەرە نەگرت و هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە سەر دەستێوەردانی حکوومەت کە گرێ و کۆسپی دەخستە بەر دەمی ئاڵوگۆڕی کاڵای بازرگانی.

لە بواری بازرگانیی نێوخۆییشدا دەبینین کە شارەزابوونی بازرگانانی خۆماڵی و چەرچی و دەسفرۆشانی گوندان کە بە شێوەیەکی ئاسایی تێبەستەی بازرگانانی چەند ناوەندێکی گرینگ بوون، لە بابل دەکەونە سەر سکەی خۆیان و ئەم ڕەوتە ئێرانیش دەتەنێتەوە.

لە دەرەوەی کاروباری بازرگانیدا، چالاکی و هەڵسووڕانی بانکان سنووردار بوو. بانکەکان تەنیا لە جەنگەی کەمبوونی بەرهەم یان لە کاتی وەرگیرانی

پیتاکدا وەگەڕ دەکەوتن؛ بەڵام دیسانیش ئەم ڕەوتە کۆسپی بەردەمی حکوومەت نەبوو کە پتر لە جاران خۆی لە کاروباری بانکی وەرنەدا یان بە شێوەیەکی ڕێکوپێک چاوەدێرییان نەکا. وەکوو دیارە ئەم ڕەوت و ڕێبازە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن درێژەی پێدەدرێ و هەتا ڕۆژگاری ئێمەش تووشی ئاڵوگۆڕ نابێ.

ڕەنێوهێنانی بەرهەم و پێچارانی گەشەی کرد و کووتاڵی ئاوریشم و شووشەگەریشی گرتەوە و لەم بوارەشدا جەماوەرێک تەواو بوونە پسپۆڕ. حکوومەت بەو پاوانانەی کە هەیبوون بە بەرهەمهێن دادەندرا و خاوەنی کۆمەڵێک کارگا بوو. هەروەها حکوومەت تەنانەت بڕشت و دەسەڵاتی خۆی خستە نێو بەستێنی کۆمەڵێک کار و پیشەی کەرتی تایبەت، بەتایبەت ئەو کار و بەرهەمانەی کە ڕاستەوخۆ کەوتبوونە بەر سەرنجی بارگای میری و قۆشەن و دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و لە ئاکامدا حکوومەت بە نرخی کەرەسەی خاو و مووچەی کرێکاراندا چۆوە و هاوسەنگی و پارسەنگی تێدا بەدی هێنان. بەم شێوەیە مەیل و تاسە بۆ بەدی هاتنی کۆمەڵێک کار و پیشەی تازە گوڵیان کرد و دواتر ئیسلام و دنیای سەدەکانی نێوەڕاست لێیان بەهرەوەر بوون.

دەرەبەگانی گەورە زۆربەیان خاوەنی جووتێر، دارتاش، ئاسنگەر، تەونگەر، نانەوا، ڕۆنگر، ئاشەوان و ئاشی تایبەت بە خۆیان بوون. ئاش بە داهێنانێکی تازە دانەدەندرا، بەڵکوو لە سەدەی چوارەمەوە کاری پێدەکرا. بەرهەمی کشتوکاڵی دەپارێزرا و پەرەی پێدەدرا. لەم بوارەدا چەند کارێکی تازە دەکرێن و لێدرانی داری توو و بەخێوکرانی کرمی ئاوریشم دێتە ئاراوە؛ هەڵبەت وەکوو ئاشکرایە ئەم کارە بۆ وڵاتێکی کە کووتاڵێکی یەکجار زۆری ئاوریشمی دەویست، زۆر گرینگ بوو. زەویوزاری بەربڵاوی حکوومەت و دەرەبەگان، هەر بەگوێرەی ڕێوشوێنی کۆن دادەچێندران و بەرهەمیان لێهەڵدەگیرا. ئەگەر جاری وایە

پێشکەوتنێک بەدی دەهات هەر لە زەوی‌وزاری حکوومەتی‌دا بوو، چونکە ئازادیی ئابووری لە کاروباری کشت‌وکاڵی‌دا یەکجار بەرتەسک کرابۆوە و کار و هەنگاوی تاک‌وتەرا دەروەستی پەرەپێدانی نەدەهات.

لە کاتێک‌دا کە بارودۆخی ئابووری هەتا ئەندازەیەک گەشە و پەرەی بە خۆیەوە دیتبوو، هەل‌ومەرجی ژیانی خەڵکی گوندان بەرەو تاڵی و نالەباری گلۆر ببۆوە. سروشتی رووناکبینانەی جەماوەری گوندەکی کە لە سەردەمی پەرەی شارستانییەتی یۆنانی‌دا رەنگی دابۆوە، تێداچوو. هەموویان دەچەوسێندرانەوە و سەربەست نەبوون و هەرگیز پێیان نەدەخوێندرا و پەروەردە نەدەکران. جووتیاران و رەنجبەران تەنیا بە هەڵکەوت و بۆ ماوەیەکی کەم سەربەست ژیاون، ئەگینا یان لە ژێر نیری حکوومەت‌دا بوون یان دەرەبەگان تەنگەیان لێ کێشابوون. ئەوان تێبەستەی زەوی‌وزار و مڵک‌وماشی حکوومەت و دەرەبەگان و ئاورگایان بوون. دەرەبەگانی گەورە رۆژبەرۆژ دەسەڵاتیان زیاتری پەرە ئەستاند و قوڵەئاغاکان ناچار بوون کە بۆ تێپەڕاندنی قەیرانی ئابووری و دەسدرێژییەکانی حکوومەت، خۆیان بخەنە ژێر داڵدەی دەرەبەگانی گەورەوە. لەبەروەی ئەم گەورەگەورانە دەبوو پیتاک بۆ حکوومەت کۆ بکەنەوە، بەرەبەرە کوێخا و گزیر و سەرکار و پاکاری بەردەستیان زیاد بوون. حکوومەت کە کۆکرانەوەی پیتاکی ئاوا بۆ سووک و ساکار ببۆوە، هەتا رادەیەک بە دەرەبەگانەوە بەسترایەوە و هەوڵ و هەڵسووڕانی بە مەبەستی کەم کردنەوەی دەسەڵاتیان شکستی هێنا. دەسرۆیشتوویی و دەسەڵاتی دەرەبەگان ئەوەندەی پەرە گرت کە بە باری دارایی و لەشکری‌دا، پادشا بە چاو لە دەستیان دادەندرا.

ئێران تەنیا وڵاتێک نەبوو کە بە دەست ئەم لاسەنگییەوە دەناڵی. لە هەموو جێیەکی دنیا، لە ئیمپراتۆریی رۆمی ئیتالیاوە بگرە هەتا غالیا و میسر و ئەفریقای

باکووری، دەرەبەگ هەبوون. خوسرەوی یەکەم بە بەرهەمهێنانی دەغڵودانی سەرەکی و ڕێکخستن و ڕاهێنانی جووتیارانی قۆشەنچی، هەوڵی دا هەتا هێندێک لە دەسەڵاتی بەرەو پەرەیان کەم بکاتەوە. ڕژمیش لاســای ساسانییەکانی کردەوە و هێراکلیووسی ئیمپراتۆر چینی جووتیارانی قۆشەنچیی بەدی هێنا، بەڵام ئاڵوگۆڕەکانی هێندە وەدرەنگی کەوتبوون، کە نەیانتوانی ببنە بەرگێڕەوەی پەلاماری دوژمنانی دەرەکی.

زەویوزاری ئەڵڵابەرپان و بەرین بوونە دامودەزگایەکی سنووردار و بەشی زۆریان بە ئیجارە دەدران. جووتیار و پاڵە و ڕەنجبەران لەسەر ئەو مڵکوماشانە کاریان دەکرد و هەرچی پێداویستیی دەرەبەگان و مەزنان بوو ڕەنێویان دێنان. بەرهەمەکان بریتی بوون لە گەنم، ڕۆن، شەراب، میوەی ڕەنگاوڕەنگ و گۆشت. مزە و مانگانەی جەماوەری بەرکار بە ویشکەماڵ دابین دەکرا و داهاتی زەویش هەر لە بەرهەمی خۆی هەڵدەگیرا و جوێ دەکرایەوە. ڕەوتی گەڕانی سکە لە گونداندا زۆر چاکی لە کەمێ دابوو. دەرەبەگان تازە لە شاران نەدەحاوانەوە و ماڵیان ڕادەگواست بۆ ناوچەکانی گوندەکی و لەسەر مڵک و ماڵی خۆیان دادەنیشتن و لە قەڵا و قایمەلانان بنەگر دەبوون و ئاوا بە سەر کاروباری مەزراکانیان ڕادەگەیشتن. کۆشک و تەلاریان بە جوانترین شێوەی باوی سەردەم ڕازابوونەوە و پیاوەکانیان هەمیشە ئامادە بوون کە خۆیان و ماڵ و منداڵ و یاران و خزمەتکارانیان لە حاند هەرا و ئاژاوەدا بپارێزن. لەو سەردەمەدا ڕەوتێکی نەگۆڕی دوور لە سۆزی مرۆڤایەتی و لەسەر تەوەرەی کشتوکاڵ لە جیهاندا بەدی هات و سەدان ساڵی درێژە کێشا. هەروەها سەدان ساڵی پێچوو هەتا بەرەبەرە لە ئاست ئەم ئاڵوگۆڕانەدا، شارستانییەتێکی تازە بەدی هات و پەرەی ئەستاند و لە گوندانەوە ڕووی کردە شاران. ئێران و ڕۆم لەسەر بنەمای

میراتی کۆن، شێوەیەک سیستمی دەرەبەگییان تێدا بەدی هات کە لەوانەی سەردەمانی پێشوو باشتر بوو. «لەبری بە کۆیلە چوونی ئەو جەماوەرە گوندەکییەی کە پێشتر ئازاد بوون، چینی دەرەبەگی بژاردە پێکهات. ئاڵوگۆڕێک لە سیستمی دەرەبەگیدا بەدی هات کە دواتر لە تەواوی وڵاتانی ئاسیا و ئورووپادا ڕەنگی دایەوە و بوو بە جێگرەوەی سەرلەبەری یاسا و ڕێسای ملکوماشی دنیای کۆن.» ئەم شۆڕش یان ئاڵوگۆڕە لەسەر تەوەرەی دەرەبەگایەتیی سەدەکانی نێوەڕاستی عەرەب و سلاڤ ـ ڕووسی[1] و مەدیتەرانەیی هەڵدەسووڕا و توانی فەرهەنگی بەرزی دنیای کەونارا بپارێزێ و پەرەی پێبدا.

حکوومەت لە کاروباری داراییدا بە ویشکەسۆزی دەجووڵایەوە. بە مەبەستی ژیاندنەوەی داب و نەریتی سەردەمی هێلێنیستی، پیتاک و سەرانەیەکی وای بۆ زەوی‌وزار و خەڵک دیاری دەکرد کە هیچکەس دەروەستی نەدەهات و بە زۆرەملی دەکەوتە ڕووتاندنەوەیان. ئەو پیتاکە ناڕاستەوخۆیەی کە بۆ گوومرگ و ڕێدارانە داندرابوون، بارێکی دیکەی بە سەر شانی خەڵکدا سەپاند. تەواوی ئەو کەسانەی کە لە توخمەی مەزن و ماقووڵان نەبوون، بەناچاری شانیان دەدایە بەر هەر کارێک کە بریتی بوون لە: کرێکاری بۆ کۆشکی میری، هێنان و ئامادەکردنی کەرەسە و پێداویستی، ڕچاوکردنی پیشەی سەنعاتکاران، پێڕاگەیشتنی چەپەرخانان و بوون بە خزمەتکاری هێزی چەکدار و شوان و گاوانی پادشا. دێنشینان دەبوو هەمیشە یەکسمیان بۆ چەپەران ساز و تەیار بێ. سەرکاروان و عارەبانەچی و لۆتکەوان دەبوو پێداویستییەکانی کاری خۆیان دابین بکەن و وەک تای تەوەرداس ئامادە بن. حکوومەت بەرهەمی کاسپکاری

---

1_ Slavo _ russe

بازارانی بە نرخێکی کەم دەکڕی و ئەگەرچی پادشا زۆر بەتوندی بە گژ گەندەڵیدا دەچۆوە، بەڵام گەندەڵبوونی کاربەدەستان ئاشی پێدەگەڕا.

حکوومەت پێویستی بە پارە بوو. زەویوزار و کارگەکانی هەموو پێداویستییەکی بارگا و قۆشەنیان دابین دەکرد و هەرچییەکیش کە زیادی مابایەوە دەفرۆشرا. ئازادیی تاک دەگەڕایەوە سەر مەیل و ویستی حکوومەت و نیزیکەی هەزار ساڵ لە ئێراندا شوێنپێی وەبەرچاو نەهات و سۆسەی نەکرا. خەزێنە پڕ نەدەبوو. دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی و قۆشەن گوژمەی زیاتریان داوا دەکرد. ئەو قەڵات و سەنگەرانەی کە لەسەر سنووران سازیان دەکردن، هێندەی تێدەچوو کە بە گران لە سەریان دەکەوت. دەبوو خەرجی هێزی دەریاوانی دابین کرابا و ئەو باڵوێزانەی کە دەنێردرانە بارگای وڵاتانی دیکە پێویست بوو بە دەستپڕی بچن و دیاری و خەڵاتێکی زۆر بەرن. لە جەنگەی چارەڕەشی و قاتیوقڕیدا حکوومەت دەبوو بە هەژاران و لێقەوماوان ڕابگا. گوژمەیەکی زۆر بۆ کاروباری فەرهەنگی و سازکردنی خوێندنگە و قوتابخانان تەرخان کرابوو. هەوڵێکی زۆر بەڕێوە بوو بۆ جوانکردنی شاران و لێدانی کەرێز و هەڵبەستنی جۆگە و قەمتەرە و ڕاگواستنی ئاو. ئەگەرچی ناکرێ بڵێین کە زەمانی ساسانی سەردەمی ئاشتی و ئارامی بووە، بەڵام دیسانیش شارەکانی پەرەیان دەستاند و لە هەموو گۆشە و کەناری وڵات شاری تازە ساز دەکران و ئاوا مەودای نێوانیان کەم دەبۆوە، بەتایبەت لەو ناوچانەدا کە بەڕێژەو بوون و کەمتر دەکەوتنە بەر شەپۆلی کارەسات و لە کۆنزەمانەوە کشتوکاڵیان لێدەکرا یان پادشای بەرچاوڕوون وەسەر ئەم ڕەوتەی گێڕابوون. بۆ باری ئاوەدانی و شارسازی سیستان و خووزستان کەوتبوونە ڕیزی پێشەوەی تەواوی هەرێمەکان و لە پلەی یەکەمدا ڕاوەستابوون.

ئەو ئاڵوگۆڕە دارایی و ماڵییەی کە خوسرەوی یەکەم دایهێنا، بەرلەوەی بە قازانجی گەل بێ، لە بەرژەوەندیی خەزێنە بوو. ئەو زوڵم و نەزانییەی کە خەڵکی ڕێکدەکوشی و دەیچەوساندنەوە، هەڵگەڕانەوە و ڕاپەڕینی بە دواوە بوو. سەرهەڵدان و ڕاپەڕین لە دنیای کۆندا کردەیەکی نامۆ نەبوو. لافاوی ڕاپەڕین لە میسر و یۆنان و ڕۆم خۆی نواندبوو، بەڵام ئەو شۆڕشانەی کە توانییان دنیای یۆنانی وەلەرزە بێنن، سەرهەڵدانی کۆیلان یان قەرزدارباران بوو. بزووتنەوەی مەزدەکی کە خاوەنی ڕەنگ و ڕوویەکی دیکە بوو، لەسەر بنەما و تەوەرەی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەڵدەسووڕا، هەر بۆیە بە کۆمۆنیزم ناودێر کراوە. ئەو ڕۆژەڕەشی و نەهامەتییەی کە گەل تێیدا نوقم ببوو، نەیدەهێشت بیر بکاتەوە و هەست بە نەبوونی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بکا. سیابەختییەکانی بوونە هۆی بزووتنی بەزیی لە نێو مەزنەپیاوانی بیرمەندی سەردەمدا و بۆ نموونە «بەرزوویە» دەنووسێ: «لە سەردەمی ئێمەدا هەموو شتێک بەرەو تێداچوونە». حکوومەت لەبەر ژیارمەندی و سامانی هەر دەدرەوشی و دەتگوت کە هێزە چەکدارەکانی هیچ شتێک بەرگەیان ناگرێ و دەرقەتیان نایە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ڕاپەڵوپۆی کۆمەڵایەتی لە نێوخۆیدا وا ڕزیبوو کە دەستی لێکبەردابوو. هەر ئەم بارودۆخە کارێکی وای کرد کە لە جەنگەی پەلاماری عەرەبان‌دا خۆی بۆ نەگیرێ و بکەوێتە ئامێزی سەرکەوتووانەوە.

**

لە سەدەی سێهەمی زایینی‌دا قەیرانێکی قووڵ سەرتاسەری دنیای لە ئیسپانیاوە هەتا چین تەنییەوە. ئەو قەیرانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی کە ڕۆمی هەژاند، تەنیا زەمانێک کۆتایی هات کە دیۆکلیسین لەسەر تەختی ئیمپراتۆری پاڵی دایەوە. قەیرانی سیاسی و دینیی ئێران توانی تۆماری تەمەنی

پێنسەد ساڵەی زنجیرەی پادشایانی ئەشکانی تێکەوەپێچێ و جێگا بۆ هاتنە سەر دەسەڵاتی زنجیرەی ساسانییەکانی «نەتەوەیی» خۆش بکا. قەیرانێکی سیاسی پادشایەتیی کووشانی گرتەوە و ئەو حکوومەتە کە لە سەردەمی «کانیشکا»دا گەیبوویە لووتکەی دەسەڵاتی، لە ڕۆژگاری دووهەمین جێگرەوەی‌دا، شاپووری یەکەم زەبری لێوەشاند و ڕووخاندی. ئەو پەیوەندییە مەند و مەتینانەی کە ئادەمیزادی چاخی نوێ‌کوچکی توانیبووی لەگەڵ دراوسێیەکانی بەدیی بێنێ، ڕێگای بۆ تەخت کرا. ئەگەرچی دنیا لە نێوان نەتەوە ڕەنگاوڕەنگەکان‌دا دابەش کرابوو، سەلماندی کە ئابووری و کۆمەڵی هەر وڵاتێک تێبەستەی وڵاتێکی دیکەیە و بچووکترین ڕووداو هەرکامیان بگرێتەوە، لەوانی دیکەش‌دا ڕەنگ دەداتەوە.

شارستانییەتی ساسانی ئاکامی هەزار ساڵ هەوڵ و تێکۆشانی نەتەوەی ئێرانییە و وێدەچێ کە نووچکەی سەرکەوتنی بێ. دوای ڕووخانی پادشایەتیی کووشانەکان، جیهان بێجگە لە ڕۆژهەڵاتی دوور، لە نێوان ڕۆم و ئێران‌دا دابەش کرا. ئیتر ئێران وەکوو زەمانی ئەشکانییەکان نەچۆتەوە نێو قاپێلکی خۆی بۆ بەرەنگاری، بەڵکوو ڕقەبەرێکە هاوشانی ڕۆم و تەنانەت شانیشی ڕەسەر شانی داوە. لەو سەردەمەدا پادشایەتیی نەتەوەیی، دینی نەتەوەیی، هونەری نەتەوەیی، کولتووری نەتەوەیی و شارستانییەتی نەتەوەیی چەتریان ئەنگاوتووە. بنەمای هەموو کارێک لەسەر کۆمەڵێکی ئەوپەڕ مەزنەوەجاخی هەڵدەسووڕا و توخم و تۆرەمە و ملکوماش درۆشم و نیشانەی بوون. بنەماڵەی میری و مەزنەوەجاخان و جڵەودارانی دینی بە بناغەی ئەو حکوومەتە دادەندران کە وڵاتی لەسەر ڕاوەستابوو. ئەم شێوازە کەوتۆتە بەر پەسن و تاریفاتی مێژوونووسانی عەرەب و لە ڕێبازی سیاسی‌دا ئەوانیان بە سەرمەشق و

شارەزا داناوە. چینی مەزن و ماقوولان زەوی‌وزاری وڵاتیان بە دەستەوەیە و لە زێدەپارووی بە میرات بەجێماوی باب و باپیرانیان دەخوارد و پادشایان هەڵدەبژارد. شەڕ و تێکهەڵچوون و کۆڕی ڕاو و میوان و میوانداری و خۆش ڕابواردن و کەیف و نەهەنگی گەلەژنخانە سەرلەبەری تەمەنی دادەگرتن. هەر پیاوێک دەیتوانی گەلێکی ژن هەبێ، بەڵام ژنیش لە هەموو مافێکی خۆی بێبەش نەکرابوو. بەرەبەرە و لە ڕەوتی ڕۆژگاردا ڕەوشت و ئاکار گەشەی کرد و بە هەودای باریکەڕێس تێکتەندرا. کۆمەڵانی قۆشەنچی و ڕاوچییان بوونە هۆگری خوێندەواری، خەڵک ڕوویان دەکردە کایەی شەترەنج و گۆیەن و فێربوونی گۆرانی و مووسیقی پەرە دەستێنێ و هەموو زانستەکان دەکەونە بەر سەرنج و گەشە پێدان. کۆشک و بارگای میری دابی تازەی جلوبەرگ و زێڕوزەمبەر و گەواهێراتی بە دڵی خۆی دادێنێ و بۆ لێنانی چێشت و سازکردنی هەر چەشنە خۆراکێک، پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبینێ. ئەم کۆمەڵە درەوشاوەیە و بە سەمبولی ژیارمەندی و هونەری ورد و باریک و شکۆمەند دادەندرێ. دیوارێکی ڕێ‌تێنەچوو کەوتۆتە نێوان ئەوان و چین و توێژەکانی خواردەستە. توێژی شارنشینان و هونەرمەندان و کاسپکاران بە ژمارە کەمن و جەماوەری گوندەکی زۆربەن، بەڵام هەلومەرجی ژیان و بە کۆیلە چوونیان لەگەڵ ڕێ‌وشوێنی دینی زەردەشتی یەکتر ناگرێتەوە.

کار و هەنگاوی پادشای ساسانی هێندێک لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆم جیاواز بوو؛ چونکە ژیانی ئیمپراتۆر تەرخانی پاراستنی کەلەپوورێک دەکرا کە خۆی بە کولتووری کۆنی دنیای کەونارای دادەنا. ئێرانیش وەکوو ڕۆم کەمەرەیەکی هۆز و نەتەوەکانی کاڵەفەرهەنگی بە دەورەیدا لێهاڵابۆوە. پادشایان گەلێک لەمپەر و بەرگێرەوەیان بەرەورووویان ساز کردن، بەڵام هەمیشەش

سەرنەدەکەوتن. بە کورتی و پوختی ساسانییەکان توانییان خۆیان وەکوو بەهێزترین پادشایانی دنیا لە خەیاڵدانی خەڵکدا بنەخشێنن.

هەموو لایەک ئۆباڵیان دەکێشا کە ئێرانی لە شێوازی حکوومەت و بەڕێوەبەرایەتی و ڕێوشوێنی شەڕ و تام و چێشکەی هونەری و شێوەی پۆشینی جلوبەرگ و خۆراک و ئاکاردا، باڵادەست و پێشەنگن. ئێرانی ئەو سەردەمە ئەرکی پەرەپێدانی هونەر و کۆمەڵی دینانی خستە سەر شانی. وێدەچێ کە دینی بوودایی لەگەڵ تووشبوونی دینی مەزدایی، بڕوا بە بەرەی چاکە و خراپە یان هەمان خێر و شەڕ دەخوازێتەوە و بوودا بە سەمبولی چاکە و «مارا» بە سەمبولی خراپە دادەنێ. بەپێی بۆچوونی کۆمەڵێک لە زانایان «مەترا»ی بوودایی، هەمان ڕەنگدانەوەی میترای خودای ڕزگاریدەری مەزدایییە. گەشە و پەرەی ئایینی مانەوی لە تورکستان و چیندا ڕوون و ئاشکرایە. ئەم ئایینە لە ڕێگای سووریا و میسرەوە توانی بە سینەی ئەفریقای باکووریدا ڕۆبچێ و «ئاگوستینی پیرۆز» بوو بە یەکێک لە پەیڕەوانی. ئایینی مانی کە لە ڕۆژهەڵات کەوتبوویە بەر پەلامار، لە ئاسیای بچووک پێشوازی لێکرا و پەرەی ئەستاند و لە ئەرمەنستان پنجی داکوتا و سەدەی دەهەم و یازدەمی زایینی گەیشتە تراکییە. ئەم دینە لەگەڵ ڕەوتی بازرگانیی ڕۆژهەڵات گەیشتە باشووری فەرانسە و شین بوون و چرۆدانی ڕێچکەی خاوەن برشتی «کاتار»ی[1] لێکەوتەوە کە کلیسای کاتۆلیک شەڕی لەگەڵ ڕاگەیاندن. لە ماوەی بیست ساڵدا، ناوچەی «بێزیە» و «کارکاسۆن» تاڵان کران و هەزاران کەس بە حوکمی دادگای تێهەڵپێچان و دۆزینی ڕوانگە و باوەڕی دینی کوژران یان سووتێندران (١٢٠٩ـ ١٢٢٩). ئەم بەشەی فەرانسە زەبرێکی وای لێوەشا و

---

١ـ واتا پاکان

خەساربار بوو کە سێسەت ساڵی پێچوو هەتا خۆی گرتەوە و برینەکانی سارێژ بوونەوە. لە لایەکەوە ئایینی مانی گەیشتە فەرانسە و چین و لە لایەکی دیکەوە ڕێچکەی نەستووری کە تەنیا ڕێچکەی بە ڕەسمی ناسراو بوو لە ئێراندا،هەتا چین پەل‌وپۆی هاویشت. ئەمەیە ڕووبەری درەوشانەوەی پرشنگی دینی کە سەرچاوەکەی ئیمپراتۆریی ئێرانە و لەوێوە هێز و وزەی تێزاوە.

هونەری ساسانی کە واوێدەچێ ڕەنگە لەگەڵ هونەری سەردەمەکانی پێشوو جیاواز بێ، لە ڕاستی‌دا بە هەوێنی ماکەی کۆنی ڕۆژهەڵاتی دەستاو دراوەتەوە. ئەم هونەرە لەگەڵ هونەری خۆرنشینی هاوسەردەمی خۆی ناتەبایە و وەکوو ئەو ناچێ. نیزیکایەتیی نێوانیان کە هێندێک لە توێژەران هەوڵیان داوە بیدۆزنەوە، تەنیا لە ڕواڵەت و ڕووکاردا ڕاستە. هونەری ساسانی هونەرێکی ئێرانییە و خاوەنی تایبەتمەندیی خۆیەتی و ڕەگ و ڕیشەی بە دنیایەکی زۆر کۆن و لەمێژیندا ڕۆچووە، ئەگەرچی لە دنیایەکدا ڕەنگی داوەتەوە کە گۆڕاوە و بە لای هێلێنیسمدا شکاوەتەوە. ئەم هونەرە کە پێگەیشتووی سەردەمێکی درێژخایەنە، ئەوەندە گەش و زیندووە کە دەتوانێ شوێن بکاتە سەر هونەری نەتەوەکانی دراوسێی. هونەری ڕۆژگاری ساسانی لە جەنگەی گەشە و برەوی خۆی‌دا بوو بە ڕاوکەی هونەر و دەسکاری نژیاروانان و پەنجەنەخشینانی ڕۆمی و لە چوارچێوەی کاری هونەرمەندانەی بیزانسی‌دا ئاڵوگۆڕی بەدی هێنا. هونەری فەریکەی سلۆڤاکەکانی دەربازبوو لە ژیانی لێرەوارنشینی، کەوتە وێنە لێ‌هەڵگرتنەوەی. وەکوو دیارە ئەم هونەرە سنوورەکانی باڵی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریی هەڵبوارد و سەری خزمەتی وەبەر دینێکی دەرەکی هێنا و بناغەی هونەرێکی ناسراو بە «ئێرانی ـ بوودایی»ی دارشت کە بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە ئەفغانستانەوە هەتا چین ڕەنگی دایەوە. هونەری ساسانی کە

تێبەستەی شکڵ و شێوەی ئێرانییە، وەکوو پردێک وایە لە نێوان شارستانییەتە کۆنەکانی ئاسیا و شارستانییەتەکانی سەدەکانی نێوەڕاستی خۆراوا. کاری شارستانییەتی دەهندە و دڵاوای ئێرانی سەردەمی ساسانی هەر بەوەندە نابڕێتەوە. ئێران بۆ ماوەی سەدان ساڵ پەیوەندییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ حکوومەتی «گووپتا»ی هیندی هەبوو. ئەم حکوومەتە سەرەنجام پاش پێکهێنانی یەکییەتییەکی نەتەوەیی، توانی بزووتنەوەیەکی هیندی بەدی بێنێ. ئێران بۆ ئەم حکوومەتە وەکوو پردی ڕاگواستنی بیر و هونەری خۆراوایی دەوری گێڕا و جیرانەکەی توانی لێی بەهرەمەند بێ. وەکوو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، لە ماوەی ئەم «سەردەمە زێڕینە»ی شارستانییەتی هیندیدا، ئەم وڵاتە توانی لە سایەی دۆستایەتی و ئاڵوگۆڕی بازرگانی و فەرهەنگی، دەستی بە گەلێک سەرچاوەی ڕۆژاوایی ڕابگا و لە چەند بوارێکی وەکوو زانستی پزیشکی، ئەستێرەناسی، هەندەسە و مەنتیقدا کەلکی پێویست وەربگرێ و لە هێندێکیاندا قەرزدارباری ئێرانە.

ئەوەی ڕاستی بێ، ئەم کۆشکە بەرز و شکۆند و ئەم دامودەزگا بەرین و بەربڵاوەی سەردەمی ساسانی کە هەنگاوی بەرز و درەوشاوەی تێدا دیارە، لە ماوەی چەند ساڵاندا داری لەسەر بەردی نەما؛ بەڵام دەبێ بزانین کە سەرکەوتنی عەرەبان بۆیە نەبوو کە چاکتریان لە سیاسەت دەزانی یان سەرکردەکانیان لەوپەڕی شارەزاییدا بوون، بەڵکوو هەلومەرجی دنیا لە ئاسیا و ئورووپا و ئەفریقادا وای هەڵدەگرت. ئەم دنیا شەکەتەی کە بە قەومانی شەڕوشووڕ و سەرهەڵدانی ناکۆکی و هەرای کۆمەڵایەتی و دینی هەڵتەکابوو، نەیدەتوانی خۆی لە حاند دوژمنێکی یەکدڵ و دین و دەمارگرژ و تەمادار ڕابگرێ و عەرەب ئاوا سەرکەوتن.

# ئاكامی سەرجەمی باس و بابەتەكان

هاتن و مانەوەی ئێرانییەكان لە بانووی ئەم [وڵاتەدا]، زەمانێكی درێژخایەنی سێ‌هەزار ساڵەی پێچووە. لەم ماوەیەدا شارستانییەتی مرۆڤی بەرلە مێژوو كە لە ئەشكەوتەكانی خۆیەوە شۆڕ ببۆوە و لە دەشت و دۆڵان‌دا بنەی داكوتابوو، بەرەبەرە گەشەی كرد. لە ماوەی سێ‌هەزار ساڵدا مرۆڤ وێڕای فێربوونی كشت‌وكاڵ و ئاژەڵداری پەرەشی پێدا و چەند هەنگاویشی بۆ دەرهێنانی كانزاكان و پەرەی پیشەی كانزاگەری هاویشت. هونەری سازكردنی دیزە و گۆزە و هەوری سوورەوەكراوی نەخشین كە بێ‌گومان لە بانووی ئێران‌دا گووراوە، خێرایەكی تەنەوەی كرد و گەیشتە ناوچە دوورەدەستەكان. ئادەمیزاد بە دانانی بەردی بناغەی ئاوەدانی و شارەدێیان، توانی ژیانێكی كۆمەڵایەتی بەدی بێنێ و ڕێكی بخا. لەو كاتە بە دواوە بە تەنیا و تاقەوەبوو نەژیا و نێوانی لەگەڵ تاقمەكانی دیكەی كۆمەڵانی ئادەمیزادان دامەزراند و ئەم ڕەوتەی پەرە پێدا.

لەبەروەی ئێران ڕێ و ڕەوگەی هات‌وچۆ و تێپەڕینی هۆزان و نەتەوانە، لە ماوەی چاخی بەرلە مێژوودا، كۆمەڵێك جووڵانەوە و كۆڕەوی بە خۆیەوە دیتووە، بەڵام ئەوەندەی ئێمە ئاگامان لێیە، جێگیربوونیان لە بانووی ئێران‌دا دەگەڕێتەوە سەر هەڵێك و هەڵكەوتێك. لە چاخی ئاسنەوە بەرەودوا كە ئێرانی لە

پووشەڵان و گیاجاڕانەوە دێن و لە چیاکانی نیشتەجێ دەبن، ژیان لەم خاکەدا ئاڵوگۆڕی قووڵی بە سەردا دێ. کایەی چارەنووس وای کردبوو کە ئێرانی پاش هەموو لایەک بێن و لە بانوویدا سەقامگیر بن. بانووی ئێران پردێکە کەوتۆتە نێوان دەشتە گیاجاڕەکانی ئووراسی و بیابانە بەربڵاوەکانی خۆرنشین کە هەتا ئەفریقا درێژ بوونەوە. لە مەودای ئەم خاک و سەرزەمینانەدا، چەند شارستانییەتێکی بەرز لە هەرێمی دووچۆمان و دەرە و دەشتی نیلدا پەرەیان ئەستاندبوو کە لەسەر تەوەرەی سازکردنی شاران ڕەنگیان دابۆوە. ئەم بارودۆخەی جوغرافیایی توانیویەتی شوێنێکی قووڵ بکاتە سەر شارستانییەتی تایبەت و مێژووی ئەم نەتەوەیە. ئێرانی بێئەوەی پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ دانیشتووانی گیاجاڕان کە خۆیان لەوێوە هاتبوون، هەڵپسێنن، هەر پاش ئەوەی توانییان کۆمەڵێکی ڕێکوپێک دامەزرێنن، مەیلیان بزووت کە توخم و تۆرەمەکانی دانیشتووی دووچۆمان بخەنە ژێر چۆکی خۆیانەوە. بۆ ماوەی هەزار و دووسەت ساڵ، ئەوان ئەم هەرێمە دەوڵەمەندەیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. هەروەها لە درێژایی مێژوودا زۆر جاران هەلیان بۆ ڕەخسا کە سنووری سروشتیی ڕۆژهەڵات ببەزێنن و دوولینگە بە سەر ملی نەتەوە کۆچەرەکانیدا بێنن. بەم شێوەیە کولتووری ئەوان کە هاوکات لە سەرچاوەی دوو دنیاوە پاراو دەبوو، گەشەی کرد. یەکیان دنیای ڕۆژهەڵاتی بوو کە بە جێڕسکانیان دادەندرا و بەگوێرەی خۆشەویستنی میراتی ڕابردووی باپیرانیان، توانیبوویان پەیوەندیی توندوتۆڵیان پێکەوە بپارێزن. شوێنپەنجەی ئەم پەیوەندییە لە هونەری کێشانەوەی شکڵی بوونەوەران، کانزاگەری، ڕەخت، زین، قایشقوقوورشی جوان و ڕەنگین و فرەچەشنی یەکسمان، ساز کردنی دەفر و ئامانی نەخشین و هەرە چاک و هەروەها لە زێڕینگەری و گەواهێرگەریی

ئەوان‌دا ڕەنگی داوەتەوە. سەرچاوەی دووهەم دەبێتە دنیای خۆراوا کە بە پێشەنگی شارسازی و نژیاروانی دادەندرێ و هونەری ڕازاندنەوە و جوانکاری و زانستەکان لەوێوە دەهاتن. ئێرانییەکان لەبەر سەقامگیربوون لە نێوان ئەم دوو دنیایەدا لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە لەبەر مرخ و توانست و چالاکیی خۆیان، توانییان شارستانییەتێکی تێکەڵاو لە ئێران‌دا بەدی بێنن کە کۆمەڵێک پێشکەوتنی وەدەست هێنا و کەوتە بەر پەسن و پێداهەڵدانی گەلانی دنیا. ئێرانی نەیانتوانی لەو کۆسپ و لەمپەرانە دەرباز بن کە نەتەوە خاوەن دەسەڵاتەکانی ئاسیایی بەرەگەیان پێ‌تەنیبوون. ئێرانی ئاوا داسەکنین و لە ماوەی ئەم نەبزووتنەدا کە چوار سەدەی کێشا، کەلکیان لە شارستانییەتە کۆنەکانی دەوروبەریان وەرگرت و کولتووریان خواستنەوە و ئەوەندەی بۆیان کرا، لە جەنگەی خۆی‌دا دنیای ئاسیایان نایە بەر چۆکی خۆیان. لە ئاسیای بچووک و کەنارەکانی دەریای «ئێژە»دا لەگەڵ ڕۆژاوا تێکهەڵچوون کە شارستانییەتی یۆنانی تێیدا ڕەنگی دابۆوە و ئازادیی بیروڕای شارنشینی و ژیانی شارستانییانە لەوێ بناغەیان داکوتابوو. سەرەنجام پادشایەتیی پاوانخوازانەی هەخامەنشی لەگەڵ ئیمپراتۆریی گەل‌سالاری یۆنانی تووشی شەڕ هات. جەرگەقەڵای تەختی‌جەمشید لە حاند جەرگەقەڵای ئاتێن ڕاستبۆوە. لێرەدا دوو دیمەنی یەکجار جیاواز وەبەرچاو دێن: لە لایەک گەل، دادوەران، پێشەوایانی دینی و لاوان بە دڵەوە سەرقاڵی پەرستنی خودایانی خۆیانن؛ لە لایەکەی دیکەوە تەواوی نەتەوەکانی بەرفەرمان، لە ژێر چاوەدێریی چەکداران و پاسەوانانی میری‌دا دێن و دەچن و پیتاک دەبەن بۆ مەزنی خۆیان. لێرەدا خودایەتییەک وەبەرچاو ناکەوێ و تەنیا پادشایە کە بە کوانووی ژیانی ئیمپراتۆری دادەندرێ و هەوڵ و تێکۆشانی میلیۆنان مرۆڤ هەر تایبەتە بە پادشا. بە باری هونەریش‌دا جیاوازیی بەرچاو لە نێوانیان‌دا دیارە؛

لەوێ خەڵک خەریکی پەرستنی خودایانن، کەچی لێرە دەستەیەکی دیکە مرۆڤ بە پیرۆز دادەنێن کە سەمبولی خودایە لەسەر زەوی.

زۆرجاران ویستوویانە شارستانییەتی هەخامەنشی بدەنە بەر شەپۆلی ڕەخنە و گوتوویانە بە باری هونەریدا یەکجار کەوتۆتە ژێر سایە و سێبەری شارستانییەتی نەتەوەکانی دیکە. ئەگەر مەبەست سازکرانی ئەو کۆشک و تەلارە دیار و ناوبەدەرەوانەن، دەبێ پێ لەو ڕاستەقینە کۆن و لەمێژینەیە بنێین کە لە هەموو ڕۆژگارێکدا ئەو نەتەوانەی کە پێکەوە نێوانیان دامەزراندووە، توانیویانە شەقڵی فەرهەنگ و شارستانییەتی خۆیان باوێنە سەر یەکتر. داخوا یۆنان بەو هەمووە داهێنان و مرخەوە، بە باری هونەری و فکریدا نەچۆتەوە سەر سەرچاوەکانی ڕۆژهەلاتی و کەلکی لێوەرنەگرتوون؟ داخوا ڕۆم ئەو کولتوورە دەوڵەمەندەی یۆنانی نەخواستەوە کە ئەویش لە ئیترووسکان و کامپانییەکانی دراوسێی شانبەشانی وەریگرتبوون؟ ئەم دوو کولتوورە یەکجار ناسکتر و پێشەنگتر و هونەرمەندانەتر بوون لە کولتووری ڕەقوتەقی ڕۆمییەکان.

پێشینییەکان پێیان وابوو کە دنیا لە نێوان دوو وڵاتی ژیارمەندی ئێران و یۆناندا دابەش کراوە. خۆ ڕاستە کە پێکهاتەی سیاسی و ئابووریی ئەم دووە پێکەوە جیاواز بوون، بەلام پارسەنگیان تێدا ڕەچاو کرابوو، چونکە دەسکەوتەکە دەگەڕایەوە سەر دەور و زەمانێکی کەموزۆر درێژخایەن و هەڵسووڕانی داهێنەرانەی مرۆڤ ئاوا لەسەر یەکتر هەڵیچنیبوو. وەکوو دیارە هەرکامەیان هەوڵی دەدا کە شێوەی ژیانی خۆی لە پاشماوەی دنیای کۆندا پەرە پێبدا. ئێرانی یەکەم گەلن کە توانییان پادشایەتیی جیهانی دامەزرێنن و بە ڕووحی پێکەوژیان و دادپەروەری گیانی وەبەربێنن، کە هەتا ئەو دەمە مەبەستێکی نەناسراو بوون. ئەوان توانییان سنوورەکانی دنیای ژیارمەند هەتا ناوچە

دوورەدەستەکانی ڕۆژهەڵات بەرین بکەنەوە و بیبەنە سەر ڕووباری سەیحوون (سیردەریا). پتر لە دوو سەدەیەک ژیانی سیاسی لە چنگ پادشای گەورەدا کۆببۆوە. پادشای مەزن توانی لە ماوەی مێژووی درێژی خۆیدا سەنگ و بایەخی شارستانییەتی لەمێژینی ڕۆژهەڵات بپارێزێ و بیگەیەنێتە ناوچە و مەڵبەندە لاپەڕەکان. خەتی قەڵەمداران و دیوانی بارگای هەخامەنشی بوو بە هۆی بەدی هاتنی کۆنترین خەتی هیندووستان. هونەری زنجیرەی موورایا لە هونەری سەردەمی پادشایانی گەورە وەرگیراوە. لەو زەمانیدا ڕێ و ڕەوگەی دەریا و چۆماوەکانی نێوان ڕۆژهەڵاتی دوور و دەریای مەدیتەرانە دۆزرانەوە و توانییان شێوەی شارسازی و ئاوداشتن بەرن بۆ ناوچەکانی نێوان جەیحوون و سەیحوون؛ بەڵام هەوڵ و هەڵسووڕانی بێوچانی ئەوان بۆ تێکشکاندنی بەرەنگاربوونەوەی هێلێنییەکان، شکستی هێنا و هێزی یۆنانی ئەم کارەی بۆ نەکرا، بەڵکوو هەڵەی ئێرانییەکان پتر ئەم هەلەی ڕەخساند. یەکییەتی سروشتی و سیاسی و ئابووریی ئیمپراتۆری هەرگیز نەیتوانیبوو وەدی بێ. دارمانی زنجیرەی پادشایانی هەخامەنشی و درانی پلە و پایەی سەربازی بە بەکرێگیراوانی یۆنانی و وەخەبەرهاتنی هەستی نەتەوایەتیی یۆنانی کە مەقدوونییە باڵی بە سەر کێشابوو، لاپەڕەی مێژوویەکی تازەی کردەوە، ئەگەرچی خودی مەقدوونییەش زۆر بە زەحمەت دەکرا توخمەی یۆنانیبوونی لێ قبووڵ بکرێ. وەکوو ئاشکرایە لە سەدەی چوارەمی پێشزایینیدا «وشیاریی ئورووپایی» بوو بە پێشەنگی هێرش و پەلامارەکانی ئەسکەندەر و تەواوی ئاسیای بچووکی بردە سەر ڕەنگی شارستانییەتی یۆنانی و سنوورەکانی ئورووپای گەیاندە ڕووباری سێند و ئاسیای ناوەندی. ئەم ڕەوتە ئاڵوگۆڕ و شۆڕشێک بوو کە زیاتر خاوەنی ماکە و هەوێنی سیاسی بوو تا ئابووری یان

کۆمەڵایەتی. ئێران کەوتە سەر ڕەوگەی ئابووریی جیهانی و بوو بە بەرهەمخۆری بەشێکی کاڵای دەرەوە و هەروەها کەلوپەلی وڵاتانی پێدا دەگوێزرایەوە و لە هەردک باڵانەوە کەوتە نێو ڕایەڵەی پێشکەوتووترین حکوومەتەکانی خۆراوایی. بەم شێوەیە حکوومەتێک کە خاوەنی مافی یەزدانی بوو، بە هاتنی ئەسکەندەر کەوتە نێو چواربەندەی داموودەزگایەکی یۆنانی. ئەم پیاوە سەرکەوتووە کە لەسەر تەختی پادشایەتیی داریووش پاڵی دابۆوە، دەیهەویست ئیمپراتۆرییەکی وەکوو هەخامەنشییەکان دامەزرێنێ و ئاوا بە شوێن تێکەڵ کردن و لێکدانی دوو گەلی گەورە و دوو شارستانییەتی مەزندا هەنگاوی دەنا.

نیزیکەی دوو سەدە باڵادەستبوونی شارستانییەتی یۆنانی، توانی شوێنەوارێکی بەرچاو لە ئێراندا بەجێبهێڵێ. ئەوەندەی کە ڕوونکردنەوەی ئاستی شوێندانانی یۆنانییەکان ئاستەمە، ڕاست ئەوەندەش بە ئێرانیبوونی خێرا و یەکلاییبۆوەی یۆنانییەکانی دانیشتووی ئێرانیش دژوارە. تایبەتمەندیی شوێن تێکران کە بە دیاردەی خۆگونجاندن و هەڵکردنی نەتەوەی ئێرانی دادەندرێ، دەتوانێ کۆمەڵێک هۆکاری دەرەکی وەربگرێ و لە کاری پێویستی خۆی وەربدا و ئەمەش بێگومان لەم پرسە پڕ وردەکارییەدا، خاوەنی بایەخی بنەڕەتییە. لە بواری ڕواڵەتی و مادیدا، زۆر وێدەچێ کە شارستانییەتی یۆنانی پێشکەوتێکی بەربڵاو و خێرای کردبێ، بەڵام لە بارودۆخ و ژیانی دینی و دەروونیدا، ڕەوت و ڕێبازێکی دیکەی پێواوە. بەراورد کردنی ئەو سەردەمە لەگەڵ سەردەمی ئێستا جێگای سەرنجە و ڕوونی دەکاتەوە کە ئێرانی دیمەن و ماکە و ڕووکاری کولتووری دەرەوەیان لەچاو بیر و باوەڕی دەروونی زووتر وەردەگرت و شار و گوندیش لەم ڕەوتەدا بەئاشکرا پێکەوە جیاواز بوون.

بەگشتی كولتووری هێلێنیستی لە ئێراندا شكستی هێنا. جڵەودارانی ئەم ڕەوتە هەرگیز نەیانتوانی لە چنگ دژایەتیی سیاسی، كۆمەڵایەتی و ئابووری دەرباز بن. كێشەی نێوان دوو شێوە ژیانی شارستانییانە، نێوان ژیانی خۆرهەڵات و ژیانی خۆرنشین، نێوان شاری سەربەست و پادشایەتیی خۆرهەڵاتی، نێوان شێوەی ئابووری كە لەسەر تەوەرەی ئازادی و كاری تاك هەڵدەسووڕا، لەگەڵ ئابووریی خۆرهەڵاتی كە حكوومەت دەستی بە سەردا گرتبوو، هەرگیز نەبڕایەوە. شارستانییەتی یۆنانی نەیتوانی چارەسەری ئەو گرێ و كۆسپە بێبڕانەوەی كۆمەڵی مرۆڤی پێ بێ و كێشەی نێوان گەل و حكوومەت و چینی دەوڵەمەند و هەژاری بۆ یەكلایی نەكرایەوە و كرێكار و سەرمایەدار هەروا بەرەوڕووی یەكتر وێستان.

وەكوو هەڵوێستێک دژی پەرە گرتنی هێلێنیسم و داسەپینی لە دەرەوەڕا، بزووتنەوەیەک دەستی پێكرد و لە ڕۆژهەڵات پارتەكان و كووشانەكان و لە ڕۆژاوا كارتاژەكان و ڕۆم خۆیان لێهەڵكرد. ئەم وڵاتانە كە لە گەڕانگەڕان دەژیان، كەموزۆر كەوتبوونە ژێر سایەی كولتووری یۆنانی، بەڵام هەموویان توانیبوویان ماكە و هەوێنی تایبەت و نەتەوەییی خۆیان بپارێزن. دنیای ئێرانی لە ئاخرین سەدەی بەرلەزایین و یەكەم سەدەكانی زایینیدا، گەیشتە ئەوپەڕی گەشەی خۆی. ئێرانی سەردەمی پارت هەتا سنووری میسر پەلوپۆی ڕۆیی. شاهانشایەتیی كووشان نیزیكەی سەرلەبەری هیندووستان و توركستانی ڕووس و بەشێک لە توركستانی چینی گرت. «سەرمەت»ەكان كە لە ناوچەی پووشەڵانی ئووراسیدا هەر جینگڵیان دەدا، لەم زەمانەدا بوونە خاوەنی بەشێكی بەرفرەوانی لێوارەكانی دەریای ڕەش و دەستیان بە دانیشتووانی گەڕانگەڕی دانووب ڕاگەیشت و لە لایەكی دیكەوە هەتا دەورووبەری ئاسیای ناوەندی

تۆرەمەیان بە ناوچەکەدا بڵاو بوویەوە. دنیای ئێرانی تۆڵەی لە دنیای یۆنانی ئەستاندەوە. کاتێک هەڵیکوتایە سەر دوو بنکەی دووری یۆنان لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی، حکوومەتی «یۆنانی ـ بەلخی» بە زەبری یووەچی یان کووشانەکانی داهاتوو تێداچوو. بەم شێوەیە شارە یۆنانییەکانی کەنار باکووری دەریای ڕەش کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سەرمەتەکان. ئێران دەستی لە تینهێنان بۆ ڕژمییەکانی دزە کردووی نێو ئاسیا هەڵنەگرت. شەڕەکانی مێهردادی فەرمانڕەوای «پۆنت»ی وەک بەربەرەکانیی ئاسیاییەکان لێکدەدرایەوە کە ئێرانی جڵەوکێشی بوون. لەو شەڕە دەستەویەخەیەی نێوان ئێران و ئیمپراتۆریی بەرەو نەمانی سلۆکیدا، ئێران سەرکەوت و خەنیمی بەزی.

وەکوو دیارە چەشنێک وێکچوون لە چارەنووسی پارتەکان و کووشانییەکاندا بەدی دەکرێ، چونکە هەردووکیان کاری خۆیان بە میراتی شارستانییەتی یۆنانی دەست پێکرد و بە بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی دایانکووژاند؛ بەڵام ئەو ئەرکەی کە خرابوویە سەر شانی پارتەکان یەکجار قورستر بوو، چونکە ئەوان ئەم شانازییە بە باڵایان برابوو کە لە سێ قۆڵەوە پاراستنی شارستانییەتی کۆنی ڕۆژهەڵاتیان پێ ئەسپێردرابوو. پارتەکان بێبڕانەوە لە پێناو ئەو ئەرکەدا تێکۆشان و جاری وایە کشانەوە هەتا بتوانن خۆیان لە پەلامارەکانی خەنیم لابدەن. پارتەکان بە خۆڕاگرتنی سەرسەختانەیان، ڕێگایان بۆ سەرکەوتنی ساسانییەکان خۆش کرد. وێناچێ بیر و باوەڕی نیشتمانپەرستانە لە زەمانی پادشایانی ئەشکانیدا ڕەنگی دابێتەوە، چونکە ئەوان بە سینگی فرەوانەوە لە تۆخم و تۆرەمەکانی بێگانەیان دەڕوانی. سەردەمی درێژخایەنی دەسەڵاتیان ڕێگای نەدا کە دژایەتیی توندوتیژ بکرێ لەگەڵ تەواوی ئەو شتانەی کە لە دەرەوەڕا هاتبوون. ئەم سەردەمە بە سەردەمی گوێزرانەوە دادەندرێ کە ڕێگای بۆ گەلی ئێران تەخت کرد هەتا

کەلەپووری خۆی بپارێزێ و ئەوەی کولتووری یۆنانی پێی بەخشیبوو بیتوێنێتەوە. بە باری سیاسیدا پارتەکان ڕێگایان بۆ ساسانییەکان خۆش کرد و بوونە پارێزەری دینی مەزدایی کە لە ڕۆژگاری ساسانییەکاندا گەیشتە چڵووکی پرشنگ و درەوشانەوەی خۆی.

ڕووخانی ئیمپراتۆریی هەخامەنشی هەتا دەگاتە دامەزرانی حکوومەتی ساسانییەکان ماوەی پێنسەد و پەنجا ساڵی نێوانە. لە درێژەی ئەم ڕۆژگارەدا ئێران کە بە ئاڵقەی تێکخرانی ئەو دوو دنیایە دادەندرا، ژانی پێدەگەیی. پارتەکانی هاتوو لە ناوچە پووشەڵانەکانی خۆرهەڵاتەوە لە حاند یۆنانی باڵی خۆرنشین چەقیبوون. لە ماوەی ئەم چەند سەدەیەدا دەتگوت تەواوی ئەو ماکە و هەوێنانەی پێکەوە نەدەکوڵین و یەکجار ناتەبا بوون، خرابوونە نێو مەنجەڵێک و پێکەوە کوڵێندرابوون. بێگومان خۆرنشین توانی شوێنەواری دیار لە بیر و باوەڕی چینی باڵای ئێرانیدا بەجێبهێڵێ و شیا ببێتە بەدیهێنی کولتووری «ئێرانی ـ ڕۆژهەڵاتی». پارتەکان هەرگیز نەکەوتنە پێوشوێنی هەتا خاشەی بکێشن و ئەویش لە سەرەتای سەردەمی زایینییەوە ڕۆژبەڕۆژ پتری پەرە ئەستاند. لە هەلومەرجێکی ئاوا زۆر لەباردا کە هەلی پشکووتنی شارستانییەتی نیشتمانپەروەرانەی ئێرانی بوو، تاج و تەخت کەوتە دەستی ساسانییەکان، کە بە قۆناخێکی یەکجار گرینگ دادەندرێ لە مێژووی ئێراندا. ئێرانی ساسانی کە توانیبووی ڕیشەی خۆی بە سینەی فەرهەنگی کۆنی ئێرانی ـ ڕۆژهەڵاتیدا ڕۆبەرێ، دوابەدوای کۆمەڵێک پێشکەوتنی سیاسی و لەشکری، لە خۆرنشین دژی ڕۆمییەکان و لە خۆرهەڵات دژی کووشانییەکان دەستی بزاوت و ئاوا جارێکی دیکە دەروازەکانی خۆی بۆ شەپۆلی تازەی کولتووری ناوچەکانی دراوسێ خستە سەر گازەرای پشت و بۆ نموونە کولتووری هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕۆم

بە کولتووری تازە بووژاوەی ئێرانییەوە گرێدرا. سەردەمی ساسانی تەنیا لە رووی ئەم تێکەڵاوبوونە تازەوە دەناسرێتەوە.

شارستانییەتی ئێرانی لە سەردەمی ساسانیدا، کەمتر وەک سەرگوڵخۆری سەرچاوەکانی دەرەکی هەنگاوی نا و هەروا پتر لە پێشوو بە بەخشندەیی ژیا. هونەرەکەی هەتا مەزنەدەریای ئەتڵەس پرشنگی هاویشت و لەسەر شێوەی تازەی «ئێرانی ـ بوودایی» گەیشتە چین. ئەو دینانەی کە لە ئێرانەوە هەڵقوڵین و لە ئورووپا و ئەفریقا دژیان راوەستان، توانییان لە بیابانەکانی ئاسیای ناوەندیدا پەل دابکوتن. دامەزراوەی سەربازی و لەشکریی ئێران دەبێتە هۆی بەدی هاتنی هێزی سوارەی سەدەکانی نێوەراست و برشتی دامودەزگای بەرێوەبەرایەتیی ئێران هەتا بارگای شارلێمانی دەروا.

ئێرانی ساسانی وەکوو قەڵغانێکی گەورە دەبێتە پارێزەری کولتووری کۆنی ئاسیای خۆرنشین لە حاند هێرش و پەلاماری هۆز و نەتەوە بیابانگەردەکان کە لافاوی هرووژمیان هەرەشە بوو بۆ سەر سنوورەکانی باکووری. گەلی ئێرانی لەو شەرەدا بۆ پاراستنی کەلەپوورە لەمێژینەکانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی هەموو هێزی خۆی دەخاتە گەڕ. ئێران لەگەڵ رۆمییەکان بۆ دەست داگرتن بە سەر رێگاوبان و دەریاکان و بازارەکان و سەرچاوەکانی دیکەی ئابووریدا کێشەی دەکرد و برستی لێبرا. ئێران لەگەڵ هیندی سەردەمی «گووپتا»دا نێوانی خۆش بوو. ئەم بار و هەوایە بۆ هەردک کولتوورەکە کە لەبەر هەبوونی پەیوەندیی ئاشتیخوازانە بە هاوبەشی گەشەیان دەکرد، یەکجار سوودی بە شوێنەوە بوو. ئەگەر بێتوو ئەم پەیوەندییانە توانیبایان هەتا خۆرنشین، یانی بۆ دنیای «یۆنانی ـ رۆمی» بڕ بکەن، رەنگبوو خەڵکی ئەو ناوچەیە بە پێشەنگایەتی و نیوبژیوانیی ئێران، لەگەڵ هیند و تەنانەت شوێنی دووری وەکوو

چینیش پەیوەند drابان و «ڕەنگە داهاتووی ئووراسی تووشی بارودۆخێکی باشتر بووبا.»

دنیای ژیارمەند لە ڕەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و دینی‌دا یەکجار لە یەکتر نیزیک بوونەوە و پتر لە پێشوو وەسەر شکڵ و شێوازێک گەڕان. لە ڕووباری سێندەوە بگرە تا میسر، لە قوستەنتەنییەوە هەتا ئیتالیا، ئیسپانیا و غالیا(گۆل)، کۆمەڵێک کۆشک و تەلار و قەڵای لەگیران نەهاتوو بۆ مەزن و ماقووڵان و دەرەبەگان سازکران و بوونە پەناگە و جێحاوانەوەی خزمەتکاران و چەکدارانیان. دوو وڵاتی ئێران و ڕۆم دژی مەزنەوەجاخان تێکەوتن و هەڵسووڕان، بەڵام بە ئاکام نەگەیشتن. دوو ئیمپراتۆریی ئێران و ڕۆم دەکەونە نێو قۆناخێکی تازەی ئابووریی دەرەبەگی کە بە ئابووری نێوماڵ ناسراوە. ئەم مەزن و ماقووڵانە بوونە پارێزەری نەریتەکانی دنیای کۆن و خۆیان ڕاگرت، بەڵام هیچ دەزانن چ نرخێکی تێچوو؟ میلیۆنان مرۆڤ کە تێبەستەی زەوی‌وزار و کارگا و باغ و کارێکن، تووشی کوێرەوەری بوون و هیچ ئومێدیان نییە کە هەرگیز لە چنگ چارەڕەشی خۆیان ڕزگار بن. ئەو دەنگە بلاوێنەی ئازادی کە سریوەی دەهات و دنیای یۆنانی پێوە بوو بڵاوی بکاتەوە، پشووی لێ‌برا. چەوساندنەوەی کۆمەڵانی خەڵک لە شاهانشایەتیی ساسانی و ئیمپراتۆریی ڕۆم‌دا کارێکی وایان کرد هەتا جەماوەر لە سەدەی یەکەمی زایینی‌دا پەنا بەرنە بەر دینە گەورەکانی تاقانەپەرستانە. ئەوان لە سەردەمی هێلێنیسم‌دا ئازادانە کاریان دەکرد و هەقدەستیان وەردەگرت، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا چەشنێک کۆیلایەتیی قورس ببوو بە باو کە تام و چێژی کار کردنی لە ناخی خەڵک‌دا دەکوشت. تازە جەماوەر لە بیری کۆکردنەوەی داهات و سامان‌دا نەبوون، بەڵکوو دەیانهەویست کە لە دەرەوەی بازنەی کاریان‌دا بکەونە نوێژ و پاڕانەوە و

بیر کردنەوە. دنیا چاکەی پێوە نەماوە و ئەو دەرد و مەرەدانەی کە مرۆڤ لەم دنیایەدا بە سەر شانیدا دێ، دەتوانێ لە دنیای دیکەدا ڕووحی بلاوێنێتەوە و ئۆخژنی باوێتە دەروونی. مەسیحایەتی لە سەردەمێکدا سەر بە ئاسۆی ژیان‌دا دەکا و پەرە دەستێنێ کە پڕە لە بێبەشی و کوێرەوەری و ناهومێدی.

سەرلەبەری بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەسەر گۆی زەوی دەبوو بە هۆی گەشە و پەرەی مەسیحایەتی کە وڵامدەرەوەی ئاواتەکانی کۆمەڵی چارەڕەشی مرۆڤ بوو. دنیای خۆرنشین ئامادەی وەرگرتنی ئەم دینەیە و خۆرهەڵاتیش پاش سێسەد ساڵ دواتر ساز و تەیارە کە لەبری دینی زەردەشتی، سەر وەبەر ئیسلام بێنێ، چونکە دینی زەردەشتی بە خۆی و ڕێوشوێنی سەخت و دوور لە دەرد و کوڵی مرۆڤ [نەیدەتوانی لا لە هاواری زەمانە بکاتەوە.]

ئەوەی ڕاستی بێ خۆ تان‌وپۆی دەرەبەگی و مڵکداری لەو ڕۆژگارەدا هەمووی هەر بە لانی نەریتیدا نەشکابۆوە. کۆمەڵێک نەتەوەی تازەی وەکوو سلۆڤاکەکان، ژێرمەنەکان، تورکەکان و عەرەبەکان، لە درێژەی سەدەکانی داهاتوودا هەتا ئاستێک پێشکەوتن کە توانییان بارودۆخەکە بگۆڕن و بیکەن بە ئابوورییەکی شارستانی. کۆمەڵەی داموودەزگای حکوومەت و پێشەوایانی دینی و مڵکوماشی بەربڵاو دەکەونە دەست ئەم نەتەوانە و ئەوانیش دەتوانن بۆ خۆگرتنی داهاتووی کولتووری مەسیحایەتی و ئیسلام کاریان پێ بکەن. بەم شێوەیە سەرەڕای دارمان، نە تەنیا کولتووری کۆن خاشەی نەکێشرا، بەڵکوو بەپێچەوانە درێژبوونەوەی لەمێژوودا دابین کرا.

سەرکەوتنی نێوەنێوە و بە دەنگ و هەرای ئەو دوو ئیمپراتۆرییە بە سەر یەکتردا، هەردک لای بەرەو لاوازی بردن و ڕێگای بۆ عەرەبان تەخت کرد.

خۆرهەڵات و خۆرنشین تووشی ڕەوگە و ڕێبازێک دەبن و سەركەوتنی هێزێكی نـوێ بـەردی بناغـەی هـەبوونیان هەڵدەتـەكێنێ و گیـرۆدەی چارەنووسـێكی هاوبەشیان دەكا. خۆرهەڵات سەری وەبەر دینی ئیسلام هێنا و خۆرنشین بوو بە پەیڕەوی مەسیحایەتی. ئەمە ئاكام و ئەنجامی بارودۆخێكی هاوشێوە بـوو كـە خەڵكی ئەم دوو باڵەی دنیا تێیدا دەژیان و زەمان نەیدەتوانی خۆی لـێ كـەنار بگرێ. بەم شێوەیە وێكچوونی ڕێكخستنی مەعنەوی یان سیاسیی تێكڕای نەتەوە ژیارمەنـدەكانی سـەدەكانی نێوەڕاسـت و سـەردەمی نـوێ لـە باڵی خۆرنشـینی هیندوچین، دەگەڕێتەوە سەر كێشە و هەرایەكی تاڵ بـەڵام سـەركەوتووانە كـە دنیای كۆنی بەرەو نەمان، بۆ پاراستنی كەلەپووری خۆی كردی و لە مێژووی دنیادا ڕوون و ئاشكرایە.

دەستەیەک لایان وایە كە سـەردەمی پاش ڕووخـانی حكوومـەتی ساسـانی، سەردەمی دڵخوازی نوێبوونەوەی ئێرانییە، چونكە دەكەوێتە شوێن یاسایەک كە دەڵـێ هـەر «نوێبوونەوەیـەک ڕێگـا بـۆ شارسـتانییەتە تازەكـان تـەخت دەكـا.» ئەگەرچی هاتنی شەپۆلی دێموكراسیی ئیسلام ئەوەندەی دیكەی باری سیاسی و ڕەوشتی ئێرانییەكان تێكدا، بەڵام نەبوو بە كۆسپی سـەر ڕێگایـان هـەتا داب و نەریتیان پارێزراو بێ و نەگاتە بارگای خەلیفەكان و لەوێ خۆی نەنوێنێ. ئەم ڕەوتە كارێكی وای كرد كە لە زەمانی گلۆربوونەوەی دەسەڵاتی خـەلیفـەكاندا، توانی نوێبوونەوەیەک لە بیری ئێرانی سەردەمی سامانییەكاندا بەدی بێنێ[١].

هەڵبەت ئەم ڕابوونەوە و بووژانەوەی ئێرانی هەتا سەردەمی سەفەوییەكان بەدی نەهات؛ بەڵام هەر چۆنێک بێ نەتەوەی ئێرانی توانی بە خۆیدا بێتەوە و شارستانییەتە گەورەكانی دەشتی بەربڵاوی نێوان دوو ڕووبارەكە قبووڵ بكا و

---

١ـ وادیارە لە ڕووی دەقی ئینگلیسییەوە ناوی«سامانی» زیاد كراوە.و.

بیانکاتە ئی خۆی. نەتەوەی ئێرانی پاش گرتنی مەقدوونییە کەوتە بەر شەپۆلی بەهێزی خۆراوایی و هەتا ڕادەیەکی زۆر لە شارستانییەتی بێگانەدا مەلەوەر بوو، کەچی هەر بە ئێرانی مایەوە. ئێرانی توانی لە حاند هرووژمی دواتری عەرەب و تورک و مەغۆلان خۆی ڕابگرێ و درێژە بە ژیانی بدا و ماکە و هەوێنی دەرەکی بێنێ و بیکاتە ئێرانی و هەر بۆیە لە ماوەی مێژووی درێژخایەنی خۆیدا، توانیویەتی هێزێکی جێی سەرسوڕمان بۆ ژیان و مانی بخاتەڕوو. وەخەبەرهاتنی ئەم گەلە لە ڕۆژگاری ئێستادا کە هەمووی ٢٥ ساڵێک دەبێ و نابێ و وەک نوێبوونەوەیەکی بەگوڕی نەتەوەیی خۆی دەنوێنێ، وێدەچێ کە لە نێو بنەماڵەی نەتەوەکانی ئاسیای خۆرنشیندا، بیباتەوە سەر دۆخی لەمێژین و ڕابردووی. ئێرانی ئەمڕۆ جارێکی دیکە بە ڕواڵەت و ڕوخساری وەرگیراو لە کولتووری خۆراوا، خۆی گۆڕیوە، بەڵام بە باری ڕووحی و دەروونیدا پابەندی داب و نەریتەکانی خۆیەتی و وێدەچێ ببێتەوە بە ناوەندی سیاسی، ئابووری و کولتووریی نەتەوەکانی ئەم بەشەی ئاسیا. هەل و هەڵکەوتی جوغرافیایی و کۆمەڵێک سامانی بەربڵاوی سروشتی و جەماوەری چالاکی کە خاوەنی داب و نەریتی یەکێک لە کۆنترین کولتوورەکانی دنیان، دەتوانن لە داهاتوودا لە نێو کۆڕی گەلانی ئاسیایی بیکەنە خاوەنی پلەیەک کە شیاوی ڕابردوویەتی.

***

# سەرچاوەکان

# (بابەتە گشتییەکان)


C.G Cameron. History of Eariy Iran, Chicago, 1936. Histoire de l'Iran anbqur. 1937.

G. Childe. L'Orient prcéhistorique, payot, Paris, 1953.

A. Christensen, Die Iranier, Muich, 1933.

G. Contneau, Manuel d'ardhéologie orientale, des origins jusqu à l'époque d'Alexandre, 4 vol. Paris, 1927. 1947.

W. Geiger et E. Kuhn. Grondriss der iranischen Plulologie, t. II. 1896–1904.

R. Grousset, Histoire de L'Asie. t.I.

A. Von Gutschinid, Geschichle Irans und seine Nachbarlande, 1888.

W. Geiger, Ostiranische kultur im Alterltum, 1882.

E. Herzfeld, Archaeologische Mitteilungen aus Iran, 9 volumes.

Archaeological History of Iran. 1935.

Iran in the Near East, 1941.

F. M. Heichelheim, Wirtschaftgeschichte des Altertums, 2 vol. 1938.

J. Marquart. Untersuchungen über die Geschichte bon Eran, 1896–1905.

G. Masfero, Histoire ancienne des peuples de l' Orient classique. 1909.

E. Meyer. Geschichte des Altertums, t. I. 1909.

A Moret, Histoire de l'Orient, 1929–1930.

J. De Morgan, Mission Scientifique en Perse, Vol. IV, 1896.

G. Perrot et C. Chipier, Histoire de l'art dans l'antiquité,1882–1911, t.v.

A.V. Pope (edit.), A Surϑey of Persian Art, 1938, t.I.et/v.

J.V. Prasec, Geschichte der Meder und Perser bis zur Makedonischen Eroberung, 1906.

G. Rawlinson, Fiϑe great monarchies. 1871–1876, volIII.

M. Rostovtzeff. Social and economic life of the Hellenistic World, 3 vol. 1941.

P. M. Sykes, A History of Persia, 2 vol. 1915.

C. Huart et L... Delaporte, l'Iran antique: Elam et Perse et la ciϑilisation Iranienne, 1943.

## گەندەوکۆزەی زەوی

T. Arne. The Srϑedish Arehaeological Expedition to Iran 1932–1933,1935.

G. Cot, teau et R. Ghitshman, Fouilles de Tépé– Giyan prés de Nehaϑend, 1935.

Mémo res de La Délégation en Perse. Puis Mémoires de la Mission de Susiane. Puis Mémoires de la Mission en Iran. sous la direction de Morgan, puis de Mecqueneni et R.P. Seheil, puis de G. Contenau et R. Ghirshman: 1900–1954 36 volumes.

R. Ghirshman, Fouilles de Sialk près de kashan. 2 vol. 1938–1939.

E.F. Schmidt, Excaϑations al Tépé Hissar Damghan. 1937.

A. Sten, An Archaeological Tour in Gedrosia, 1934.

A. Sten, Arcaaeologe, at Tour in the Ancient Persia. 1936.

Archaeologicat Reconnaissances in North – Western India and South-Eastern Iran, 1937.

A. Sten, Old Routes of Western Iran, 1940.

## ١ـ بەرلە مێژوو، کەلوپەلە مەفرەقییەکانی لوڕستان، گەنجینەی زێویەی سەقز

G. Contenau, Le Trésor d' Astrabad et les fouilles de Tépé Hissar, Rev Ass. XXXI, 1934.

R. Ghirshman. Notes sur les peuples et l'art de l'Iran préhistorique, Rev. Arts Asiat. X. 1936.

R. Dussaud: Ceinture en Bronze du Luristan aόec scène de chasse. Syria, XV,1934.

R. Ghirshman, Le Trésor de Sakkez, les débuts de l'art mède et les bronzes du Luristan, Artibus Asiae, 1950.

R. Forrer, Six bronzes préhistoriques du Luristan, Bull. de la Ste. Préhist. de France, t. XXXX, 1932.

C.T. Gadd, Luristan Bronzes, Brit. Mus Quarterly, t.v. 1930.

" " More Luristan Bronzes, ibid. t. VI.

" " Bronzes from North– Western Persia, ibid. t. VII. 1933.

" " Three L uristan Bronzes, ibid. t. IX. 1934.

A. Godard, Les Bronzes du Luristan, 1931.

F. Hancar, Kaukasus – Luristan, 1935.

V. Minorski, The Luristan Bronzes, Apollo. XIII, 1931.

L. Speelers, Nos Bronzes perses. Bull. Musées royaux d'art et d'arch, 1931.

## سەردەمی هەخامەنشیەکان

J. Bidez et F. Cumont, Les Mages hellénisés, 1938.

E. Babelou, Les Perses achemenides, Catalogue des monnaies, 1939.

E. Benveniste, Les Mages dans l' Anceien Iran.

C. Clemen, Die griechischen und lateinischen Nachrichten über die persische Religion, 1920.

O. Dalton, The treasure of the Oxus. 1921.

R. Ghirshman, Nurabad. Etude sur les temples du feu en Iran. Syria, 1947.

Masjid_i_Soleiman, Résidence des premiers princes achéménides, Syria, 1950.

R.Ghirshman, Suse . ύn ύillage perse – achéménide, Mémoites M. A. I., vol. XXXvI, 1954.

M. Dieulafoy, L'acropole de Suse, 1890.

M. Dieulafoy, L'art antique de la perse.

G.Cardascia. Les archiύes des Murasu, une famille d'homes d'affaires babyloniens à L'époque perse (455–403), 1951.

G.Cousin. kyros le Jeune en Asie Mineure, 1905.

C.Driver, Aramaic documents of the fifth century B.C.1954.

K . Erdmann, Die tranische Feuerheiligtum, 1941.

E.Flandin et P. Coste, Voyage en Perse Pendant les années. 1840/41–1843/45.

G. J. Gadd, The fall of Nineðeh, 1923.

E. Herzfeld, Am Tor ðon Asien, 1920.

E. Herzfeld, Altpersische Inschriften, 1938.

P. J. Jung, Dareios I. König der perser, 1944.

F. Justi, Iranisches Namenbuch, 1895.

R. G. Kent, Old Persian Grammar, Texts, lexicon, 2eme ed., 1953.

L. W. King and R. C. Thompson. The sculptures and inscriptions of Darius the Great on the rock of Behistun in Persia, 1907.

F. W.Konig, Aelteste Geschichte der Meder und Perser, 1934.

F. W.Konig, Relief und Inschrift des Koenigs Dareios I, am Felsen don Bagis. tan, 1938.

F. W.Konig, Der falsche Bardia, Dareios der Grossc und die Lügenkönige, 1938.

A. Meillet, Grammaire du ðieux perse.

J. De Morgan, Manuel de numismatique orientale, 1923.

H. S. Nyberg, Die Religionen des alten Iran, 1938.

A. T. Olmstead, The History of the Persian Empite, 1948.

E. Pillet, Le palais de Darius à Suse, 1914.

G. Posener, La première domination perse en Egyple, 1936.

Prasec, Kyros der Grosse, 1912.

Prasec, Dareios, 1914.

G.Radet, La première incorporation de l' Egypte à l'empire perse. Revue des Etudes anciennes, 1909.

G. Rawlinson, Fiðe great monarchies, t. III, 1871–1876.

M. Rostovtzeff, Iranians and Creecs in Soulh Russia, 1922.

F. Sarre und E. Ilerzfeld, Iranische Felsreliefs, 1910.

E. Sehmidt, Persepolis, vol.I.1953.

F. Spiegel. Iranische Altertumskunde, 3 vol. 1871–1878.

P. Weissbach. Die Keilinschriften der Achaemcniden, 1911.

S. Wikander. Feuerpristcr in Kleinasien und Iran, 1946.

G. Widengren. Hoehgottglanbe im Alten Iran, 1938.

Sukumar, Sen. Old Persian Inscriptions of the Achaemenian Emperors. Calcutta. 1941.

E.Obst, Der Feldzug des Xerxes, 1913.

S. Wikauder, Mithra en ə ieux perse, Orientalia Suecann, 1952.

## سەردەمی پارتەکان

F. Altheim, Alexander und Asien, 1953.

E. Bikerman, Institutions des Seleucides, 1938.

N. C. Debevoise, A polilcal history of Parthia, 1938.

R. Ghirshman, Un bas– relief d' Artaban. V. aðec inscription pehledi – arsacide Monum. Piot, 1950.

Quelques intailles du musée de Calcutta à légendes en lokharien pehlði arsacide et pehlði sassanide, volume publié à la mémoire du prof. E. Herzfeld. 1952.

Chapitre "Art parthe" dans "Ilomme et Art" Laorusse (Sous presse).

C. Hopkins, Aspects of Parthian Art in the Light of Discoðeries From Dura– Eu– ropos. Beiyteus, III.

M.T. Rostovizeff, Dura and Problem of Parthian Art, 1936.

H. Seyrig, Anliquilés syriennes, Syria, 1936.

W. Wroth, Calalogue of the Coins of Parthia, 1903.

M. J. Saint–Martin, Fragments d'une histoire des Arsacides, 1850.

V. Kahrstedt, Artabanos III und seine Erben, 1950.

## سەردەمی ساسانییەکان

F. Altheime, Die Kriese der allen welt. 3 vol. 1943.

F. Altheime, Lileratur und Gesellschaft im ausgehenden Altertum, 2 vol. 1948.

F. Altheime, Aus Spätatike und Chrislentum, 1951.

F. Altheime, Asien und Rom, 1952.

F. Altheime, Niedergang der alten Welt. 2 vol. 1952.

F. Altheime, Ein asiatischer Staat, 1er vol. 1954.

H.W. Bailey, Zoroastrian Problems in the Ninth– Century Books, 1943.

Ch. Bartholomae, Zum sasanidischen Recht, 1922.

E.Burnouf. Etudes sur la langue et les textes zends, 1840– 1850.

A. Christensen, L'Iran sous les Sassanides. 1936, 2ème ed. 1944.

Fr. Cumont, Textes cl Monuments figurés relatifs aux mystères de Milhra, 2 vol. 1896/99.

J. Darmesteter, Le Zend– Adesta. 3 vol 1893.

G. Fluegel, Mani, seine Lehre und seine Schriften, 1862.

R. Ghirshman. Inscription du monument de Châpour I á Châpour, Revue des Arts Asiat., 1936.

" Les fouilles de Châpour, ibid, 1938

" Un plat sassanide en argent doré. Artibus Asiae. 1942.

" Les astodans, Etude sur les rites funéraires sous les Sassanides. ibid. 1948.

" A propos des bas– reliefs rupestres sassanides, ibid, 1950.

" Inscriptions Pehlði des plats sassanides du Musée de L'Ermitage.B.S.O.S., 1951.

" Scénes de banquets sur l'argenterie sassanede. Art. Asiae. 1953.

" Chapitre "Art Sassanide" dans Homme et Art, Larousse,1956.

" Une coupe sassanide à scene de Chasse, Artib. Asia, 1955.

" Argenterie d'un seigneur sassanide, Ars Orientalis 1956.

" Bichâpour. Les mosaïques sassnides, 1vol. 1956.

E.Herzfeld, Zoroaster and his morld, 2 vol. 1947.

E.Herzfeld Paikuli, 2 Vol. 1924.

G. Husing. Der Mazochismus, 1935.

A.V.W. Jackson, Zoroaster, the Prophet of Ancient Iran, 1899.

" On the date of Zoroaster, J.of Am. Or. Soc., 1896.

" Studies in Manichaeism, ibid, 1923.

" Prof. Jackson Memorial Volume, Cama Orient. Lust., 1954.

" Etudes sassanides (en russe), 1909.

E.Kühnel Wachtonneth, Die Ktesiphon. – Expedition, 1931– 32–33.

B.Labourt. Le christianisme dans l'empire perse, 1904.

R.Laufer, Sino–Iranica, 1919.

G. Le Strange, The Lands of the Easlern Caliphate.

Macoudi, Les Praities d'or.Trad .C. Barbier de Meynard, 1865.

J. Markuart – G. Messina, A Catalogue ef the Proðineial Capitals of Eranshahr. 1931.

J.J. Modi, The religious system of the Parsis, 1908.

" The funeral ceremonies of the Persees, their origin and explanalion, 1905.

J.H. Maulton, Early Zoroastrianism, 1913.

F. Paruck, Sassanian Coins 1924.

Bilvestre de Sacy. Mémoires sur diderses antiquilés de la Perse et sur les médailles des rois de la dynastie des Sassanides, 1793.

C.Salemann, Maruchaische Studien, 1908.

H.C. Puech. Le Manichéisme, San fondateeur, sa doctrine. 1949.

R.Reitzenstein und H.H. Schaeder. Studien Zum antiken synkretismus Iran und Griechenland. 1926.

F.Spiegel, Aϑesta, die heilige Schrift der Parsen. aus sein Grundtext übersetzt mit Rücksicht auf die Tradition, 3 vol,. 1852–1863.

B.Spuler, Iran in Früh – islamischer Zeit. 1952.

M.Sprengling, Third Century Iran Sapor and kartir, 1953.

E.Benveniste et L. Renou, Vrtra et Vithragna. 1934.

W.B.Henning. Zoroaster, Politician os Witch–doctor? 1951.

S. H. Taqizadeh, Old Iranian Calendars. 1938.

F.Wolff, Aϑesta– übersetzungen auf der Grunde ϑon Chr. Bartholomae's wörterbuch, 1924.

R.C.Zaehner, Zurϑan. A Zoroastrian dilemma, 1955.

G.Widengren, Xosrau Anosurϑan, les Hephtalites et les peuples turcs. Orientalia, 1952.

J.Smiruoff, Argenterie orientale. 1909.

J.Orbelli et k. Trever, Le Métal Sassanide (en russe), 1935.



٤- ڕێی [ڕاگا]: کاشیی
سووری نەخشین



۱- کۆمەڵێک ئامرازی بەردینی ئەشکەوتی «تەنگی پابدا»



۳- سیێلکە: گۆڕێکی سەر بە چینی یەکەم



۲- سیێلکە: دەسکە چەقۆیەکی داتاشراو لە یەسقان ←



٦ـ سیێلکە: گۆڕێکی سەر بە گۆڕستانی «ب»



٥ـ تەپەی حەسار: تونگەڵەی ڕەش





٨ـ لوڕستان: تەورێکی مەفرەق (برۆنز)

٧ـ سەرکەوتنی نارام سین

١٠ـ لوڕستان: کلکەی قفڵ و قەرازەی ئەستۆبەندی ئەسپی عارەبانە



١٣ـ لوڕستان: زەنگی لغاوی مەفرەق

٩ـ لوڕستان: تەورێکی مەفرەق





١١ ـ ١٢ـ لوڕستان: سەری ئاغزوونەی ڕەخت و زینی ئەسپ





١٤ـ لورستان: دەرزیلەی مەفرەق





١٥ـ لورستان: بزنەکێوی مەفرەق

١٦ـ لورستان: پەیکەرێکی بچووکی مەفرەق



١٧ـ گەنجینەی [زێوییەی] سەقز: کلکە کالانی زێڕ



١٨- پەیکەرەی «ناپیر- ئاسوو»ی شاژنی «ئوونتاش - هووبان»

١٩- لورســــتان: ئاوێنــــەی مەفرەق (مزقەڵایی)





٢٠- گەنجینەی [زێوییەی] سەقز: پەلکە تەتەڵەیەکی زێڕ

٢١- لوڕستان: لغاوی مەفرەق



٢٢- هه‌مه‌دان(؟):

بوونه‌وه‌رێکی زێڕ



٢٣- هه‌مه‌دان (؟):

بوونه‌وه‌رێکی زێڕ



٢٤- لوڕستان:

نه‌زرینه‌یه‌کی مه‌فره‌ق



٢٥- گه‌نجینه‌ی [زێوییه‌ی]

سه‌قز: سه‌ره‌شه‌هێنی زێڕ



٢٦- گه‌نجینه‌ی [زێوییه‌ی]

سه‌قز: سه‌ره‌شێری زێڕ



٢٧– لوڕستان: کیتەڵەی مەفرەق





٢٨ـ لورستان: دەرزیلەی
نەزرکراو (نەزرینە)



٢٩ـ گەنجینەی [زیویەی] سەقز: پەڕە و پەلکەی کەمەرەیەکی زێڕ





٣٠ـ گەردنئاویزی زێڕ

٣١ـ دەسبەندی زێڕ



٣٢ـ تۆق یان سینەبەندی زێڕ (مووزەی تاران)



٣٣ـ کەلاردەشت: پیاڵەی زێڕ (مووزەی تاران)



٣٤ـ ئازەربایجان: پیاڵەیەکی سواڵین لەسەر دیمەنی گیانلەبەرێک (مووزەی تاران)



٣٥ـ رووبەری مەسجیدسولەیمان



٣٦ـ تەختیجەمشید: پلیکانی ئاپادانە



٣٧ـ تەختیجەمشید: دیمەنی لە حەواوە



٣٨- پاسارگاد: فرەوەهەری باڵدار



٣٩- بێستوون: داریووشی یەکەم



٤٠- پاسارگاد: نێژگەی کووروووش



٤١- بێستوون: بەردەتاشی داریووش



٤٢- تەختیجەمشید: داریووش لە جەنگەی دیداری گشتیدا



٤٣ـ نەخشی ڕۆستەم:

ئاورگا



٤٤ـ شووش: دیمەنی

لە حەواوە



٤٥- تەختی‌جەمشید: سەگێکی داتاشراو لە بەردی مەرمەڕی ڕەش



٤٦- تەختی‌جەمشید: پەیکەرەیەکی بەردی مەرمەڕی یۆنانی (مووزەی تاران)



٤٧- تەختی‌جەمشید: سەری میرێک لە هەویری بەردی لاژوەرد (مووزەی تاران)



٤٨- تەختی‌جەمشید: بەردەتاشێکی تالاری سەتکۆڵەکە



٤٩- دیمەن و قەڵافەتی شێرەداڵ لەسەر کاشی



٥٠- تەختیجەمشید: پەلکە و پەڕەی تەتەڵەیەکی زێڕ



٥١- تاجەگوڵینەی

زێڕ



٥٢- سەرکۆڵەکەیەکی کۆشکی

هەخامەنشی



٥٣- گۆزەی مەفرەقی هەخامەنشی



٥٤- دەسبەندی زێڕ



٥٥ـ کۆمەڵی کەوانداران لەسەر کاشی



٥٦ـ تەختیجەمشید: شاندی باجدەرانی سووریا



٥٧ـ هەمەدان (؟): دەسکێکی نەخشینی زێرینی بەردەهەسان




٥٨ـ یەک هەتا چوار، کۆمەڵێک سکەی هەخامەنشی؛ پێنج هەتا
هەشت، کۆمەڵێک سکەی میرهەرێمانی هەخامەنشی



٥٩- بەمبەئی: دیمەنی شەڕی داریووش و ئەسکەندەر لەسەر مزاویک لە ئیسووس



٦٠- ٦١- تەختی‌جەمشـــید: بەردەتاشی سەردەرانەی پەرسـتگایەکی بـەرەوەی تەختی‌جەمشید





٦٢- دینـــەوەر(؟): ســـەری سیلێنووس ←

٦٣- دینـەوەر (؟): ســەری ساتیرێک →







٦٤- شەمی: پەیکەرەیەکی مەفرەق



٦٥- نەهاوەند: چەند پەیکەرەیەکی بچووکی مەفرەق سەر بە پەرستگای یۆنانی



٦٦ـ شەمی: پەیکەرۆکەیەکی مەفرەق



٦٧ـ شـــەمی: ســـەری
بەردەمەرمـــــــەڕی
پادشایەک





٦٨-٦٩- شووش: گۆڕی تاکەکەسی سەر بە سەردەمی پارتی



٧٠- شووش: گۆڕستانی گشتیی سەردەمی پارتی



٧١ـ شەمی: سەری مەفرەقی ئانتیۆخووسی چوارەم(؟)



٧٢ـ بەژنی بەردەمەرمەڕی پەیکەرەیەکی یۆنانی

٧٣ـ شووش: سەری مەلەکە «مۆزا». ئەم سەرە لە مەڕمەڕ داتاشراوە و لەسەر تاجەکەی بە خەتی یۆنانی نووسراوە و دەڵێ ئانتیۆخووس سازی کردووە. لە ڕووی شێوازی نووسینەکەوە دەکرێ بڵێین سەر بە کلکەی سەدەی یەکەمی پێشزایین تا سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینییە.





٧٤ـ شووش: سەری داتاشراوی پیاوێک لە بەردەقسڵ



٧٥ـ هەمەدان: سەری داتاشراوی پیاوێک لە بەردەقسڵ





٧٦ـ پەیکـەری بەلاشـی سێهەم (؟)



٧٧ـ بێســـتوون: بەردەتاشێکی پارتی

٧٨ـ شووش: بەردەتاشی ئـەردەوانی پێنجـەم (مووزەی ئێران)



٧٩- تەنگی سەرژک: بەردەتاشی پارتی



٨٠ ـ بەردەتاشی مێهردادی دووهەم (لای چەپ) لەگەڵ گۆدەرزی دووهەم



٨١ ـ سوارەی پارتی، لە قوڕ سازکراوی لە کڵ دەرچوو



٨٢ ـ تەنگی سەرزک: بەردەتاشی پارتی



٨٣ ـ ئاگردانی مەفرەق



٨٤ ـ کۆمەڵێک پەیکەرۆکی لە یەسقان داتاشراوی سەردەمی پارتی
(مووزەی تاران)



٨٥ ـ شووش: میدالیای لە قوڕ سازکراوی لە کۆڵ دەرچوو




٨٦ ـ کۆمەڵێک سکەی سەردەمی پارتەکان، یەک: ئۆرۆدی یەکەم، دوو: فەرهادی پێنجەم و مۆوزا، سێ: فەرهادی چوارەم، چوار: گۆدەرزی دووهەم، پێنج: مێهردادی دووهەم، شەش: مێهردادی دووهەم، حەوت: گۆدەرزی دووهەم (؟) هەشت: مێهرداد (لە وەرگێڕانی ئینگلیسیدا نووسراوە ڤەردانی دووهەم.)



٨٧ ـ تیســـفوون:
کۆشکی ساسانی



٨٨ ـ بیشـــــاپوور:
سه‌رسه‌رای گه‌وره‌ی
کۆشکی ساسانی



٨٩ ـ بیشـــاپوور: کۆشـــکی
ساســـــانی، شانشـــــین و
گه‌چبڕی و ورده‌کارییه‌کانی





٩٠ـ دەوریی زێوینی ئاوەزێڕکراو، دیمەنی ڕاوی پادشای ساسانی

٩١ـ گۆزەلەیەکی زێوی ئاوەزێڕکراو (مووزەی تاران)



٩٢ـ شەربەیەکی بەردی بلوور



٩٣- قوماشێکی دوای سەردەمی ساسانی



٩٤- دەورییەکی بەردی بلوور





۹۵-۹٦- مزاویکەکانی کۆشکی پادشایانی ساسانی



٩٧- بیشاپوور: نەزرگەی دووکۆڵەکە



٩٨- بیشاپوور: ئاورگا



٩٩ـ نەخشی ڕۆستەم:
ئەردەشـێری یەکـەم
پلـەی پادشـایەتی
وەردەگرێ



١٠٠ـ بیشـاپوور:
سـەرکەوتنی
شاپووری یەکەم



۱۰۱ـ شووش: مۆرێکی سەردەمی ساسانی





۱۰۲ـ کۆمەڵێک سکەی پادشایانی ساسانی؛ یەک: بارامی پێنجەم، دوو: شاپووری یەکەم (لە وەرگێڕانی ئینگلسیدا نووسراوە شاپووری دووهەم)، سێ: شاپووری یەکەم، چوار: ئەردەشێری یەکەم، پێنج: خوسرەوی یەکەم، شەش: بەلاش (لە وەرگێڕانی ئینگلیسیدا نووسراوە یەزگردی دووهەم.)

# لیزگەی هەموو ناوەکان

**(ب)**

## (پ)

(ت)



(ج)



(چ)

## (ڕ)

## (ز)



## (ژ)



## (س)

## (ش)

**(گ)**



**(ل)**

## (م)

## (ن)

(و)



(ه)

## (ی)